# مَفاهِيمْ

## يَجِبْ أنْ تُصَحَحْ

## بەكوردی

تەوەسول کردن

بیدعەو جۆرەکانی

داواکردنی شەفاعەت

ھەقیقەتی ئەشعەریەکان

تەبەڕوك وەرگرتن بەئاسارەکان

تایبەتمەندییەکانە پێغەمبەر ﷺ

مەولودی پێغەمبەری خوا ﷺ

زیارەتکردنی مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ

نوسینی

السيد محمد بن علوي المالكي الحسيني

خادم العلم الشريف بالبلد الحرام

وەرگێرانی

محمد ئومێد شێخ ئەحمەد بەرزنجی

# مَفاهيم يَجب أن تُصحَح

## تێگەیشتنەکان
## پێویستە ڕاست بکرێنەوە

نوسینی:

**السيد محمد بن علوي المالكي الحسني**

وەرگێڕانی:

**موحەمەد ئومێد شێخ ئەحمەد بەرزنجی**

وتارخوێن لە مزگەوتی شێخ سعیدی پیران سلێمانی

# بسم الله الرحمن الرحيم

**ناوی کتێب :** ( مفاهيم يجب أن تصحح ) به کوردی .

**نووسەر :** سەید موحەمەدی کوڕی عەباسی علوی مالکی حوسەینی .

**وەرگێڕ :** موحەمەد ئومێد شێخ ئەحمەد بەرزنجی .

**نۆبەی چاپ:** چاپی یەکەم ٢٠١٣ ز – ١٤٣٤ ك .

**چاپخانەی:** ( ڕێنما ) له سلێمانی .

**تیراژ :** ١٠٠٠ دانه .

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانه گشتیەکان
ژمارەی ( ١٩٢٤ ) ی ساڵی ( ٢٠١٣ ) ی پێدراوه.

## پەسەند کردن لە لایەن بەڕێز پرۆفیسۆری یاریدەدەر
## لە زانکۆی صلاح الدین ( د . حسن خالد موستەفا موفتی )

حەمدو سەنای نەبڕاوە بۆ پەروەردگار ، دروودی خوا بۆ سەر گیانی پێغەمبەری پێشەوا ، پاشان بۆ سەر گیانی یارو یاوەرانی بە گشتی تا ڕۆژی دوایی .

ئەڵبەتە هەر کارێك گەنجانی کوردی موسوڵمان نزیك بخاتەوە لە بیروباوەری ڕاستەقینەی ئیسلام و شوبهەو بیری چەوت بڕوێنێتەوە ئەوا کارێکی پەسەند و سوپاسکراوە ، ئەم بەرهەمەش چ خودی دانراوەکە کە بریتی یە لە ڕاستکردنەوەی بۆچونی هەڵەو تێگەیشتن لە کۆمەڵە بابەتێك بە هەڵە ، لەلایەن زانای هاوچەرخ خوالێ خۆش بوو ( السید محمد بن علوی المالکی) دانراوەو دەیان زانای پایە بەرز لە جیهانی ئیسلامی دا ( تقریظ ) و ستایشیان کردووە ، هەروەها چ وەك وەرگێرانی دانراوەکە کە برای بەڕێزم ( مامۆستا شێخ محمد ئومێد شێخ ئەحمەد بەرزنجی ) خوا پاداشتی بەخێری بداتەوە هەستاوە پێی و کردوویەتیەوە بە کوردی و ، برای بەڕێزو خۆشەویستیش ( مامۆستا شێخ بەختیار نێرگزەجاری ) بە سوپاسەوە پێداچونەوەی بۆ کردووە، تێکڕای ئەم هەوڵ و ماندوبونەیان جێگەی دەست خۆشی و سوپاسی هەموو موسوڵمانی گەلی کوردە ، بەتایبەت لەم سەردەمەدا کە بەداخەوە کەسانێکی ناحاڵی لە دەقەکانی تەشریعی ئیسلامی بەبێ زانست و زانیاری بەڕاست و چەپدا فەتوای نادروست دەدەن و خەڵکی بە خۆیانەوە گومڕا دەکەن ، کە پێویستە ئەمڕۆ گەنجانی خوێن گەرم لەو بابەتانە شارەزا بن بەبەڵگەی ڕاست و دروست ، کۆمەڵە تەوەرێکی ئاڵۆزکراو بە زوبانی شیرینی کوردی لە ڕای پەسەند و دروست ئاشنا بن ، دووبارە خوای گەورە پاداشتی بەخێری هەموو کاردۆستێکی دڵسۆز بەئاینی ئیسلام بداتەوە و نمونەی وەرگێڕیش زیاد بکات ئامین . وصلی الله و سلم علی سیدنا محمد وعلی آله و صحبه اجمعین ..

٢٠١٣\٧\٤ هەولێر .

## پەسەند کردن لە لایەن بەڕێز دکتور عرفان رشید شریف
## مامۆستای زانکۆی سلیمانی کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان سەرۆکی لیژنەی فتوای سلێمانی

خزمەت کردن بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و گە یاندنی پەیامی پیرۆزەکانی و بەرگری کردن لە عقیدەی راست و دروستی ئەهلی سوننەت وجەماعەت " بەدرێژایی مێژوو ئەرکێك بوە لە سەرشانی دڵسۆزان و خەمخۆرانی ڕێبازی خواناسی بەبێ سڵەمینەوەو گوێ دانە لۆمەی لۆمەکاران ڕاستیەکانیان بۆ هەموان ڕوون کردۆتەوە : ﴿ الذين يبلغون رسالات الله ويخشونه ولا يخشون أحدا إلا الله وكفى بالله حسيبا ﴾ .

لەسەردەمانێکیشدا کە ئەهلی بیدعەو گومڕایی تیری ژەهراوی خۆیان لە سنگی ئەهلی حەق ڕاکێشابێت و بە پیلانی ناحەزانی ئیسلام ویستبێتیان گومان و دوودڵی بخەناو ئەهلی خواناسیەوە بێ هیچ دوو دڵیەك گەورە مەردان و ڕاست ڕەوان لێیان هاتونەتە دەنگ و بە نوری ئیمان وبە زانست و مەعریفەولێبڕانیان توانیویانە بەرپەرچیان بدەنەوە و بەبەڵگەی ڕاست و دروست و ڕەوان ناڕاستەی ناڕاستیان خامۆش بکەن ، لەم پێناوەش دا چەندین نوسراو لەلایەن زانایانەوە نوسراون و ڕاستیەکانیان بڵاوکردۆتەوەو دەستنیشانی بیروبڕوای چەوتی لاڕێکانیان کردووە ، بەتایبەتیش لەچەند ساڵی ڕابردودا هەموو ئەو بیروبۆچونانەی کەبرەویان پێدرا لەلایەن خەواریجەکانی سەردەمەوە وەکو بابەتگەلی: ( تجسیم و شرك و کوفرو بێ مەزهەبی و.... هتد ) کەوەکو مۆتەکەیەك کردیانە گەردنی بەشێك لە گەنج و لاوەکان و بەئێستاشەوە هەر پێوەی دەناڵێنن ، بۆیە پەرچ دانەوەی ئەم بیرو بۆچونانە کەبەداخەوە موسوڵمانی پێلەکەدار دەکەن و ئەو ئایەت و فەرمودانەی کەبۆ موشۆیك و کافر ومونافقەکان هاتوون ئەیدەنە پاڵ موسولچمان و ئەهلی تەحید و یەکتاپەرستی

گەلیٚ لە زاناکان بە نوسراوەکانیان ئەرکی سەرشانیان بەجیٚ هیٚناو بووە چقڵی چاوی خەواریجەکان و شادی و دڵخۆشی ئیمانداران ..

لەو نمونە گەورانە : نوسراوە بە پیٚزەکەی زانای گەورە ( السيد محمد علوی المالکی ) بەناوی ( مفاهيم يجب ان تصحح ) لە پیرۆزترین شویٚنی سەر رووی زەمین دا ( مەککە ) ی پیرۆز نوسی و بڵاوی کردەوە و هەر زوو بە زوو بە جیهانی ئیسلامی دا بڵاوبویەوەو بووە قەڵغان و چەکی دەستی گەنج و لاوەکانمان ، بۆ زیاتر برەودان بەم خزمەتەی مامۆستا ( محمد علوی المالکی ) برای بەریٚزمان ( مامۆستا شیٚخ محمد ئومیٚد بەرزنجی ) وەریگیٚراوەتە سەر زوبانی شیرینی کوردی ، دڵنیاین کە ئەبیٚتە تیٚشویەك بۆ مامۆستای وەرگیٚرو سودیٚکی نەبڕاوەش بۆ گەنج و لاوە خۆشەویستەکان و ئەگەر تەوژمی دەمارگیریش برەویٚنریٚتەوە هەموو ئەو کەسانەش کە بانگەشەی ( تجسيم و شرك و کوفر ) بۆ ئەهلی یەکتاپەرستی ئەکەن وازئەهیٚنن و ئەگەریٚنەوە بۆ ریٚبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت .

هیوای بەردەوامی بۆ مامۆستا شیخ محمد ئومیٚد ئەخوازین و داواکارین لە خوای بەخشندە ئەم کارەی لیٚ قبوڵ بفەرمویٚت .

وصلى الله وسلم و بارك على سيدنا محمد وعلى آله و صحابته الى يوم الدين .

٢٠١٣\٩\٢٢

## پێداچوونەوەو هەڵسەنگاندن

## لە لایەن ( مامۆستا شێخ بەختیار عبدالقادر نێرگزەجاری )

سوپاس بۆ خودای پەروەردگار ، درووود و سەلام لەسەر گیانی بەڕێزترین پێغەمبەر گەورەو سەروەرمان محمد و لەسەر خانەوادەو هاوەلانی بە گشتی .

پاش خوێندنەوەو تێڕامانی ووردی ئەم پەڕتوکە گرنگەی زانای پایەبەرزو خواناس و خزمەتگوزاری زانستی ئاینی لە شاری حەرەمی پیرۆز ( السيد محمد بن علوي المالكي الحسني ) بەناوی ( مفاهيم يجب أن تصحح ) گەیشتمە دڵنیاییەکی تەواو کە ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبە پڕ بایەخ و زۆر پێویستانەی کە هەموو موسوڵمانان بەهەموو بیرو بۆچونە جیاوازەکانەوە پێویستە زۆر بە ووردی بیخوێننەوە و لە مانا بەرزو هەڵوێستە پڕ دادوەری و ڕاو بۆچوونە بە ئینسافەکانی لەسەر بابەتە جێ ناکۆکەکان کە بە مێشك و دڵی کراوەو سەلیقەیەکی بەرزو هەستێکی پڕ لێپرسینەوەوە ، لەبەردەم خوداو خەڵکی دا ڕوونی کردۆتەوە ، بەمەبەستی نەهێشتنی ئەو ناکۆکیانەی کەدەبنە مایەی تێکدانی ڕیزی موسوڵمانان و بەرپاکردنی ڕق و کینەو دوژمنایەتی بەرامبەر ئەو موسوڵمانانەی کەبە دڵێکی پڕ لە جۆشی و عەشقی خوداییەوە خەریکی بەندایەتی و یەکتاپەرستی خۆیانن .

وەك لە سەرەتای کتێبە عەرەبیەکەی بەڕێزیاندا یاداشت کراوە کە زیاتر لە چل زانای گەورەی جیهانی ئیسلامی کە خاوەنی بڕوانامەی بەرزی وەك دکتۆرا و پلەی بالأتر لە زانستە ئیسلامی یەکان دا ، هەمووشیان خاوەنی تەقواو زانست و شارەزاییەکی زۆرن لەم بوارەدا و پلەو ئەزمونێکی گەورەیان هەیە لە حکومەت و دامەزراوو ڕێکخراوە ئیسلامی یەکاندا زۆر بە شارەزایی و وورپایی و دادپەروەریەوە هەڵیان سەنگاندووە و دەرکیان بە ڕاستی و ئاستی بەرز و

بۆچـوون و هەڵوێسـتـە جـوان و بیروبـاوەڕە خـاوێن و ناوەندگیرییـە ڕاسـتەکەی کردووە لە ( تقریظ ) و هەڵسەنگاندنەکانیان دانیان بەم ڕاستیانەدا ناوە .

مـەخابن لـە بەرامبەریشـدا هەنـدێکیش هـەن دڵ و مێشـك و چـاوی خۆیـان داخسـتووەو دەرك بـەو ڕاسـتیانە ناکـەن و لـە گێـژاوی گومـان و تۆمـەتبارکردنی خەڵکی دا بـەناڕەوا خۆیـان هێشـتۆتەوە ، دەسـت دەکـەن بە تۆمـەت بەخشـینەوە بەسـەر ئەوانـەی کـە تەوەسـول بـەجاهی حـەزرەت و تـەرووك وەرگـرتن بە ئاسـارە پیرۆزەکـانی و داوای شـەفاعەت کـردن بـە خـاتری پێغەمبـەر ﷺ دەکـەن ، کەلـە قورئـان و سـوننەدا ئامـاژەی پێکـراوەو هـاوەڵان و شـێن کـەوتوان( تـابعین ) پەیڕەویان کردووە ، بەڵام ئەوانە بەبێ بوونی زانیارییەکی قوڵ و بێ باکانە و بێ بوونی بەڵگەو تێگەیشتنێکی فراوان ، هـەر بەخوێندنەوەی چـەند نامیلکەیـەکی بێ بنەماو هەڵبەستراو هەستاون بە کافرو موشریك کردن و بەبیدعەچی دانانی کۆمەڵێکی زۆر لە موسوڵمانان هەر بەتەنیا لەبەرئەوەی لە بیری تەسك و زانستی ناتەواوی ئەوانەدا جێگەی نابێتەوە ، بگرە بیروڕای زانا گەورەکانی خۆشیان کە گوایە بەسەر مەشقی خۆیان داناوەو بانگەشەی پەیڕەوی لێکردنی دەکـەن ، ئـەو ئەمانەتشیان نەپاراسـتووە و ووتـەو ڕاوبۆچـونەکانی ئەوانیشـیان شـێواندووە و پێچـەوانەیان کردۆتـەوە وەك ئـەو درۆو بوهتانـەی بـەدەمی زانـای خۆیـان ( شـێخ محمـــد عبـــدالوهاب ) هەڵیانبەســـتووە لـــە کتێبەکـــەدا بەبەڵگـــەوە و ئامـــاژە بەسەرچـــاوەکانیەوە یاداشـــت کـــراوە ، بەخوێندنـــەوەی تـــەواوی کتێبەکـــە ڕاستیەکانی وەك خـۆری نیـوەڕۆی هـاوین نمایـان دەبێـت ، بگـرە ئـەو حـوکم و بڕیارەی ئەوان ئەگەر بەسەر پێغەمبەرانیش ( علیهم السلام ) جێ بـەجێ بکرێـت ، ئـەوا ئـەوانیش سـەلامەت دەرناچن و تۆمەتـەکانیان ئـەوانیش دەگرێتـەوە ، وەك داواکەی حەزرەتی موسا ( علیه السلام ) کە یەکێکە لە پێغەمبەرە ئولوعەزمەکان ، پاشان ئەوەی خودا – جل جلاله – پلەی پێغەمبەرایـەتی پـێ بەخشـی و ئایـەت و نیشانەی کۆمەك و پشتگیری خۆی نیشـان داو وادەی سـەرکەوتنی پێدا بەسـەر

فیرعەون و دەست و پێوەندیدا ، بەڵام موسا پێغەمبەر داوای یارمەتی و ئامڕازو هۆکارە دونیاییەکان و کەسێك هاوکاری و پشتگیری لێ بکات وەك لە سورەتی (طـه ) ووتەکانی موسا پێغەمبەر تۆمار کراوە کەداوای گوشاد کردنی سینەو ئاسانکردنی کارەکانی و کردنەوەی گرێی زوبانی و ووتەکانی پڕ دانایی بن و هارونی برایشی کۆمەکی بکات ، وە پشتی بەرنەدات ، خودای گەورەش لۆمەی نەکرد و پێی نەفەرموو تۆ بەم داوایانەت هاوبەشت بۆمن بڕیار داوە و تەنیا پشت بە بەڵێن و کۆمەکی من نەبەست ، بەڵکو پشتت بە کۆمەکی خەڵك و هۆکارو ئامڕازە دونیایەکان بەست ، بەڵکو پێی فەرموو :

﴿ قد أوتيتَ سؤلك يا موسى ﴾ .

لەخوای میهرەبان دەپارێینەوە کە ئەم کتێبە ناوازەو پڕدانایییەی زانای پایە بەرز بکات بە مایەی ڕەوینەوەی هەوری ڕەشی ئەو تۆمەت و بوهتانانەی کە ناحەزان و بێ ئاگایان لە جەوهەری ئایین و ووردەکاریەکانی بەندایەتی بەسەر خەڵکانی خواناسان و بۆ خوا صوڵحاوان دا دەیبەخشنەوە ، وە ئاشنایان کات بەو ڕاستیەی کە ڕێگەی گەیشتن بە ڕەزامەندی خودا بە قەد ژمارەی هەناسەی هەموو بەدیهێنراوانی خودا دەبێت ( طرق الى الله بعدد أنفاس الخلائق ) ، تکاو ئامۆژگاریم بۆیان ئەوەیە بۆ تێگەیشتنی ڕاستیەکان و ڕاست کردنەوەی بیرو بۆچونە هەڵەکانیان بابێن ئەو کتێبە ڕەسەن و سەرچاوە بەهادارانەی زانایانی گەورە بەتوانای پێشینی ئوممەت بخوێننەوە ، کەبەشێوەیەکی وورد و زانستیانە ڕاڤە و توێژینەوەی ئەم باسە جێ ناکۆکیەیان کردووە و ڕای دروست و ڕاستیەکان یەکلایی کردۆتەوە .

وەك ڕوون و ئاشکرایە بۆ هەڵسەنگاندنی هەر بیروڕاو ڕێبازێك ئەبێت لە ڕێگای سەرچاوەو نوسراوەکانی خۆیانەوە بگەینە بڕیارێکی دروست ، نەك ڕێگای چەند نوسراوو ئامیلکەی ناحەزو هەڵبەستراو .

ماوەتەوە کە ڕێزو پێ زانینی بۆ هەوڵ وماندووبوونی برای ئازیز و دڵسۆز مامۆستای بەڕێز ( شێخ محمد ئومێد بەرزنجی ) دەبڕین کە لە وەرگێڕانی ئەم

پەرتوکە ناوازەدا توانا و کاتی خۆی بۆ تەرخان کردوو بە دڵسۆزیەوە درێغی نەکرد بۆ ئەوەی خوێنەرانی کورد لێی بێ بەش نەبن و بتوانن بە زوبانی شیرینی دایکیان بیخوێننەوەو سوود و بەهرەی لێ وەربگرن و بەم ڕاستی یە پڕ بەڵگەو قەناعەت بەخشانە ئاشنا بن .

دیسان سوپاسی بەڕێزیان دەکەم کە متمانەی پیاچوونەوەی وەرگێڕانەکەی و بەراوردکردنی لەگەڵ نوسخە عەرەبیەکەدا بەبەندەی دڵسۆزتان بەخشی ، لە خوای گەورە دەپارێمەوە لەئاستی ئەم ئەرکە پیرۆزەدا ببم و بە ئەمانەتەوە توانیبێتم چمکێکی ئەم کارە هەستیارو گرانەیە هەڵگرتبێت لە هونەری داڕشتنەوەو دانانی زاراوەو ووشەی کوردی لە شوێنی گونجاوی خۆیدا بە کۆمەکی خودای بە توانا لە هەندێك لەو شوێنانەدا کە بە پێویستم زانیبێت سەرکەوتوو بین و مایەی ڕەزامەندی خوێنەرانی بێت .

وە بەگەورەیی خۆشیان لەکەم و کوڕی گەیاندنی مانا بەرزەکانی ئەم کتێبە وەك پێویست بمانبەخشێ ، چونکە کاری پڕ کەماڵ هەر شایستەی خودای گەورەیە .

و صلى الله و سلم على سيدنا و مقتدانا و شفيعنا و ملاذ نجاتنا محمد و آله و صحبه أجمعين

٢٠١٣\٥\٢٧

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ وَقُل اعْمَلُوا فَسَيَرى اللهُ عَمَلَكُم وَرَسُولُهُ وَ الْمُؤمنُونَ سَتُرَدُّونَ اَلى عالِمِ الغَيبِ وَ الشَهادَةِ فَيُنَبِئُكُم بِما كُنتُم تَعمَلُونَ ﴾ التوبة ١٠٥

**پێشـەكی :**

دوای ئـەوەی كـە سـوپاس بـۆ خـوا ئـەم كتێبـەی مامۆسـتای پایـە بـەرز جەنابی ( شێخ مالكی ) م خوێندەوە و لێكۆڵینەوەم لەسەر كرد ، گەیشتمە ئـەو ڕاسـتی یـەی كـە ئـەو باسـانەی لێـرەدا تۆمـارن پێویسـتە هـەموو موسوڵمانێ زانستیان لەسەر هەبێ ، بەتایبەت لـە ڕۆژگـارێكی وەك ئـەمڕۆدا كەلـە چـوار دەورەوە دژایـەتی بـیروڕاو پیرۆزیـەكانی بـاوەڕداران دەكـرێ ، وەلـەناو خـۆ دا خۆركـە بـۆ موسـوڵمانان دروسـت دەكـرێ ، هـەر جـارەی بـەناوێك و لەسوچـێكی ئـەم ئـەرزو ئـاوی ئوممـەتی ئیسـلامەوە كـەلێنێك دەكرێتە ناوجەرگی عەقیدەی برواداراەوە ، میللـەتی كوردیش كـە سـوپاس بۆخـوا بـاوەڕدارەو لەسـەر بنـەمای ئـاینی پـیرۆزی ئیسـلام كاروبـاری ژیـانی بـەڕێوە دەبـات ، دیـارە بـێ بـەش نـین و ناشـبین لـەو هـەوڵ و دژایەتییـەی كەلەلایەن بەكرێگیراوان و دوژمنانی دین و نەتەوەوە دەكرێتە سەریان .

هەرچەندە ناوەكان و كەسەكان لە دژایەتیەكەدا جیاوازبن و هەرلایـەكیان خاوەنی ڕەنگ و پۆشاك و شێوەی تایبەتی بن ، بـەڵام ئامـانج و بیروبۆچـون و ئاغایـەتیان بـۆ دوژمنـانی دیـن و نەتـەوە یەكێكـەو گـەر بـە ڕوكەشـیش دژایـەتی یـەكتری بكـەن بـەڵام نـاوەڕۆك یـەكیان دەخـات و ڕۆژگـاریش ئـەو ڕاستیەی سەلماندوەو دەیسەلمێنێ .

كتێبی ( مفاهيم يجب أن تصـحح ) تاكە نوسـراوو پەڕتوكێكە كەلەسالانی (هەشـتاكانەوە ) بــەلای زۆربــەی زانایانــەوە كــە بتــوانێ و تــوانیبێتی بۆچونەكان یەكبخات و تاكەكانی ئەم میللەتی ئیسلامە لەسەر ئاستی زانا

ناودارەکانی لەیەك نزیك بکاتەوەو ، بە شێوەیەکی هێمنانە و لەسەرخۆ بیرو هزریان بجولێنێ و بیانگەڕێنێتەوە سەر بنەما پیرۆزەکان ، وەوەلامێکی زانستیانەش بێ بۆ نەیارانی .

لەلایەکی ترەوە خاوەنی ( مفاهيم يجب أن تصحح ) هەستاوە بە ووتوویـژ کردن لەگەڵ نەیارانیدا و بەبەڵگەی بەهێزی ڕاستەوە لەگەڵیان دا دوواوەو زۆرجاریش شوێن کەوتوی نەیارانی دێنێتەوە سەر ڕاستە شەقامی هیدایەت ، بێگومان ئەمەش تەنها بەو نوسین و بەڵگانەی کەلە شێخ و مامۆستاکانی خۆیانەوە کە تۆمار کراوەو جێگای بڕوای قوتابیەکانیانن ، کەئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی بۆتە هۆی بڵاوبونەوەو سەرکەوتنی ئەم کتێبەو لەسەرجەم وولاتانی جیهانەوە لەسەر ئاستی موفتی و زانا بەرزەکان پشتگیری و هەڵسەنگاندنی پێشکەش کراوە .

کە یەکڕایی لەسەر دەستەواژەی ( ووتوێژ لەگەڵ نەیاران بەبۆچوون و هزری نەیاران هۆکاری سەرکەوتنی دانیشتنەکانە ) دروست دەکات ، بەتایبەتی ووتوێژ کردن و وورووژاندنی ئەو بابەتە هەستیارانەی کە پەیوەندی بە بیروباوەڕ و یەکتاپەرستی یەوە هەیە ، لەگەڵ ئەو باسانەی کە پەیوەندی بە نرخ و ڕێزو شەرەفیابی حەزرەتی موحەممەدەوە ﷺ هەیە کە خوا پێی بەخشیوە ، کەسەرجەم باوەرداران لەدێر زەمانەوە و لەگەڵ دەرکەوتنی نوری نبوەتدا و لە هاوەڵان و شوێن کەوتوان و زانایانی سێ سەدەی زێڕین لەسەری کۆن و هیچ جیاوازی یەکی ئەوتۆ لەنێوانیان دا لەسەر ئەو باسانە نەبووە کە جێگەی ئاماژە پێکردن بێ ، وەکو ئەوەی کە کەلەم کتێبەدا گرنگی پێدراوە و کردویەتی بە سێ بەشی سەرەکی یەوە . لەوانە :

له بەشی یەکەمی دا باس لەمانە دەکات :

* خۆپاراستن لە بیٚ باوەڕکردن و تەکفیری باوەرداران .

*جیاوازی خستنە نێوان پلەی ( خالق و مخلوق ) واتە : بەدیهێنەر کە خودایە و بەدیهێنراو کە بەندەکانی خودان .

* ( التعظيم بين العبودية والأدب ) جیاوازی نێوان ئەو کردەوانەی کە بۆ پەروەردگار دەکرێن و بەندایەتین لەگەڵ ئەوانەدا کە بۆ مرۆڤ دەکریٚ و ریٚزو عادەتن .

* ناوەندی ( الواسطة ) لە نێوان خودا و بەندەکانی .

*داهێنراوەکان واتە بیدعەو پۆلێن کردنی لەلایەن زانایانەوە .

* ئەشاعیرە : کە نووسەر ئەم ڕێڕەوە بە ووردی ڕوونی دەکاتەوە ، وەڕەدی هەموو ئەو تیرە ژەهراویانە ئەداتەوە کەبەرانبەر ئەشاعیرەکان هەڵدراوەو بەلای هەندێکیانەوە بەدەرچوو لەدین باسکراون .

* حەقیقەتی تەوەسول کردن : کەباس لەو تەوەسولانە دەکات کە لە پلەی (متفق علیه ) دان ، و تەوەسولی ئادەم پێغەمبەر بە حەزرەتی موحەممەدەوە دێنێتەوە و تەخریجی دەکات و ڕای شێخ ( ابن تیمیه ) لەسەری باس دەکات ، وەڕاوبۆچونی ( شیخ محمدی کوری عبدالوهاب ) دێنێتەوە کە چۆن باوەریان بەم تەوەسولە هەبووە ، لەگەڵ ناوبردن و پۆلێن کردنی هەموو ئەو گەورە زانایانەی کەناسراون بە ( حفاظ السنة ) کە چۆن تەوەسولیان بە پێغەمبەری خواوە کردوە .

* شەفاعەت : روون کردنەوەی حەقیقەتی تکاو ڕجاو شەفاعەت و داواکردنی لەلایەن هاوەڵانەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، وەبۆچون و راڤەی ئیبنو تەیمیە لەسەر ئایاتی شەفاعەت .

* دەستەواژەی ئیستیعانەو یارمەتی وەرگرتن : کەتیایدا داواو ئیستیعانە بە پێغەمبەری خوا ﷺ روون دەکاتەوە .

* وەلەبەشی دووەمی کتێبەکەدا : تایبەتی کردووە بە تایبەتمەندی یەکانی حەزرەتی موحەممەدەوە ﷺ ( الخصائص النبویە ) ، لەگەڵ حەقیقەتی نبوەت و حەقیقەتی مرۆڤایەتی پێغەمبەرﷺ ، وەتێگەیشتن لە ووتەی تەبەڕوك وەرگرتن لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ، وەتەبەروك کردن بە ئاسارو شوێنەوارەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ .

وەلە بەشی سێ یەمدا نوسەر کۆمەڵێ باسی جیاوازی هێناوە کەلەم ڕۆژەدا بۆتە جێگەی باس کردنی خەڵك لەلایەن خەڵکانی کەم زانیاری یەوە ، کە بەناوی سەلەف و لایەنی ڕزگاریخوازی ئیسلامەوە کردویانەتە جێگەی خیلاف و جیاوازی لە نێوان موسوڵمانان لەسەرجەم جیهانی ئیسلامی دا ، لەوانە :

* تێگەیشتن لە فەرمودەی ( لا تشد الرحال الا الى ثلاث مساجد ) کە تیایدا نوسەر ووتەی پێشەوایانی سەلەڤ لە دروستی و پێویستی زیارەت کردنی گەورەمان حەزرەتی موحەممەد ﷺ هێناوە .

* باس کردنی ئازادکردنی ( ثویبة ) لەکاتی هێنانی هەواڵی لە دایك بوونی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ کە ڕاو بۆچونی زانایانی بە ووردی تێدا باس کردووە .

* حوجرەی پێغەمبەری خوا ﷺ و چۆنیەتی بە گەورە دانانی لەلایەن خاتوو عائشەو حەزرەتی عومەرەوە – رەزای خوایان لەسەر بێ – .

* گومەزی سەوزو ڕای شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب .

* تێگەیشتن لە دەستەواژەی ( مەولودی پێغەمبەری خوا ﷺ ) لە نێوان دروستی و نادروستی دا لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە .

* تێگەیشتن لە ووتەی ( ئیجماع ) و یەکڕایی لە نێوان زانایانی ئوممەت.

## ڕای زانایانی ئیسلام لەسەر ( مفاهيم يجب أن تصحح )

ئەم کتێبەی خوالێخۆش بوو ، ( شيخ حسنين محمد مخلوف ) پێشەکی بۆ نوسیوە و کەئەم زاتە موفتی پێشوی وولاتی میصرەو ئەندامی کارای کۆمەڵی زانایانی ئەزهەرە ، کە هانی موسوڵمانان ئەدات بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتنی و ، وەبە پێویستی دەزانێ کە منداڵەکانیان فێری ئەم حەقیقەتانە بکەن چونکە تێگەیشتن لەم حەقیقەتانە و ئیش پێکردنی گەیشتنە بەو نورەی کەلەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە نێراوە ، تا هۆکارێك بێ بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو گومڕایی و درۆو بانگەشە ناهەقانەی کەدەکرێت لەلایەنی دوژمنانیەوە .

وەلەسەر ئەو پێشەکیەوە کە ( شێخ حسنين ) نوسیویەتی ، کۆمەڵێ لە گەورە پیاوانی زانایانی جیهانی ئیسلامی پشتگیریان کردووە ، لەوانە :

١- الشيخ محمد بن أحمد بن حسن الخزرجي : وزير الشؤن الإسلامية و الأوقاف – دولة الإمارات العربية المتحدة . .

٢- أ . د . محمد الطيب النجار : رئيس جامعة الأزهر سابقاً ، ورئيس مركز السنة والسيرة ، وعضو لجنة جائزة الملك فيصل العالمية .

٣- د . أبي الوفاالتفتازاني \ وكيل جامعة القاهرة .

٤- المفتي الشيخ محمد بن عبدالله آل الشيخ أبي بكر بن سالم \ مفتي جمهورية جزر القمر الإسلامية .

٥- الأستاذالمستشار السيد علي بن عبدالرحمن الهاشمي الحسني \ المستشار بديوان رئيس دولة الإمارات العربية المتحدة .

٦- الشيخ إمام موسى ضيف الله \ عضو الرابطة الإسلامية ، وإمام مسلمي تشاد .

پاشان له ماوەیەکی کەم و لەگەڵ دەرکەوتنی ئەم کتێبەدا وورده وورده کێشه جیاوازی لەسەرەکان بەرەو حەل و شیکار چوون و له جیهانی ئیسلامی یەوه کاریگەریەکانی دەرکەوت ، بەتایبەت له هەردوو شاری مەککەو مەدینەی پیرۆز ، بۆیه ئەوانەی که چاویان به حەق و حەقیقەت دا هەڵنەئەهات ، ئەوانەی کەبەنوری خۆری حەقیقەت وەك شەمشەمەکوێرە نابینا دەبوون ، کەوتنه دژایەتی و کۆکردنەوەی ئەم کتێبەو لەهەندێ شوێن کار گەیشته سوتاندنی و کەوتنه نامیلکه دەرکردن بۆ سوك کردنی ئەم کتێبه ، هەروەك له ژیانەکەی خوالێخۆش بوودا به ڕوونتر ئاماژەم پێکردووه ، بەلام لەبەرامبەری ئەمانەدا زانایانی تێگەیشتوو وەمامۆستایانی ئاینی کەهەڵگری ڕیساله و جێگەدارو میراتبەرانی راستەقینەی حەزرەتی محمد ﷺ بوون ، هەر زوو هەستیان بەو دژایەتیه ناڕەوایه کرد و بەچەکی ئیمان و پێنوسی هەقەوه هاتنه مەیدان و پشتگیری تەواوی ئەم کتێبی ( مفاهيم يجب أن تصحح ) ی خوالێخۆش بوو ( السيد مالكي ) یان کرد و ، بەهەڵسەنگاندن و نوسینی پشتگیری بۆ کتێبەکه هاتنه مەیدان و ( تقريظ ) ی خۆیان تۆمار کرد ، که تا رەمەزانی ساڵی ( ١٤٢٥ هـ ) که نوسەری کتێبەکه له ژیان دا بوو ( ١١ جار ) له چاپ درایەوەو به وولاتانی ئیسلامیدا بلاوبویەوەو بووه ، هۆی ڕەوینەوەی ئەو گومان و ئیشکالانەی که خرابوونه ناو ریزی موسوڵمانانەوه ، که ژمارەی ئەو زانایانه و هەڵسەنگاندنەکانیان له نوسخه عەرەبیەکەدا تۆماره به نوسراوو واژووەوه ( خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوه سەری ) که زۆرینەیان خاوەنی چەندەها تەئلیفات و نوسین و فتوای شەرعین ، کەلێرەدا تەنها ناوەکانیان و پلەی زانستیان بلاودەکەینەوه و بریتیین له :

١- محمد بن الشيخ أحمد ابن الشيخ حسن الخزرجي \ وزير الشؤن الإسلامية و الأوقاف و رئيس لجنة التراث و التأريخ و قاضي إمارات أبوظبي سابقاً في دولة الإمارات العربية المتحدة .

٢- ا . د . محمد الطيب النجار \ وكيل الأزهر الأسبق و رئيس جامعة الأزهر سابقاً و عضو مجمع البحوث الإسلامية بمصر ، وعضو مجمع اللغة العربية بمصر وعضو لجنة جائزة الملك فيصل العالمية .

٣- السيد عبدالله كنُّون الحسني \ الأمين العام لرابطة العلماء بالمغرب ، وعضو مجمع البحوث الإسلامية بالقاهرة ، عضو رابطة العالم الإسلامي بمكة المكرمة . ٢ \ شعبان \ ١٤٠٥

٤- الدكتور الحسيني عبدالمجيد هاشم \ وكيل الأزهر الشريف ، والأمين العام لمجمع البحوث الإسلامية سابقاً ، ١٤٠٥\٦\٣ ه .

٥- ا . د . رؤوف شلبي \ وكيل الأزهر الشريف سابقاً .

٦- السيد يوسف هاشم الرفاعي \عضو مجلس الأمة ووزير لشؤن مجلس الوزراء الكويتي .

٧- الدكتور عبدالفتاح بركة \ الأمين العام لمجمع البحوث الإسلامية بالقاهرة .

٨- د . أحمد عمر هاشم \ رئيس مجلس قسم الحديث سابقا و عميد كلية أصول الدين بالزقازيق – قاهرة

٩- د . عبدالغني الراجحي \ أستاذ الدراسات العليا بجامعة الأزهر .

١٠ – الشيخ محمد السنراوي \ المفتش الأول بالأزهر و المستشار الديني لمحافظة الفيوم .

١١- الشيخ سيد أحمد العوض \ قاضي المحمكمة العليا ورئيس مجلس الإفتاء الشرعي بسودان ١٥ – ربيع الثاني – ١٤٠٥ هـ . .

١٢- الشيخ محمد مالك الكاندهلوي \ شيخ الحديث ورئيس الجامعة الأشرفية و أمير جمعية علماء الإسلام في باكستان .

١٣- الدكتور عبدالرزاق إسكندر \ مدير التعليم والأمين العام بجامعة العلوم الإسلامية بكراتشي .

١٤- الشيخ محمد بن يوسف البوري \ نائب رئيس الجامعة للعلوم الإسلامية – كراتشي .

١٥- سيد محمد عبدالقادر آزاد \ رئيس مجلس علماء باكستان ، خطيب المسجد الملكي – لاهور ١١\٥\١٤٠٨ هـ .

١٦- نفيس الحسيني خليفة \ إمام الشيخ عبدالقادر رائبوري- لاهور .

١٧- علي أصغر \ خطيب منطقة بنجاب \ لاهور – باكستان .

١٨ – محمد عبدالواحد \ خطيب الجامع الإسلامي بمنطقة سيالكوت – باكستان .

١٩ – أ . الدكتور حسن الفاتح قريب الله \ مدير جامعة أم درمان الإسلامية – جمهورية سودان .

٢٠ – الأستاذ أحمد عبدالغفور عطار \ الأديب الكبير من كبار أدباء المملكة العربية السعودية – المكة المكرمة ، الحائز على جائزة الملك فيصل العالمية في الأدب العربي .

٢١- الشيخ يوسف بن أحمد الصديقي \ القاضي الوكيل لمحكمة الأستئناف العليا الشرعية – بحرين و وعضو المجلس التأسيسي للرابطة الأسلامية ١٣ – شعبان – ١٤٠٥ هـ .

٢٢ – الشيخ محمد الشاذلي النيفر \ عميد كلية الشريعة سابقاً بتونس ، وعضو مجلس الأمة التونسي ، و عضو رابطة العالم الأسلامي بمكة المكرمة .

٢٣ – الفقيه الشيخ محمد الفال البناني \ الأمين العام للرابطة الأسلامية الموريتانية وعضو رابطة الأسلامي بمكة المكرمة .

٢٤ – العلامة الفقيه الأصولي الشيخ محمد سالم عدُّود \ رئيس المحكمة العليا بموريتانيا سابقاً ، وعضو مجلس الفقهي برابطة العالم الأسلامي بمكة المكرمة و وزير الثقافة والشؤن الأسلامية بموريتانيا .

٢٥ – الشيخ محمد عزيز الرحمن الحقاني الهزاروري \ إمام و خطيب مسجد الصديق الأكبر – راولنيدي – باكستان ، خليفة الأمام المحدث العلامة محمد زكريا الكاندهلوي ثم المدني .

٢٦ – الشيخ ابي زيد إبراهيم سيد \ موجّه اللغة العربية بجمهورية المصر العربية .

٢٧ – الشيخ محمد عبدالواحد أحمد \ وكيل وزير الأوقاف بجمهورية مصر العربية ، من علماء الأزهر الشريف .

٢٨ – الشيخ ابراهيم الدسوقي مرعي \ وزير الأوقاف السابق بمصر ٢١ – ربيع الأول ١٤٠٦ هـ .

٢٩ – الشيخ حسين محمود مُعوض \ من كبار علماء الأزهر الشريف .

٣٠ – الشيخ عبدالسلام جبران \ رئيس المجلس العلمي الأقليمي بمراكش و بأسم أعضاء المجلس .

٣١ – الشيخ سيدي الفاروقي الرّحالي \ العلامة الأصولي و رئيس مجلس العلماء بمغرب .

٣٢ – الشيخ سيدي محمد العربي بن البهلول الرحالي \ المحقق الأصولي بمغرب .

٣٣ – الشيخ السيد عبدالله بن محمد بن الصديق الغماري \ الفقيه المحدث – المغرب .

٣٤ – السيد عبدالعزيز بن محمد بن الصديق الغماري \ المحدث الأصولي .

٣٥ – السيد محمد بن علي الحبشي \ رئيس المركز الأسلامي – اندونيسيا .

٣٦ – السيد الحبيب عبدالقادر السقاف \ إمام حضر موت العلامة العارف بالله .

٣٧ – السيد أحمد بن محمد زبارة \ مفتي الجمهورية اليمنتية .

٣٨ – السيد أبراهيم بن عمر بن عقيل \ مفتي لواء تعز .

٣٩ – الشيخ أسد بن حمزة بن عبدالقادر \ صدر علماء زبيد – اليمن .

٤٠ – السيد عبدالهادي عجيل \ رئيس الأنقاذ الأسلامي اليمني .

٤١ – محمد حزام المقرمي \ رئيس المركز الإسلامي. – تعز – اليمن .

٤٢ – السيد محمد بن سليمان \ مفتي زبيد – اليمن .

٤٣ – الشيخ محمد بن علي المنصور \ مدير المعاهد العلمية – صنعاء

٤٤ – محمد علي مكرم \ مفتي لواء الحديدة – اليمن .

خوای گەورە ئەو هەڵسەنگاندن و بۆچونانەیان بۆ بکاتە تێشویەکی رۆژی دواییان و لە نامەی چاکەکاریاندا تۆماری بفەرمویّ بۆیان .

کاری بەندە لە کاتی وەرگێراندنی ئەم کتێبە نایابە لە کاتێکدا کە ئەو هەموو زاناو کەڵەپیاوانەی ئوممەتی ئیسلام لەسەری نوسیویانە هەروا ئاسان نی یە و بیّ کەموکورتیش نابیّ لە بەندەوە ، بۆیە لەکاتی بەکوردی کردنەکەیدا هەڵستاوم بەم کارانەی خوارەوە :

١–بەراورد کردنی هەموو دەقە عەرەبیەکانی فەرموودەکان بە سوننەن و هەوڵدان بۆ ئەمەش هەوڵم داوە بچمەوە سەر کتێبەکان خۆیان ، نەك بە سەیرکردنی نوسخە ئەلەکترۆنیەکان ، چونکە ئەو نوسخانەی کە

ئەلەکترۆنیین و ئەمڕۆ بڵاون بیّ هەڵەی چاپ و پەڕاندن نین ، ئەمەش بۆ ئێمەی کورد کارێکی ئاسان نەبوو ، لەبەر نەبوونی هەندیّ لەو سەرچاوانە لە وولاّتی کوردوستان دا.

لێرەوە سوپاس و پێزانینی خۆم پێشکەش بەهەموو ئەو بەرێزانە دەکەم کە هەندیّ لەو سەرچاوانەیان دەست خستم .

٢- لەزۆر شوێنی ئەم کتێبەدا نووسەر رەحمەتی خوای لەسەر چونکە خۆی پلەی ( محدِث ) ی هەبوە ، هەڵساوە بە نوسین و دیاری کردنی سەرچاوە کان لەشوێنی خۆیدا و نەیکردووە بە فەهرەس ، کەوەك عادەتە ، هەوڵمداوە کەبەو شێوە عادەتیەی لێبکەم بەلاّم لەهەندیّ شوێندا لەبەر گرنگی بابەتەکەی نەمتوانیوە و وەك خۆی هێشتومەتەوە .

٣- زۆر تر گرنگیم بە نوسینی ( باب و فصل و موضوع ) داوە لە سەرچاوەکان ، لەبەر رێك نەکەوتنی ژمارەی لاپەڕەیان لەگەڵ یەکتری ، چونکە سەرچاوەکانی ئێستا کەبەردەست بوو چاپی تازە بوون بۆیە لاپەرەی چاپەکانی جیاوازن لە قەبارەو ووردو گەورەیی دا .

لە کۆتایدا :داواکارم لە کورد زوبانیانی هاوراو موسوڵمانم کە بە چاوی زانستەوە ئەم کتێبە بخوێننەوەو لێی تێبگەن ، وەتانەیخوێننەوە هیچ بیرو بۆچون و رەخنەیەك نیشان نەدەن .منداڵەکانیان لەسەری پەروەردەبکەن تا بە هۆیەوە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺلە دڵیاندا دروست ببیّ .

وەسوپاس و پێزانینم بۆ برایانی بەرێزم هەریەکە لە ( دکتۆر حسن خالد موفتی و دکتۆر عیرفان فقیّ رشید ) کە هەندیّ لە کاری خۆیان بەم خزمەتە بەخشی و هەڵسەنگاندنیان پێشکەش کرد ، وە سوپاس و پێزانینم بۆ برای بەرێزم ( مامۆستا شێخ بەختیار نێرگزەجاری ) کەئەرکی بەسەراچونەوەی دەقەکان و بەراوردکردنی بەنوسخە عەرەبیەکەی گرتە

ئەستۆی خۆی ، خوای گەورە نمونەیان زیاد بکات وزانست و زانیاری زیاتریان پێ ببەخشێ و تەمەنیان درێژ بکات بۆ خزمەت کردن بە رێبازی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ .

داواکارم لە خوای میهرەبان کەئەم کارەمان بۆ بگێڕێ بە تێشویەکی رۆژی دوایمان و بەری ڕەزامەندی خۆیی و شەفاعەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان بخات ، موسوڵمانان یەکبخات و لەسەر ڕاستە شەقامی هیدایەت ژیانمان پێ بباتەسەر و دووبەرەکی و ناکۆکی لە نێوان دا لەناوبەرێت . لە بیرو هزری ژەهراوی دوژمنانی دین بمان پارێزێ ، بمانگێرێ لەوانەی کە ووتەی هەق و راستی کار لە دڵ و دەرونیان دەکات ، زاڵمان بکات بەسەر وویستە خراپەکانی نەفس و شەیتانمان و یەکمان بخات لەژێر سێبەری ئایەتی پیرۆزی :

﴿ وتعاونوا على البر و التقوى ولا تعاونوا على الإثم والعدوان ﴾ .

و صلى الله وسلم وبارك على سيدنا محمد و على آله و أصحابه و أزواجه وأتباعه الى يوم الدين .

وەرگێڕ

محمد ئومێد شێخ ئەحمەد بەرزنجی

ووتارخوێن لە مزگەوتی شێخ سعیدی پیران ١٥\\ ٧\\ ٢٠١٣

## کورتەیەك لە ژیانی

## زانای خواناس : ( السید محمد علوی )

ناوی تەواوی: (السيد محمد الحسن بن علوي بن عباس بن عبدالعزيز بن عباس بن محمد المالكي الحسني الادريسي)یە، لە ساڵی (١٣٦٢ه) بەرانبەر (١٩٤٣م) لە شاری مەککەی پیرۆز لەدایك بووە. هەر لە منداڵیەوە لە خزمەت باوکی خوالێخۆشبوویدا لە زنجیرە کۆڕ و وانەکانی مزگەوتی (الحرام– مەککەی پیرۆز)دا بەشدار بووە، چونکە باوکی یەکێ بووە لە زانا ناودارەکانی شاری مەککە و مامۆستا و مودەریس بووە لە مزگەوتی – الحرام– دا.....

ئەم زاتە بە نەسەب ئەولادی پێغەمبەرن و سەیدن و (الحسنی)ن، بەڵام ناو و شۆرەتیان بە (المالکی) دەرکردووە، ئەمەش هۆکارەکەی ئەوە بووە کە مالکی دەفەرموێ: (کاتێ باپیرم لە سەردەمی –الشریف عون– دا کرا بە موفتی سعودیە لەسەر مەزهەبی ئیمامی مالك لەو کاتەوە ئەو شۆرەتەیان وەرگرتووە)...

هەر لە منداڵیەوە زۆر لە زانایانی سەردەمی بینیوە و دەرس و سوودی لێوەرگرتوون (کە لە دوایدا ناویان دەهێنین)...

(السید المالکی) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە بواری تێگەیشتن و لەبەرکردندا خوای گەورە بەهرەیەکی فراوانی پێ بەخشیبوو، بۆیە هەر زوو بەلاوی ناوی دەرکرد و توانی پلەی ماستەر و دکتۆرا لە زانکۆی –أصول الدین– لە ئەزهەری پیرۆز بەدەست بهێنێ لەو چەند ساڵەدا کە لە مصر ژیاوە توانیویەتی چەندەها شوێنی وەك هیند و پاکستان و لیبیا و مەغریب و وڵاتانی بلاد الشام لە ڕێگەی (رحلات العلمیة)ەوە بگەڕێ و دۆست و کەسانی شیاو و زانا و عالمانیان بناسێ.

که دەگەڕێتەوە بۆ شاری مەککەی پیرۆز لە ساڵی (١٩٧١م) بە فرمانی میری دەبێتە مودەریس لە (الكلية الشريعة في مكة المكرمة) تا ساڵی (١٩٨٠م)...

لەدوای ئەوەی باوکی لە ساڵی (١٩٧٢) وەفات دەکات کەلێنێکی گەورە دەکەوێتە ڕیزی موسوڵمانانەوە بەتایبەتی حەلقەی تەدریسی مزگەوتی کەعبەی پیرۆز، بۆیە زانایانی شاری مەککە بەتایبەت (الشيخ حسن المشاط) و (الشيخ محمد نور سيف) و (الشيخ سليم رحمة الله) و (السيد أمين كتبي) و زۆرێکی تر یەکڕا دەبن لەسەر ئەوەی کە تەکلیف لە (السيد محمد المالكي) بکەن تا لە شوێنی باوکی دابنیشێ، بۆیە لەدوای سێ ڕۆژ بەسەر وەفاتی باوکیدا دەبێتە مودەریس لە مزگەوتی کەعبەی پیرۆز و لە شوێنی باوکی خوالێخۆش بووی تەدریس دەکات تا کۆتایی ژیانی...

لە ساڵی (١٩٨٠)دا بڕیار دەدا بۆ خۆیەکلایی کردنەوەی تەدریس و مودەریسی لە مزگەوتی کەعبەی پیرۆز و داوای –استقاله– پێشکەش بە میری دەکات و لە زانکۆی شەریعەی مەککەی پیرۆز واز دێنێ و بێ بەرامبەر و لەبەر خوا خزمەتی خۆی بە موسوڵمانانی حەرەم پێشکەش دەکات و میریش داواکەی وەردەگرێ... کە لەسەر ڕێ و شوێنی تەدریس و ئامۆژگاری باوکی لەو ماوە زۆرەی تەمەنیدا بە هیچ شێوەیەك لاینەداوە، بەمەش زیاتر لە دڵی زانایانی شاری مەککە و موسوڵماناندا زیاتر خۆشەویستر بووە و جێگەی خۆی کردۆتەوە...

زیاتر کۆڕ و دانیشتنەکانی بریتی بوون لە باس کردنی بنەما پیرۆزەکانی ئیسلام و جێگیر کردنی لە دڵی خوێندکار و قوتابی و گوێگرانی بە بەڵگەی تەواو پشتگیری زانستی سەردەم، لە هەوڵی تەواودا بووە بۆ پتەوبوونی بڕوای گوێگرانی بەخوای باڵادەست بە شێوەیەك کە (مراقب) و ئامادەیە،

که ئیتاعه و گوێڕایەڵی تەواویان هەبێ بە بەندایەتی زۆر و شەونخونی، زۆر جەختی لەسەر خۆشەویستی خواو و پێغەمبەرەکەی دەکردەوە، بۆ ئەم مەبەستەش دەیگەیاندن بە پلەی یەقین و زانستی عیرفان و تەصەوف و سلوك و ڕەوشتی جوانی فێر دەکردن.

بۆیە لە یەك کاتدا لەنێوان قوتابی و گوێ گرانیدا مامۆستا بوو، مودەریس بوو، موڕەبی بوو، مورشیدێکی ڕەبانی و ڕاستەقینە بوو...

بۆیە هەر زوو کۆمەڵێك بوونە دوژمنی و هەوڵی لابردن و سووك کردن و لاوازکردنی کۆڕەکانیان ئەدا... بەڵام بە زانستی زۆر و بە نیشاندانی حیکمەت و پەنداری و لەسەرخۆیی توانی بەسەر هەموو ئەو کۆسپانەدا سەر بکەوێ...

## چالاکیەکانی نووسەر....

السید محمد المالکی ڕەحمەتی خوای لێ بێ بەشداری هەموو کۆڕە زانستی و ئاینییەکانی شاری مەککەی کردووە، لە هەموو کۆڕەکاندا بانگەشەی بۆ یەك ڕیزی موسوڵمانان و ڕێگەی عیرفانی خۆی کردووە، بە – محاضرة – کانی بەشداری کۆڕی (الموسم الثقافية برابطة العالم الاسلامي) کردووە....

لەنێوان ساڵەکانی (١٩٨٠ بۆ ١٩٨٢) لێژنەساوی (لجنة التحكيم الدولية لمسابقة القرآن الكريم) بووە کە لە وڵاتی سعودیە سازدرا...

هەڵبژێرا بە سەرۆك لە (مؤتمر الامام مالك) کە ساڵانە لە وڵاتی مەغریب دەبەسترا.

بەشداری لە ( مؤتمر القاضي عبدالوهاب البغدادي ) کرد کە (دار البحوث) لە شاری دوبەی سازیدا لە (١٣–محرم–١٤٢٤) بەرانبەر (٢٠٠٥)...

لـه چـەندەها دانیشـتنی تایبـەتی بە میوانـەکانی سعودیە لـە زانایـان و عالمانی جیهان ئامادە بووە لە کاتێکدا کە سەردانی ولاتیان کردووە...

## بەرهەمەکانی نووسەر:

ئەم زاتە زۆر گرنگی بە ڕێڕەوی پێشەوا (مالك کوڕی انس) ئـەدا، کە لـە سـەرجەم وتـە و ئامۆژگـاری و کـۆڕ و نوسـینەکانیدا ئـەم ڕاسـتیە دەبینـرێ، لەسەر ئەم مەزهەبە ئەم کتێبانەی داناوە:-

* دراسات حول الموطأ...
* فضل الموطأ و عناية الامة الاسلامية به...
* دراسة مقارنة عن روايات موطأ الامام مالك...
* شبهات حول الموطأ وردها...
* امام دار الهجرة مالك بن أنس...
* تحقيق تلخيص القاسي للموطأ رواية ابن قاسم...
* الفقه المالكي وأحواله في ظل الفقه الحنبلي بمكة المكرمة في القرن الرابع عشر...

کە ئەمەیان ئەو لێکۆڵینەوە زانستیە بوو کە لـە دوبـەی لـە (١٣-١٩ محـرم ١٤٢٤) پێشکەشی کرد...

لەبەر زۆر گرنگی دان و بەرز ڕاگرتنـی مـەقام و پلـەی حـەزرەتی پێغەمبـەر ﷺ وە جێبـەجێ کردنـی بـەردەوامی بۆ فـەرموودەکانی حـەزرەت ﷺ بـاس کردنێکی زۆری لەم بارەیەوە و شارەزاییەکی تەواوی لـە زانسـتی فـەرموودە و جۆرەکانی، تـوانی چـەند نوسـراوێك بنوسـێ و لـە شـاری مەککـە و لـەلای زانایانی ئیسلام پلەی (المحدث) ی بدرێتێ، لەو کتێبانە :

* عناية الامة بالسنة...

* كشف الغمة...

* المنهل الطيف في أصول الحديث الشريف...

وه دوباره له خزمەت فەرموودەكاندا زۆر گرنگی دەدا بە سیرەت و ژیانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ وە بەردەوام باسی -شمائل المحمدي- دەكرد و گەورەیی و زیندوویەتی ئەو سەردارەی بۆ قوتابیان و گوێگرانی بەیان دەكرد، بە بەڵگەی تەواو بە قورئان و فەرموودە و ئیجماع و قیاس، كە زۆرێك لە زانایانی تر سەرسام دەبوون لە پلەی زانست و زانیاری ئەمدا...

هەموو جارێ لە سەرجەم كۆڕ و دانیشتنەكانیدا كە باس لە هۆكارەكانی گەیشتن بە چاك بوونی ئومەت و گەڕانەوەیان بۆ ڕێگەی ڕاست دەكرا دەیفەرموو: صەلاح و چاكی ئوممەت گەڕانەوەیە لە دوای قورئان بۆ بە گەورە دانان و خۆشویستن و ڕێزلێگرتن و زیندووكردنەوەی سیفات و سوننەت و پارێزگاری كردنی شوێن و تەبەروك كردن بە پێغەمبەرەكەیەوە... زۆرێكیش لە وتەكانی بە بەڵگەوە لە هەمان دانیشتندا دەسەلماند... بۆیە لەم بوارەشدا ئەسپی زانستی خۆی تاوداوە و چەندەها كتێبی داناوە، لەوانە:

* محمد ﷺ الانسان الكامل...

* تأريخ الحوادث النبوية...

* الذخائر المحمدية...

* مفاهيم يجب أن تصحح...

* شفاء الفؤاد في زيارة خير العباد...

* وهو بالافق الاعلى...

* القدوة الحسنة في منهج الدعوة ضرورة الرجوع الى السنة النبوية...

هــەروەها چــەندین وتــار و نوســراوی لێکۆڵــەرەوەیی لەســەر بــەرزێتی مەولودی حەزرەت ﷺ نوسیوە و کە زۆر لە ڕۆژنامەکانی وڵاتی سعودیە لە کاتی خۆیدا بۆیان بڵاوکردۆتەوە، دوو مەولودنامەشی وەك خۆی لە چاپ دراون، کە بریتی بوون لە (مولد الشیخ علي القاريء) و (مولد ابن الدیبع الشیباني) کە دەقی وتارەکانی -السید محمد المالکی-یە کە لەو دوو شوێنەدا خوێندویەتەوە...

گەر سەیری لایەنێکی تری ژیانی بکەین لە ڕێگەی نوسراوەکانیەوە کە چۆن گرنگی بیرو فیکرەی زانستی سەردەمی کە خەڵکی و موسوڵمانان بتوانن بە شێوەیەکی سەردەمیانە بەرانبەر دوژمنانی نەفس و ئیسلام و ڕێبازەکەیان بوەستن، کە تیایدا پێشینەی ئەم ئومەتی ئیسلامەی بەستۆتەوە بە داهاتوویەوە، کە بیرو مێشکێکی زۆر پتەوی لەسەر مێژوو هەبوو، کە لەم بوارەشدا ئەم کتێبانەی داناوە:

* شریعة الله الخالدة...
* المسلمون بین الواقع و التجربة...
* مفهوم التطور والتجدید...
* منهج السلف في فهم النصوص...
* خصائص الامة المحمدیة...
* المستشرقون بین الانصاف والعصبیة...

مامۆستای زانا و خواناس و نووسەر لەگەڵ ئەم هەموو بەهرە زانستیەی کە خوا پێیدابوو، هەرگیز بۆ چەند ساتێکیش لە ڕێگەی باو و باپیر و زانایانی پێشووی ئەم دینە لاینەدا و هەرگیز ڕێگەی تەزکیەی دڵ و دەروون و تەصەوفی ون نەکرد، کە خوڕەوشتی (الائمة الربانیین) بوو، بۆیە

زۆر گرنگی ئەدا بە تەزکیە و تەصەوف و نزیکی لە پیاوانی خوا و دۆستانی خوا کە لەم بوارەشدا کتێبی (أصول التربیة الاسلامیة)ی داناوەو وەك میراتێك بۆ موسوڵمانانی جیٚ هێڵاوە، وە گرنگی بە دۆعا و پاڕانەوە و شوێن کەوتنی بۆ خواناسان بیر نەکردووە، هەموو جار بە شوێن کەوتوانی دەفەرموو کە بگەڕێن بە شوێن دۆعای پیاو صاڵحاندا، کە لەم بارەشەوە ئەم کتێبانەی نوسیوە:

* أبواب الفرج...
* خلاصة شوارق الانوار...
* الحصون المنیعة...

السید محمد المالکی لەسەر ڕیٚ و شوێنی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بوو، بەردەوام بوو لە بەرانبەرکیٚ و بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسانەدا کە دژی ئەشعەری و ماتوریدیەکان بوون، لە مەزهەبا مالکی بوو بەڵام پشتگیری تەواوی هەر چوار مەزهەبەکە بوو، لەسەر خۆشەویستی دڵ و دەروون بۆ مەزهەبەکان قوتابیانی پەروەردە دەکرد...

لە طەریقەتدا شوێن کەوتە بوو بۆ ڕێگەی پێشەوا (أبی قاسم الجنید) کە ناسراو بوو بە (الشاذلیة) کە بەردەوام سەیر و سلوك و ڕەوشتی ئەم خواناسەی بە جوانی و وردی ڕوون دەکردەوە، کە بەشێوەیەکی ئاسان و سادە وەربگیریٚ، کە ئەمەش بە شێوەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا لە کاتی چاوپێکەوتنی لە ڕاگەیاندنەکاندا باسی دەکرد و بانگەشەیەکی تەواوی دەکرد بۆ دەرخستنی ڕاستی و گەورەیی ئیسلام...

## ناحەزان دژایەتی دەکەن:

لـە دێـر زەمانـەوە هـەر کەسـێك هـەر بیرێکـی هێنابـێ هـەر زوو کۆمـەڵێك بوونەتە نەیاری و دژیایەتیان کردووە، بەتایبەت هەڵگرانی پەیامی پاکی ئاینی ئیسلام و شوێن کەوتە ڕاستەقینەکانی حەزرەت ﷺ کە لێرەو لەوێ لە دژیان وتەو نوسین و کۆڕ و دانیشتن لەسەریان کراوە...

لە کاتێکدا کە نوسراو و کتێبەکانی (محمد المالکی) دەکەوتە بەردەست و زۆرێـك لـە موسـوڵمانان ڕاسـتی و هەقیقـەتی ئیسـلامیان وەك خـۆی بـۆ دەردەکەوت بە تایبەت لە وڵاتێکی وەك (سعودیە)دا هاوەڵان و هەڵگرانی دژ بەم بیرو فیکرە کەوتنە خۆیان و چەند نوسراو و کتێبێکیان لە دژی مالکی نوسی و بڵاویان کردەوە لەوانە (هذە مفاهیمنا) لەلایەن –صالح بن عزیز آل شیخ– وە (حوار مع المالکي في رد منکراتە و ضلالاتە)ی لە لایەن –شیخ عبداللە بـن منیـع– وە نوسـراوێك لەلایـەن (سمـیر المـالکي والتـویجری و الانصاري) بڵاوبوویـەوە، بەڵام خـوا ڕاسـتە و ڕاسـتیش سـەردەخات، بۆیـە لەگـەڵ کەوتنـە نـاوەوەی ئـەم کتێبانـەدا، شۆڕشـێکی بـیرو فیکـری لـەناو زانایانی وڵاتەوە دەستی پێکرد و پشتگیری تەواویان بۆ (المالکی) نیشان داو هەڵسان بە دەرکردنی کۆمەڵێ کتێبی تر لە دژی ئەوان و پشتگیرێك بۆ محمد المالکی، لەوانە:

* الـرد المحکـم المنيـع علـى شـبهات ابـن منيـع ... لەلايـەن: السـيد يوسـف هاشم الرفعي.

* إعلام النبيـل بمـا في شـرح الجـزائيری مـن التبلـيس والتضـليل... لەلايـەن: الشيخ الراشد المريخي.

* التحـذير مـن الاغـترار بمـا جـاء في كتـاب الحـوار... لەلايـەن هـەردوو زانـا (عبدالکريم المغربي و عبدالحلي العمراوي)يەوە....

ئەم پشتگیری مالکی و بەرپەچدانەوەی دوژمنانی تەنها شاری مەککە و وڵاتی سعودیەی نەگرتەوە، بەڵکو لە سەرجەم وڵاتانی ئیسلامەوە زانایان هەڵسان بە نوسراو و چاوپێکەوتن و سەفەر بۆ لاکردن دەوریان بینی (کە زۆر لەو پشتگیریانە لە کتێبی –مفاهیم یجب ان تصحح–ی السید محمد المالکی بڵاوکراوەتەوە)، لەوانە پشتگیری زانای خواناسی کوردی بۆتانی (الدکتور محمد سعید رمضان البوطي)یە کە فەرمووی: (محمد علوي المالکي من أهل السنة والجماعة، ولم یقرأ الناس تآلیفه و کتاباته ولم یروا من واقع حیاته الا ما یزیدهم ثقة بأستقامته وصلاح حاله وسلامة عقیدته) واتە ئەم زانایە لەسەر ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە و هیچ کەسێك نییە کە نوسراو و دانراوەکانی بخوێنێتەوە و سەیری واقیعی ژیانی بکات مەگەر ئیستقامەت و باوەڕ و چاکێتی و سەلاحی ئەم زانایەو ڕاستێتی و سەلامەتی بیروباوەڕی ئەم زانایەی بۆ دەربکەوێ...

لەگەڵ ئەم هەموو دژایەتی کردن و لەسەر هاتنە وەڵامەی زانایانی جیهانی ئیسلامی، سنگ فراوانی و لەسەر خۆیی (السید محمد المالکی) نەگۆڕاوەو هەڵسوکەوتی بەرانبەریان تێك نەدا... بانگەشەی کردن بە دانیشتن و لێك تێگەیشتن، بە تەساموح و لێك حاڵی بوون، هەڵسا بە دانانی کتێبی (التحذیر من المجازفة بالتکفیر) کە باس لە یەکبوون و وەحدەتی ڕیزی موسوڵمانان دەکات و وەڵامی کافر کردنی ئەوان بۆ ئەم بەوە ئەداتەوە کە موسوڵمان دەبێ سیفەتی چۆن بێ لەو بارەوە بێ ئەوەی کەس بریندار کات، ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ...

نوسەر و زانا و خواناس هەڵسا بە دانانی کۆمەڵێ کتێبی زانستی شەرعی بۆ قوتابیانی، تا لەو ڕێگەیەوە هەوڵی لێبڕانی مورید و قوتابیانی بێنێتە بەرهەم و وای لێکردن کە ئەگەر نەشکەڕێن بە شوێن سەرچاوەکاندا

نوسراوه به پێزه بەڵگەدارەکانی ئەم هەموو پرسیار و وەڵامێکیان بۆ ئاسان بکات... لەو نوسراوانە:

* زبدة الاتقان في علوم القرآن...

* القواعد الاساسية في علوم القرآن...

* القواعد الاساسية في علم مصطلح الحديث...

* القواعد الاساسية في أصول الفقه...

شێخی مالکی لەگەڵ ئەم هەموو سەرقاڵی و ژیانی زانستیەیدا هەرگیز نوسراو و هەوڵ و لێبرانی باوك و باپیری ون نەکرد و لەبیر نەکرد، هەڵسا به دانانی کتێبی (اتحاف ذوي الهمم العلية برفع أسانيد والدي السنية) وه (العقود اللؤلؤية بالاسانيد العلوية) کە تیایدا هەموو وانە و نوسراو و نامەکانی باوکی تیا تۆمار کردووه....

وه لەسەر زانای باپیریشی کە ئەویش مودەریسی مەککەی پیرۆز بوو لە مزگەتی کەعبەدا کتێبی (نور النبراس بأسانيد الجد السيد عباس)ی دەرکردووه. وه کتێبی (الطالع السعيد المنتخب من المسلسلات والاسانيد)ی نوسیوه کە تیایدا ناوی ئەو زانا بەڕێزانەی تۆمار کردووه کە خۆی و باوك و باپیری زانستیان لێوەرگرتووه...

جگە لەو بەرهەمانە کۆمەڵێ نوسراو و کتێبی تریشی هەیە کە عەقیدە و بیروباوەڕی موسوڵمانان دەپارێزێ لە شوێنکەوتنی دوژمنانی دین لە کاتی بەندایەتیدا وەك حەج و زیارەتی خۆشەویست و شەوی بەرات و ڕۆچوون لە مەدح و ستایشی خۆشەویست ﷺ دا کە ڕاستیەکان وەك خۆی لە پێغەمبەرەوه و هاوەڵانیەوه دەخاتە بەر دەست کە ئەمە ناوی هەندێکیانە:

* الحج فضائل وأحكام...

* في رحاب البيت الحرام...

* ماذا في شعبان...

* المدح النبوي بين الغلو والانصاف...

* الزيارة النبوية بين الشرعية والبدعية...

* منهج السلف في فهم النصوص بين النظرية والتطبيق...

## ئەو مامۆستایانەی کە زانستی لێیان وەرگرتووە...

ئەوەی لێرەدا تۆماری دەکەین لە ناوی ئەو مامۆستایانەی کە خوالێخۆشبوو المالکی سوودمەند بووە و دەرسی لە خزمەتیاندا خوێندووە، لە کتێبی (الطالع السعيد من المسلسلات والاسانيد)ی نوسەر خۆی وەرگیراوە کە بەم شێوەیەیە:

باوکی خۆی – السيد علوي بن عباس المالكي– ت١٣٩١هـ....

الشيخ محمد يحي أمان... ت ١٣٨٧هـ...

الشيخ محمد العربي بن التباني... ت ١٣٩٠هـ...

الشيخ حسن بن سعيد يماني... ت ١٣٩١هـ...

حسن بن محمد المشاط... ت ١٣٩٩هـ...

الشيخ عبدالله بن سعيد اللجي... ت١٤١٠هـ...

الشيخ محمد نور سيف بن هلال ... ت١٤٠٣هـ...

الشيخ محمد يس الفاداني... ت ١٤١٠هـ...

الشيخ عبدالله بن أحمد دردوم ... ت ١٤٠٧هـ...

الشيخ حسنين بن محمد مخلوف ... مفتي الديار المصرية... ت ١٤١١هـ...

الشيخ محمد الخافظ التيجاني المصري... ت١٣٩٨هـ...

الشيخ محمد ابراهيم أبو العيون –الشيخ الخلوتية بمصر..

زانستی (القرآءات السبع)ی لە خزمەت (الشیخ عبدالعزیز عیون السود) لە شاری (حمص) تەواو کردووە و ئیجازەی لەسەر وەرگرتووە..

## وەفاتی مالکی:

لە بەرەبەیانی شەوی هەینی (١٥ی ڕەمەزان ١٤٢٥) بەرانبەر (٢٩ اکتوبر ٢٠٠٤) لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا هیجرەتی کردەوە بۆ لای پەروەردگاری و وەفاتی کرد، لاشەکەیان گواستەوە بۆ مزگەوتی حەرام و لە بەردەم کەعبەی پیرۆزدا و لە دوای نوێژی عیشای ڕۆژی هەینی نوێژی مردویان خوێند، لەنێوان مامۆستایان و بانگخوازان و عومرە خوێنانی ڕەمەزان دا، بەپێ و بۆ گۆڕستانی (المعلاه) و بۆ ماڵی هەتا هەتایی قیامەتی گواسترایەوە و لە نزیك مەرقەدی دایکی موسوڵمانان (خاتوو خەدیجە) و لە تەنیشت باوکیەوە تەسلیم بە خاك کرا، هەزاران ڕەحمەتی خوای پەروەردگارت لەسەر بێ و بەهەشتی بەرین جێگەی هەتا هەتاییت بێت، پاداشتی نوسین و خزمەتی تەمەنی شەست و سێ ساڵەت بە چاکی و باشترین شێوە لە پەروەردگارتەوە وەربگریتەوە... ئامین...

* * *

ناونیشانی ماڵ و مەدرەسەی خوالێخۆشبوو: المملكة العربية السعودية – المكة المكرمة– حي الرصيفة – خلف قصر أبو الخير للافراح...

# بِسمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

**الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على أشرف المرسلين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.**

## پێشەکی نوسەر:

**خودای بەرز و بێ هاوتا، خەڵات و بەخششی زۆری بەسەردا ڕژاندوین، کە بەم بەخشش و خەڵاتانە ڕێزی زۆری لێ گرتووین، لەوانە بەم ئاسایش و ئارامی و دڵنیاییەی لە تەواوی نیشتمانەکەمان دا پێی بەهرەمەند بوین[1].**
**وە یەکێکی تر لەو نیعمەتانە (بەخششانە) بەجێهێنان و پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلامە، بە ڕاگرتن و پاراستنی سنورەکانی و پەیڕەوکردن لە پەڕاوی پیرۆزی خودا و ڕێڕەو و سوننەتە بەرزەکانی پێغەمبەرەکەی ، گەورەمان (مُحمدی کوڕی عبدالله —د.خ).**
**کە ئەمەش هەموو فەزڵی خوایە، پاشان بە فەزڵی ئەو دەستەڵاتدارانەی کە خوای گەورە گێڕاونی بە پارێزەر بۆ ئەم وڵاتە (کە ناسراون بە پارێزەری — الحرمين الشريفين—)، کە درێغیان نەکردووە، خوای گەورە جەزای بەخێریان بداتەوە.**
**بە فەزڵ و گەورەیی خوای پەروەردگار کە ئەم وڵاتەی پاك کردۆتەوە و پاراستویەتی لە هەموو پیسیەك و خراپەیەك، دوور لە هەموو هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانێك، ئەمەش بە هەواڵی پێغەمبەرمان ﷺ کە فەرموویەتی: (لا**

---

**[1]- مەبەست بە تەواوی نیشتمان وڵاتی سعودییەیە و بە تایبەتیش هەردوو شاری مەککە و مەدینە.**

يجتمع دينان في جزيرة العرب)[1] واتە: دوو دین و ئاین لە نیوە دوورگەی عەرەب دا کۆنابنەوە..

وە فەرموویەتی: (وانّ الشيطان قد أيس ان يُعَبد في جزيرة العرب)[2] واتە: شەیتان بێ ئومێد بووە لەوەی کە جارێکی تر لە نیوە دورگەی عەرەبیدا بپەرسترێتەوە....

وە یەکێ لە پاڕانەوەکانیدا فەرموویەتی: (اللّهُمَ لا تجعل قبري وَثناً يُعبَد)[3] خوایە شوێن گۆڕەکەم نەگێڕی بە شوێنی پەرستن.... کە پاڕانەوەکەشی لای خوا گیرا بووە....

وە لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: ( إنَّ اخوفَ ما اتَخَوَّفُ على امتي، الأشراكُ بِالله، أما إني لستُ اقولُ يعبدونَ شمساً وَلا قمراً ولا وَثناً، ولكن أعمالاً لغير اللهِ وَشهدةً خفية)[4] .

واتە: ئەوەی کە زۆر دەترسم لەسەر ئومەتەکەم بێتە پێشەوە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە، بەڵام من ناڵێم کە هاوەڵەکەیان بریتی بێ لە بەندایەتی کردنی خۆر یان مانگ یان بتەکان، بەڵام مەبەستم ئەو کردەوانەیە کە بۆ غەیری خوا دەکرێن و ئەو پەرستنانەیە کە بۆ ئارەزووەکان بە نهێنی دەکرێ...).

بەتایبەتی بۆ ئەم وڵاتەیە کە ئیمان تیایدا کۆ دەبێتەوە و خەڵکی بۆ ئەوێ دەگەڕێنەوە، کە شوێنێکە هەڵگرانی ئەم پەیامە دڵیان لەوێ ئارام دەگرێ

---

[1]- ئیمامی (ابن ماجه) لە (كتاب الزهد) ڕیوایەتی کردووە.

[2]- ئیمامی مالك لە (الموطأ) وە (أحمد) لە (المسند) ڕیوایەتیان کردووە.

[3]- ئیمامی مالك لە (الموطأ)دا ڕیوایەتی کردووە...

[4]- ئیمامی -البزار- بە سەنەدێکی باش ڕیوایەتی کردووە (بڕوانە بۆ -مجمع الوزائد- الهيثمي- (١٠/٥٤)).

که شاری مەدینەی پیرۆزە که حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ الأيمانَ لَيَأزِرُ الى المدينة كَما تأزِرُ الحَيَّةُ الى جُحرِها).[1]

واته: ئیمان و بڕوا هەمووی بەرەو شاری مەدینە کۆدەبێتەوە و هەروەك چۆن مار له کولانەکەیدا لوول دەخوات.

وه له گێڕانەوەیەکی تردا هاتووه که (إنَّ الدينَ لَيَأزِرُ الى الحجاز كما تأزِرُ الحَيةُ الى جُحرها، وَليعقلنَّ الدينَ مِنَ الحجاز معقل الأروية مِنْ رأس الجبل)[2]

وه ئیمامی مسلم له ڕێگەی -ابن عمر-ەوە هێناویەتی که فەرموویەتی: ( إنَّ الاسلامَ بَدأ غريباً وَ سَيَعُودُ غريباً كما بَدَأ، وَهوَ يَأزِرُ بينَ المسجدين، كما تأزِرُ الحَيةُ فِي جُحرِها) واته: ئاینی ئیسلام به نامۆیی و غەریبی هاته ناوتان، وه ئەگەڕێتەوە سەر ئەو نامۆییەی که لێوەی هاتووه، وه لەو ڕۆژەدا تەنها لەنێوان ئەم دوو مزگەوتەدا کۆدەبێتەوە هەروەك چۆن مار له کونەکەیدا لوول دەخوات)....

پێشەوایانی ئەم وڵاتە لەگەڵ سەرەتای هاتنیان ئیشیان لەسەر ئەم یاسایانە کردووه مەبەستیان بووه ئەو فەرموودانە وەك خۆی بپارێزن و له دڵی خەڵکیدا جێگیری بکەن، که ڕیزەکانی میللەت لەسەری بپارێزن و ڕێگرەکان له ئاستیاندا بتارێنن، سوپاس بۆ خوا خەڵکی و موسڵمان لەسەر یەك مەبدەئو ڕێباز کۆبوونەتەوەو ئاڵای پیرۆزی -لا إله إلا الله محمد رسول الله- تاکە ئاڵایانە، بەڵام هەندێ لەوانەی که بەکرێگیراوی دەستی بێگانەن ویستویانە و ئەیانەوێ که ماسی بگرن له ئاوێکی لێڵ داو، ئەو وێنە جوانەیە بشێوێنن و فیتنە و دووبەرەکی بڵاوبکەنەوە، پۆشاکی ڕەش و ئیرادەی شەڕ لەنێوان هەڵگرانی دین دا بچەسپێنن، که بەمەش دەرگایەکی

---

[1]- ئیمامی بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووه.

[2]- ئیمامی -الترمذي- له (کتاب الأيمان)دا ڕیوایەتی کردووه.

تريان كردەوە، كە ئێمە سوپاس بۆ خوا هیچ پێویستیەكمان بەوانە نی یە و باوەڕمان بە خوای خۆمان بەهێزە وە گومانی باشمان هەیە بەرانبەر بە دەسەلاَتدارانمان كە ئەهلی ژێر و بڕوامانن و موسولَمانانیان لە دلَەڕاوكێیەتی پاراستووە...

ئاینی ئیسلام چەندەها فرسەتی داوە بە دوژمنەكانی تا بەهۆیەوە بنواڕن و بیر بكەنەوەو ڕێگەی ڕاستی بدۆزنەوە وەك دەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلاَمَ اللّهِ﴾التوبة:٦.

ئەگەر یەكێ لەوانە كە هاوەلَیان بۆ خوا بڕیار داوە داوای لێ كردی كە پەنای بدەی پەنای بدە تا ئەوەی گوێی لە وتەكانی خوا بێ.

وە فرسەتی داوە بەو كەسانەش كە لە ناخیاندا بەرهەلَستی و نكولَی كردن هەیە بە دەربڕینی بەرهەلَستی و تێگەیشتن و بەلَگەكانی خۆیان و بتوانن باسی بكەن ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ البقرة:١١١. واتە: ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن كە لەسەر هەقن فەرموون بەلَگەكانتان نومایان بكەن و بیخەنە بەردەست.

ئیسلام داوا دەكات لە هاوبەش پەیداكەرەكان (مشركەكان) كە بنواڕن و تێبفكرن لە فرمانەكانی ئەم ئایینە، جارێ لەسەر شێوەی تەنهایی بانگیان دەكات و جارێكیش لەسەر شێوەی كۆمەلَی ، ئەمەش بە گرتنی دانیشتن و كۆبوونەوەكان بۆ قسەكردن لەسەر هەقیقەتی دین و هەقیقەتی بانگخوازەكەی كە حەزرەتی محمدە ﷺ بە فەرموودەی ﴿قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ أَن تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَى وَفُرَادَى ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾ سبأ: ٤٦.

بەلَكو لەمەش گەورەتر، ئیسلام بەلَێن و عەهدی پارێزگاری ئەدا بە دوژمنانی تا بێنە پێشەوە و قسە بكەن و دلَنیابن لە نەفس و لە شوێنی

خۆیان، کە بیر بکەنەوە ئەوانیش دروستکراوی خوان و بیرو عەقڵیان هەیە کە پێویستە بەکاری بهێنن و تێگەیشتنیان هەیە کە پێویستە بیخەنەکار، وە لەدوای ئەم ئەقڵ و تێگەیشتنانەیان، کە پێویستە بە گوێی ئەو بەرهەمە بکەن کە لەو ئەقڵ و تێگەیشتنەوەیانەوە وەریان گرتووە بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ سَبَأ: ٢٤.

ئەمە فرمانی خوایە بۆ پێغەمبەرەکەی کە بڵێ بەو موشریکانەی کەلەسەر بەتاڵ کۆبوونەتەوەو لەسەر گومڕایین کە هیچ دینێکی ڕاستیان نیيە، کە هیچ بیروباوەڕێکی دانپیانراوی وایان نیيە کە جێگەی ئەوەبێ موجادەلە و موناقەشەی لەسەر بکرێ: ئەوەتا یان من لەسەر هیدایەت و ڕاستیم یان ئێوە، یان من لەسەر گومڕاییم یان ئێوە؟؟!

لەم تێگەیشتن و ڕوانگەیەوە:

ئەم چەند تێگەیشتنە لە هەندێ لەو باسە ئیسلامیانەوە کە جیاوازی ڕا لەنێوان زانایاندا تیایدا هەیە ئەخەمە بەردەست تا هیچ کەس نەتوانێ بڵێ: ڕاو بیری زانایان لەسەر یەك ووشە کۆنابێتەوە...

بۆیە پێویستە ئەو باسانە دەربخرێ و بخرێتە نێوان دوو دەستەی زانایان و لێکۆڵەران بۆ وردبوونەوە و دیراسە کردنی، ئەگەر ڕاست بوو ئەوە سوپاس بۆ خوا کە ئەمەش لە پشتگیری خواو هیدایەتی خواوەیە.

ئەگەر هەڵەش بوو، ئەوە لە منەوەیە و لە ئیجتیهادی منەوەیە، ئەمەش بۆ ڕوون کردنەوەی هەقیقەتەکان و ڕاست کردنەوەی ئەو تێگەیشتنانەیە، کە هیچ مەبەستێکمان لە پشتی ئەم نوسینەوە نی یە مەگەر چاکخوازی و شوێن کەوتنی ڕاستی نەبێ، چونکە ئێمەش مرۆڤین و بۆچوونەکان ئەپێکین و هەڵەش دەکەین تیایدا، هەموو کەسێ لە ئێمە لێی وەردەگیرێ و ئەشدرێتەوە بە ڕوویدا، تەنها گەورەی (المعصومين) نەبێ کە هیچ وتەیەکی

لە خۆیەوە نەبووە ، مەگەر وەحی و نیگای لای پەروەردگاری بووە ، وە هەموو نوسراو و کتێبێك جێگەی زیادبوون و کەمکردنەوەیە، جێگەی دەستکاری و گۆڕان و چاك کردنە تەنها ئەو کتێب و نوسراوە نەبێ کە قورئانە و بەتاڵ و نادروست لەنێوانیدا نی یە و تیایدا هەرگیز کۆنابێتەوە...

هەر کەسێ غەیری ئەم وتەیە بانگەشەی بێ ئەوە ئیفتیرای کردووە و لە ڕاست لای داوە...

من پشت بە خوای خۆم دەگرم لەو زانستەی کە بۆ بەرانبەرکێیی یان موجادەلە فێربین یان بلاوی بکەینەوە، وەك پێغەمبەرم ﷺ دەیلێمەوە ( من طَلَب العلم لِيُماريَ بهِ السُفهاء، أو يُكابِرَ بهِ العُلَماء، أو يَصْرِفَ بهِ وَجوُهَ الناسِ إليهِ أدخَلَهُ الله النار)[1] .

ئەم کتێبەمان وەك هەموو نوسراوەکانی تر، جێگەی چاك کردن و بەسەراچوونەوەیە، وە من بە فەزڵی خوا لە هەموو نوسراوێکمدا کە دامنابێ نوسیومەو تۆمارم کردووە کە:

( داواکارم لە خوای پەروەردگار کە پشتگیرم بێ و تەوفیقم بدات لەسەر ڕاستی لە کاتی نوسینەکاندا... ئەگەر ڕاست بێ لە فەزڵی خواوەیە، ئەگەر هەڵەی تێکەوت لە نەفسی من و ئیجتیهادی منەوەیە، بۆیە داواکارم لەوانەی کە دەیخوێننەوە تیایدا ڕێنومویم بکەن و هەڵەکانم بۆ دەست نیشان بکەن ) .

وە زانایان لەناو خۆیاندا بەردەوام لە خزمەت یەکتریدا بەسەر نوسراو و بابەتەکاندا ئەچنەوە، کە گەیشتنە ڕاستی دان ئەنێن بە ڕاستی داو واز لە

---

[1]- ئیمامی ترمذي و کۆمەڵێکی تر ڕیوایەتیان کردووە.

ڕایەکەی خۆیان دێنن، خۆ گەر باسێك بوو کە زیاتر لەوە هەڵبگرێ ئەوە لاکەمەکەی لێی بێ دەنگ دەبن...

گفتوگۆی نێوان زاناکان شێوازێکی بابەتی لەخۆ دەگرێت، گیانی لەیەك تێگەیشتن و خۆپارێزی و ترسان لە خوای گەورە نمایان دەکات.

لەبەرئەوەی پێشەوای هەموویان ڕۆشنبیری و ئاڕاستە و ئامازەی ئایین و خۆپاراستنە لە قەدەغە کراوەکانی خودای گەورەیە، دەست گرتنی خەڵکانە بۆ هەموو خێر و چاکەیەك کە هەر ئەمەش ڕۆڵی میراتگرانی پێغەمبەرانە (علیهم السلام).

لە خودای گەورە دەپاڕێینەوە لەسەرچاوەکانی لادان و هەڵخلیسکان بمانپارێزێت و ڕێنوماییمان بکات بۆ شاڕێگەی ڕاستی خۆی، هەر خۆی (جل جلالُـهُ) بیسەر و وەڵامدەرەوەی داواکانمانە، پشت و پەنامان هەر خودایە.

السيد محمد بن علوي المالكي الحسني

# تێبینیەکی گرنگ

## پەیوەندی بەو فەرموودانەوە هەیە کە لەم کتێبەدان

لــەم نوســراوەماندا کۆمــەڵێکی زۆر لــە فــەرموودەکانی پێغەمبــەر و ﷺ ئاثاری گێڕاوەمان تۆمار کردووە.

وتەی زانایانی ئیسلام لە زانا بەرزەکانی فەرموودەمان هێناوە کە جێگەی متمانە و بڕوان، ئەو فەرموودانە هەندێکیان هەیە کە هەندێکی تریان بەهێز دەکات، یان پلەی حسن-ی ئەداتێ، وە هەندێکیان هەیە کە پلەی -وقف- وەستان لەسەری ئەداتێ، هەندێکیشیان هەندێکیان لاواز دەکات.

مەبەست لەم وتەیە:

پلەی (صحیح-حسن-ضعیف) ئەگەر جێگیر بوو بوو لەلای زانایانی فەرموودە ئەوانەیان کە جێگەی متمانەن وەك (الترمذي، البیهقی، المنذري، الهیثمي) ئەوە ئیتر پێویست بە گەڕان و وردکردنەوەو چوونەوە سەر کتێبەکانی (الجرح والتعدیل) و (أسماء الرجال) ناکات..

بەڵێ : ئەگەر کەس لەو زانایانەی کە جێگەی بڕوان و فەرموودەکانی وتەیان لەسەری نەبوو، ئەوە دەرگای توێژینەوەو بەسەرداچوونەوە[1] کراوەیە و ئەم باسەش باسێکی فراوانە و چەندەها فەرموودەیە هەیە کە لەم شێوەن و چاوەڕێی کەسانێکی تێگەیشتوو دەکات تا خزمەتیان بکات و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکات و تەخریجیان بکات...

---

[1]- واتە (البحث والمراجعة).

## ( ڕێڕەوم لە دانانی ئەم کتێبەدا )

**ئەم نوسراوەم کردووە بە سێ بەشەوە:**

**بەشی یەکەم :**

**تایبەتە بە بیروباوەڕ و عەقیدەوە.**

**کە تیایدا ڕوونکردنەوەم کردووە لەسەر خراپەکاری کافربوون و گومڕا کردنی خەڵکی لەم ڕۆژەدا.**

**بەشی دووەم :**

**تایبەتە بە پلەی (النبوە) نبوەتی پێغەمبەرەوە ﷺ کە تیایدا لە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر ﷺ و هەقیقەتی پلەی پێغەمبەرایەتی و مرۆڤایەتی، وە تێگەیشتن لە چۆنیەتی تەبەروك وەرگرتن بە پێغەمبەر و ئاسارەکانی.**

**بەشی سێیەم:**

**چەند بەشێکی جیاوازە، تیایدا باس لە ژیانی بەرزەخ و دروستی زیارەتی پێغەمبەر ﷺ و هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە ئاسار و بینین و بۆنە ئاینیەکانەوە هەیە.**

# بەشی یەکەم

## ( چەند ڕوون کردنەوەیەك لەسەر بیروباوەڕ )

تیایدا :

## ڕوونکردنەوە لەسەر پلەکانی کافرکردنی خەڵکی و بە گومڕابوونیان بە شتەکانی سەردەم

# خۆپاراستن لە بێ بڕواکردنی خەڵکی

زۆر لـە خـەڵکی بـە هەڵـەدا دەبـڕێن -خـوا ئیصـلاحیان بکـات- لـە تێگەیشتنی هەقیقەتی ئەو هۆکارانەی کە خاوەنەکانیان لە بازنە و سنوری ئیسـلام دەردەکـات و بـەوەش حـوکمی بـەکافربوونیان لەسـەر پێویسـت ئەگێڕێ، ئیتر بەهۆی ئەو لادانە بچوکەوە پەلە دەکەن بۆ حوکمدان بەسەر ئەو موسوڵمانەدا و بەکافر ئەیناسێنن، هەتا وای لێ دێت کە لەسەر زەوی دا موسـوڵمان نامێنـێ مەگـەر کـەمێکیان نـەبێ. جارێـك پێشـەوای هـەردوو حەرەمی پیرۆز پێی گوتین: حوکمی کافربوون بە گوێرەی دەربڕینەکانی لە یەکتر جیابکەنەوە، ئێمەش گوتمان: ئەوە هەڵپەیەکە بە تەواوی لە جێگەی شیاوی خۆیدا نییە، چونکە ئەمە حوکمە پلەو ئاستەکانی دوور و دژوارە، ڕێگاکانیشـی سـەخت و پـڕ نشـێوە، پشـت بـە بنـەماکانی یەکتاپەرسـتی دەبەسـتێ، وە هـەر کەسـێك تـەواوی هەقیقەتـەکانی شـارەزا نـەبێت، هـیچ ئامـاژەیـەکی کـافربوونی کەسی بە بەڵگەوە دەست ناکەوێت. ئێمە بۆ ئەو جۆرە کەسانە عوزرێکی باشیان بۆ ئەهێنینەوە و گومانێکی باش بۆیان دەبەین و ئەڵێین:

بـەڵکو لـەم بەکافرکردنەیانـدا نیـەتێکی بـاش شـاراوە بـێ، لـە ڕوانگـەی بەرگری کردن لە فرمان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپەوە سەری هەڵدابێ، بەڵام خۆ هەموو فرمان بە چاکە و نەهی کردنێك دەبێ لە ڕێگەی حیکمەت و پەندیاری و ئامۆژگاری چاکەوە دەست پێبکات وە ئەگـەر پێویستی بوو ئەچێتە نـاو موجادەلـەوەو ئـەم شـێوەش دەبـێ بـە چـاکترین شـێوە بـەڕێوە بچـێ، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ادْعُ إِلَـى سَـبِيلِ رَبِّـكَ بِالْحِكْمَـةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ النحل: ١٢٥.

کـە ئەمـە شـێوەیەکە وەرگـیراوە و نـزیکترە بـۆ تێگەیشـتن بـە نیـەت و چاکەکان و (مخالفتُه خَطأ و حماقة) لادان لەم شێوازی بانگـەوازەش هەڵـەو گێلی یە....

گـەر موسـڵمانێکت بـانگ کـرد کـە نوێـژی دەکـرد، فـەرزەکانی خـوایی سەرشـانی جێبـەجێ دەکـرد، خـۆیی دەپاراسـت لـەو شـتانەی کـە خـوا بـە حـەرامی گێـڕاوە لەسـەر شـانی، بانگەشـەی ڕاسـتی دەکـرد، مزگەوتـەکانی ئاوەدان دەکردەوە هەموو ئیشێکی چاکی لـەناو خـەڵکی دا دیـار بوو، بـەڵام لە ئیش و فرمانێکدا جیاوازی هەبوو لەگەڵ تۆدا، وە ئـەو ڕایـەی لـەلای ئـەو بووە لەنێوان زانایاندا جیاوازییەکی کۆنی لەسەر بێ و لە چـەند کەسـێکەوە ئینکاری کرابێ و تۆش لەسەر ئەو شێوەبی، ئـەوە بـێ سـێ و دوو کـردن بـە کـوفری تـەواو ئەیناسـێنێ و حـوکمی کـوفری بەسـەردا ئـەدەی بەتـەنها ئـەو جیاوازییـەی کـە لەگـەڵ تـۆ هـەیبووە کـردی بـە کـافر و بـێ بـڕوا، کـە بەمـە گـەورەترین خراپـەت ئـەنجام داوە، فرمانێکـت هێناوەتـە پـێش کـە خـوای پـەروەردگار نـەهی لێ کـردووی کـە بیکـەیت وە بـانگی کـردووی بـۆ گـرتن و هێنانە پێشەوەی فرمانەکان بە حیکمەت و چاکەخوازی...

زانای ناودار –السید أحمد– ناسراو بە (الحداد) ئـەڵێ: یـەکڕایی زانایـان دامەزراوە لەسەر ڕێگـرتن لەسـەر کـافرکردنی کەسـانێك کـە ئـەهلی قیبلـەبن، مەگەر کەسێك کە بەتـەواوی نـەفی دروسـتکاری بەتوانای خـالق بکـات (جلَّ شأنهُ) یـان بـەبێ پـەردە هـاوەڵ و شـەریك بۆ خـوا بڕیـار بـدا کـە هـیچ بـواری تـەئویلی تێـدا نـەبێ، یـان ئینکـاری ئـەو شـتانە بکـات کـە لـە دینـەوە بـە زەرورەت فێربوونیان پێویست بوو بێ، یـان ئینکـاری فرمانێك بکـات کـە بـە متواتری یان بە کۆیی لەسەری هاتبێ کە ئەوە زەرورەتە لە دین بێ...

هەمووش ئەزانین کە ئەو شتانەی لە دینن بە زەرورەت وەك یەکتاپەرستی (التوحیـد)، پێغەمبەرایـەتی، خـەتمی دوا پـەیام و ڕسـالەتی خـوایی بـە پێغەمبـەری خۆشەویست ﷺ، زیندووبوونـەوەی ڕۆژی دوایـی، پاداشت و سزا، بەهەشت و دۆزەخ، کە پۆزش لە هیچ موسولمانێ وەرناگیرێ کە بڵێ ئەمانەم نەزانیوە، مەگەر یەکێ کە تازە هاتبێتە ئیسلامەوە و زووتر هیچ زانستی نەبووبێ، ئەوە پۆزشی وەردەگیرێ تا ئەوەی فێری دەکرێ، ئیتر دوای ئەوە ئەگەر وەرگەڕایەوە عوزری نامێنێ.

متواتر: ئەو هەواڵەیە کە کۆمەڵێك ئەیگێڕنەوە کە نەگونجێ لەسەر درۆ کۆببنـەوە... چ لـە ئیسـناد دا وەك فـەرموودەی : (مـن کـذّبَ علـيَّ متعمـداً فليتبوا مقعَدَهُ مِنَ النار) وە یـان لـەڕووی زۆری و کۆمـەڵ کۆمـەڵی یـەوە وەك ئـەوەی بـە تـەواتر قورئـان کۆکرایـەوە، لـە ڕۆژهـەلات و ڕۆژئـاواوە بـە خوێندنـەوەو لەبەرکردن مایـەوە، کۆمـەڵێك لـە کۆمـەڵێکی وەرگـرت کـە ئەمـە پێویستی بە ئیسناد نییە.

ڕێ دەکەوێ تەواتری کردەوەیـی بێ، وەك ئـەو کردەوانـەی کـە لەسـەری ڕێکـەوتوون لەسـەردەمی پێغەمبـەرەوە تـا ئێسـتا، یـان تـەواتری عـیلم و زانستە، وەك بڵاوبوونەوەی موعجیزەکان، کە ئەو موعجیزانە هەریەکەیان بە تـەنها گێڕانـەوەیان پلـەی –احـاد–یـان هەیـە، بـەڵام ئـەو بەشـداربونەی کـە هـەموو مرۆڤێکـی موسوڵمان بـە بـاوەڕەوە گێڕاویەتـەوە ئەیگەیەنێتـە پلـەی متواتر.

وە حوکمدانی کوفر بەسەر موسوڵمانێك دا بەبێ ئەوەی شـوێنی ئـەوە بـێ زۆر خەتەرێکی گەورەیە، لەبەر فەرموودەی (إذا قال الرجُلُ لأَخيه: يا كـافر،

فقد باءَ بها أحدُهُما)[1] واته: هەركات پیاوێك به براكەی وت: ئەی كافر، ئەوە حوكمی كافرەكە بەر یەكیان دەكەوێ...

وە دروست نی یە دەركردنی ئەم حوكمە مەگەر لای یەكێ كە زانابێ بەهۆی ڕۆشنایی شەریعەتەوە ، بە هەموو بەشەكانی چوونە ناوەوە و هاتنە دەرەوەی ئەو كردەوانە كە مرۆڤی پێ بێ بڕوا دەبێ ، وە سنورەكانیش جیاكەرەوەن لەنێوان بێ بڕوایی و ئیمانداریدا كە لە حوكمەكانی شەرعدا بەیان كراوە.

وە دروست نیە بۆ هیچ مرۆڤێك كە لەم مەیدانەدا ئەسپی خۆی تاو بدات و تەكفیری خەڵكی بكات ، بەهۆی وەهم و گومانەوە بێ جێگیربوونی و دڵنیایی و زانستی تەواو بەو باسەیە، خۆ ئەگەر بەو شێوە بكەین ئەوە تەڕو وشكمان بەیەك یاسادا بردووەو لەسەر زەوی دا تاكە موسوڵمانێ نامێنێ مەگەر كەمێكیان نەبێ..

هەروەك چۆن دروست نییە تەكفیركردن بە هۆی توش بوونی بەگوناه لەگەڵ ئیمانداری و ئیقرار كردن بە دوو وتەی پیرۆزی شایەتومان، كە لە فەرموودەی أنس هاتووە كە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی:
(ثلاث مِن أصل الأيمان: الكَفُّ عمن قال: لا إله إلا الله، لا نُكفِرُهُ بذنبٍ ولَا نُخرِجُهُ عنِ الاسلامِ بالعمل، والجهادُ ماضٍ منذ بعثني اللهُ الى أن يُقاتِلَ آخِرُ أمتي الدجال، لا ينطلِهُ جورُ جائر ولا عدل عادل، والأيمانُ بالأقدار...)[2]
واته: سێ شت لە بناغەكانی ئیمان و بڕوان:

---

[1]- ئیمامی بخاری ڕیوایەتی كردووە وە فەرموودەكە لە أبی هریرەوە گێڕاوەتەوە.
[2]- ئیمامی ئەبو داود ڕیوایەتی كردووە.

١) وازهێنـان لـەو کەسـەی کـە دەڵـێ/ لا إلـه إلا الله، بـێ بڕوایـی پـێ نـاڵێن بەهۆی گوناهێکەوە کە توشی بێ، وە لـە ئیسـلامیش دەری ناکـەین بـەهۆی کردەوەکەیەوە کە لە ئیسلام نەبێ.

٢) تێکۆشان لە ڕێگەی خواداو جیهادکردنـدا فرمانێکە خوا لەگەڵ ناردنی مـن بـە پێغەمبەرایەتیـدا ناردویـەتی و بـەردەوام دەبـێ تـا شـەڕ لەگـەڵ کۆتـا کەسـی دەجـال دا دەکـرێ، کـە ئـەم حوکمـە (واتـە جیهـاد) بـەتاڵی ناکاتـەوە نەستەمی ستەمکاران وە نە دادپەروەری دادپەروەران...

٣) وە بڕوا بوون بە قەدەرەکان...

لەبەر ئەم یاسایانە خۆمان دەپارێزین لە حوکمدان بە بێ بڕواکردنـی خـەڵك دا، خـوا هیدایـەت بەخشـە بـۆ ڕێگـەی ڕاسـتەقینەو گەڕانـەوەش بـۆ لای ئـەو دەبێ...

## بۆچوونی شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب

لەم باسەماندا ئەم پیاوە –شێخ محمـدی کـوڕی عبـدالوهاب– بۆچوونێکی بەهێزی هەیە، کـە زۆر لەوانـەی کـە نیسـبەتی خۆیـان ئـەدەن لـەم ، ئینکاری ئەم بۆچوونە دەکەن و دەڵێن دراوەتە پاڵی، وە پاشان حوکمی کوفر ئەدەنە پـاڵ هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە پێچـەوانەی ڕێبازەکـەی ئـەم کـەوتوون... فەرموون ئەوە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهابە کە هەموو ئەو فرمانانـەی کـە دراوەتە پاڵی بەدرۆیان ئەخاتـەوەو ، وا بـەیان ئـەکات کـە ئەوانـە ئیفـتیران و

بەدەم ئەمەوە هەڵبەستراون کە لە بەشەکانی بیروباوەڕدا و لە نامەکەیدا کە بۆ خەڵکی (القصیم)ی نوسیوە تیایدا دەڵێ:[1]

( لە پاشان لێتان ناشارمەوە، کە پێم گەیشتووە کە نامەکەی (سلیمان بن سحیم) گەیشتۆتە لاتان، کە زۆر لە ئێوە وەرتان گرتووە و بە ڕاستتان زانیوە، بەڵام خوا دەزانێ کە ئەو پیاوە بە دەم منەوە درۆ و ئیفتیرای تیاکردووە، وە زۆر لەو شتانە بە خەیاڵی مندا نەهاتووە تا بیاننوسم لەوانە:

ئەو وتەیە کە دەڵێ: من بەتاڵکەرەوەی کتێبی هەر چوار مەزهەبەکەم، گوایە من وتوومە: خەڵکی ماوەی شەش سەد ساڵە لەسەر بەتاڵن، وە گوایە من بانگەشەی پلەی ئیجتیهادم کردووە و خۆم لە پلەی (التقلید) دەرکردووە، وە گوایە من وتوومە: ڕای جیاوازی نێوان زانایانی ئیسلام نەگبەتی یە، وە من ئەوانەم هەموو بە بێ بڕوا دانابێ کە تەوەسولیان بە پیاو چاکانەوە کردبێ وە من (شیخ البویصری)م بە کافر دانابێ لەسەر قسەی (یا أکرم الخلق) وە گوایە من وتوومە: ئەگەر لە توانامدا بووایە کە قوبەی سەوزی ئارامگای پێغەمبەر ﷺ بڕوخێنم دەمڕوخاند وە ئەگەر دەستەڵاتم بەسەر کەعبەی پیرۆزدا بشکایە شوێنی ئاوە چۆڕەی کەعبەم دەگۆڕی بە ئاوە چۆڕێ کە لە تەختە دروست کرابێ، وە گوایە من زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ حەرام کردووە، وە نکوڵی سەردان و زیارەتی گۆڕی دایك و باوکم و موسڵمانانم کردبێ، وە من گوایە وتوومە، هەرکەس سوێن بە غەیری خوا بخوات کافر و بێ بڕوایە، وە گوایە من هەر یەکە لە (ابن

[1]- بنوارە –نامەی یەکەم– لەو نامە تایبەتانەی کە لەناو کۆمەڵی دانراوی شێخ محمد عبدالوهاب بلاوکراوەتەوە بە بایەخەوە لە (زانکۆی پێشەوا محمدبن سعود)ی ئیسلامی بەشی پێنجەم.

الفارض و ابن عربي) بە بێ بڕوا دەزانم، وە هەرچی (دلائل الخيرات) هەیە لەگەڵ (روض الرياحين) ئەيانسوتێنم و ئەوەی دووەمیان ناو دەنێم (روض الشياطين).

وەڵامی من بۆ ئەو جۆرە بابەتانە: ئەوەیە کە ئەڵێم: (سُبحانَكَ هذا بُهتانٌ عظيم)[1]، ئەوانە پێش ئێستا باوەڕیان بە پێغەمبەر محمد ﷺ نەبووە، وە وتەی نابەجێیان بۆ (عیسی ی کوڕی مەریەم) هەڵبەستووە و پیاوچاکانیان لەناو خەڵکدا شکاندووە، ئەوانە فێرن درۆ هەڵدەبەستن، خوا دەفەرموێ:﴿إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللّهِ﴾ النحل: ١٠٥، درۆیان بەدەم پێغەمبەرەوە ﷺ هەڵبەست و وتیان گوایە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی:

(وانَّ الملائكه وعيسى و عزيراً في النار) هەریەکە لە فریشتەکان و عیسا و عوزەیر وان لەناو ئاگردا... بەڵام خوای پەروەردگار ئایەتی نازڵ کرد و تیایدا فەرمووی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا الْحُسْنَى أُوْلَئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ﴾ الأنبياء:١٠١.

## نامەیەکی گرنگی تری شيخ عبدالوهاب

ئەم نامەیەیان شێخ محمد عبدالوهاب ناردویەتی بۆ (السويدی)، کە زانایەك بووە لە خەڵکی عێراق، کە ئەم (السويدی)یە لە نامەیەکیدا پرسیاری کردووە لە (ابن عبدالوهاب) لە بارەی ئەو شتانەوە کە بەناوی

---

[1]- پاك و بێگەردی بۆ خودا ئەوە بوهتانێکی گەورەیە...

ئەمەوە لە خەڵکی یەوە ئەوترێت و بڵاوکراوەتەوە ، ئەمیش بەم نامەیەی وەڵامیان ئەداتەوە کە تیایدا ئەڵێ: [1]

(ئەو بوهتان و درۆیانەی کە بڵاوکراوەتەوە کە مرۆڤی عاقڵ و ژیر شەرم و حەیا دەکات لەوەی کە بیگێڕیتەوە، لەوانە کە وتوویانە: من هەموو خەڵکیم بەبێ بڕوا داناوە مەگەر ئەوانەیان نەبێ کە شوێنی من کەتوون، سەیرە؟ چۆن ئەمە دەچێتە مێشکی ژیرەکانەوە ئایا موسوڵمان شتی وا دەڵێ؟...

وە وتوتانە: ئەگەر من دەسەڵاتم ببوایە گومەزی سەر مەرقەدی پێغەمبەرم ﷺ ئەڕوخان، وە گوایە (دلائل الخيرات)م حەرام کردووە کە بخوێنرێتەوە، وە من صەڵەوات خوێندنم لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردووە بە هەر شێوەیەك بخوێنرێتەوە، ئەمە بوهتانە و بەدەم منەوە کراوە، وە موسڵمان هیچ گومانێ لە دڵیا جێ ناکاتەوە لەسەر شتێك کە پەرتوکی خوا لەسەری دوابێ..

وە لە لاپەڕە (٦٤) داو لە هەمان نوسراودا ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ (وە ئەوەی وتراوە: کە من ئەوانە بەکافر دەزانم کە تەوەسول لە پیاوچاکانەوە دەکەن، وە (بویصری)م لەسەر (يا أكرم الخلق) کافر کردبێ، وە ئینکاری زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرم ﷺ کردبێ وە ئینکاری زیارەتی گۆڕستانی دایك و باوك و غەیری ئەوانم کردبێ وە هەر کەس سوێند بە غەیری خوا بخوات کافرم کردبێ...

وەڵامی من بۆ ئەمە (سُبحانَكَ هذا بُهتانٌ عظيم)

---

[1] بنوارە بۆ ( القسم الخامس من الرسائل الشخصيه ) لا ٣٧ لە ( مجموعة مؤلفات الشيخ ) ..

## ( سِبابُ المسلم منسوق و قِتالَهُ كُفر )

بزانـه کـه ڕق بـوون لـه موسـڵمانان و وازهێنانیـان و پشـت تێکردنیـان لـه حەرام کراوەکانە، وە وتەی ناشرین بە موسڵمانان خاوەنەکەی بەرەو فاسـق بوونی دەبات و خوێن ڕشتنی بە کوفر و بێ بڕوایی ئەگەیەنێ.

لەم باسەمدا ئەوە با بەس بێ کە ئەم فەرموودە ئەگێڕینەوە:

خالدی کوڕی وەلید ڕەزای خوای لێ بـێ لـە کاتێکا لـە سریەکەیدا بەرەو لای هۆزی (بني جذيمه) ئەڕۆیشت تا ئیسلامەتیان پێ ڕابگەیەنێ، کاتێ کە نزیك بووەوە لێیان بەرانبەریان بوویەوە (واتە ئەوان هاتبوونە دەر و خۆیـان لە ئامادەباشیدا بوون) .

خالـد پێـی وتـن : موسـڵمان بـبن، وتیـان: ئێمـە قـەومێکی موسـڵمان و بڕوادارین، فەرمووی: باشە چەکەکانتان لابدەن و لـە وڵاخەکانتان دابـبەزن، وتیان: نەخێر بەخوا چەك دانانرێ مەگەر دوای شەڕ نـەبێ، ئێمـە باوەڕمـان نـە بـە تـۆ هەیـە و نـە بەوانـەش کـە لەگـەڵ تـۆدان. خالـد فـەرمووی: هـیچ ئەمینیـەك و سـەلامەتیەکتان پـێ نـادەم تـا دانەبـەزن و چـەك دانـەنێن، ئـیتر کۆمـەڵێکیان دابـەزین و پاشماوەکـەیان بـەرەو دوا کشـانەوە. لە ڕوایـەتێکی تردا:

(خالد لە کۆتایدا گەیشت بە قەومێك کە بەرانبەری وەسـتا بـوون، فەمووی پێیان: ئێوە کێن؟ موسڵمانن یـان بـێ بـاوەڕ؟ وتیان: ئێمـە بـاوەڕدارین نوێـژ دەکەین و باوەڕمان بە محمد ﷺ هێناوە، وە مزگەوتمان دروست کـردووە و بانگمـان تیـاداوە، فـەرمووی: ئـەی ئـەو چەکانەتان بـۆ هـەڵگرتووە؟ وتیـان: لەنێوان ئێمەو هۆزێك لە عەرەب دژایەتی هەیە، ترساین کـە ئێـوە ئـەوان بن، بۆیە چەکمان هەڵگرت. خالد فەرمووی: دەی چەکەکانتان دابنێن دایاننـاو،

پاشان فەرمووی: بەدیل بیانگرن، بەم شێوە هەر کۆمەڵەو کەوتە ژێر دەستێك لە هاوەڵانی خالدەوە، کاتێ بەرەبەیان خالد هاواری کرد و وتی: کێ دیلی لایە با بیکوژێ، بەم شێوەیە ئەوەی لای (بنو سلیم)یەکان بوو هەموو کوژران بەڵام (مهاجر و انصار)ەکان کەسیان نەکوشت بەڵکو دیلەکانیان ڕەوانە کرد، کاتێ ئەم هەواڵە گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ کە خالد وای کردووە فەرمووی: (اللهم إني أبرأُ اليكَ مِمّا صنع خالد) کە دووجار ئەم دۆعایەی خوێندەوە.

دەڵێن: خالد بۆیە بەو شێوە جولایەوە چونکە وا گومانی برد کە ئەوانە وتیان موسڵمانین لەسەر خۆپاراستن وتویانە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەو پەلە کردنەی دورخستەوە و جێگیر نەبوونی ئەو فرمانە لەخۆوە نەبووە پێش ئەوەی مەبەستی ئەوان بزانێ کە لە سەرەتادا لە بری (أسلمنا) وتیان (صبأنا)، بۆیە خالد لەسەری ناکەوێ، چۆن بۆ خالد کەمتەرخەمی دەبێ لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە فەرمووی (نعمَ عبدُالله وأخو العشيرة خالد بن الوليد وسيف من سيوف الله سَلَّهُ اللهَ على الكفارِ والمنافقين) .

هەروەها چیرۆکی (ئوسامەی کوڕی زەید) خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بوو کە ئیمامی بخاری ڕیوایەتی دەکات لە (أبي ظبيان) دەڵێ: گوێم لێوە بوو ئوسامەی کوڕی زەید ئەیوت: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردینی بۆ لای هۆزی (الحَرَقَة)، پێش بەیانی گەیشتینە لایان و بەسەریانا سەرکەوتین، من و یەکێ لە هاوەڵان (الأنصار) شوێن پیاوێکیان کەوتین، کاتێ گرتمان وتی (لا إله إلا الله) (هاوەڵەکەم) وازی لێ هێنا، منیش بە ڕمەکەم لێمدا تا کوشتم کاتێ گەڕاینەوە هەواڵیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش فەرمووی پێم: يا أُسامةَ! کوشتت دوای ئەوەی وتی (لا إله إلا الله) عەرزم کرد: ئەو پشتی بەو وتەیە پێگرتم بۆ ئەوەی نەیکوژن ئەگینا ئیمانی نەبوو، حەزرەت

ﷺ وتەکەی خۆی دوبارە و سێ بارە کردەوە تا خۆم بە خۆمم ئەوت خۆزگە دوای ئەو ڕۆژە موسڵمان بوومایە...

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە:

پێغەمبەری خوا فەرمووی پێم/ ئایا تۆ دڵیت شەق کرد تا بزانی ڕاست دەکات یان درۆ؟ ئوسامە وتی: ئیتر شەڕ لەگەڵ کەسێکدا ناکەم کە بڵێ لا إله إلا الله.

پرسیاریان کرد لە ئیمامی عەلی (کرم اللهُ وجهە) لەو کەسانەی کە پێچەوانەی ئەمن لە فیرقەتەکاندا کە ئایا ئەوانە کافر و بێ بڕوان؟ فەرمووی: نەخێر ئەوانە لە بێبڕوایی و کوفر ڕایان کردووە. وتیان: ئەی ئەوانە مونافق و دوو ڕوون؟ فەرمووی: نەخێر چونکە دووڕووەکان یادی خوا ناکەنەوە مەگەر بە کەمی نەبێ، بەڵام ئەمانە یادی خوا زۆر دەکەن... وتیان: ئەی ئەوانە چین؟ فەرمووی: ئەوانە کۆمەڵێکن فیتنە بەسەریاندا هاتووە، چاوی کوێر کردوون و گوێچکەی کەڕ کردوون... (واتە نە ڕاست ئەبینن و نە ڕاستیش ئەبیستن)...

# پلەی بەدیهێنەرو پلەی بەدیهێنراو
## ( الخالق و المخلوق )

جیاوازی لەنێوان پلەی بەدیهێنەر و پلەی بەدیهێنراو: بریتی یە لەو سنورە جیاکەرەوەیەی کە لەنێوان بێ بڕوایی و ئیمانداییە، کە لەو باوەڕەداین هەرکەس ئەو دوو پلەیە تێکەڵ بکات، ئەوە خۆی بێباوەڕ کردووە (پەنا بە خوا)...

وە بۆ هەموو پلەیەك کۆمەڵێ مافی تایبەتی هەیە، بەڵام چەند فرمانێك هەیە کە لێرەداو لەم بەشەدا باس دەکرێ، وە بە تایبەت ئەو فرمانانەی کە تایبەتن بە پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﷺ وە بە تایبەتمەندییەکانی خۆشەویستەوە کە بەهۆیەوە جیای دەکاتەوە لە باقی خەڵکانی تر و پلەو مەقامی بەرزی ئەداتێ، کە ئەم فرمانانە بووەتە شتێکی شوبهە لەلای هەندێ لەو کەسانەی کە بیرومێشکیان بێ هێز و تەسکە و تێڕوانینیان بۆ باسەکان لاوازە و خراپ لە مەفهومەکان تێدەگەن، بۆیە بێ وەستاندن حوکمی کافربوون ئەدەن بەسەر هاوەڵانی ئەو فیکرەیە و لە بازنەی ئیسلام دەری دەکەن، کە ئەمەش لەو گومانەوە دروست بوو لایان کە تێکەڵیەکی تەواویان کرد لەنێوان پلەی (خالیق و مەخلوقدا)و پلەی پێغەمبەریان بەرزکردەوە بۆ پلەیەك کە پێی بڵێن (مەقامی ئولوهیەت) یان (پلەی خواوەندی))، کە ئێمە خۆمان بەری دەکەین لەو جۆرە بیرکردنەوانە ، پاك و بێگەردی تەنها بۆ زاتی خوای باڵادەستە... وە ئێمە بە فەضڵی خوای گەورە، ئەو فرمانانەی کە پێویستی خوایەتیە چاك ئەزانین، وە ئەوەی پێویستی فرمانی پێغەمبەرایەتیە بەتایبەت –حەزرەت ﷺ– چاك ئەزانین، وە ئەشزانین ئەو فرمانانە کامانەیە کە خوا بەخشیویەتی بەتایبەت بە

پێغەمبەر ﷺ و نەیداوە و نەیبەخشیوە بە هیچ کەس لە مەخلوقاتی خۆی، بەبێ ئەوەی هیچ زیادەڕەویەکی تیا بکەین و بیگەیەنین بە سنوری ئەو وەسف و سیفەتانەی کە لە تایبەتمەندی ڕبوبیەت و ئولوهیەتن کە لە بەخشین و نەدان و سوود و زیان و سەربەخۆیی زاتی و دەسەلاتی تەواو و هەیمەنەی گشتگیر و خەلق کردن و مولکیەت و تەدبیر و پیرۆزی و بەندایەتی تەواوی لەلایەن بەندەکانیەوە جەلالیەتی خوا خۆی دەبینێتەوە بە جیاوازی هەموو جۆر و ئەحواڵ و مەرتەبە و پلەکانیەوە...

بەڵام زیادەڕەوی واتە (غلو) کە بریتی یە لە پیادا هەڵدان و داچوون تیایدا بۆ خۆشەویستی و طاعەت و پەیوەست بوون پێوە، کە ئەمە پەسەندە و داواکراوە هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە کە دەفەرموێ:
(لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم)

بە مانای: بەرزکردنەوەو پیاهەڵدان و ثەناکردنێك کە نەیگەیەنێتە پلەی خوای گەورە، کە ئەمە لە پلەی ستایشکراویدایە و دروستە، وە ئەگەر مانای غەیری ئەمەی لێ وەربگری، ئەو کاتە مەبەستەکە دەبێتە نەهی کردن لە پیاهەڵدان و مەدح و سەناکردنی، وە مەعلوم و زانراوە: کە ئەمەی دووەم تەنانەت هیچ کەس لە نەزان و نەزانی نەزانەکانی ناو موسڵمانان نایڵێن و باوەڕیشیان پێ‌ی نییە، چونکە خوای بالادەست ڕێزی لە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ گرتووە پلەی بەرزکردۆتەوە لە قورئاندا بە هەموو جۆرەکانی پلەی بەرزکراوەکان، کە پێویستە لەسەر شانی ئێمەش کە وەك خۆی گەورەی بکەین و ڕێزی لێ بگرین هەروەك خوای خۆی ڕێزی پێداوە...!

بەڵێ: لەسەرمانە کە بەشتێك وەسفی پێغەمبەر نەکەین کە یەکێ لە سیفاتە ڕبوبیەتەکانی بداتێ کە تەنها بۆ زاتی پەروەردگارە.. ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کە وتی:

(دَع ما دَعَتهُ النصارى في نَبيِّهم

وآحْكُمْ بِما شيئَتَ مَدْحاً فيه وآحَتِكم)

ئەگــەر بــەم شــێوە وەســفێکی پێغەمبــەر ﷺ ت کــرد کــە دوور بــوو لــە ســیفاتەکانی خواوەنــدەوە، ئــەوە هــیچ گومــان و هاوەڵــدانان و بێبڕوایــەکی تیایدا نییە، بەڵکو ئەبێتە یەکێك لە هۆکارەکان بۆ نزیك بوونەوە لە خواو بە بەندایــەتی بــۆت هــەژمار دەکرێــت... ئــەم هاوشــێوانەمان زۆرە لــە قورئــانی پــیرۆزدا کــە پێویســت گێــڕاوە لەســەرمان بــەرز ڕایــان بگــرین کــە بــریتین لــە پێغەمبەران و ڕەوانــە کراوانــی خــوا –ســەلاَت وســەلامی خوایان لەسەر– وە فریشــتەکان و ڕاســتگۆیان و شــەهیدان و پیاوچــاکان کــە خــوا دەفــەرموێ ﴿ذَلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى الْقُلُوبِ﴾ الحج:٣٢.

وە ئایەتی پیرۆزی ﴿ذَلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ عِندَ رَبِّهِ﴾ الحج: ٣٠.

ئەلێرەوە و لەم تێگەیشتنەوە: کەعبە ڕێــزلێگیراوە، بــەردە ڕەشــەکە (الحجــر الأســود) و مــەقامی ئیــبراهیم (علیــە الســلام) ڕێــزلێگیراوە، کــە ئەوانــە چــەند بەردێکن خوا فرمانی پێکــردوین کــە لــە کــاتی طــەوافدا بــەرز ڕایــان بگــرین و پلەی (تــەعظیمیــەت)یــان بــدەینێ، وە فرمــانی پێــداوین کــە دەســت بدەین لــە (ڕوکنــی یــەمانی) و بــەردە ڕەشــەکە مــاچ بکــەین و نوێــژ بکــەین لــە پشــتی مەقامــەوە وە بوەســتین و پاڕانــەوەمان بخــوێنین چــونکە لــەویادا دۆعاکــان گیران و ڕەدنابنەوە، کە لە بەرانبــەر دەرگــای کەعبــەی پیرۆز و ئــەو شــوێنەی پێی دەڵێن (الملتزم) بمێنینەوە، کە ئێمە لەم جۆرە کردەوانەمان ناپەرستین تەنها خوای پەروەردگار نەبێ، وە هیچ سوود و زیانێکیان ڕاستەوخۆ نییە مەگــەر بــە ئیــزن و ئــیرادەی خــوا نــەبێ، کــە ئەمــە بیروبــاوەڕی موســوڵمانی ڕاستەقینەیە.

## پلەی بەدیهێنراوەکان (مقام المخلوق)

سەرەتا، بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ ئێمە بڕوامان دامەزراوە لەسەر ئەوە کە ئەم خۆشەویستەمان ﷺ مرۆڤە و هەموو ئەو شتانەی کە بۆ غەیری ئەو لە مرۆڤەکان دێتەجێ بەسەر ئەمیشدا دێتەجێ لە نەخۆشی و هاتنە پێشەوەی هۆکارەکان کە زیادی و کەمی بە مرۆڤ دەبەخشێ، هەروەك خاوەنی بیروبڕوا (العقیدە) دەفەرموێ:

وَجائزٌ في حَقِّهِمْ مِنْ عَرَضِ          بغيرِ نَقصٍ كَخَفيفِ المَرَضِ

وە پێغەمبەر ﷺ بەندەیەکی خوایە و خاوەنی هیچ زیان و سودێك بۆ نەفسی خۆی، نەمردن و نەژیان و نەزیندوبوونەوە نییە مەگەر بە مەیل و بە مەشیئەتی خوای پەروەردگار نەبێ، خوا دەفەرموێ: ﴿قُل لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعاً وَلاَ ضَرّاً إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَاْ إِلاَّ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ الأعراف: ١٨٨.

واتە: ئەی محمد ﷺ تۆ پێیان بڵێ: من خاوەنی هیچ سوودو زیانێ نیم بۆ خۆم نەئەتوانم قازانج بە خۆم بگەیەنم و نە ئەتوانم زیان لە خۆم دوور بخەمەوە، واتە نهێنیەکان نازانم، ئەگەر غەیبم بزانیایە خێر و قازانجی زۆرم بۆ خۆم کۆدەکردەوە هەرگیز تووشی زیان نەدەبووم من هیچ نیم ئەوە نەبێ کە موسوڵمانان لە گوناه و سزاکەی ئەترسێنم وە مژدەیان ئەدەنێ بە پاداشتەکان ، وە پێغەمبەر ﷺ بەڕاستی ئەو پەیامەی کە لەسەر شانی بوو گەیاندی و ئەو ئەمانەتەی پاراست و ئومەتی ئامۆژگاری کرد و ئەو ناڕەحەتی بەندایەتی و ناسۆرەی ژیانەی لەسەریان بوو ڕەوانییەوە، تێکۆشا لەپێناو سەرخستنی دینەکەی خوادا تا گەیشتەوە بە پلەی یەقین و بە شێوەیەك کە خوا لێی ڕازی بوو ئەمیش لەخوای خۆی ڕازی بوو گەیشتەوە بە مەقامی نزیکی لە پەروەردگاری، چونکە ئەمیش مرۆڤ بوو

وەك باقی مرۆڤەكانی تر دەمرن و دونیا بەجێدێڵن، وەك خوا دەفەرموێ ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾ الزمر: ٣٠.

وە لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ أَفَإِن مِّتَّ فَهُمُ الْخَالِدُونَ﴾ الأنبياء: ٣٤.

وە پلەی بەندایەتی (خۆ بە بەندەی خوا دانان) یەكێكی تر بوو لە سیفاتە بەرزەكانی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ كە هەموو جار شانازی بەم سیفەتەوە دەكرد و ئەیفەرموو ﴿إنّما أنا عبدٌ﴾ من تەنها بەندەیەكی خوای باڵادەستم، كە خوای پەروەردگاریش لە شوێنە بەرزەكاندا وەسفی پێغەمبەر دەكات و بە عەبد و بەندەی خۆی ناوی دەبات لە ئایەتی ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ﴾ الأسراء:١ وە دەفەرموێ ﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾ الجن: ١٩

كە ئەم سیفەتی مرۆڤیەتەی پێغەمبەر ﷺ خۆی لە خۆیدا یەكێكە لە گەورەترین موعجیزەكانی كە مرۆڤەو لە ڕەگەزی مرۆڤە، بەڵام جیاكەرەوەیەك هەیە تیایدا كە بەخشراوە پێی و لە هیچ كەسێك لە مرۆڤەكانی تردا نەبێ، وەك خۆی ﷺ باس لە نەفسی خۆی دەكات و دەفەرموێ ( إني لستُ كَهِيْئتكمُ إني أُبيتُ عند ربي يَطعِمُني وَيَسقيني)[1]

من وەكو ئێوە ناژیم من لە خزمەت خوای خۆمدا ئەمێنمەوە و ئەو زاتەیە نانم ئەداتی و ئاواشتەم دەكات...

لێرەوە بۆمان دەردەكەوێ كە وەسفدار كردنی پێغەمبەر ﷺ بە بەشەریەت و ڕەگەزی مرۆڤیەوە، پێویستە ڕەگەزیەك بێ كە جیای بكاتەوە لە مرۆڤەكانی تر لە باس كردنی تایبەتمەندییە جوان و ئاكارە چاكەكانیدا،

---

[1]- رواه البخاري ، باب : الوصال ومن قال ليس في الليل صيام ، ژمارە ( ١٩٦١، ١٩٦٢، ١٩٦٣، ١٩٦٤ )

که ئەمە لە سیفەتەکاندا تایبەت نابێ بە کەسایەتی ئەم پێغەمبەرەوە ﷺ بە تەنها، بەڵکو بۆ سەرجەم پێغەمبەران -بەخشراوە لەلایەن خوای گەورەوە- ئەمەش بۆ ئەوە بووە تا سەیرکردنمان بۆ سەرجەم پێغەمبەران بە شێوەیەك بێ کە بگونجێ لەگەڵ پلەو مەقامیاندا...

تابزانین کە تێبینی کردنی ڕەگەزی مرۆڤی ئاسایی دوور بێ لەو تایبەتمەندیانەوە ئەمە تێڕوانینێکی سەردەمی نەزانی و سەیرکردنی ئەو کەسانەیە کە هاوەڵیان بۆ خوا بڕیار دەدات، لە قورئانی پیرۆزدا چەندە شایەت و بەڵگەمان هەیە لەسەر ئەم باسەمان، لەوانە:

وتەی کۆمەڵی پێغەمبەر نوح بەرانبەر بە پێغەمبەرەکەیان هەروەك خوا بۆمان دەگێڕیتەوە، وتیان: ﴿فَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قِوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَراً مِّثْلَنَا﴾ هود:٢٧.

وە وتەی قەومی پێغەمبەر موسا و هارون کە وتیان ﴿فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ﴾ المؤمنون: ٤٧.

یان وتەی کۆمەڵی ثمود کە بەرانبەر (صالح) پێغەمبەریان وتیان ﴿مَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِآيَةٍ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ الشعراء:١٥٤.

یان پێغەمبەر شوعەیب کە هاوڕێیانی ( ئەیکە ) پێیان وت ﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ . وَمَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ الشعراء: ١٨٥- ١٨٦.

وە نموونە و بەڵگەیەکی قورئانی تر ئەوە بوو کە موشریکەکان بەرانبەر بە هەقی پێغەمبەر ﷺ ئەیانوت و بە چاوی بەشەریەتی ڕووتەوە ئەیانبینی و ئەیانووت چۆن ئەبێ پێغەمبەر بێ لەکاتێکدا نان ئەخواو لە بازەڕەکاندا ئەگەڕێ ﴿وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ﴾ الفرقان:٧ ، کە پێغەمبەر ﷺ باس لە نەفسی خۆی دەکات لە

فەرموودەکانـدا کـە خـوا چـۆن ڕێـزی لێ نـاوە و زۆر لـە سـیفاتی بـەرزی پێبەخشیوە و بەهۆیانەوە لە هەموو چینەکانی مرۆڤ دووری خستۆتەوە.[1]
وە لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: (تنـامُ عينـايَ وَلا يَنامُ قلبي) چاوەکانم دەخەوێ بەڵام دڵم هەرگیز نانوێ.. [2]

وە لـە فەرموودەیـەکی تـردا: (إنـي أراكـم مِـن وراءِ ظهـري كمـا أراكـم مِـن أمـامي) مـن ئـەتانبینم لـە پشـتی سـەرمەوە وەك چـۆن لـە بەردەممـدا ئەتانبینم...[3]

وە لـە فەرموودەیـەکی تـردا ئەفـەرموێ: (أوتيـتُ مفـاتيحَ خـزائنَ الأرض)[4] واتـە: (کلیلـەکانی گەنجینـەکانی زەوی دراوە پـێم) وە پێغەمبـەر ﷺ هەرچەندە لە ژیاندا دەڵێین مردووە یان وەفاتی کردووە، بەڵام ئەو زینـدووە و لە ژیانی بەرزەخی خۆیدا بە شێوەیەك دەژی کە گوێبیستی وتەکانـە و وەڵامی سەلامەکانیش ئەداتەوە، وە ئەو صەڵەواتانەی لەسەری دەخوێنرێ پێی دەگەیەنرێ، وە کردەوەکانی ئومەتی ئەخرێتە بەردەستی، بە کردەوە چـاکەکانیان دڵ خـۆش و فـەرەحناك دەبـێ، وە بـۆ خراپەکانیشـیان داوای لێخـۆش بـوون دەکـات لـە خـوای پـەروەردگار ، وە خـوای گـەورە حـەرامی گێڕاوە لەسەر زەوی کە لاشەی پێغەمبەران بخوات یان بیپرووێنێ، کـە ئەمـە

---

[1]- لەم کتێبەدا لەسەر ئەم باسەیە بەشێکی تەواو لێی ئەدوێین لەژێر ناوی (الأنبياء بشر ولكن).. إن شاء الله.

[2]- رواه البخاري رقم ٣٥٦٩ باب/كان النبيُّ تنامُ عينهُ ولا ينامُ قلبهُ.

٣- رواه مالك في ( الموطأ ) رقم ٧٠ ص ١١٢ عن أبي هريرة ، وەبنـوارە بـۆ ( فتح الباري شرح صحيح البخاري – زين الدين الحنبلي ) ٣ \ ١٤١ .

٤ رواه البخاري في صحيحيه رقم ٢٩٧٧ .

ماناى وايە ئەو لاشەيە پارێزراوە لە هەموو ئەو ئافات و ناڕەحەتيانەى كە لە زەوى دا ڕوو دەدات...

لە ئەوسى كوڕى ئەوسەوە -ڕەزاى خواى لێ بێ- دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: (إنَّ مِنْ افضلِ أيامكم يوم الجمعة، فيهِ خَلقَ آدم، وَفيهِ قُبضَ، وفيهِ النفخَةُ، وَفيه الصعقةُ، فأكثِروا عليَّ مِنَ الصلاةِ فيه، فإنَّ صلاتكم معروضته عليَّ) قالوا: يا رسُول الله! وكيف تُعْرَضُ صلاتنا عليكَ وَقد أرِمتَ؟ (بليت) فقال (إنَّ الله عزوجل حَرَّمَ على الأرض أن تأكل أجساد الأنبياء)[1] .

واته: (لە باشترينى ڕۆژەكان ڕۆژى هەينى يە، تيايدا ئادەم پێغەمبەر خەلق بوو، تيايدا ڕۆحى بەرزكرايەوە، وە لە ڕۆژى هەينيدا فوو دەكرێ بە قەرەنالدا و دونيا تەواو دەبێ، وە تيايدا زيندوو دەكرێنەوە و بەرەو مەحشەر دەڕۆن، زۆر صەڵەواتم لە هەينى دا لەسەر بخوێنن، چونكە صەڵەواتەكانتان دەخرێنە بەردەستم، وتيان: ئەى پێغەمبەرى خوا ﷺ دەى چۆن صەڵەواتەكانمان دەخرێنە بەردەستت لەكاتێكدا تۆ پوكاويتەوە (مردويت)؟ فەرمووى: خواى گەورە حەرامى گێڕاوە لەسەر زەوى كە لاشەى پێغەمبەران بخوات...

وە لەسەر ئەم باسە نوسراوێكى سەربەخۆ هەيە كە زاناى پايەبەرز حافيظ جەلالەدينى سيوطى دايناوەو ناوى ناوە (إنباء الأذكياء بحياة الأنبياء) .

وە ئيبنو عەباس -ڕەزاى خواى لێ بێ- ئەگێڕێتەوە كە حەزرەتى پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: (حياتي خيرٌ لكم تُحَدِثُونَ وَ يُحَدِثُ لَكُم، وَ

---

[1]- رواه أحمد وأبو داود وابن ماجه وابن حبان في (صحيحه) والحاكم في المستدرك.

وَفاتي خيرٌ لكم تُعْرَضُ عَلَيّ اعمالكم فَما رايتُ مِنْ خير حَمِدتُ الله عليه، وَما رايتُ مِنْ شَرٍّ استغفرتُ لكم)[1] .

واته: ژیانی من خێری تیایه بۆ ئێوه قسهم بۆ دهكهن و منیش قسهتان بۆ دهكهم، وه مردنیشم خێری تیایه بۆ ئێوه، كردهوهكانتان دهخرێته بهردهستم، كه خێر و چاكهم تیا بینی سوپاسی خوای لهسهر دهكهم ، وه هیچ خراپهیهكتان نییه كه بخرێته بهردهستم مهگهر داوای لێخۆشبوونتان له پهروهردگارم دهكهم...

عن أبي هريرة –ر.ض– عن رسول الله ﷺ– قال: (ما مِن أحدٍ يُسَلِّمُ عليَّ إلا رَدَّ اللهُ عليَّ روحي حتى أرُدَّ عليهِ السلام)[2] واته: هیچ كهسێ نیه كه سهلامم لێ بكات مهگهر خوای گهوره ڕۆحهكهم بۆ دهگێڕێتهوه ههتا وهلامی سهلامهكهی بدهمهوه. ههندێ له زانایان ئهفهرموون:

كه دهڵێ (ردّ عليّ روحي) واته خوا نوتق و قسه كردنم بۆ دهگێڕێتهوه نهك ڕۆح بۆ ههموو لاشهكه.

–عن عمار بن ياسر (ر.ض) قال: قال رسول الله ﷺ: (إنَّ الله وَكَلَ بقبري مَلَكاً أعطاهُ اللهُ أسماءَ الخلائق فلا يُصلي عليَّ أحدٌ الى يومِ القيامة إلاّ أبلغني بإسمهِ وإسم أبيه، هذا فلان بن فلان قد صلّى عليك)[3] .

واته: خوای گهوره فریشتهیهكی لای گۆڕهكهم داناوهو ناوی ههموو خهلقانی پێ بهخشیوه، هیچ كهس نیه كه صهڵهواتم لهسهر بخوێنێ تا

---

[1]– (الهيثمي) دهڵێ: ئهم فهرمووده ئیمامی البزار ڕیوایهتی كردووه و پیاوهكانی ههموو له پیاوه چاكهكانن.

[2]– رواه أحمد وابو داود.

[3]– رواه البزار.

ڕۆژی دوایـی مەگـەر ئـەو فریشـتەیە بـەناوی خـۆیی و نـاوی باوکیـەوە پـێم دەگەیەنێ، کە ئەمە فلانی کوڕی فلانە صەڵەواتێکی لەسەر خوێندویت..
وە لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرمووێ:[1]

(إنَّ الله تبارك وتعالى مَلَكاً أعطاهُ الله أسماءَ الخلائق، فهو قائم على قبري إذا متُ، فليس أحد يُصلي عليّ الا قال: يا محمد صلّى عليك فلان بن فلان، قال: فيصلي الرب تبارك وتعالى على ذلك الرجل بكل واحد عشراً) .

واتە: بۆ خوای گەورە هەیە فریشـتەیەك، کە نـاوی هـەموو مـەخلوقاتی پـێ بەخشیوە، کە مردم لەسـەر گۆڕەکەم ڕادەوەستێ، ئیتر هـیچ کـەس نییـە کە صەڵەواتم لەسەر بخوێنێ مەگەر پێم دەڵێ: ئەی محمد ئەوە فلانـی بن فلان صەڵەواتی لەسەر خوێندی، فەرمووی: خوای گەورە بۆ ئەو پیاوەیەو بۆیەك صەڵەواتەکەی دەجار ڕەحمی خۆی لەسەر دەخوێنێ.

وە ئیمامی طبرانی لە (الکبیر)و غەیری ئەویش هێناویانە.[2]

وە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ هەرچەندە ئێستا لـە گۆڕی موبارەکیدایە، بەڵام فەضڵ و گەورەیی و پلەو مـەقامی لەلای پـەروەردگاری بـاقی و بەردەوامـەو هـیچ گومـانی تێدا نییە لـەلای بڕوادار، لەبەرئەمەیـە کـە ئەیکەینـە هۆکـار و سـەبەبێك بـۆ خزمـەت پـەروەردگارمان کـە (تەوەسـول) ی پێـوە دەکـەین، کـە ئەمـە هـەمووی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو ڕاسـتیەی کـە بـاوەڕبوون بـەو مانـاو خۆشەویستی و کەرامەتانەی کە لای خـوا هەیـەتی، وە بۆ بڕوابوون پێـی و بڕوابـوون بـە پـەیام و ڕیسـالەتەکەی ﷺ کـە ئەمـە پێـی نـاڵێن بەندایـەتی

---

[1]- رواه ابن حبان.

[2]- کـە فـەرموودەکانی لـەم بـارەوە زۆرن پشـت بـە خـوا لـە بەشـێکی ئـەم کتێبەمانـدا ئەیانهێنینەوە، وە یەك فەرموودە زانایـان کردوویانـە بـە بەڵگـەو هێناویانەتـەوە بۆ زۆر لە باسەکان و تەواویش بووە.

بۆپێغەمبەر بەڵكو هەرچەندە بەرزی بگری و پلە و ڕوتبەی بەرز ڕابگری ئەویش هەر یەكێكە لە دروستكراوانی خواو بەبێ ئیزنی پەروەردگار نەسوود و نە زەرەر نابینێ و نایگەیەنێ...

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ﴾ الكهف: ١١٠.

## ئەو فرمانانەی كە لەنێوان هەردوو پلەكەدا بەشدارن دژبە پاك و مونەزەهی خوای پەروەردگار نین

زۆر لە خەڵكی بە هەڵەداچوون لە تێگەیشتنی هەندێ لەو فرمانانەی كە لەنێوان هەردوو پلەكەدا بەشدارن (پلەی خالیق و پلەی مەخلوق) كە وا گومانیان بردووە كە نسبەتی ئەو فرمانانە بەلای پلەی مەخلوق و دروستكراوانەوە بووە بە شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان...

ئالێرەو لەم تێگەیشتنە هەڵەیانەوە: ئەو تایبەتمەندانەی كە پلەی پێغەمبەرایەتی لەسەر بەندە بووە بە شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان[1] بۆ نموونە:

یەكێ لەو شتانەی كە بە هەڵە لێی تێگەیشتوون و بە ڕێختەری مرۆڤ پێواویانە و گەورەیان كردووە لەسەر پێغەمبەری خوا، وە وایان بینیوەتەوە كە ئەو وەسفانە دەبێتە وەسف بۆ پلەو سیفاتی ئولوهیەت، كە ئەمەش نەزانینی ڕووتە، چونكە خوای پەروەردگار بە ئارەزوو و ئیرادەی خۆی كێی بوێ پێی ئەبەخشێ بێ ئەوەی لەسەر خۆی پێویست بكات. بەڵكو

---

[1]- كە پشت بە خوا لەم كتێبەماندا بەشێكمان تایبەت كردووە بە سیفەتە تایبەتەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ كە تیایدا ڕای زانایانمان لەسەری تۆمار كردووە.

ئەو بەخشینە زیادە فەزڵێکی خوایی یەو ئەیدا بە کەسانێك کە بیەوێ ڕێزیان لێنێ و مەقامیان بەرزبکاتەوە ، و ئەو فەزڵەی ئەمان بەسەر غەیری خۆیاندا دەربخات و خەڵکی لێ حاڵی بکات، کە ئەمە هیچ کەمیەکی تیادا نی یە بەرانبەر مافەکانی ڕبوبیەت و سیفاتەکانی ئولوهیەت، چونکە ئەو مافانە پارێزراون بەشێوەیەك کە بگونجێ لە خزمەت مەقامی خوای پەروەردگار...

مادەم یەکێ لە مخلوقین واتە دروستکراوان کە وەسف دار کرا بە یەکێ لەو فرمانانە ئەوە بە شێوەیەکە کە بگونجێ لەگەڵ مرۆڤایەتیدا بە شێوەیەك کە دیاری کراوە و بەدەست دێت بە ئیزنی پەروەردگار و بە فەزڵ و ئیرادەی ئەو، نەك بەهێزی ئەو کەسە، نەك تەدبیر و ڕێگا بۆ دانانی، چونکە ئەو مرۆڤە لاوازو بێ هێزە و ناتوانێ زیان و قازانج بۆ خۆی بەدەست بهێنێت ناتوانێ مردن و ژیانی خۆی دیاری بکات، نازانێ زیندووبوونەوەی خۆیشی بە ویستی خۆی بەدەست بخات.

کە زۆر لەو فرمانانە هەن کە بەڵگەن لەسەر پاراستنی مافەکانی خوای گەورە، بەڵام تەنها خوای گەورە خۆشی بەخشیویەتی و ڕژاندوویەتی بەسەر پێغەمبەردا ﷺ و هەندێکیشی بۆ کەسانی تر کە گەورە و بەرزیش نەکراوەتەوە تا بیگەیەنێتە پلەی ئولوهیەت یان بیگێڕێ بە شەریك و هاوەڵ بۆ خوای پەروەردگار...

لەوانە: پلەی شەفاعەت، لە فرمانەکانی خوای گەورەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ﴾ الزمر:٤٤.

وە لەلایەکی تریشەوە پلەی شەفاعەت جێگیر بووە بۆ حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ و غەیری پێغەمبەریش بە ئیزنی خوای پەروەردگار هەروەك لە فەرموودەدا هاتووە : (أوتيتُ الشفاعةُ) [1] يان (أنا اولُ شافع مُشَفَع)...[2]

وە یەکێکی تر: زانستی غەیب و نهێنییەکان:

کە بووە بە یەکێ لە فرمانەکانی خوای گەورە بە ئایەتی: ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ﴾ النمل:٦٥. لە هەمان کاتدا خوای پەروەردگار پێغەمبەرەکەی لەو نهێنیانە شارەزا کردو ئیزنی ئەوەشی دا کە بە کێی ئەبەخشێ، بە ئایەتی ﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَداً . إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَداً﴾ الجن:٢٦-٢٧.

یەکێکی تر: هیدایەت دان :

کە خوا تایبەتی کردووە بە خۆیەوە وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾ القصص:٥٦.

لە هەمان کاتدا پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ خوا پێی دەفەرموێ ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحاً مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُوراً نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ الشورى: ٥٢. کە هیدایەتی یەکەم غەیری ئەم هیدایەتەی دووەمە، کە ئەمە تەنها خاوەن عەقڵەکان لێ ی تێدەگەن لەو ئیماندارانەی کە ئەتوانن جیاوازی بخەن لەنێوان دروستکار و دروستکراودا، خۆ ئەگەر وا نەبێ پێویست ئەکا بڵێن: تۆ ئەی پێغەمبەر هیدایەتدەری بۆ سەر هیدایەتی

---

١ رواه البخاري كتاب التيمم رقم ٣٣٥ .

٢- رواه أحمد في مسنده والدارمي عن جابر – ٢٦٨٩ و ٢٦٩٣ وقال : حديث حسن .

ڕێبەری (إرشاد) خوایی، یان بڵێین خوا فەرموویەتی: ئەی محمد تۆ هیدایەتی خەڵکی ئەدەی بە هیدایەتێك کە غەیری هیدایەتەکەی ئێمەیە.

بەڵام هەردوو ئەم دوو حاڵەتە ڕوینەداوە، بەڵکو جێگیر بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ هیدایەتێکی ڕەها بەبێ قەید و شەرت چونکە مرۆڤی یەکتاپەرست لە ئێمە لەناو موسڵماناندا و لەناو ئەهلی ئیسلامدا مانای ئەم وتانە چاك تێدەگا و ئەو جیاوازیانە دەرك پێدەکات کە نسبەتی بەلای خواوە چەندێکە و نسبەتی بۆلای پێغەمبەریش ﷺ چۆنە..

وە نمونەیەکی تر: قورئانی پیرۆز هێناویەتی کە وەسفی پێغەمبەری خۆشەویستمان دەکات بە دوو سیفەتی (ڕەئووف و ڕەحمەت) کە دەفەرمووێ: ﴿بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ التوبة:١٢٨. لە هەمان کاتدا خوا وەسفی خۆی دەکات لە زۆر لە ئایەتەکاندا وە دەفەرموێ ﴿رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ التوبة:١١٧. کە ئەمە وا زانراوە کە ئەم دوو زاراوە (رَؤُوفٌ - رَّحِيمٌ) دوو سیفەتی لە یەك جودان لە کاتێکدا کە وەسفداری پێغەمبەرەکەی ئەکات بەو وەسفە بە شێوەیەکی ڕەها و بێ قەید و شەرت وەسفی ئەکات، چونکە ئەو کەسەی کە قسەی لەگەڵدا دەکرێ (کە پێغەمبەری خوایە) یەکتاپەرستە و باوەڕی بە خوای خۆی هەیە، چاك ئەزانێ جیاوازی نێوان خالیق و مەخلوق، دروستکراو و دروستکار چییە؟، خۆ ئەگەر وا نەبووایە ئەو کاتە پێویستی بەوە دەکرد، لە وەسفدارکردنەکەدا بڵێ، ڕەئوفیەك غەیری ڕئفەتی ئێمە، ڕەحیمیەك جگە لە ڕەحمی ئێمە- یان بڵێین: (رَؤُوفٌ برأفة خاصته) یان (رحيم برحمة خاصة) یان بوترایە: ڕەئوفیەتێك کە بگونجێ لەگەڵ ڕەئوفیەتی مرۆڤداو میهرەبانیەك بە میهرەبانی بەشەری- بەلام ئەمانە هیچی نەوتراوە و باس نەکراوە بەڵکو دەقەکە جێگیر بووە

بەشێوەیەکی موطڵەقی و ڕەهایی چ ڕەحمەت و چ ڕەئفەت بەبێ قەید و بێ شەرت بۆیە فەرموویەتی ﴿بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ التوبة:١٢٨.

## مەجازی عەقڵی و بەکارهێنانەکانی

هیچ گومانی تێدا نییە کە مەجازی عەقڵی لە قورئان و فەرموودەکاندا بەکارهاتووە، لەوانە خوا دەفەرمووێ:

﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً﴾ الأنفال: ٢. هەرکات قورئان بەسەریاندا بخوێنرێتەوە ئیمانیان زیاد دەکات ، نسبەتی زیادبوونی ئیمانی داوە بەلای ئایەتەکانەوە، کە ئەم ئیسنادە مەجازی عەقڵی یە، چونکە ئەوەی لە هەقیقەتدا ئیمان زیاد دەکات تەنها زاتی خوای پەروەردگارە.

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿يَوْماً يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيباً﴾ المزمل:١٧ ڕۆژێك دێت کە هەموو منداڵەکان دەگێڕێن بە پیر، کە لێرەدا نسبەتی (الجعل) گێڕانەکە دراوە بەلای وشەی (اليوم) ڕۆژ، کە ئەمە مەجازێکی عەقڵی یە، چونکە ڕۆژەکە شوێنی ئەوەیە کە بیانگێڕێ بە پیر، کە لە ڕاستیدا ئەوەی کە ئەیانگێڕێ بە شێوەی پیری تەنها خوایە...

یان خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْراً . وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيراً﴾ نوح: ٢٣-٢٤.

کە ئەو سێ بتەیە زۆر کەسی گومڕا کردووە، کە ئیسنادی گومڕاییە کە دراوەتە پاڵ بتەکان کە ئەمە مەجازێکی عەقڵی یە، چونکە ئەوانە تەنها هۆکارن بۆ هاتنە پێشەوەی گومڕاییەکە و ئەوەی هیدایەت ئەبەخشێ و گومڕا دەکات خوای پەروەردگار خۆیەتی..

یان خوا دەفەرموێ: لە چیرۆکی فیرعەوندا ﴿يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحاً﴾ غافر: ٣٦. کە لێرەدا ئسنادی بینا دروست کردنەکەی داواتە پاڵ هامان کە ئەمە مەجازی عەقلّی یە چونکە هامان ئەمری دەکرد نەك دروستی دەکرد بەڵکو ئەوانەی دروستیان دەکرد کرێکار و بەردەستەکانی بوون..

وە نموونەی ئەمە لە فەرموودەکانی پێغەمبەریش دا ﷺ هاتووە کە زۆر لە زانایان شارەزاییان لێی هەیە و لەسەری وەستاون، لەوانە جیاوازی نێوان ئسنادی هەقیقی و ئسنادی مەجازیان لەلایەو پێویست بەوە ناکات لێرەدا هەموو یەکێ لەوانە تۆمار بکەین، زانایان دەڵێن: وتن و دەرچوونی ئەو جۆرە ئیسنادانە لە یەکێکی شارەزای یەکتاپەرستەوە دەبێ، چونکە باوەڕی ساغ ئەوەیە کە مرۆۃ باوەڕی پتەوبێ بەوەی کە خالیقی بەندەکان و کردەوەکانیان تەنها خوای پەروەردگارە، بە شێوەیەك تەئسیری کەس نییە لەسەر خوا نەمردوو نە زیندوو، کە ئەمە بریتی یە لە باوەڕێکی یەکتاپەرستی تەواو، کە پێچەوانەی ئەمە خاوەنەکەی دەخاتە شیرك و هاوەڵ بۆ خوا دانانەوە...

## تێبینی کردنی نیسبەت
## لە پێوەری کوفر و ئیمان دا پێویستە

ئەوانەی کە گومڕا بوون هەڵساون بە گرتنی ڕوکەشی زاراوەکان (ظواهر الألفاظ) بێ ئەوەی گوێ بدەنە بەڵگە و قەرینە و مەبەستەکان ، وە بێ ئەوەی بنواڕن بۆ ئەو یەکگرتنەی کە نابێتە هۆی دوبەرەکی نێوان ئەو کەسانەی کە دانیان ناوە بە خەلقی قورئان ، کە ئایەتی ﴿إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً﴾ الزخرف: ٣ کردووەتە بەڵگە، لەگەڵ ئەوانەی کە قەدەر پێش

دەخەن کە دەستیان گرتووە بە ئایەتی ﴿فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ الشورى:٣٠. وە ئایـەتی ﴿بِمَـا كُنـتُمْ تَعْمَلُـونَ﴾ المائـدة: ١٠٥ وە غـەیری ئـەمانیش ، وە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پێدادەگرن بە (الجبر) بە ئایەتی ﴿وَاللَّـهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ الصافات:٩٦، وە ئایەتی ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَـكِنَّ اللّهَ رَمَى﴾ الأنفال:١٧.

لابردنی پەردە لەسەر ئەم حاڵەتە:

هەموو ئوممەت –غەیری قەدەریەکان– لەسەر ئەوە کۆن کە ( کردەوەی بەندەکان) دروستکراوی خوای پەروەردگارن بە ئایەتی ﴿وَاللَّـهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُـونَ﴾ الصـافات: ٩٦. وە بـە ئایـەتی ﴿وَمَـا رَمَيْـتَ إِذْ رَمَيْـتَ وَلَـكِنَّ اللّـهَ رَمَى﴾ الأنفال: ١٧، با لە هەمان کاتدا دروست بێ کە وەسفی ئەو بەندەیە بکەیت لەسەر شێوەیەکی تر کەبەرەو دەست کەوتنی شتەکانی ببات، وەك خوا دەفەرموێ ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾ البقرة ٢٨٦ وە ئایـەتی ﴿فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ الشورى: ٣٠ وە غەیری ئەو ئایەتانەی تر کە دان دەنێن بە خستنە پاڵی کەسب بەلای بەندەی خواوە کە هیچ زەروریەتێك نییە تەعلیقی توانا و قودرەت بدەیتە پاڵ ئەو کەسەوە یان ئەو شتەوە کە قودرەتەکە و تواناکەی بەلادا براوە ئەگەر هاتوو بە داهێنان بوو بەتەنها، چونکە قودرەتی خوای پەروەردگار لە ئەزەلدا پەیوەستە بە جیهانێکەوە پێش داهێنان و هاتنە پێشەوەی، کە ئەمە لە کاتی هاتنە پێشەوە و داهێنانەکەدا پەیوەست ئەبێ پێوەی بە شێوەیەکی تر لە پەیوەست بوون غەیری ئەو پەیوەستەی یەکەم...

## هەقیقەتی نسبەت دانی کردەوەکان بەلای بەندەکانەوە

لەوەی سەرەوە کە باسمان کرد دەردەکەوێ: کە نسبەت دانی قودرەت تایبەت نەکراوە بە هاتنە پێشەوەی ئەو شتەوە کە نسبەتەکەی بەلادا دراوە کە (المقدور بها)یە ، وە کردەوەی بەندەکانیش نسبەتیان دراوەتە پاڵ بەندەکان لە ڕێگەی کەسب و بەدەست هێنانەوەیە نەك لە ڕێگەی داهێنان و ئیختراعەوە، چونکە تەنها خوای پەروەردگارە کە داهێنەری شتەکانە و تەقدیریان بۆ دیاری دەکات و ئەیانخاتە سەر ئەو کردەوانە ، ئیتر نەهاتووە و نەوتراوە کە چۆن شتێك بێتە پێش کە نەهی لێکرا بێ چونکە ئەو فرمانە جیاوازی دەبێ لەگەڵ ئیرادەدا، بە بەڵگەی ئەوە کە فرمانی کردووە بە هەموو خەڵکی کە ئیمان و بڕوان بهێنن، ئیتر نەهاتووە لە زۆرییانەوە مەگەر لەبەر ئایەتی﴿وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ﴾ یوسف: ١٠٣.

ئیتر نسبەت دانی کردەوەکان بەلای بەندەکانەوە لە نسبەتی بەندەکانە بۆ لای هۆکارەکان یان واسیطەو پەیوەندارییەکان کە ئەمەش هیچ ڕێگرییەکی تیا نیە، چونکە سازدانی هەموو هۆکارەکان (مسبب الأسباب) هەر خۆی بەدیهێنەری واسیتە و ناوەندگیرییە، کە واتا و هێمای ناوەندگیرکەشی بەدیهێناوە، وە ئەگەر خودای گەورە ئەو هۆکار و ئامراز و ناوەندگیرییەی نەبەخشییایە بە بەدیهێنراوەکانی ئەوا هیچ ڕۆڵ و بەها و بایەخێك بۆ بەکارهێنانی ئەم هۆکار و واسیتانە نەدەما، بۆیە دەبینین ئەو ژێری و ئامرازانە بە تەنە بێ گیان و گەردوون و باران و ئاگر نەدراوە، کە دراوە بە فریشتەکان و مرۆڤەکان و پەرییەکان.

## جیاوازی مانا بە جیاوازی نسبەتی زاراوەیی

لەوە دەچێ تۆ بڵێی: ناگونجێ نسبەتی یەك کردار بدەیتە لای دوو بکەر لەبەر کۆنەبوونەوەی دوو کاریگەری لەسەر یەك شت..

دەڵـێین: بەڵێ وایـە و بـەو شـێوەیەیە کـە ئێـوە دەڵـێن، بـەڵام ئـەوە لـە کاتێکدایە کە یەك کردەوە تەنها یـەك مانـای هـەبێ لـە بەکارهێنانیـدا ، بەڵام ئەگـەر هـاتوو خـاوەنی دوو مانـا بـوو، ئـەو کاتـە بـە موجمـەلی لـەنێوان دوو بەکارهێناندا ڕادەوەستێ و هیچ ڕێگریەك نییە کە بەکاربهێنی بۆ یـەکێکیان ، هـەروەك زانـراوە بـۆ بـەکارهێنانی لـەو ناوانـەدا کـە هاوبەشـن لـەنێوان دوو شـتدا، یـان لـە هەقیقـەت و مـەجازدا وەك ئـەوترێت: ئـەمیر یـان پاشـا فڵانـە کەسـی کوشـت یـان ئـەوترێت: شمشـێر بەدەسـتەکە کوشـتی، کـە کـردەوەی کوشـتنەکە بـەکاردێت لەسـەر پاشـا کـە ئـەم بەکارهێنانـە لـە غـەیری مانـای خۆیایەتی چونکە پاشا یان ئەمیر تەنها فرمـانی کـردووە، یان ئـەڵێن خـوای گەورە کردەوەکان بە دەستی ئەوە بە مانای داهێنـراو و بونی کردەوەکە بە دەستی ئەوە ، یان ئـەڵێن دروسـت کراوەکە فڵان کـردەوەی کـرد، بـە مانـای ئـەوە کـە دروسـت کراوەکـە مـرۆڤ بـێ، شـوێنی ئـەو شـتەیە کـە خـوا خـەڵقی تیـاکردووە بـە قـودرەت و هێزێـك لـە دوای ئـەوە کـە خـەڵقی ئـیرادەی تیـا دروسـت کـردووە، وە لـە دوای ئـەوە کـە خـەلقی زانسـت و عیلمیشـی تیـا دروسـت کـردووە، دەبیـنین قـودرەتی پەیوەسـت کـردووە بـە ئـیرادەوە وە هەڵسـان و جوڵانـدنی پەیوەسـت کـردووە بـە قـودرەت و هێزێکـەوە کـە پەیوەنـدی مـەعلول بـە عیلەتـەوە دەکـات ، وە پەیوەنـدی داهێنـەر بـە داهێنراوەوە دەکات، ئەمە لە کاتێکدا کە بۆ عاقڵ بەکاربهێنێ ، خۆ ئەگەر وا نەبوو ئەوە موسەبیبەکان لەسەر سەبەبەکان کۆدەبنەوە و کەڵەکە دەبەستن ئـەو کاتـە دروسـتە کـە هـەر شـتێك پەیوەنـدی هـەبوو بـە قودرەت و هێـزەوە

ناوی بنیّ ی بکەر یان (فاعل) ، ئیتر پەیوەندییەکە لە هەر شوێن و پلەیەکدا بێ، ئەتوانی بە شمشێر بەدەستەکە بەلایەك بلّێ ی بکوژە، وە بە ئەمیرەکەش لەلایەکی تر بلّێ ی بکوژە، چونکە کرداری کوشتنەکە پەیوەندی بە هەردووکیانەوە هەیە، با پەیوەندی یەکە بۆ هەر یەکەیان بە شێوەیەکی جیاوازبێ، بەڵگەش لەسەر دروستی دوولای جیاواز بۆ یەك کردەوە بەیەك گەیشتنیان وەك نموونە دەهێنینەوە:

خوای پەروەردگار نسبەتی (الأفعال) جارێك ئەداتە لای فریشتەکان جارێکیش ئەیداتە پاڵ غەیری فریشتەکان لە بەندەکانی خۆی، وە جارێکیش نسبەتی ئەداتە پاڵ نەفسی خۆی وەك ئەفەرموێ:

﴿قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ﴾ السجدة: ١١

﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا﴾ الزمر: ٤٢

﴿أَفَرَأَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ﴾ الواقعة: ٦٣

یان لە ئایەتێکی تردا ئیزافەی (ئەفعال) ئەداتە پاڵی و دەفەرموێ ﴿أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاء صَبّاً . ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقّاً . فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبّاً﴾ عبس (٢٥,٢٧) .

﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً﴾ مريم: ١٧

﴿فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا﴾ الأنبياء: ٩١

کە لێرەدا ئیسنادی فووکردنی داوەتە پاڵ خۆی و کە لە ڕاستیدا جبرەئیلە (عليه السلام) فووەکە دەکات..

یان دەفەرموێ ﴿فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ﴾ القيامة: ١٨ کاتێ پێغەمبەر ﷺ گوێ ی لە قورئانەکە دەگرت کە جوبرەئیل بۆی دەخوێندەوە...

خوا دەفەرموێ ﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَـكِنَّ اللّهَ قَتَلَهُمْ﴾ الأنفال: ١٧ ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَـكِنَّ اللّهَ رَمَى﴾ الأنفال ١٧ کە سیفەتی کوشتنی داوەتە پاڵ نەفسی خۆی، هاویشتنەکەشی بۆ سەر نەفسی خۆی گێڕایەوە..

کە مەبەست لێرەدا ئەوە نی یە: کە نەفی هاویشتنەکە بۆیان پێغەمبەر بوو بێ ﷺ وە بە بەرد بوو بێ، بەڵکو بە مانای ئەوە هاتووە کە ئەوان نەیانکوشتوون و بەردە بارانیان نەکردوون بە مانایەك کە پەروەردگار ئیرادەی بووە لە کوشتن و هاویشتنەکە، کە ئەمە داهێنان و تەقدیرکردنە، کە ئەمە دوو مانای جیاوازن، وە جارێکیش نسبەتی کردەوەکە ئەداتە پاڵ هەردووکیان بەیەکەوە وەك خوا دەفەرموێ:

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوْاْ مَا آتَاهُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ سَيُؤْتِينَا اللّهُ مِن فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ...﴾ التوبة: ٥٩.

ڕوایەت کراوە لە خاتوو عائیشەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە خوای پەروەردگار هەرکات ئیرادەی کرد بە خەلق کردنی منداڵێك ، فریشتەیەك ئەنێرێ ئەچێتە ناو منداڵدانی ئافرەتەکە ئەو نوتفەیە بگرێ بە دەستی و پاشان شێوەی لاشەیی پێ بدا و بفەرموێ: ئەی پەروەردگار بە کوڕ بێ یان بە کچ؟ لاشەی ڕێك بێ یان لار و گێڕ؟ خوای پەروەردگاریش بەو شێوەیە ئیرادەی ئەکات ئەفەرموێ و فریشتەکەش بەو شێوە دەکات. وە لە گێڕانەوەیەکی تردا: فریشتەکە شێوەکەی دروست دەکات پاشان بەفوی خۆی ڕۆح دەکاتە لاشەکە و بە بەختەوەر و چاکەخواز یان بە بەدبەخت و زیان بەخش.

کاتێ کە لەمە تێگەیشتین:

ڕوون بۆوە بۆت کە کردەوە بەکاردێ لەسەر چەند شێوەیەکی جیاواز کە ناکۆکی لەنێوانیاندا نی یە، وە ئەم کردەوەیە جارێك نسبەتی دراوەتە پاڵ

بێ گیانەکان، وەك دەفەرموێ ﴿تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا﴾ إبراهيم: ٢٥، کە درەختەکە خۆی بەری خۆی ناهێنێ، وەك حەزرەت ﷺ فەرمووی بەو کەسەی کە خورمای دەخوارد (خُذْها، لَوْ لَم تأتِها لأتتك) فەرمووە کە وەك (طبراني و ابن حبان) هێناویانە وەری بگرە ئەگەر تۆش نەهاتیتایە بۆ خواردنی خۆی بۆ لای تۆ ئەهات.

خستنەسەری (الأتيان) هێنان جیاوازە جارێ بۆ لای پیاوەکەیە و جارێکیش لای خورماکەیە، بەو مانایە کە هاتنی خورمایەکە وەك هاتنی پیاوەکە نیە، کە هاتنەکە لە هەردوو بارەکەدا بە ئیعتباری جیاواز هاتووە و بە مانای مەجازیەکەیەتی، کە مەجاز لە هێنانی بۆ لای پیاوەکە بە مانای ئەوە کە خوای گەورە هێز و قودرەتی و ئیرادەی لەو کەسەدا خەلق کردووە تا بتوانێ بیهێنێ... وە هاتنی خورماکە بەو مانایەیە کە خوای گەورە هۆکاری بۆ ئەڕەخسێنێ تا بگاتە تۆ، وە لە ڕاستیدا بریتی یە لە ئیضافەی هێنان بۆ لای خوای گەورە لە هەموو بوارەکاندا...

هەروەك لە وەڵامی قارون بۆ موسای پێغەمبەر ﷺ کە وتی: ﴿قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي﴾ القصص:٧٨.

وە هەروەها وەك لە فەرموودەدا هاتووە کە دەفەرموێ (أَصبحَ مِنْ عبادي مؤمن بي وَكافر، فأما من قال: مُطِرْنا بِفَضلِ الله و رَحمَتِهِ فذلِك مؤمن بي كافر بالكوكب، وأما مَن قال: مُطِرنا نَبِؤ كذا و كذا، فذلِك كافرٌ بي مؤمن بالكوكب) ، واتە: لەبەندانی خوا دا هەیە ڕۆژ دەکاتەوە و باوەڕدارەو بێ دینیشە بەوەدا کە دەڵێ: بارانمان بۆ باراوە بە فەضڵ و ڕەحمەتی خوا، ئەوە باوەڕدارە بە خواو بێ باوەڕە بە ئەستێرەکان، وە ئەگەر وتی بارانمان بۆ باراوە بەهۆی هەڵهاتنی فلأن ئەستێرە و کەوکەبەرەوە ئەوە بێ باوەڕە بە ئێمە و ئیمانی بە ئەستێرەکان هەیە.

شـێخی نـەوەوی ئەفـەرموێ: (زانایـان ڕای جیاوازیـان هەیـە لەسـەر بێبـاوەڕی بـۆ ئـەو کەسـەی کـە دەڵـێ بارانمـان بـۆ بـاریوە بـەهۆی ئەستێرەکانەوە لەسەر دوو شێوە:

یەکـەم: ئـەوە بـێ بڕوایـە بـە خـوای میهرەبـان و ئەسـڵی ئیمـانی لێ سەنراوەتەوە، دەرچووە لە میللەتی ئیسلام، وتوویانە: ئەمە بۆ یەکێکە کە ئەو وتەیە بڵێ و باوەڕی تـەواوی وابـێ کـە ئەستێرەکان (فاعلُ مُدبر)ن و بارانەکـە لەوانەوەیـە، هـەروەکو هەنـدێ لـە خەڵکـە نەزانـەکان ئـەیڵێن، کـە هەرکەس ئەم بڕوایـەی ببـێ ئەوە بەبێ شك و گومان بێ بڕواو کافرە، کە ئەمـە فـەرموودەو ڕای گشـتی زانایـانی ئیسـلامە، لەوانـە پێشـەوا شـافعی (ڕەحمـەتی خـوای لەسـەر) کـە ئـەوە مانـای ڕوکەشـی فەرموودەکەیـە، وە وتوویانە: لەسەر ئەم ڕایە هەرکەس بڵێ: بارانمان بۆ بارا بەهۆی هـەڵهاتنی فلانە ئەستێرەوە، کە بڕواو عەقیدەی تـەواوی ببـێ کـە تـەنها خـوا خـاوەنی ڕەحمەتی فراوانە و ئەو هەڵهاتنە تـەنها کـات و نیشـانەیەکە کە بە عـادەتی خەڵکی دیاری کراوە، ئەوە وەك ئەوە وایە وتـووبێتی: بارانمـان بـۆ بـارا لـەو کاتەدا کە ئەو ئەستێرە هەڵهاتووە، ئەمە بێ بڕوا و کافر نابێ.

بـەڵام جیـاوازی ڕا لەسـەر ئەوەیـە کـە ئەمـە کەراهـەتی هەیـە، وە وتـەی (أظهر) لەسەر ئەوەیە، کە ئەم کەراهەتە بۆ تەنزیهە و گونـاهی لەسـەر نییـە، وە هۆکـاری ئـەو کەراهەتـەش ئەوەیـە کـە: لـەنێوان کـوفر و غـەیری کـوفردا بەکاردێت، لـەو کاتـەدا گومـان لەسـەر وتەبێژەکە دروسـت دەکـات، وە لەبـەر ئەوەشـە کـە ئـەو وتانـە یەکێکـە لـە وتـەکانی سـەردەمی نـەفامی و ئـەوان بەکاریان هێناوە.

دووەم: لە ئەسڵی تەئویل کردنی فەرموودەکەدا:

ئەمە مەبەست بە کوفر و کوفرانەکردنی نیعمەتەکانی خوای بالاّ دەستە کە تیایدا ئیزافەی کارەکان ئەدەی لە ئەستێرە، ئەمە بۆ یەکێکە کە باوەڕی وا نەبێ ئەستێرەکان تەدبیر ئەکەن، وە پشتگیری ئەم تەئویلەیە بە گێڕانەوەیەکی تر دەکەین کە لەم بەشەدا هاتووە، کە دەفەرموێ (أَصْبَحَ مِنَ النَّاسِ شاكِرٌ وَكافر)، لە گێڕانەوەیەکی تردا (ما أنعمتُ على عبادي نعمةً إلاّ أصبَحَ فريقٌ منهم بِها كافرين)، وە لە گێڕانەوەیەکی تردا (ما أنزَلَ الله تعالى مِنَ السماءِ مِنْ بَرِكَةٍ، إلاّ أصبَحَ فريقٌ مِنَ الناسِ بها كافرين)، کە وتەی (بِها) بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کوفری نیعمەتە... خواش زاناترە... هتد...

وەکو ئێوە دەبینن زاناکان لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون، ئەگەر نیسبەتی کردارێك بدرێتە پاڵ هۆکار و ناوەندگیرێك پێی کافر نابێ. مەگەر باوەڕی وابێ کە ئەو هۆکارە بکەرو کارساز و داهێنەری تەنهای ئەو کردارەیە، ئەگەر هاتووە ئەم هۆکارانەی بەم شێوەیە تێبینی نەکرد و هەروەکو ناوەندێك و نیشانەیەکی سادە و حاڵەتێکی ئاسایی زانی کە خاوەنی قەدەرەکان (جل جلاله) بەدیهێناوە ئەوە کوفر نیيە بەڵکو شەریعەتی خودا بە پەسەند کراو و مەندوب دیاری کردووە ، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە (د.خ) دیارە کە دەفەرموێ: (مَنْ أسدى إليكم مَعروفاً فكافئوهُ، فإنْ لم تستطيعُوا، فادعُوا لَهُ حتى تعلمُوا أنَكُمْ قد كافأتموُه)، هەرکەس فرمان و ئیشێکی چاکی بۆتان جێبەجێ کرد پاداشتی بدەنێ، ئەگەر نەتانتوانی ئەوە دۆعای خێری بۆ بکەن تا کابرا بزانێ کە ئێوە پاداشتان داوەتەوە.

وە لە فەرموودەیەکی تردا فەرمووی: (مَنْ لم يَشكرُ الناس لم يَشَكِرِ الله) هەرکەس سوپاس گوزاری خەڵکی نەکات ئەوە سوپاسی خواشی نەکردووە..

که لێرەدا ئەو خەڵکانە بە جێگەی ئەوە ئەوانی کە خاوەنی جۆبەجۆ کاری فرمانەکەی تۆیە نەك خواو سوپاسیشی دەکەیت.

وە لە قورئانی پیرۆزدا دەبینین کە خوای پەروەردگار ستایشی ئەو بەندانەی دەکات لەسەر ئەو کردەوانە کە دەیکەن و بە پاداشتی گەورە پاداشتیان ئەداتەوە، وەك لە چیرۆکی پێغەمبەر ئەیوب دا دەفەرموێ ﴿نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ ص:٣٠، یان پاداشتی ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ یونس:٢٦، وە یان دەفەرموێ ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا﴾ الشمس:٩.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە فیعل و کردەوە بەکارهاتووە بۆ چەند شێوەیەکی جیاواز، کە هیچیان بەرانبەری (دژایەتی و ناکۆکی) ماناکانی تر ناکات، ئەگەر بێتو بە جوانی و دروستی لێی تێبگەیت.

ماناکان فراوانترن لە دەربڕینەکان، ئەوەی لە سینەدایە فراوانتر و زۆرترە لەوەی کە دەخرێتە سەر کاغەز، کە ئەگەر بوەستین لەسەر هەقیقەت و ماهیەتی وتەکان بەبێ بەکارهێنانی مەجاز، ئەوە ناگەیتە هیچ ڕاستیەك مەگەر ئەو ڕاستیەی بڵێین: (دەقەکانمان کۆکردەوە و جیاوازیمان خستە نێوان ئەو شتانەوە کە دروستن)، ئەی نابینی کە خوای پەروەردگار هەواڵ ئەدا لە چیرۆکی ئیبراهیم پێغەمبەرداو دەفەرموێ: ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ﴾ إبراهيم:٣٦، خوایە ئەوانە زۆریان لە خەڵکی گومڕا کرد، یان دەبینی ئیبراهیم هاوەڵی بۆ خوا بڕیاردا لە شتێکدا کە بێ گیانە، وە وتی ﴿أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ . وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ الصافات: ٩٥-٩٦.

لەنێوان ئەمانەدا ئەوە کۆدەبێتەوە کە بڵێین: هەرکەس هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات لە شتێکدا کە داهێنراوی و کاریگەری هەبێت، ئەوە موشریکە، جا یەکسانە بێ گیان بێ، ئادەمی بێ، پێغەمبەر بێ و هەر شتی تر بێ، وە هەرکەس بڕوای وابێ کە ئەو شتەیە خوا بەهۆی هۆکارێکەوە کە بۆی

هێناوەتە پێش، کە فاعیل تەنها خوای پەروەردگارە هیچ هاوەڵی نییە، وە ئەو کەسەش ئیمانداره و یاساکانی خوا بەجێدێنێ، ئەمە بە موسوڵمان دادەنرێ، با هەڵەیەکیش بکات لە گومانێکیدا بەرانبەر بە سەبەب و هۆکارەکە، نەك هەڵەکە و گومانەکەی لە خالیق بێ –جل شأنهُ....

## بەرزڕاگرتن لەنێوان بەندایەتی و ئەدەب دا

زۆرێك لە خەڵکی دەکەونە ئەو هەڵەوە لە تێگەیشتنی لە ماهیەتی تەعظیم و بەرزڕاگرتن و هەقیقەتی بەندایەتی، کە لە نێوان ئەم دوو شتەدا زۆر شت تێکەڵ دەکەن، وا دەزانن کە هەر جۆرێکی بەرزڕاگرتن دەبێتە بەندایەتی و بەگەورە دانانی بەرانبەر، وەك هەڵسان لەبەر کەسێکی تر: دەست ماچ کردن، بەرزڕاگرتنی پێغەمبەر ﷺ بە وتنی وتەی (سیدنا ، مولانا)، یان وەستان بەرانبەر مەرقەدی موبارەکی بە نیەتی زیارەت بە شێوەیەکی ئەدەب و گەردن کەچی، ئەمانە هەموو لای ئەوانە زیادەڕەوییەو غلووە و دەبێتە بەندایەتی بۆ غەیری خوا، کە ئەمە لە هەقیقەتدا نەزانین و نەفامی و کەللە ڕەقیە، کە خوا هەرگیز پێی ڕازی نابێ، وە پێغەمبەر ﷺ وای نەفەرمووە، وە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام هیچ دەقێکی لەم شێوەی نەهێناوە.

ئەوە باوکە ئادەم، یەکەم ڕەگەزی مرۆڤ، یەکەم بەندەی بۆ خوا صوڵحاو لەم ڕەگەزەدا، خوا فرمانی کرد بە سەرجەم فریشتەکان کە کڕنوش و سوجدەی ئیکرام و ڕێزلێنانی بۆ ببەن، وەك ئاماژە و بانگەوازێك بە هەڵبژاردنی ئادەم (علیه السلام) لەنێوان هەموو بەدیهێنراوەکانی تردا بەو زانستەی کە پێی بەخشی بوو ، وەك فەرمووی: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إَلاَّ إِبْلِيسَ قَالَ أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِيناً . قَالَ أَرَأَيْتَكَ

هَذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ....﴾ الأسراء: ٦١-٦٢، له ئايەتێکی تردا: ﴿قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾ ص: ٧٦، وه له ئايەتێکی تردا ﴿فَسَجَدَ الْمَلآئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ . إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى أَن يَكُونَ مَعَ السَّاجِدِينَ﴾ الحجر: ٣٠-٣١.

فریشتەکان هەموویان ئادەمیان بەرز ڕاگرت لەبەر فرمانی بەرز ڕاگرتنی خوایی بۆ ئادەم، وه ئیبلیس خۆی بە زلزانی و کڕنوشی نەبرد بۆ کەسێ کە لە قوڕ دروستکراوە، ئەوە یەکەم کەسێ بوو لە مەخلوقانی خوا کە سەرپێچی فەرمانی خوایی کرد، وه وتی: من باشترم لەو، سوجدەی نەبرد و ڕێزی لێ نەگرت، ئەوە یەکەم خۆبەزلزانێ بوو وه یەکەم کەسێ بوو کە سیفەتی تەکەبوری بەسەر خوادا دروست کرد، خواش لە ڕەحمەتی خۆی دەری کرد لەبەر خۆ بەگەورە دانانی بەسەر یەکێ لە بەندە چاکەکانی خوا، کە ئەوە تەکەبوریش بوو بەسەر خواوە، چونکە کڕنوش تەنها بۆ خوا دەبرێ کە تەنها خواش فرمانی کرد کە بۆ ئادەم ببرێ، کە ئەم سەجدە و کڕنوشە کڕنوشی ڕێزلێنان و بەرزڕاگرتن بوو، ئەنیا ئادەم یەکێکە لە بەندانی خوا و لە یەکتاپەرستانە...

## وه ئەوەی لە دەقەکاندا هاتووە لەسەر ڕێزلێنان و بەرزڕاگرتنی پیاوچاکان

خوای پەروەردگار لە چیرۆکی پێغەمبەر یوسف دا (علیه السلام) دەفەرموێ ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّواْ لَهُ سُجَّداً﴾ یوسف: ١٠٠، کە ئەمە تەحییە و ڕێزلێنان و بەرز ڕاگرتن بوو بۆیان، وه کڕنوش و سەجدەی براکانی بۆی، بەڵگەن لەسەر فەرموودەی قورئان (وَخَرُّوا)، ئەمە لەوە دەچێ لە شەریعەتی ئەواندا دروست بوو بێ، هەروەك سەجدەی مەلائیکەکان بۆ

ئادەم وایە و جێبەجێ کردنی فەرمانی خوای باڵادەستە، وە تەئویلێکیش بوو بۆ خەوەکەی یوسف پێغەمبەر چونکە خەوی پێغەمبەران ڕاستە و جۆرێکە لە سروش (وحي)...

وە سەبارەت بە حەزرەتی محمد ﷺ خوا لە هەقیدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً . لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾ الفتح: ٨ ، ٩، بنوارە دەفەرموێ ﴿وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ﴾، وە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ الحجرات:١، وە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ...﴾ الحجرات: ٢، ئەم سێ ئایەتە و ئایەتی: ﴿لا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُم بَعْضاً﴾ النور: ٦٣، کە نەهی دەکات لە خزمەت ئەو پێغەمبەرەدا ڕابوەستی و خراپی بێ ئەدەبی بەکاربهێنێ و پێش پێغەمبەر ﷺ قسە بکەیت.

سهل کوڕی عبدالله دەفەرموێ: مەڵێن: پێش وتەکانی پێغەمبەر ﷺ واتە لەپێش پێغەمبەردا ﷺ هیچ شتێك مەڵێن، وە کە فەرمایشتی کرد گوێی بۆ شل بکەن و لێی تێبگەن...

وە وتراوە: ئایەتەکە بە مانای ئەوە هاتووە کە هیچ جۆرە فرمانێك دەرمەکەن تا پێغەمبەری خوا فرمان دەرنەکات، وەك کاتێ چوون بۆ جیهاد و شەڕی کافران وە ئایەتی ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ الحجرات:١، کە (السُلمي) دەفەرموێ: (خواتان بپارێزن لەو شتانەدا کە ئیهمالی تیابێ بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ و بەرانبەر فەوتاندنی حورمەتەکانی، پاشان نەهیتان لێ دەکات لە دەنگ بەرزکردنەوە بەسەر دەنگی پیرۆزیدا) ...

وە بانگی ئەو پێغەمبەرە مەکەن هەروەك خۆتان لەناو خۆتاندا یەکتری بانگ دەکەن، (أبو محمد مكی) دەڵێ: واتە لەپێش ئەو پێغەمبەرەوە قسە مەکەن، وتاری لێ تێك مەدەن، بەناوی خۆیەوە بانگی مەکەن وەك لەنێوان

خۆتانا یەکتری بانگ دەکەن، بەڵکو بەرز ڕایبگرن و ڕێزی لێ بگرن، وە بە بەڕێزترین ناوەوە بانگی بکەن وەك: (یا رسولَ الله، یا نبي الله، ...) کە ئەمەش مانای ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێ: ﴿لَا تَجْعَلُوا دُعَاء الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاء بَعْضِكُم بَعْضاً﴾ النور: ٦٣..

کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو لە هەقی ئەو کۆمەڵەدا کە هاتن بۆ خزمەتی و هاوریان کرد: ئەی موحەمەد وەرە دەرەوە بۆلامان، خواش زەمی کردن و بە نەزان و جاهیل وەسفداری کردن بەڵکو فەرمووی زۆر لەوانە عەقڵیان پێ ناشکێ...

عەمری کوڕی عاص دەڵێ: (هیچ کەس نەبوو لە پێغەمبەری خوا زیاتر لەلام خۆشەویستر بێ وە تێر بە چاوەکانم لەبەر ڕێز و حورمەتم نەمتوانیوە سەیری ناوچەوانی بکەم، ئەگەر یەکێ بڵێ وەسفی پێغەمبەرم ﷺ بۆ بکە، ناتوانم چونکە تێر بە چاوەکانم نەمتوانیوە بۆی بنواڕم)[١] .

وە شێخی ترموزی ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە حەزرەت ﷺ دەهاتە ناو هاوەڵانی لە کۆچ کردوان و ئەنصارەکان کە ئەوان دانیشتون، کە ئەبوبەکر و عومەریان لەناودابوو، کەسیان نەیانتوانی چاو بەرزبکەنەوەو سەیری پێغەمبەری خوا بکەن تەنها ئەم دوو هاوەڵە نەبێ، کە ئەمان سەیری دەم و چاو و ڕوخساری پێغەمبەریان دەکرد و پێغەمبەریش سەیری ئەوانی دەکرد و بەدەم یەکترەوە زەردەخەنەیان دەکرد...

---

[١]- ئیمامی مسلم ڕیوایەتی کردووە لە (کتاب الأیمان) باب- کون الأسلام یهدم ما قبلَهُ) .

وه ئوسامەی کوڕی شەریك دەگێڕێتەوە کە (هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە خزمەتیا بوون هەروەك باڵندە بەسەر سەریانەوە وەستا بێ ئاوا بون...

وە لە سیفەتی پێغەمبەر ﷺ بوو کە هەرکات وتەی بفەرمووایە سەرنجی دانیشتوانی ڕادەکێشا و وەك تەیر لەسەر سەریان بێ وا دەبوو.

عروەی کوڕی مسعود دەڵێ: کاتێ ساڵی (القضیة) بوو قورەیشیەکان هاتنە خزمەتی بینیان چۆن هاوەڵانی ڕێزی لێ دەگرن بە شێوەیەك کە دەست نوێژ دەشوات پێشبڕکێ و شەڕ دەکەن لەسەر ئاوی دەست نوێژی، چۆن نایەڵن تفی موبارەکی بکەوێتە زەوی و بە دەستەکانیان دەیگرنەوە و ئەیهێنن بە دەم و چاو و لاشەیاندا، چۆن مویەك لە قژی موبارەکی بکەوێ ئەیبەن و ئەیپارێزن، چۆن بۆ جێبەجێ کردنی فرمانەکانی هەموو لەپێشن، چۆن کاتێ وتەی دەفەرموێ دەنگیان نزم دەکەنەوە و بە ئەدەبەوە گوێبیستی دەبن، قوڕەیشیەك کە گەڕایەوە وتی:

ئەی قوڕەیشیەکان، من کیسرام لەسەر کورسی پاشایەتی خۆی دیوە، قەیصەرم لەسەر تەختی پاشایەتیەکەی دیوە، نەجاشیم لە موڵکی خۆیدا دیوە، وەڵڵاهی هیچ مەلیکێکم لەناو هۆزەکەی خۆیدا نەدیوە لە وێنەی موحەمەد لەناو هاوەڵانیدا)

وە لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (هیچ پاشایەکم نەدیوە کە قەومەکەی بەرز ڕایبگرن وەك قەومی محمد کە پێغەمبەرەکەیان بەرز ڕادەگرن، قەومی وام دیوە تەنانەت سەلام لە پاشاکەشیان ناکەن...).

طەبەرانی و ابن حبان لە (صحیح)ەکەیدا دەریان کردووە، لە ئوسامەی کوڕی شەریکەوە (ڕەزای خوای لێبێ) وتی: دانیشتبووین لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ وەك باڵندە لەسەر سەرمان بێ وابوو، کەس لە ئێمە قسەی

نەدەکرد، کاتێ کەسێ بهاتایە بۆ لای و بیوتایە: لە عەبدانی خوا کێ خوا زۆر خۆشی دەوێ؟ ئەیفەرموو: ئەوەیان کە ڕەوشتی لە هەموویان جوانترە (أحسنهُم خُلُقا)[1]..

ئەبو یەعلی گێڕاویەتەوە و بەڕاستی داناوە لە بەرائی کوڕی عازبەوە (ڕەزای خوای لەسەر) دەڵێ: من ویستم پرسیارێك لە پێغەمبەر ﷺ بکەم لە شتێکدا، بۆ ماوەی دوو ساڵ لەبەر هەیبەتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دوام خست..

ئەلبەیهەقی لە زوهەریەوە هێناویەتی دەڵێ: کاتێ ئەنصار لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کە دەسەت نوێژی دەشت یان تفی موبارەکی فڕێ ئەدا هەڵیان دەگرتەوە و ئەیانهێنا بە دەم و چاو و لاشەیاندا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێیان (لم تفعلون هذا؟) بۆچی وا دەکەن؟ ئەیان وت: (نلتمِسُ بهِ البركةَ) بەرەکەتی لێ وەردەگرین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (کێ پێی خۆشە خواو پێغەمبەری خوا خۆشی بوێ با ڕاستگۆ بێ و ئەمانەت بپارێزێ و ئەزیەتی دراوسێ نەدات)[2].

**بە کورتی:**

لێرەدا دوو فرمانی گەورە هەیە پێویستە تێبینیان بکەین:

یەکەم: پێویست بوونی تەعظیم و بەگەورە دانانی و ڕێز لێگرتنی و بەرزکردنەوەی پلەی پێغەمبەر ﷺ بەسەر هەموو مەخلوقاتی خوادا...

دووەم: ڕبوبیەتی تەنها و باوەڕ بوون بەوە کە خوای پەروەردگار لە زات و سیفات و کردەوەکاندا بەسەر هەموو مەخلوقاتی خۆیدا سیفەتی تاك و تەنهایی هەیە، کە هەرکەس بڕوای وابێ کە یەکێ لە دروستکراوانی خوا

---

[1]- بەم شێوە لە (الترغيب)دا هاتووە ع/١٨٧، وە دەڵێ: طەبەرانی ڕیوایەتی کردووە.

[2]- بەم شێوە لە (الكنز)دا هاتووە ٢٢٨/٨.

بەشداری کارو سیفات و زاتی خوا دەکات ئەوە بە موشیرك دادەنرێ و هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوە، وەکو ئەو موشیرکانەی لێ دێ کە باوەڕیان وابوو بتەکان خوان و جێگەی پەرستنن، وە هەر کەسیش لە مەرتەبەی پێغەمبەر ﷺ کەم بکاتەوە ئەوە گوناهبارە یان بێ بڕوایە پێی.

بەڵام ئەوەش کە زۆر زیادەڕەویی دەکات لە تەعظیم و مەزن کردن و بەرزڕاگرتنی پێغەمبەر ﷺ بە هەرکام لە شێوەکان و وەسفداری ناکات بە سیفاتی خوا، ئەوە ڕاستی پێکاوەو پارێزگاری لەلایەنی ڕبوبیەت و پەیامەکەی کردووە، کە ئەمە مانای ئەو وتەیەیە دەبێ کە دەڵێ: ئیفراط و تەفریط (توندگیر و شل گیری) تیا نییە.

وە ئەگەر لەناو وتەی باوەڕدارانده وتەیەکمان بینی کە ئیسنادی شتێ بوو بۆ لای غەیری خوا، ئەوە پێویستە بیگێڕینەوە سەر مەجازی عەقلی و پێویست ناکات بە کافر و بێبڕوای بکەین، چونکە مەجازی عەقلی بەکارهاتووە لە قورئان و لە سوننەتدا..

## ناوەندگیری هاوبەش دانان ( الواسطة الشركية )

زۆر لە خەڵکی لە هەقیقەتی ناوەندگیری بەهەڵەدا چوون، فەرمانێکی وشك و ناڕەوا دەردەکەن کە هەموو ناوەندگیریەك هاوبەشی دانانە، وە هەر کەسێك هەر ناوەندگیریەك بە هەر شێوەو چۆنایەتیەك بکات ئەوە هاوبەش و هاوەڵی بۆ خودا داناوە، کاروباری ئەم ناوەندگیرانەش وەکو حاڵی هاوبەش دانەران وایەو ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکەن بە پاساوی حوکمی ناڕەوایان ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ الزمر:٣، کە بەڵگە هێنانەوە بەم ئایەتە پەسەند نیەو لەجێی خۆیدا نیە، چونکە هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە زۆر ڕوکەشە و ڕوونە کە لە ئینکاری کردنی بێ

باوەڕان دایە بۆ نەپەرستنی بتەکانیان، بە شێوەیەك کە بتەکانیان کردبووە خواو ئەیانپەرست، کوفر و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانەکەیان لەوەدا بوو کە بتەکانیان ئەپەرست و ئەیانوت کە ئەم پەرستنەمان بۆ نزیك بوونەوەمانە لە خوای گەورە، کە ئەمە مانایەکی تەواوی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە...

لێرەدا وتەیەکی گرنگ هەیە پێویستە باس بکرێ:

ئەم ئایەتە خۆی بۆ خۆی شایەتی ئەدات لەسەر حاڵی ئەو موشیرکانە کە هەرگیز ڕاستیان نەکردووە لەسەر ئەو وتەیەی کە وتویانە: ئێمە کە دەیانپەرستین تەنها بۆ نزیك بوونەوەمانە بۆ لای خوای پەروەردگار، ئەگەر ئەوانە ڕاستیان بکردایە و نەیانپەرستنایە و تەنها بە هۆکارێکی واسیتەیی بەکاریان بهێنایە ئەوە بەو شێوە نەدەبوو، چونکە خوای پەروەردگار نەهی کرد لە موسوڵمانان کە وتەی ناشرین و جنێو بدەن بە بتەکانیان بۆ ئەوەی دەمارگیری نەیانگرێ و وتەی نابەجێ بەرانبەر بە خوای موسوڵمانان دەرنەبڕن وەك فەرمووی:

﴿وَلاَ تَسُبُّواْ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ فَيَسُبُّواْ اللّهَ عَدْواً بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾الأنعام: ١٠٨

ڕیوایەت کراوە لە عبدالرزاق و عەبدی کوڕی حومەید و ئیبن جورەیرو ئیبن مونذر و ئیبن أبی حاتەم و ئەبو الشیخ لە قەتادەوە (ڕەزای خوای لەسەر) کە گێڕاویەتەوە: (موسوڵمانان وتەی نابەجێیان بە بتەکانی کافرەکان دا، ئەوانیش لە بەرانبەردا وتەی نابەجێیان بە خوای گەورە وت، خواش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

﴿وَلاَ تَسُبُّواْ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللّهِ فَيَسُبُّواْ اللّهَ عَدْواً بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ الأنعام: ١٠٨. کە ئەمە هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەیە.

که تیایدا نەهی کرد لە باوەڕداران بە نەهیەکی تەحریمی بەهێز کە نابێ وتەیەك بڵێین کە نزمی و سوکایەتی تیابێ بەرانبەر بەو بەردە کە ئەوان ئەیپەرستن و چوار دەوری مەککەی پیرۆزیان لێ پڕ کردووە، چونکە وتنی ئەم جۆرە وتانە توڕەبوونی ئەو بێ بڕوایانە بەرزدەکاتەوە، لە کاتێکدا لەناو کرۆکی دڵیاندا چەسپاوە کە ئەو بەردەیە خوای خێر و شەڕی ئەوانە، بۆیە بەرەنگار دەبنەوە و بەم کارەشیان وتەی نابەجێ بەرانبەر بە خوای بالادەست دەڵێن، بە شێوەیەك نوقستانی ئەدەنە پاڵ خوا لە کاتێکدا کە خوا پاك و مونەزەهە لە هەموو کەمیەك، خۆ ئەگەر ئەوان ڕاستیان بکردایە کە ئەوە بۆ نزیك بوونەوەیانە لە خوای گەورە، ئەوە هەرگیز بەو شێوە دەمارگیری نەیدەگرتن و هێرشیان بە وتەی ناشرین نەدەکردەوە سەر پەروەردگاری موسوڵمانان. کە ئەمەش نیشانەیە لەسەر ئەوە کە ئەو خوایە (الله) لە دڵی ئەواندا زۆر کەمتر بووە لەو بەردەی کە پەرستویانە..

وەیان دەبینین کاتێ لێیان دەپرسین: کێ خالقی زەوی و ئاسمانەکانە ئەیانووت خوا ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ لقمان: ٢٥. ئەوانە گەر ڕاستیان بکردایە و ئیعتیقادی تەواویان بوایە بەخوا کە خالقی هەموو ئەرز و ئاسمانەکانە، ئەوە بەندایەتیان تەنها بۆ خوا دەبوو، نەك لە دارو بەردێك خۆیان بە دەستی خۆیان دروستی بکەن و لەسەر خوای گەورەش بەرزی بکەنەوە، ئەوانە خوای گەورە لە دڵیاندا زۆر کەمترە لەو بەردانە، ئەوەتا خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُواْ لِلّهِ مِمِّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالأَنْعَامِ نَصِيباً فَقَالُواْ هَـذَا لِلّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَـذَا لِشُرَكَآئِنَا فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلاَ يَصِلُ إِلَى اللّهِ وَمَا كَانَ لِلّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَى شُرَكَآئِهِمْ سَاء مَا يَحْكُمُونَ﴾ الأنعام: ١٣٦. ئەگەر لە نەفسیاندا ئەو بەردە گەورەتر نەبووایە لە خوا ئاوا بەرزیان نەدەکردەوە و تەرجیحیان نەئەدا، کەواتە خوای گەورە ئەو حوکمە

جوانــه ئــەدا بــە ســەریاندا کــە شـیاوی بــن کــە دەفــەرموێ ﴿سَــاء مَــا يَحْكُمُونَ﴾الأنعام: ١٣٦.

وه لـه نموونـەی ئەمەیه وتـەی ئەبوسوفیان پێش موسـوڵما بوونی وتـی: (أعلُ هُبَل)[١]، کە بتەکـەی خۆیـان کە نـاوی هوبەلە بـەرزی بکەنـەوه بەسـەر پـەروەردگاری زەوی و ئاسمانـەکان، کـە لەوپـەڕی ناڕەحـەتی جەنگدایـەو ئەیـەوێ بـەهۆی هوبەلـەوه خـۆی و سـوپاکەی سـەرکەون و موسـوڵمانەکان بشـکێنن، ئەمـە و ئـەو ئاسـتی تێگەیشـتنەیه کـە موشـریکەکان بیریـان لێ کردۆتەوە، ئەو تێگەیشتنەیه بەرانبـەر بە بتـەکانیان، کە بتـەکانیان سوپای موسـوڵمانەکان بشـکێنێ، نـەك خـوای موسـوڵمانەکان... کـە ئـەم ڕاسـتیه خەڵکی لێ ی بێ ئاگان و پێویستە ڕاست بکرێنەوه..

ئەی نابینی کاتێ خوای پەروەردگار فرمانی کرد بە موسوڵمانان کە لـه نوێژەکانیانـدا ڕوو لـە کەعبـە بکـەن، واتـە بەندایەتیەکانیان بـەڕووی کەعبـە بخوێنن و بیکەنـە قیبلـە بـۆ خۆیـان، نـەك عیبـادەت و بەندایـەتی بـۆ کەعبـە بکەن، ماچی و زیارەتی کەعبە و بەردە ڕەشەکە بریتـی یـه لـه بەندایـەتی بۆ خوا و شوێن کەوتن و ئیقتدایـە بـە حـەزرەتی پێغەمبـەر ﷺ و ئـال و شـوێن کەوتوانی، خـۆ گـەر یـەکێ لـە موسـوڵمانان بەنیـەتی بەندایـەتی و عیبـادەت ڕوو لـە کەعبە بکـات یـان ماچـی بـەردە ڕەشـەکە بکـات، ئـەوە بـە موشـریك دادەنرێ و وەك بتپەرستەکانی لێ دێت..

کەواتە (واسیتە و ناوەنـدگیری) وەرگـرتن لـە بەندایەتیەکانمانـدا شـتێکی پێویستە و بەبێ ئەوە ناکرێ، ئەمە شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان نیـیـە، هەرکەس واسیتەیەك بخاتە نێوان خۆی و پـەروەردگاری نابێ بە موشـریك، خۆ گەر وابوایە ئەوە سەرجەم خەڵکی دەبوایە هاوەڵیـان بـۆ خـوا بڕیاردایـە،

---

[١]- ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

چـونکه سـەرجەم فرمانـەکانیان لەسـەر پەیوەنـدو واسـیتە وەرگـرتن ڕاوەسـتاوە، حـەزرەتی پێغەمبـەر ﷺ قورئـانی وەرگـرت بـە هۆکـاری جبرەئیلـەوە، کەواتـە جوبرەئیـل واسـیتەیە بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ وە پێغەمبـەر ﷺ واسـیتەیەکی گەورەیـە بـۆ هـاوەڵان و صـەحابەکان (ڕەزای خوایان لەسەر) کە ئەو هاوەڵانە لە کاتی ناڕەحەتیەکانیاندا هاواریان بۆ پێغەمبەرەکەیان دەبـردو شـکاتی حـاڵی خۆیـان لـە خزمەتیـدا دەکـرد و ئـەیانکردە وەسـیلە بـۆ خزمـەتی پـەروەردگاریان، وە داوای دۆعایـان لـە پێغەمبـەر ﷺ دەکرد حەزرەت ﷺ نەیفەرموو پێیـان: موشریك بـوون یان لـەدین دەرچـوون وە نەیفـەرموو: شـکایەتی بـۆ لای مـن دروسـت نییـە، نەیفەرموو داوای دۆعام لێ مەکەن، وە نەیفەرموو: بڕۆن بۆ خۆتان بپاڕێنەوە خوا نزیکترە لێتان تا من، نەخێر، بەڵکو ڕادەوەستا و دەپاڕایەوە بۆیان و دڵخۆشـی دەکـردن لـە کاتێکـدا هـەموو زانسـتیان هـەبوو بـەوە کـە خـوا بەخشندەیە و بەخشـدەری هەقیقیـیە، وە خـاوەنی (الباسـط و الـرزاق)ە، وە پێغەمبەرﷺ بە ئیزنی خوا دەبەخشێ کە ئەیفەرموو: (إنما انا قاسمٌ واللهُ يُعطي) خـوا دەبەخشـێ و مـن بەشـی دەکـەم، بـەهۆی ئـەم وتـەوە دروسـتە وەسـفداری مرۆڤێکـی سـادە بکـەیت بـەوە کـە ئیشـەکانمان بـۆ جێبـەجێ دەکات یان ناڕەحـەتی لەسـەر هەڵدەگرێ، واتـە کە ئـەوە بووەتـە واسیتە لـە هـەردوو حاڵەتەکـەدا، ئەمـە بـۆ مرۆڤێکـی سـادە ئـەبێ بەرانبـەر گـەورە و ڕێزدار و پێغەمبەری ئاخر زەمـان، کە ناسـراوە بە (سـید الثقلین) و (أفضلُ خلقِ الله) ئەبێ چۆن واسیتەیەك بێ؟ ئەی پێغەمبـەر ﷺ وەك لـە –صـحیح– دا هاتووە نەیفەرمووە: (مَنْ فَرَّجَ عَنْ مؤمِن كَرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُنيا...) یـەکێ ناڕەحەتیەکی دونیایی لەسەر شانی موسڵمانێ هـەڵبگرێ... کەواتـە مانـای وایە ئیماندار سیفەتی(مُفَرِّج الكُرباتِ)ی پێ بەخشراوە...

ئەی خۆشەویست نەیفەرمووە: (مَنْ قضى لأخيهِ حاجةً، كنتُ واقفاً عند ميزانه، فإن رجَحَ وَالا شفعتُ لَهُ)...

هەرکەس ئیشی برایەکی موسوڵمانی جێبەجێ بکات یان بۆی ئاسان بکات، ئەوە من لەسەر کێشانە و پێوانەی قیامەتی ڕاوەستاوم ئەگەر سووک بوو شەفاعەتی بۆ دەکەم) کەواتە مانای وایە ئیماندار سیفەتی (قاضٍ للحاجات)ی پێ دراوە...

ئەی نەیفەرمووە: (من ستر مسلماً...) فەرموودەکە

یان نەیفەرمووە: (إنَّ للهِ عزوجل خَلْقاً يُفزَعُ إليهم في الحوائج) خوای پەروەردگار کۆمەڵی دروستکراوانی هەیە لەکاتی نارەحەتیەکاندا بە هانای خەڵکەوە دێن...

ئەی نەیفەرمووە: (وَاللهُ في عَونِ العبدِ مادامَ العبد في عون أخيه) خوا بە هانای بەندەی خۆیەوەتی مادەمێ ئەو بەندە بە هانای براکەیەوە بێ.

ئەی نەیفەرمووە: (مَنْ أغاثَ ملهوفاً، كتبَ اللهُ لَهُ ثلاثاً و تسعونَ حسنة)[1]

باوەڕدار بەپێی ئەم فەرموودانە لابەری غەم و هاوکار و فریادڕەس و بڕیاردەر و داپۆشەری هەڵە و پەڵەو... چەند سیفەتێکی تریشە کە پەروەردگار پێی بەخشیوە، بەڵام دڵنیان کە لابەری غەم و یارمەتیدەر و فریادڕەس و داپۆشەری خەوش و هەڵەکان، بڕیاردەری ڕاستەقینە بۆ هەموو کار و سیفەتەکان تەنها هەر خودای گەورەیە (جل جلاله)، بەڵام کاتێك کە ناوەندگیرێك (واسطة) دێتە کایەوە دروستە نسبەتی ئەو کارە بدەی لە بەدیهێنراوانی خوا (جل جلاله).

لە زۆر لە فەرموودەکانی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺدا هاتووە، کە ئەو سوودە دەگەیەنن کە خوای پەروەردگار سزا و عەزاب لەسەر خەڵکی زەوی

---

[1]- بیهقی و بەزار و ئەبو یەعلی ڕیوایەتیان کردووە.

لادەبات بەهۆی لێخۆشبوونیان، یان مزگەوت دروستکردنیان، وە خوای پەروەردگار ڕزق و ڕۆزیان بۆ ئەنێرێ بەهۆی ئەو بەندانەوە کە چاکە خوازن لەناویاندا عەزاب و بەڵایان لەسەر هەڵدەگرێ بەهۆیانەوە.

طبراني ڕیوایەتی کردووە لە (الكبير)، وە بەیهەقی لە (السنن)دا هێناویانە لە (مانع الديلمي)یەوە (ڕەزای خوای لەسەربێ) کە دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: (لولا عِبادُ اللهِ رُكَعُ، وَصُبيَةُ رَضَّعُ، وَبهائِمُ رُتَّعُ، لَصُبَّ عليكمَ العذابَ صَبَاً، ثُمَ رَضٌ رضّاً) .

ئەگەر بەندە ڕاستەکانی خوا نەبن کە بەردەوام لە بەندایەتیدان، وە منداڵە شیر خۆرەکان نەبن، وە ئاژەڵە بێ زوبانەکان نەبوانایە، سزا لە یەك بەدوای یەك دائەباریە سەرتان.

وە (بوخاری) ڕیوایەتی کردووە لەسەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە (ڕەزای خوای لەسەر) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هَلْ تُنْصَرونَ وَ تُرزَقونَ اَلاّ بِضُعَفائِكمْ)، ئایا ئێوە سەردەکەون و ڕزق و ڕۆزیتان بۆ دێ مەگەر بەهۆی بێ هێزەکانتانەوە نەبێ..

وە تورمزی و حاکم ڕیوایەتیان کردووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لَعَلَكَ تَرْزَقُ بهِ) بەڵکو بەهۆی ئەوەوە خوا ڕزق بدات..

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوای لەسەر) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهِ عزوجل خلقاً خلقَهُمْ لِحوائجِ الناس يَفزَعُ إليهم الناسَ في حوائِجهم أولئك الآمنون من عذاب اللهِ تعالى)[1] .

بۆ خوای پەروەردگار هەیە کۆمەڵێ دروستکراو، کە خەلقی کردوون بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستی خەڵکی، کە خەڵکی لە کاتی ناڕەحەتیەکانیان هاوار بۆ لای ئەوان دەبەن، ئەوانە ئەمینن لە سزای خوای پەروەردگار...

---

[1]- طبراني ڕیوایەتی کردووە لە (الكبير)دا وە (أبو نعيم و قضاعي) یش هێناویانە .

له جابری کوڕی عبدالله وه (ڕەزای خوایان لەسەر) کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ الله لَيُصلح بِصلاح الرجل المسلم ولده و ولد وَلَده، وَأهلَ دويرته و دويرات حوله، وَلا يزالون في حفظِ اللهِ عزوجل مادامَ فيهم)[1] .
خوای پەروەردگار بەهۆی چاکێتی پیاوێکی موسوڵمانەوە ئیصلاحی کوڕەکەی و کوڕی کوڕەکەی ئەکات، ئیصلاحی خەڵکی چواردەوری و تایفەکەی ئەدات، وە بەردەوام ئەوان وان لەژێر پارێزگاری خوادا تا ئەو پیاوە لەناویاندا بێ...

لە عبدالله کوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لەسەر) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:[2] (إنَّ اللهَ ليدفع بالمسلمِ الصالح عن مئة أهل بيت من جيرانه البلاءَ) خوای گەورە بەهۆی موسڵمانێکی چاك خوازەوە بەڵاو ناڕەحەتی لەسەر سەد لە خەڵکانی دراوسێی لادەبات، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ﴾ البقرة: ٢٥١.

لە -ثوبان-ەوە فەرموودەیەك بەرزكراوەتەوە كە فەرموویەتی:
(لا يَزالُ فيكم سبعَةٌ بِهِمْ تَنصَرُون، وَبهم تُمْطرون، وَبِهم تُرْزَقونَ حتى يَأتيَ أمرُ اللهِ)

---

[1]- ابن جرير له تەفسیرەكەیدا هێناویەتی (٣٤١/٢)، وه (النسائي) له (المواعظ من السنن الكبرى) داهێناویەتی و تەخریجی کردووه، وه له (التحفه)دا ٣٨٥/١٣ هاتووه وه پیاوەکانی بۆ ئیسناد هەموو ڕاستگۆن مەگەر شێخ النسائی نەبێ كە ئەو پلەی (ثقه)ی هەیە.
[2]- طبراني ڕیوایەتی کردووه.

بەردەوام لەناوتانە هەیە حەوت لە نێراوانی خوا، کە بە هۆیانەوە خوا سەرتان دەخات بەهۆیانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێ، بە هۆیانەوە خوا ڕزقتان ئەدات هەتا فرمانی خوا دێتە پێشەوە...

لە (عُبادەی کوڕی صامت)ەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (الأبدال في أُمَتي ثلاثون، بهم ترزَقوُن وَبهم تَمطرَون وَبهم تَنُصرون) ئەبدال لە ئومەتی مندا ژمارەیان سی کەسە بەهۆیانەوە خوا ڕزقتان ئەدات و بە هۆیانەوە بارانتان بۆ دەبارێ و بەهۆیانەوە سەردەکەون، قەتادە لێرەدا دەفەرموێ (من ڕجام وایە حەسەن لەوان بێ)[1] واتە شێخ حسن ی بەصری...

ئەم چوار فەرموودەیەی دوایی (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەی خۆیدا لە ئایەتی ﴿وَلَوْلا دفع الله الناسَ﴾ البقرە: ٢٥١، داهێناویەتی، کە دروستە بکرێتە بەڵگە، کە بە کۆی هەموویان دەبێتە هەواڵێکی ڕاست.

لە (ئەنەس)ەوە (ڕەزای خوای لەسەر) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَنْ تَخْلُوَ الأرضُ مِنْ اربعين رَجُلاً مثل خليل الرحمن، فَبِهم تسْقَونَ وَبهم تُنْصَرون، ما ماتَ منهُم أحد إلاّ أبدَلَ اللهُ مكانَهُ آخر)[2] سەر زەوی چۆڵ نابێ لە چل پیاو لە نمونەی خەلیلی خوا (ئیبراهیم) کە بەهۆی ئەوانەوە تێر ئاو دەبن، بەهۆیانەوە سەردەکەون، هەرکام لەوانە کە بمرێ خوای گەورە یەکێکی تر لە شوێنی دادەنێ..

---

[1]- طەبەرانی ڕیوایەتی کردووە.

[2]- طەبەرانی لە (الأوسط) ڕیوایەتی کردووە وە سەنەدەکەی پلەی (حسن)ی هەیە وە لە (مجمع الزوائد) هاتووە لە ١٠/٦٣.

## هۆكار و واسیتەی گەورە

لـە ڕۆژی دوایـی، ڕۆژی لێپرسـینەوەو مەحشـەر، كـە ناسـراوە بـە ڕۆژی تەوحیـد و یەكتاپەرسـتی، ڕۆژی ئیمـان و بڕوا، كـە لـەو ڕۆژەدا گـەورە بـۆ هۆكـار و واسـیتەی گـەورە دەردەكـەوێ، خـاوەنی لیـوای مـەعقود و بـەڵێن پێدراو پلەی مەحمود (ستایش كراو) و خاوەنی حەوزی چاوەڕوان كراو، ئەو كەسەی كە شـەفاعەت داوا دەكات لـە خـواو خۆیشـی شـەفاعەت دەكات كە هەرگیز شەفاعەتی ڕەد نابێتەوە، كە لەو ڕۆژەدا خوا وادەو بەڵێنی خۆی ئەباتـە سـەر و پێغەمبـەری خـواش وادەی خـۆی دەباتـە سـەر و كـەس لـە ئومەتەكـەی بـێ بـەش ناكـات، خـەڵكی دەچـنە خزمـەتی و شـەفاعەتیان بـۆ دەكات وادەو بـەڵێن دێتـە جـێ كـە فـەرمووی (یـا محمـد، ارفـع رأسـك واشـفع تُشَفَع وَسَلْ تُعطَ) ئەی موحەمەد سەر بەرزبكە و داوا بكە و شـەفاعەت بكـەو داوا بكە تا پێت ببەخشم...

* * *

## خەرقەی وتە هەڵبەستراوەكان ( ثوب الزّور )

زۆرن ئەوانەی لەسەر بەڕەی حەقیقەت بانگەشە بۆ ڕاستی خۆیان ئەكەن و مشەخۆرن لەسەری بەڵام ڕاستی لەوان بەرییە وەك هۆنەرێك دەڵێ:

وكُلُّ يَدَّعِي وصلاً بلَيْلَى　　　　وليلى لاَ تُقِرُّ لَهُمْ بِذَ اكا

هـەموو بانگەشـە دەكـەن گەیشـتوون بـە لـەیلا،لـە پـەرێزی كەسـیانا ئـۆقرە ناگرێ لەیلا ..

ئەمـە جگـە لـەوەی ئەمانـە وێنـەی ڕاسـتیەكان دەشـێوێنن و بـێ ڕێـزن بەرامبەر پیاوچاكان و پایەبەرزان ئەم جۆرە كەسـانە ئـەم وەسـف و پێناسـە وردەی پێغەمبەریان (د.خ) بەسەردا دەچەسپێت كە دەفەرموێ: ((المتشبع

بمالم يُعطِ كلابس ثوب زور)) خۆیان بە تێر و تەسەل دەزانن بە شتێك كە لە بنەڕەتدا پێیان نەبەخشراوە وەك پۆشەری خەرقەی درۆ.

كۆمەڵگای موسڵمان بەزۆرێك لەم كەسانە گیرۆدە بووە، بێ گەردی ئومەتیان لێڵ كردووە و دووبەرەكیان خستۆتە نێو موسڵمانانەوە تۆوی دوژمنایەتی و ناحەزای لەنێوان براو باوك و رۆڵەكانیان دەچێنن، بە دەرگای ڕاستكردنەوەی چەمكە ئاینییەكاندا دێنە ژوورەوە بۆ ئازاردانی ئەوانەی لەناو بازنەی ئیسلامدان، بەناوی پەیڕەوكردن لە ئاكار و ئاسەواری سەلەف ڕێگای نكوڵی حەقیقەتیان گرتۆتەبەر، لە جێگای دانایی و ئامۆژگاری جوان و نەرم و نیانی ڕق و كینە و وشكی و بێ ئەدەبی و بێ تامیان داناوە و پیادەی دەكەن.

هەندێ كەسیش هەن بانگەشەی تەصەوف ئەكەن و خۆیان بە پەیڕەوانی دەزانن بەڵام ئەوانە دوورترین كەسن لە هەقیقەت و جەوهەرەكەی، وێنەكەیان شێواندووەو ڕێز و پایەی ڕێبازەكەیان لەكەدار كردووە جورئەتیان داوە بە خۆیان پێشەواو عاریفە گەورە ڕابەرە بەرزەكانیان بدەنە بەر تیری ڕەخنە و هێرشە ناڕەواكانیان. ئێمە دڵنیاین كە تەصەوف خورافات و كاری ناڕەواو جادوگەری و شەعوزە نی یە وە بیردۆزی فەلسەفی و بیروبۆچونی نامۆ بە شەرعی خودا نیە، دوورە لە هاوبەشدانان و حلول و ئیتحاد...هتد.

پێمانوایە ئەوەی پێچەوانەی كیتاب و سوننەت بێت جێگای پەسەند كردن و تەئویل كردن نییە، ئێمە دەزانین كە تەصەوف قوتابخانەی زانست و زانكۆی بیرو فیكری باڵایە، هەموو ڕێباز و تەریقەتەكان ئاسۆی بەرزی بیروباوەڕ و شەرعی ئیسلام نومایان دەكەن ڕوویەكی تەواوكاری ئاداب و ئاكارە بەرز و عیرفانیەكانە.

بــه پــەیڕەوکردنی ئیمــان و بــاوەڕی تــەواو بەدەســت دێــت، هــەموو کاروبارەکــانی ژیــان تــەواو دەکــات و دەبوژێنێتــەوە، پوختــەی ئاکــار و بانگــەوازە ڕەببانیــەکان لــە خۆیــدا بەرجەســتە دەکــات وەك ڕاســتگۆیی و ئامانــەت پــارێزی و وەفــا و لــە مــافی خۆبــوردن (إثــار) و ئەمەکــداری و بەخشــندەیی و سەرخســتنی لاواز و فریادڕەســی لێ قــەوماوان و کۆمــەك و چاکەکردن و کۆشــش کــردن بــۆ سەرخســتنی هــەق و ئــارام گــرتن لەســەر ناڕەحەتیــەکان و پێشــبڕکێ کــردن بــۆ بــەجێهێنانی هــەموو ئاکــار و ڕەوشــتە بەرزەکانی تر.

لەم ڕێرەوە بۆنخۆش و ئاکارە جوانانەوە چالاکی و قارەمانیەتی پیاوان و پێشــەوا ئازاکــانی چــەرخی یەکــەمی ئیســلام دەرکــەوت و کەســایەتیە ئیسلامیەکان بە ئەوپەڕی شەوق و پەرۆشەوە باشترین نموونەی پیاوانی خودا و بەرزترین ئاکارو ڕەوشتی جوانەوە ناو و ناوبانگیان بەرزبوویەوە و مێژووی تازەمــان شــانازی بــە گــەورەیی و شــکۆداری و هــەوڵ و تەقــەلای ئەوانەوە دەکات. لێرەوە بە دڵنیاییەوە بۆمان دەرکەوت کە هەموو ڕابوون و ڕاپەڕینــە گــەورەکان بــەرپا ناکرێــت بــەبێ پەیامــە ڕۆحــی و بــەهرەو ئیلهامــە ئیمانیەکان ، وە سەرناگرێ بەبێ ڕەوشتی بەرز و ئیرادەی بەهێزی پیاوانی ئەم مەیدانە و پشت بەستوو بە بیروباوەڕی پیرۆزی ئیسلام.

سیفات و ئاکارە جوانــەکانی چێنراوی نــاخی مرۆڤ و لایەنە دەروونــی و بــەهرەو توانــا ڕۆحیــەکان و، هێــزە معنەویــەکان ســەرمایەیەکی گــەورە و وزەیــەکی شــاراوەی گــەلانن، وە کۆگــا و کارگەیــەکی مــەزنن بــۆ بنیاتنــانی نەتەوەکان و بەرەو پێش چوونی کاروانی مرۆڤایەتی بەرەو ئامانجە بالاکان بۆ ڕۆشتن بە ڕێبازی پیاوچاکانی سەلەف و عاریفە گەورەکانی گەلەکەمان، دەبیــنین چــۆن دەبــن بــە پێشــەنگ و نموونەیــەکی جــوان و هۆکــارێکی

ڕاستەوخۆ بەرەو ڕابوون و هەستانەوەی ئوممەت و گەشانەوەی بەرچاوی مێژووی ئیسلام و کەلەپورە مەزنەکەی.

ئەوە ئیمان بوو بەرزترین وێنەی ئیمانی گەرم و زیندو و داگیرساو بەشەوق و ئەوینەوە لە دڵ و دەروونی هاوەڵە دڵسۆزەکانی پێغەمبەر (د.خ) و شوێنکەوتوانیەوە بوو کە بە بەردەوامی هەڵدەقوڵا بەرەو پەروەردگاریان ، کە دەیگەیاندن بە پلەوپایەی ئیحسان بە جۆرێك کە خودای گەورەیان لە هەموو شتێکدا دەبینیەوە وە هەستیان بە چاودێری خوداش لە هەموو جوڵەو ڕەفتارێکیان دەکرد، بەڵکو لە هەموو چرکەو ساتێك لەگەڵ هەموو هەناسەیەکیان لەو چاودێرییە خودایی بێ ئاگا نەبوون بە هەستی قوڵ و فەراسەتی ئیمانیان دەستی قودرەتی پەروەردگارییەتی خودایان لە گەردووندا دەبینی، بەڕاستی دڵنیا بوون خودا ئاگای لە ختورەی دڵیان و ئەندێشە و خەیاڵی ناخیان و تاوانی چاوەکانیان و ڕاز و نهێنی سینەیانە و دڵیشیان کردبووە عەرشی پەروەردگاریان و هەستی ژیانەوەیان پێ دەبەخشین.

## لەنێوان باشترین داهێنراو و خراپترین داهێنراو دا

زۆرێك لەوانەی کە نسبەتی خۆیان ئەدەن لە زانایانی پێشین و سەلەف ، وا بڵاویان کردۆتەوە و بەشێوەیەك بانگەشە دەکەن بۆ سەلەفیەت بە دەمارگیریەکی کوێرانە و بە بیرومێشکێکی نەزۆك و تێگەیشتنێکی نەزۆك و ناکامەوە ، بە سنگێکی تەسکەوە بەرەنگاری گشت تازە داهێنراوێك ڕادەوەستن، ئینکاری هەموو داهێنراوێکی بەکەڵك دەبنەوە، بە بیانوی ئەوە کە ئەو شتانە بیدعەن، وە هەموو یەکێ لە بیدعەکان گومڕایییە، بێ جیاوازی خستن لەنێوان جۆرەکانی بیدعەدا، لە کاتێکدا کە شەریعەتی

ئیسلام پێویستی گێڕاوە لەسەرمان لە جیاوازی بخەین لەنێوان جۆرەکانیدا و بڵێین:

داهێنراوەکان تیایاندا هەیە چاکە و تیاشیاندا هەیە خراپە، کە ئەم جیاوازی‌یە مرۆڤی بیر تیژ و فامیدە دەیناسێتەوە..

ئەمە ئەو زانستەیە کە زانایانی زانستی ئوصول لە پێشینەکانمان لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە (ڕەزای خوایان لەسەربێ) وەك پێشەوا (عیزی کوڕی عبدالسلام، شێخی نەوەوی، پێشەوا سیوطی، زانای پایەبەرز (المحلی)، وە ابن حەجەر و غەیری ئەوان)...

وە فەرموودەکانی حەزرەت ﷺ هەندێکیان ڕاڤەن (تەفسیر) بۆ هەندێکی تریان، وە هەندێکیان هەندێکیان تەواو دەکات، کە پێویستە تێڕوانینمان بۆیان بە چاوێکی تێگەیشتووانەوە بێ و بە ڕۆحیەتی شەریعەت ڕاڤەیان بکەین و ئەو تێگەیشتنانەیان وەربگرین کە ئەهلی (نظر) یەکڕایی خۆیانیان لەسەر دەربڕیوە...

بۆیە دەبینین زۆر لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ پێویستی بە ڕاڤەکردن هەیە، کە لە مرۆڤێکی خاوەن ژیری پڕ و بیرێکی تیژ و تێگەیشتنێکی شایستە و دڵێکی چێژ وەرگرەوە بێت و ، لە ڕووباری سازگاری شەریعەتەوە کۆمەکی وەرگرتبێ و، کاروباری موسڵمانان و پێداویستیەکانی ڕەچاو بکات و، لە سنورو بنەماکانی شەریعەت و دەقی قورئانی و سوننەتەکانەوە پیادەی بکات و لێی دەرنەچێ.

لە نموونەی ئەمانە ئەم فەرموودەیە دێنینەوە کە دەفەرموێ: ((كُلُ بِدْعَةٍ ضلالة) کە پێویستە لە ڕاڤەکەیدا بڵێین: (مەبەست بە بیدعە خراپەکاریەکانیانە کە لەژێر سێبەر و دەقی ئەصڵێکی شەرعیدا جێگەی نابێتەوە).

که ئەم جۆرە بەکارهێنان و تەقیدکردنە بەشتێکی دیاریی‌یەوە لە غەیری ئەم فەرموودەشدا هاتووە، لەوانە فەرموودەی: ((لا صلاةَ لِجارِ المسجدِ إلاّ في مسجد) واتای ڕوکەشی و وتەیی: نوێژ دروست نییە بۆ دراوسێی مزگەوت مەگەر لە مزگەوتدا نەبێ.

کە ئەم فەرموودە سودی تەقیدکردنەکەی زیاترە کە وەك ئەوە وایە فەرمووبێتی نوێژی تەواو و پاداشتی تەواو نی‌یە بۆ دراوسێی مزگەوت مەگەر لە مزگەوتدا نەبێ ئەینا نوێژەکەی دادەمەزرێ...

کە ئەم مەسئەلە کەمە جیاوازییەکی لەنێوان زانانیاندا لەسەرە...

وە فەرموودەی: ((لا صلاةَ بِحضَرةِ الطعام)) نوێژ مەکە بە ئامادەبوونی خۆراك کە ماناکەی وای لێ دێ بڵێین: نوێژی تەواو نییە لەو کاتەدا لەبەر خەیاڵ بۆلا ڕۆشتن و یان پەلەکردن لە تەواو بوونی نوێژەکە..

وە فەرموودەی: ((لا يُؤمِنُ أحدكم حَتى يُحِبَّ لأخيه ما يُحِبُّ لِنفسه) ئیمانی نییە ئەو کەسەتان کە ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ برا موسوڵمانەکەشی پێی خۆش نەبێ.. کە مەبەست ئیمانی تەواوە...

وە فەرموودەی: ( واللهِ لا يُؤمِن، واللهِ لا يُؤمِن، واللهِ لا يؤمِن) قيل من يا رسول الله؟ قال: (من لم يأمَنَ جارَهُ بوائفَةُ ) .

ئیمانی نییە ئەوەی داروسێ‌یەکەی لەم ئەمین نەبێ واتە ئیمانی تەواو نابێ.

وە فەرموودەی: ((لا يدخُلُ الجَنَةُ قاطِعُ رَحِم وعاق لِوالِدَيه) ناچێتە بەهەشتەوە ئەوەی صیلەی ڕەحمی پچڕاندووەو ئەوەش دڵی دایك و باوکی یەشاندووە، واتە ناچێتە بەهەشت تا ئەو سزایانە لە دۆزەخدا نەبینێ ئەینا لە دوادا دەچێ...

بە کورتی: زانایـان لەسـەر ڕوکەشـی فەرموودەکە بڕیاریـان نـەداوە بـەڵکو لەسەر تەئویلەکەی فتوایان داوە...

لێرەوە فەرموودەکەی (بدعة)ش لـەم جۆرەیـە، کە بە گشتی فـەرموودەکان هەڵسوکەوتی هـاوەڵان ئـەوەیان سـەلماندووە کـە داهێنـراوی خـراپ لـەژێر ئەسڵی هەموویەتدا جێی نابێتەوە واتە (أصل كُليّ)...

وە فەرمووده‌ی : ((مَنْ سَنَّ سُنَةً حَسَنَةً، كان له أجرُها وأجرُ مَنْ عَمِلَ بها الى يومِ القيامة)) سوننەتێکی چاك دابمەزرێنێ..

وە فـەرموودەی: ((علـيكم بُسُـنَتي وسُـنة الحلفـاءِ الراشـدين)) شـوێن سوننەتی پێغەمبـەر و چوار هاوەڵەکـەی، وە وتـەی خەلیفـە عومـەر (ڕەزای خوای لەسـەر) کە فـەرمووی: ((نِعْمَتُ البِدْعَةِ هذه)) باشترین داهێنراویەکە ئەمە کە لە جەماعەتی نوێژی تەراویح دا فەرمووی: کە ئەمانـە و کۆمـەڵێکی تریش هەموو بەڵگەن لەسەر وتەکەمان..

## جیاوازییەکی پێویست لەنێوان داهێنراوی شەرعی و زمانەوانیدا

هەنـدێك ، ڕەخنـە لـە دابـەش بـوونی داهێنراوەکـان دەگـرن بـۆ (چـاك و خراپ)، وە بـە شێوەیەکی زۆر گـەورە ئینکاری ئەکـەن، بـەڵکو زۆرێکیـان بـە فیسـق و گـومڕایی نـاوی دەبـەن، وە ئەمـەش لەبـەر پێچـەوانەیەتی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویـەتی: ((كَلُّ بِدعةٍ ضلالة)) هـەموو داهێنراویـەك گومڕایی‌یـە، وە ئـەم وتەیـە لـە (لـەفـظ)دا گشـتی‌یە بـۆ وەسفدارکردنی داهێنراوەکان بە گومڕایی..

وە لێرەوە دەبینیت ئەوانە دەڵێن: ئایا لەدوای ئەم وتەیەی شاریعەوە کە خاوەنی ڕساڵەتە کە وتەی ((كلَ بدعة ضلالة))یە، دروستە موجتەهدێك یان

فەقیهێك لە هەر پلەیەك دا بێ بڵێت: نەخێر، نەخێر هەموو داهێنراویەك گومڕایی نیە، بەڵكو هەندێكی گومڕایی یەو هەندێكی چاكە و حەسەنەیە، وە هەندێكی تری خراپەیە. ئە ئەبەم بۆچوونە زۆر لە خەڵكی ئیغرابوون و هاوار دەكەن لەگەڵ هاوارکاران و ئینكاری دەكەن لەگەڵ مونكیران داو، ڕەشایی كۆمەڵی ناحاڵیەكان زۆر دەكەن بێ ئەوەی هیچ لە مەقاصیدی شەریعەت تێگەیشتبن و لە ڕۆحی دینی ئیسلام بەشیان درابێ..

پاشان زۆر لەسەر ئەم حاڵەیان نامێننەوە هەتا بە ناچاری دەگەڕێن بەشوێن دەرگایەك تا خۆیانی لێ دەرباز بكەن و حەلی ئەو كێشانەیان بكەن كە تووشیان بووە، وە هەستن بە ڕاڤەكردنی ئەو واقیعەی كە تیایدا دەژین، ئەو كاتە ناچار دەبن پەنا ببەنە بەر هەموو داهێنانێكی هۆكاری وەكو سەبەب و وەسیلەكان تا دەربازیان ببێ، ئەگەر وانەبێ ئەو كەسانە ناتوانن بخۆن و بخۆنەوەو دابنیشن و ماڵ دروست بكەن، بەڵكو ناتوانن پۆشاك بپۆشن و هەناسە بدەن و خێزانیش دروست بكەن، وە ناتوانن هەڵسوكەت بكەن نە لەگەڵ نەفسی خۆیان و نە لەگەڵ كەس و كارو برادەران و نە لەگەڵ كۆمەڵگاش دا، وە ئەم هۆكار و وەسیلەیە كە ئەیگرنەبەر ئەوەیە كە بە وتەیەكی پاراو پێیان دەڵێ: كە داهێنراوەكان دەبنە دوو بەش، داهێنراوی دینی و داهێنراوی دونیایی. پاك و مەنەزەهی بۆ خوا! ئە لێرەدا ئەو كەسە بۆ نەفسی خۆی پەنا دەباتە بەر ئەم داهێنانەو دابەشی دەكات، خۆ بەلایەنی كەمەوە گەر هیچی نەكردبێ ئەوە ناوەكەی داهێناوە، خۆ ئەگەر وتمان كە ئەم ماناكردنە لە سەردەمی زێڕینی پێغەمبەرایەتیدا هەبووە، بەڵام ناوبردنی (دینی و دونیایی) بە هیچ شێوەیەك لە سەردەم و تەشریعی پێغەمبەرایەتیدا نەبووە، دەی لە كوێوە ئەم دابەش كردنەت هێنا؟ وە لە كوێوە ئەم ناوە داهێنراویەت هێناوە؟

ئەگەر کەسێ بڵێ: دابەش کردنی داهێنراوەکان بۆ چاك و خراپ لە شاریعەوە نەهاتووە، ئێمەیش پێی دەڵێین: کەواتە دابەش کردنی داهێنراوەکان بۆ دینی قبوڵ نییە، وە دونیایەکان قبوڵە کە ئەمە خودی داهێنران و داهێنراون..

شاریع کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كَلُّ بِدعةٍ ضلالةِ) داهێنراویەکان هەموو گومڕایین، بە شێوەی ڕەهایە و هەموو شتێ دەگرێتەوە، یەکسەر ئەو کەسانە دەڵێن: نەخێر، نەخێر هەموو داهێنراوەکان گومڕایی یە بەڵام ڕەها نییە و هەموو شتەکان ناگرێتەوە و بەڵکو داهێنراوەکان دەبن بە دوو بەشەوە: ئایینی کە گومڕایی یەو، دونیایی کە هیچ شتێکی لەسەر نییە.

بۆیە پێویستە ئەم باسە گرنگە ڕوون بکەینەوە و زۆر لەو ئیشکالانەی لەسەری هەیە بیرەوێنینەوە پشت بە خوا...

دەڵێین:

ئەو کەسەی کە خاوەنی ئەو وتەیەیە شاریعە، کە حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ کە زوبانی ئەو زوبانی شەرعە، کە پێویستە لەسەرمان بەو تەرازووە شەرعی‌یەوە هێناویەتی ئێمە لێی تێبگەین. ئەگەر بزانیت کە داهێنراوەکان لە ئەسڵدا بریتی یە لە: هەموو داهێنان و هێنانە ناوەوەیەك بەبێ نموونە هێنانەوە لەسەری، ئەوە زیهن و بیرکردنەوەمان دەڵێ هەموو زیادکردنێك یان داهێنراوییەك کە زەم کرابێ وەکو زیادەکردنێ لە فرمانەکانی دین، کە بکرێ بە بەشێك لە دین، کە زیادەیەکی وابێ مۆرکی شەریعەت وەربگرێ و بە شێوەیەك وای لێ بێت کە خەڵکی جێبەجێی بکەن و بشڵێن ئەمە دینە و لە خاوەنی شەریعەتەکەوە پێمان گەیشتووە، ئەوە ئەم ئاگادار کردنەوەیەیە کە حەزرەت ﷺ ئاگادارمان دەکاتەوە تیایدا کە فەرموویەتی: (مَنْ أحْدَثَ في أمرنا هذا ما لَيس مِنهُ، فَهُوَ رِدُ)، هەر کەسێ لە فرمانی ئێمەدا شتێك زیاد

بكات كه له ديندا نه‌بێ ئه‌وه ڕه‌د ده‌كرێته‌وه و لێی قبول ناكرێ... ئه‌و وته‌یه‌ی لێره‌دا وه‌ك ده‌ڵێن: (الحَدُّ الفاصل)و واته سنوری جیاكه‌ره‌وه له‌نێوانماندا وته‌كه‌ی حه‌زره‌ته ﷺ كه فه‌رموویه‌تی (في أمرِنا هذا)یه...

له‌به‌رئه‌مه‌یه، كه به تێگه‌یشتنی ئێمه داهێنراوه‌كان چاكه و خراپه ده‌گرێته‌وه، ئه‌مه‌ش ته‌نها له پێناسه‌ی داهێنراوه له زمانه‌وانیدا (لغة)دا كه ته‌نها داهێنان و دروست كردن ده‌گرێته‌وه، كه له‌لای هیچ كه‌سێكمان گومانی تێدا نییه كه مانای داهێنراوی شه‌رعی مه‌گه‌ر گومڕابوون و فیتنه‌یه‌كی زه‌مكراو نه‌بێ كه ڕه‌د كراوه‌ته‌وه هیچی تر نییه، خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌و كه‌سانه‌ی نكوڵی ده‌كه‌ن له‌م مانایه تێبگه‌ن، ئه‌وه بۆیان ده‌رده‌كه‌وێ كه ده‌رگای لێك نزیك بوونه‌وه‌مان كراوه‌یه‌و شوێنی ناكۆكی و لێك دووركه‌وتنه‌وه‌شمان زۆر دوور ده‌بێ.

## زیاده وته‌یه‌ك بۆ نزیك بوونه‌وه‌ی تێگه‌یشتنه‌كان

من وا ده‌بینم كه ئه‌وانه‌ی ئینكاری دابه‌ش بوونی داهێنراوی ده‌كه‌ن، ته‌نها ئیناكریان بۆ دابه‌ش بوونه شه‌رعییه‌كه‌یه، به به‌ڵگه‌ی ئه‌وه كه خۆیان داهێنراویان دابه‌ش كردووه بۆ دینی و دونیایی، وه وتوشیانه ئه‌مه زه‌روره‌تی ژیانه، وه ئه‌وانه‌ش كه داهێنراویان دابه‌ش كردووه بۆ چاك و خراپ، ئه‌وانیش وا ده‌بیننه‌وه كه ئه‌مه دابه‌ش كردنه له مانای لوغه‌ویه‌كه‌یدایه ، چونكه ده‌ڵێن: (زیاده كردن له دین و شه‌ریعه‌ت دا گومڕایی یه و خراپه‌یه‌كی گه‌وره‌یه) كه هیچ گومانێك له‌م باره‌وه له‌لایان نییه...

كه‌واته جیاوازییه‌كه‌ی نێوانیان جیاوازییه‌كی ڕووكه‌ش و شكڵی یه، مه‌گه‌ر ئه‌وه بێ كه من وا ده‌بینم ئه‌و براده‌رانه‌مان كه ئینكاری دابه‌ش بوون

بۆ چاك و خراپ ئەكەن و دان ئەنێن بە دابەش بوونی بۆ دونیاری و دینی، بەختیان نەبووە بۆ وردی دەربڕینەكەیان، لەبەرئەوەی كە ئەوان حوكم دەكەن بە گومڕایی بۆ داهێنراویەك كە لە دین دا بێ ، – كە ئەمەش ڕاستە –وە حوكمیان كردووە كە هیچ شتێ نییە لەسەر داهێنراوییە دونیاییەكان، كە ئەمە حوكمێكی خراپە، چونكە بەهۆی ئەم حوكمەیانەوە، هەموو داهێنراوێكی دونیایان ئیباحە و دروستی پێ داوە، كە ئەمەش خەتەرێكی گەورەیە، بەهۆیەوە كەوتوونەتە ناو موصیبەت و ناڕەحەتیەكانەوە، كە پێویست ئەكات باسێكی ورد لە (واجب و ضروري) لەم باسەدا بكرێ، ئەویش ئەوەیە كە بڵێن: (ئەم داهێنراوە دونیاییانە تیایاندا هەیە خێرو چاكەیە، وە تیاشیاندا هەیە كە خراپەو شەڕەنگێزیە )، كە ئەمەش واقیعەو هەموو كەس دەیبینێ مەگەر كەسێك كە نەزان و نابینابێ، كە ئەم زیادكردنە لە وتەكەدا پێویستە، ئیتر لە لێكۆڵینەوەی ئەم مانایەدا بە وردی لەلایەن ئەو كەسانەوە كە داهێنراویان دابەش كردووە بۆ چاك و خراپ، كافیە بۆیان كە تێبگەن و جیاوازی ڕایان نەهێڵن، وە زانراویشە كە مەبەست پێی مانای لوغەویەكەیەتی وەك لە پێشتر وتمان، كە تەعبیرە لەو مانایەی كە ئەوانەی ئینكاری دەكەن پێناسەیان كردووە بە دونیایی..

كە ئەم قسەیە لەوپەڕی تێگەیشتن و دیقەت و وردی و ئیحتیاطیەیە، كە بەرانبەر هەموو شتێكی تازە دەڵێ پێویستە بە تەرازوو و حوكمی شەرعی و یاساكانی دین دا تێبپەڕێ و بكێشرێ، كە پێویستە لەسەر موسوڵمانان كە هەموو كارێكیان كە دێتە ڕێیان، وە هەموو فرمانێكی دونیاییان كە تازە داهێت بۆیان بیخەنە بەردەم شەریعەتی ئیسلام، تا حوكم و یاسای ئیسلامی تیا ببیننەوە، با ئەو داهێنراوە تازەیە لە هەر پلەیەك دا بێ، كە

ئەمــەش نایەتــەجێ مەگــەر بــە دابــەش کردنێکــی ورد نــەبێ لەلایــەن پێشەوایانی ئوصولەوە، خوای گەورە لەو زانا ئوصولیانەمان خۆش بێ و لێیان ڕازی بێ کە بەبێ کەم و کورتی و یان دەستکاری یان تەئویل کردن مانا چاك و پوختەکانیان لە پێچەوانەکانیان بۆ جیاکردوینەتەوە...

## بانگەشەی پێشەوایانی تەصەوف
## بۆ ئیش کردنە بە شەریعەتی ئیسلام

***تەصەوف*** : ئەو ستەم لێکراوەی خراوەتە خانەی تۆمەتەوە، کەم کەسن ئەوانەی کە بەرامبەری بە ئینصاف بن، بەڵکو چاو قایمی و بێ ڕوویی هەنـدێکیان گەیشـتۆتە ئاسـتێك لـە زەمکـردن و ناشـرین کردنیـان سـڵ ناکەنـەوە، لـە بـە شـایەت وەرگـرتن و دادپـەروەریان پـەك بخـەن و هـەوڵی سڕینەوەی دەدەن، دەڵێن فلان کەس جێگەی متمانە نییە، وتە و هەواڵی لێ وەرناگیرێ، کە بڵێی بۆچی؟ دەڵێن: لەبەرئەوەی صۆفییە!!!

سـەیرەو سەرسوڕهێنەرە! دەبینین زۆر لەوانەی کە تەصەوف بە خراپ دادەنێ و زەمی دەکات و دژایەتی هەڵگرانی دەکات و بە دوژمن بە خەڵکی دەناسێنێ ، دەبینن هەندێ لەوانە هەر ئەو کردەوانە دەکەن کە صۆفیەکان دەیکەن، هەر ئەو وتانە دەڵێن کە صۆفیەکان دەیڵێن، کەچی لەلای هیچ شـەرم نییـە لـەکاتی وتارەکانیـان وتـەی پێشـەوایانی تەصـەوف دەکەنـە نموونەو وتارەکانیان پێ جوان دەکەن، چ لە وتاری هەینیەیان یان لە سەر کورسی وانە وتنەوەیان زۆر بە ڕاشکاوانە دەڵێن: فوضەیلی کوڕی عیاض وادەفـەرموێ، جونەیـد وا دەڵـێ حەسـەنی بەصـری ڕای وایـە، سـەهلی تەستوری وا دەڵێ، مەحاسبی و بشری حافی دەکەنە نموونەی تێگەیشتن لە دین.

ئەی ئەوانە پێشەوایانی تەصەوف نین، ئەی ئەوانە ئەقطابەکان نین کە دامەزرێنەری کتێبی تەصەوفین، کە مەناقیب و ڕەوشتەکانیان تۆمار کراوە، نازانم ئەوانە خۆیان نەزانن یان خۆیان بە نەزان نیشان ئەدەن؟ یان کوێرن یان خۆیان لە ئاست ڕاستیەکاندا کوێر دەکەن؟

پێم باشە لەم نوسراوەدا هەندێ لە وتەکانی پێشەوایانی تەصەوف بهێنمەوە و پیاوەکانیان ئاماژە پێ بکەم، ئەمەوێ وتەکانیان لەسەر شەریعەتی ئیسلام بهێنمەوە تا لە هەقیقتیان تێبگەین، چونکە پێویست وایە کە ویستت کەسێ بناسی لە خۆیەوەو لە کەسەکەوە بیناسێنی، مرۆڤیش خۆی باشترین هۆکارە بۆ دەرخستنی ڕاو و بۆچوونەکانی خۆی و خەڵکانیش متمانە و باوەڕیان لەسەر وتەکانی خۆی زیاتر دادەمەزرێ...

پێشەوا جونەیری بەغدادی دەفەرموێ: ڕێگایەکان لە خەڵکی داخراون مەگەر ئەو ڕێگە نەبێ کە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایە ﷺ و سوننەتەکانی و ڕۆیشتن لەسەر ڕێگەکەی ئەو، چونکە ڕێگاکانی خێر و چاکە هەموویان تەنها لەسەر پێغەمبەر ﷺ کراوەتەوە، لە ڕێگەی ئەوەوە هاوەڵان و شوێن کەوتوانیان پێگەیشتون.

پێمان گەیشتووە کە ئەبا یەزیدی بەسطامی، ڕۆژێك بە هاوەڵانی فەرموو: هەڵسن با بەیەکەوە بچین بۆ لای ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی وا ناساندووە کە پلەی ویلایەتی هەبێ، دەڵێ: ڕۆیشتین تا گەیشتین بە پیاوێك ئەیویست بچێتە ناو مزگەوت، بینیمان بەڵغەمێکی فڕێ دایە حەوشەی مزگەوتەکە، ئەبا یەزیدی بەسطامی وازی لێ هێناو سەلامیشی لێ نەکرد و گەڕایەوە، وە فەرمووی: ئەمە ئەمین و پارێزەر نەبوو لەسەر پاراستنی بۆ یەکێ لە ئاداب و ڕەوشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیتر چۆن دەتوانێ پارێزەر بێ بۆ ئەو پلانەی کە ئەولیا و پیاوچاکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

ذوالنـون ی مصـری ئەفـەرموێ: خولگـەی وتـەکان چوارە: خۆشویسـتنی پـەروەردگار، ڕق لێبـوونی کـەم، شـوێن کـەوتنی قورئـان، ترسـان لـە حـاڵ گـۆڕین... وە نیشـانەکانی خۆشویسـتنی خـوا: شـوێنکەوتن و چـاودێری پێغەمبـــەری خـــوا ﷺ لـــە ڕەوشـــت و کردارەکانیـــدا و لـــە فـــەرموودەو سوننەتەکانیدا.

سیڕی سەقەطی دەفەرموێ: تەصەوف ناوە بۆ سێ مانا: ئەوەیە کە نوری زانستیەکانی و نوری وەرعەکەی ناکوژێنێتەوە، وتەیەك نەڵێ کە ناوەڕۆکی مەبەستەکەی دژایەتی قورئـان و سوننەت بێ، وە کەرامەتێ دەرنـەخات کـە تیایدا سنورەکانی خوا بشکێنێ..

ئەبو نەصر بشری کوڕی حارث الحافی دەفەرموێ:

لـە خـەودا گەیشـتم بـە خزمـەتی پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی پـێم: ئـەی بشـر، ئـەزانی خـوا بەچـی تـۆی ئـاوا بەرزکردۆتـەوە لـەناو هاوەڵانـدا؟ عـەرزم کـرد: نـەخێری ئـەی پێغـەمبـەری خـوا، فـەرمووی: بـە شـوێنکەوتنت بـۆ سـوننەتی من، بە خزمەتکردنت بۆ پیاوچاکان، بە ئامۆژگاری کردنت بۆ برادەرانت، وە بـــە خۆشویســـتنت بـــۆ هـــاوەڵان و ئـــەهلی بـــەیتی مـــن، ئەوەیـــە کـــە تـــۆی گەیاندووەتە پلەی ئەبرار...

ئەبو یەزید طەیفوری کوڕی عیسای بەسطامی دەفەرموێ:

بە خەیاڵم دا هات کە عەرزی خوا بکەم و داوای لێ بکـەم کـە لـە پـەیداکردنی نان بۆ خۆم و بۆ خێزانم پەیدایان نەکەم تا بەندایەتی زیاتر بکەم ، بە خۆمم وت: چۆن دروستە بۆت ئەو داوایـە بکـەیت لـە کاتێکدا کـە پێغەمبـەری خـوا داوای نەکردووە؟ ئیتر داواکەم نەکرد..

پاش ئەم حاڵەتەم خوای پەروەردگار بەشێوەیەك ژیاندمی كە خۆراك و ژیانم بەشی دەكردم و هەڵپەم بۆ نەدەكرد، وە ئافرەتیشم لەبەرچاو وا نزم بوو وەك دیوار ببینم وابوو...

وە لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ئەگەر پیاوێكتان بینی ئەوەندە كەرامەتی پێدرابوو هەتا بە هەوادا بەرز دەبوویەوە، پێی هەڵمەخەڵەتێن و باوەڕی پێ مەكەن تا سەیری دەكەن و لە ژیانی دەزانن كە ئایا لە فرمان و نەهیەكانی خوادا چۆنە، وە ئایا سنوری خوا دەپارێزێ، وە ئایا شەریعەتی ئیسلام جێبەجێ دەكات؟

ئەبو سولەیمان عەبدولرەحمانی كوڕی عەطیەی دارانی دەڵێ:

جاری وا هەبووە خاڵێك لە وتەكانی قەومەكەم لە دڵمدا جێگیر بووە، چەند ڕۆژێ پێوەی ماومەتەوە، وەرم نەگرتووە تا دوو شایەتم لەسەر نەهێنابێ كە قورئان و سوننەتن، گەر لەسەر ئەو دوانە بوو بێ وتوومە بە دڵم: ئێ ئێستە وەری بگرە.

ئەبو حەسەن ئەحمەدی كوڕی ئەبی حەورانی دەفەرموێ:

هەركەس هەر كردەوەیەك بكات بەبێ شوێن كەوتنی سوننەتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بەتاڵە و لێی وەرناگیرێ.

ئەبو حەفص عومەری كوڕی موسەلەمەی حەداد دەفەرموێ:

هەركەس كردەوەكانی و وتەكانی و حاڵەكانی لە هەموو كاتێكدا بە قورئان و سوننەت نەكێشێ، وە ئەندێشە و ختورەكانی دەروونی لۆمە نەكات، ئەوا لە دیوانی پیاوچاكان دا هەژمار ناكرێت.

ئەبو قاسم جونەیدی كوڕی موحەمەد دەڵێ: هەركەس قورئان لەبەرنەكات و فەرموودەكان نەنوسێتەوە، ئەوە لە هیچ شتێكدا لەم فرمانەی ئێمە

شـوێنی ناکـەوین، چـونکە ئـەم زانسـتەی ئێمـە پەیوەسـتە بـە قورئـان و سوننەتەوە..

وە دەڵـێ: ئـەم ڕێـڕەوەی ئێمـە پەیوەسـتە بـە ئوصـوڵەکانی قورئـان و سـوننەتەوە، وە ئـەم زانسـتەی ئێمـە پشـت بەسـتوو و گرێـدراوە بـە فەرموودەکانی حەزرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئەبی عثمان ڕەحمەتی خوای لێ بێ فەرمووی:

هاوڕێیەتی لە خزمەتی خوا بە چاکترین ڕەوشت و ئەدەبە و بە بەردەوامی موراقەبە و هەیبەتەوەیە، هاوڕێیەتی لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بە شـوێنکەوتنی سـوننەت و ڕەوشـتەکانیەتی، هاوڕێیـەتی پیاوچـاکان بـە ڕێزلێگرتن و خزمەتکردنیانە، هاوڕێیەتی لەگەڵ کەس و کاردا بە ڕەوشت جوانی نیشاندان و بەدەم هاوردنەوەیە، هاوڕێیەتی برادەران بە بەردەوامی ڕووخۆش دەرخستن و سوپاسگوزارییە بە مەرجێ گوناه و خراپەی تیا نـەبینرێ، وە هاوڕێیـەتی لەگـەڵ نـەزان و جاهیلـەکان بـە پاڕانـەوەی خێـر بۆیان و هیدایەتیانە...

وە هـەروەها ئەفـەرموێ: هەرکـەس فرمانـەکانی سـوننەتی بەسـەر نەفسـیا بەجێ هێنا لە وتەو کردەوەکانیدا ئەوە کە قسەی کرد بە پەندیاریـەوە قسـە دەکات، هەرکـەس فرمـانی هـەواو ئارەزواتی لەسـەر نەفسـی هێنایـە پـێش ئـەوە هـیچ ناڵـێ مەگـەر داهێنـراو و خـراپ نـەبێ خـواش دەفـەرموێ: ﴿وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا﴾النور: ٥٤.

ئەبوحەسەن ئەحمەد کوڕی موحەممەدی نوری دەڵێ:

هەرکەستان بینی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لەگەڵ خوادایەو لـە سـنوری شەرعی خوا دەردەچوو، ئەوە نزیکی مەبنەوە چونکە ئەوە موبتەدیعە.

ئەبو فەوارس شاه کوڕی شوجاعی کرمانی ئەفەرموێ:

هەرکـەس چـاوی لـە نامـەحرەم داخسـت و نەفسـی خـۆی گرتـەوە لـە ئارەزووەکـان، نـاو دڵـی جـوان کـرد بـە موراقەبـەی پـەروەردگار و ڕوکەشـی لاشەشـی ڕازانـدەوە بـە شـوێنکەوتنی بـۆ سـوننەتەکانی پێغەمبـەر ﷺ وە نەفسـی ڕاهێنـا لەسـەر خـواردنی حـەڵاڵ، ئـەوە فەراسـەتی هـەرگیز بەهەڵـە لەگەڵیا نادوێ...

ئـەبو عـەباس ئەحمـەد کـوڕی موحەمـەدی کـوڕی سـەهل ی کـوڕی عـەطـاء ئـادەمی دەفـەرموێ: هەرکەسـێ نەفسـی خـۆی بـە ڕەوشـت و ئادابـەکانی شـەریعەت بـەخێو بکـات خـوای پـەروەردگار دڵـی بـە نـوری زانسـت و مەعریفەت ڕۆشن دەکاتەوە، لە کاتێکدا کە هیچ پلەو مەقامێك نییە بەڕێزتر بێ لە پلەی شوێنکەوتنی خۆشەویستی خوا ﷺ لە فرمانەکانی و وتەکانی و ڕەوشت و کردارەکانی..

هـەروەها دەفـەرموێ: هەرشـتێ پرسـیاری لێ دەکـەیت لـە زانسـت دا (شەریعەتی ئیسلامیدا) بۆی بگەڕێ ئەگەر نەتبینیەوە، ئەوە لـە گۆڕەپـانی پەندیاریـدا ئـەبێ، ئەگـەر لەویاشـدا نـەتبینی، ئـەو کاتـە پرسـیارەکەت بـە تـەرازووی یەکتاپەرسـتی بکێشـە، خـۆ ئەگـەر لـەم سـێ شـوێنەدا وەڵامـت دەست نەکەوت ئەوە بیدەرەوە بە ڕووی شەیتاندا..

ئەبو حەمزەی بەغدادی ناسراو بە (البزار) دەڵێ:

هەرکەسێ ڕێگەی خوای پەروەردگاری ناسی و لەسەری ڕۆیشت، خوای گـەورە هـەموو کارەکـانی بـۆ ئاسـان دەکـات، وە هـیچ بەڵگەیـەك نییـە بـۆ ناسینی ڕێگەی خوا، مەگەر بەڵگەی شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کردەوەو ئەحوال و فەرمایشتەکانیدا.

ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی داود ئەڕەقی ئەڵێ:

له نیشانەی خۆشویستنی خوایە: داچوون له خواپەرستی و ئیتاعەکردنی، وه شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا حەزرەتی محمد ﷺ.

ئەبو موحەمەد عبدالله ی کوڕی مەنازل دەڵێ:

کەس نییە کە یەکێ لە فەرزەکانی.خوا بفەوتێنێ مەگەر خوا موتبەلای دەکات بە فەوتانی سوننەتەکان، وە کەسیش نییە کە موتبەلابێ بە فەوتانی سوننەتەکان مەگەر نزیکە تووشی بەجێهێنانی داهێنراوەکان (البِدَع) دەبێ.[1]

## هەقیقەتی ئەشعەریەکان

زۆر لە ڕۆڵەی موسوڵمانان نەزان و عەوامن بە مەزهەب و ڕێبازی ئەشعەری، وە نازانن ئەشعەریەکان کێن، وە لە فرمانی عەقیدە و بیروباوەڕیان نەشارەزان، تەنانەت زۆریان لە ڕووی نەزانینەوە نسبەتی گومڕایی دەدەنە پاڵیان، یان هەیانە بە لەدین دەرچوو یان مولحید پێناسەیان دەکەن.

ئەم نەزانینە بەم ڕێبازە بووەتە هۆکاری پارچەبوون و پەرتەوازەیی یەکڕیزی ئەهلی سوننەت و نەمانی شکۆیان لەبەرچاوی دوژمنانیان، کە بە هۆیەوە هەندێکیان ئەشعەریەکانیان لەناو ڕیزی گومڕابووانـدا تۆمار

---

[1]- زانای بەڕێز و ناودار شێخ عبدالحفیظ المکی له نوسراوێکی بەهێز و نرخ دراویدا بەناوی (موقف أئمة الحركة السلفية من التصوف والصوفية) هەموو ئەو وتانە و ئاڕاو بۆچوون و پێناسانەی کۆکردۆتەوە، لەوانە وتە و ڕای هەریەکە لە (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ابن تيمية، ابن القيم، الذهبي، ابن كثير، ابن رجب، محمد بن عبدالوهاب)ی هێناوە کە چۆن پشتگیرن بۆ تەصەوف و مەدحی دەکەن و سەنای مەشایخانی صۆفیەکان دەکەن..

کردووه، ئیتر نازانم چۆن و بە چ پێوەرێك ئەوانە لەنێوان ئیمانداران و گومڕابواندا فرمانەکان ئەنرخێنن؟ وە چۆن بە یەکسانی سەیری ئەهلی سوننەت و دەرچووەکان لە دین وەك موعتەزیلە و جەهمیەکان ئەکەن؟
﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ . مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ القلم: ٣٥-٣٦.
ئەشعەریەکان: ئەوانە پێشەوای هیدایەت بەخشن لە زانایانی موسوڵمانان، کە زانستەکەیان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی داگرتووە، کە خەڵکی لەسەر ئەو فەزڵ و زانست و دینەی ئەوان قەرزارن، ئەوانە سەرگەورەی زانایانی ئەهلی سوننەن و لەڕووی دەرچوانی موعتەزیلەکان لە سەردەمی خۆیاندا لە سەنگەری جیهادی قەڵەم و نوسین و بانگەشەی هەق و ڕاستیدا بوون.

ئەوانە ئەو کەڵە پیاوانەن کە شێخ ئەبو موحەمەد لەبارەیەوە دەڵێ: وەك شێخی ئیسلام ابن تیمیە لە (الفتاوی)دا هێناویەتی: (زانایانمان سەرخەری زانستی دینن، ئەشعەریەکانیش سەرخەری ئوصولی دینن)[1] .

لەناو ئەشعەریەکاندا پیاوی لێکۆڵەرەوەی فەرموودەو ڕاڤەکاری قورئان لە زانایاندا دەرکەوت، وەك شێخی ئیسلام ئەحمەدی ناسراو بە (ابن حجر) ئەلعەسقەلانی کە بێ وێنە بوو لەم بوارەدا خاوەنی کتێبی (فتح الباری شرح صحیح البخاری) کە ئەشعەری مەزهەبە و کتێبەکەشی هەموو یەکێ لە زانایان چ لە کۆن و چ لە نوێ پێویستیان پێیەتی و ناتوانن لێی بێ نیازبن.
هەروەها پیری زانایانی ئەهلی سوننەت پێشەوا نەوەوی- خاوەنی (شرح صحیح مسلم) و هەموو ئەو نوسراو و کتێبانەی کە کەس نییە نەیانناسێ -ئەشعەری مەزهەبە-.

شێخ و پیری زانایانی تەفسیر و ڕاڤەی قورئان پێشەوا قورطبي خاوەنی تەفسیری (الجامع لأحكام القرآن) ئەشعەری مەزهەبە.

[1]- الفتاوی -ابن تیمیة- ٤/١٦.

شێخی فیقهو فەرموودە پێشەوا زەکەریا ئەنصاری ئەشعەری مەزهەبە.

شێخی ئیسلام ابن الحجر الهیتمی خاوەنی کتێبی (الزواجر عن أقتراق الکبائر) ئەشعەری مەزهەبە.

هەروەها پێشەوایان (ئەبوبەکری باقلانی، قەسطەلانی، نەسەفی، شەربینی، ئەبوحەیانی نەحوی خاوەنی تەفسیری (البحر المحیط)، ابن جوزی خاوەنی (التسهیل فی علوم التنزیل و...) غەیری ئەوانە هەموو ئەشعەرین.

گەر بمانەوێ ئەو زانا بەرزانە لە فەرموودەناس و ڕاڤەکارانی قورئان و شارەزایانی فیقهو شەریعەت لە پێشەوایانی ئەشعەری ببژێرین یان تۆماریان بکەین پێویستمان بە چەند کتێبی گەورە هەیە و کاتیش نایەت بە دەستمانەوە ، وئەو زانایانە بە زانستەکەیان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی سەرزەوییان ئاشنا کردووە... کە پێویستە لەسەر شانمان جوانی و چاکیەکان بۆ خاوەنەکانیان ببەینەوە، وە گەورەیی و فەزڵ و ڕێزی ئەهلی عیلم بزانین و بیانناسین، ئەوانە خزمەتکاری شەریعەت و ڕێبازی گەورەی پێغەمبەرانن ﷺ.

چ چاکەو خێرێك لەوەدا دەبینرێتەوە کە زانایانی ناوداری پێشینانی خۆمان لە پیاوچاکان بەرەو گومڕایی ببەین و لە خزمەتەکانیان خۆمان بێ سوود بکەین؟ .

ئەگەر باوەڕمان پێیان وایە کە ئەوانە لە دین لایانداوە و هەڵخلیسکاون لە ڕێگەی ئیسلام ئەی چۆن خوای گەورە دەرگای سوود و قازانج لەو زانستەی ئەوانەمان بۆ دەکاتەوە؟ .

من لێرەدا دەڵێم:

ئالەم سەردەمەی ئەمڕۆماندا لەنێوان زانایان دا لە (دكتۆرەكان) و بەناو عەبقەریەكان كەس هەیە بتوانێ لەو زانستەی ئەوان بهێنێ وەك ابن حجر العسقلانی و پێشەوا نەوەوی، وەك ئەو خزمەتەی ئەوان بە سوننەتی پێغەمبەر و زیندوكردنەوەیان، كەس تۆ بڵێی هەبێ ئەو ئیشە بكات كە ئەو دوو زانایە كردوویانە؟ هەزاران ڕەحمەت و مەرحەمەتی خوایان لەسەر بێ.

چۆن ئەو ئەشعەری مەزهەبانە بە گومڕا بناسێنین لە كاتێكدا كە پێویستمان بە زانست و زانیاری ئەوانەیە؟ .

چۆن زانست و زانیاریان لێ وەربگرین لە كاتێكدا ئەوانە لەسەر گومڕایی بن، لە كاتێكدا پێشەوا ئیبن سیرین ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ ئەڵێ: ئەم عیلم و زانستە دینە، بزانە لە كێ دین وەردەگری؟ .

ئایا باشتر وانەبوو ئەوانە بیانوتایە: ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ئیجتیهادیان كردووە و تیایدا هەڵەیان كردووە؟

بەڵێ گەر هەریەكە لە پێشەوا نەوەوی[1] و عەسقەلانی[2] و قورطبي[3] و باقلانی[4] و فەخری[5] ڕازی و هەیتەمی[6] و زەكەریای[7] ئەنصاری لە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت نەبن، ئەبێ كێ بێ ئەهلی سوننەت؟

من لێرەوە بە بانگەشەیەكی ڕاستەقینە، ڕوو دەكەمە هەموو ئەوانەی كە خۆیان بە بانگخوازی ئیسلام دەزانن كە : لە خوا بترسن لە حاڵی ئوممەتی پێغەمبەردا ﷺ وە بەتایبەت لە زانایان و پیاو خوایانی ئوممەت و هەڵبژاردەكانیان چونكە ئەم ئوممەتە لەسەر خەیر و چاكەن تا هاتنی ڕۆژی دوایی، كە هیچ خێر و چاكەیەك ڕوو لە ئێمە ناكات گەر دانی خێر و چاكە بە زانایان و پێشینانماندا نەنێین...[1]

---

[1]- بنوارە بۆ ئەو نوسراوەی شێخ محمد علی الصابونی كە سەبارەت بە ئەشاعیرە دایناوە...

## ئەو هەقیقەتانەی کە لەناو لێکۆڵینەوەکاندا دەمرێنرێن

زۆر لە لێکۆڵینەوەکان کە لەنێوان زانایاندا و بۆ کۆمەڵێ مەسئەلەی بیروباوەڕی بەردەوام بووە ، کە خوای پەروەردگار بەو شێوە هیچ جۆرە تەکلیفێکی لێ نەکردووین، وە من وا دەبینم کە ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانە لە بەرزێتی و بەهای ئەو هەقیقەتانە کەم دەکاتەوە و نایهێڵێ، لەوانە و بۆ نموونە ئەو جیاوازییەی کە لەنێوان زانایاندا دەرکەوتووە لەسەر بینین و بەخزمەت گەیشتنی خوای پەروەردگار لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ کە چۆن و بە چ شێوەیەك بووە، کە جیاوازی و ڕا دەربڕینێکی زۆر دوور و درێژ لەم باسەدا کراوە، هەندێ دەڵێن: بەدڵ خوای بینیوە، وە هەندێك دەڵێن بە چاوی سەری بە خزمەتی گەیشتووە، کە هەرکامیان بەڵگەی خۆیی پێیە و ڕایەکەی خۆی سەردەخات...

ئەوەی من لێرەدا دەیبینمەوە: داچوون لەو باسەدا بێ هودەیە و کات بەفیڕۆدانە و هیچ جۆرە سودێکی تیا نیە، زەرەرو زیانی زۆرترە لە قازانجەکانی، بەتایبەت لەو ساتەدا کە مرۆڤێکی نەزان گوێی لێوە دەبێ، دەکەوێتە ئەو حاڵەوە کە لە دڵیدا ئیشکالی بۆ دروست دەبێ و بگرە باوەڕی بە باسەکەش نامێنێ.. بەڵام گەر ئێمە ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانەمان پشت گوێ خست و بە جۆرە هەقیقیەکەی خۆی ئیکتیفامان کرد، کە خۆی چۆن هاتووە وا باسی بکەین دەبینین کە باسەکە بە قورسی و وەك خۆی لە دڵدا دەمێنێتەوە بەوەی کە بڵێین: پێغەمبەر ﷺ خودای بینیوە، لەوە زیاتر لێی نەدوێین، وە فێربوون و داچوون لە باسەکە هەڵبگرین بۆ ئەو کەسە خۆی.

## حەزرەتی موسا فەرمایشتی لە خزمەتی خوا کرد ،

## وتەی پیرۆزی خوای بیست، لە خواوە ڕاستەوخۆ وەڵامی وەردەگرت

کە ئەم باسەش بۆتە جێگەی لێکۆڵینەوەو قسە لەسەر کردن لەلایەن زانایانمانەوە سەبارەت بە هەقیقەتی وتەی خوای پەروەردگار، هەندێك دەڵێن: کەلامی خوای پەروەردگار نەفسی‌یە، هەندێکی تر دەڵێن: کەلامی خوای پەروەردگار پیت و دەنگە...

وە من پێم وایە کە هەردوو کۆمەڵەکە لە هەقیقەتی پاك و مونەزەهیەتی خوای گەورەدا یەکن و خۆشیان دوورە پەرێز دەگرن لە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان بە هەموو جۆرەکانییەوە..

مەسئەلەی کەلام و وتەی پەروەردگار، هەقیقەتێکی جێگیرەو هیچ ناکۆکیەکی لەگەڵ کەماڵی خوادا نییە و ماوەی باوەڕ پێنەبوونی نییە، کە یەکێکە لە سیفەتەکانی خوای پەروەردگار و لە قورئاندا جێگیر بووە و پێویستی باوەڕبوونمان پێی فەرزکراوە، کە تەنها خوا خۆی نەبێ لە هەقیقەت و ماهیەتی نازانێ.

ئەوەی کەمن بە باشی دەبینم و بانگەشەی بۆ دەکەم: جێگیربوونی ئەو هەقیقەت و ڕاستی‌ییەیە کە (بونی کەلامی خوایە) بێ داچوون لە چۆنیەتی و شێوەی دەڵێن: ئەوە وتە و کەلامی خوایە، خوای پەروەردگار سیفەتی (مُتَکَلِم)ی هەیە، خۆمان دوور دەگرین لە باس کردنی ئەوە کە نەفسی‌یە یان پیت و وشەیە یان بێ وتەو دەنگە یان وتەو بێ دەنگە، کە پێغەمبەرمان ﷺ باش خوای ناسیوە و لەو جۆرە داچوونەی نەکردووە، ئێمەش بێ زیاد و کەم کردن لەو سەرداوەمان وەرگرتووە، ئایا باس کردن و داچوون لەو باسەیە نابێتە شتێکی داهێنراو کە پێشینانمان باسیان نەکردبێ؟ .

## فەرموودەی: ( إني أراكُمْ مِنْ خلفي )

یەکێکی تر لەو باسانەی کە لێکۆڵینەوەی لەلایەن زانایانەوە لەسەر کراوە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە ئەفەرموێ (إِني أراكُم مِنْ خلفي كما أراكم مِنْ أمامي) مـن لـە پشـتی سـەرمەوە ئـەتانبینم هـەروەك چـۆن لـە پێشـەوە ئەتانبینم.

هەیە ئەڵێ: خوای گەورە دوو چاوی لە پشتی سەرەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ خەلق کردووە. وە هەندێ ئەڵێن: خوای گەورە هێزی بینینی چاوەکانی پێغەمبەری ﷺ بە شێوەیەك زیادکردووە کە بتوانێ ئەو شتانەی پشتی سەریشی ببینێ، وە هەندێکی تر دەڵێن: خوای پەروەردگار ئەو شتانەی لە پشتی سـەری پێغەمبـەرەوە ڕوو دەدەن پێچـەوانە دەکاتـەوە بـۆ بـەردەم پێغەمبەرو بە باشی دەیانبینێ...

هەموو ئەم باس کردن و تراوانە هەقیقەتی باسەکەمان لەبەرچاو تێك ئەدا و لە جوانی و ڕەونەقی کەم دەکاتەوە، هەیبەتی ناهێڵێ و بڕوا دانامەزرێنێ.

ئەو باسەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە پشتەوە شتەکانی دیوە وەك چۆن لە پێشەوە بینیویەتی، ئەوە هەقیقەتێکی جێگیرکراوی هەیە و خۆی صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ هەواڵی ئەو حاڵەی خۆی پێداوین و ماوەی ئینکاری کردنی یان باوەڕ پێ نەبوونی تیا نەهێشتووەتەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە بانگەشەی بۆ دەکەین و ئەیبینین ئەوەیەکە:

ئەم بینینە جێگیرە و هەقیقەتی هەیە وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ باسی لێوەکردووە، بێ ئەوەی بچینە ناو چۆنیەتی و چەندیەتیەوە و شێوەکانیەوە، پێویستە لەسەرمان کە باوەڕمان لەسەری جێگیر بکەین، کە

بەهۆیـەوە دەسـتەڵاتی خـوای پـەروەردگارمان زیـاتر بـۆ نومایـان دەبـێ و مەناقیب و گەورەیی حەزرەتی پێغەمبەریشمان زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە..

## جوبرەئیل لە شێوەی پیاوێکدا خۆی نیشان ئەدات

یەکێکی تر لەو باسانەی کە زانایان جیاوازی ڕایان لەسەر دەربڕیوە، ئەو چـۆنیەتی و شـێوەیەیە کـە جوبرەئیـل (علیـه السـلام) لـەکاتی هاتنـە خوارەوەیـدا و لەسـەر شـێوەی پیاوێـك دەرکـەوتووە... هەنـدێکیان دەڵـێن: خوا جوبرەئیل وا لێ دەکات کە بەشـەکانی لاشـەی دەخاتـەوە یـەك تـا بچوك بێتـەوەو ببینـرێ، وە هەنـدێکی تریـان دەڵـێن خـوای گـەورە لەلاشـەی دەفەوتێنێ تا بێتە سەر ئەو شێوە...

ئـەوەی مـن لێـرەدا ئـەیبینم: هـەموو ئـەم بۆچـوونانە بـێ سـوودە و بـێ هودەیە خۆ خەریك کردن بە لێکۆڵینەوە لەم باسە تـەنها کـات بردنـە سـەرەو خۆ هیلاك کردنە، ئێمە باوەڕمان جێگیرە لەسەر ئەوە کە خـوای پـەروەردگار سیفەتی (قادری) هەیەو ئەتوانێ لەو شێوەدا ببینێرێ، کە ئەمەش بینـراوە، هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ لەسـەر ئـەو شـێوەی مرۆڤـە بینیویانـە، ئـیتر بەلامانەوە گرنگ نییە، کە ئەو ڕێگەیە کامەیە تا شێوەی فریشـتەیەك بخاتـە سەر شێوەی مرۆڤێك...

کـە پێویسـتە خۆمـان لـەو بۆچـوونانە بـەدوور بگـرین تـا گـەورەیی باسەکانمان وەك خۆی بمێنێتەوە..

# تێگەیشتن لە تەوەسول

زۆر لــە خــەڵکی بەهەڵەداچــوون لــە تێگەیشــتنیان لــە تەوەســول و هەقیقەتەکەیدا، بۆیە لێرەدا ئەو هەقیقەتە تۆمار دەکەین لەسەر ئەو شێوەی کە ئێمــە ئــەیبینین کــە ســەرەتا پێویســتە چــەند ڕاســتیەك هەیــە بــەیانی بکەین:

یەکەم : تەوەسول یەکێکە لە ڕێگاکانی دۆعا و پاڕانەوە، وە دەرگایەکە بۆ ڕووکردنە زاتی پەروەردگار، کە مەبەستی ڕاستەقینەیی تیایدا زاتی خوایە، وە ئەو شتە یان کەسەیە کە تەوەسول و خاتری پێ دەکرێ تــەنها ناوەنــدەو وەسیلەیەکە بۆ نزیك بوونەوە لە زاتی پەروەردگار کە هەرکەس لەمە زیاتر و باوەڕی بە جۆرێکی تر بێ ئەوە هاوەڵی بۆ خوا بڕیارداوە..

دووەم : ئــەو کەســە یــان شــتە کــە تەوەســولی پــێ دەکــرێ تــەنها لەبــەر خۆشەویســتی خوایــە بــۆی، وە بــاوەڕی کەســەکەیە کــە خــوای پــەروەردگار خۆشـــی دەوێ گـــەر پێچـــەوانەی ئەمـــە دەرکـــەوت ئـــەوە زۆر دوورە لـــەو ڕاستیەوەو دەچێتە ناو باسی کەراهەت و حەرامییەتیەوە.

سێیەم : ئەگەر ئەو کەسەیە کە تەوەسول دەکات باوەڕی وابێ کە ئەو کەسەیە یان ئەو شتەیە خاوەنی سوود و زەرەرە بۆ خۆی، یان وەك خوا وایە و دەوری خـوا دەبینـێ ئـەوە بـەبێ گومـان خـۆی بێبـاوەڕ و موشـریك کردووە..

چـــوارەم : تەوەســـــول فرمـــــانێکی زەروری و پێویســـــت نییـــــە، وە وەڵامدانــەوەش لەســەری ڕانەوەســتاوە، بــەڵکو ئەســڵ تیایــدا پاڕانەوەیــە لــە خزمــەت خــوادا بــە شــێوەیەکی ڕەهــا هــەروەك خــوا دەفــەرموێ: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ﴾ البقرة: ١٨٦. کاتێ بەندەکانم داوا دەکەن من زۆر نزیکم لێیانەوە... یان دەفەرموێ: ﴿قُلِ ادْعُواْ اللّهَ أَوِ ادْعُواْ الرَّحْمَـنَ أَيّاً مَّا

تَدْعُواْ فَلَهُ الأَسْمَاء الْحُسْنَى﴾ الأسراء: ١١٠ تۆ بفەرموو پێیان با داوا لە خوا بکەن بە الله یان بە ( الرحمن) کە یەکێکن لە ناوەکانی خوا...

## ئەوەی لەسەری ڕێکەوتون لەسەر تەوەسول

هیچ کام لە موسوڵمانان جیاوازی ڕایان دەرنەبڕیوە لەسەر دروستی تەوەسول بۆ لای خوا بە کردەوە چاکەکان، هەرکەس بەڕۆژوو بێ یان نوێژ بکات یان قورئان بخوێنێ یان خێر و چاکە بکات، ئەوە تەوەسولی بە ڕۆژووەکەی و نوێژ و قورئان خوێندن و چاکەکانی کردووە، بەڵکو زۆر لەپێشترە بۆ وەرگرتن و گەیشتن بە مەرام و مەبەستی، کە دوو کەس نییە جیاوازیان لەسەر ئەمە هەبێ، بەڵگەش لەسەر ئەمە:

فەرموودەی ئەو سێ کەسەی کە لە ئەشکەوتەکەدا مانەوەو دەرگایان لەسەر داخرا یەکێکیان چاك جوڵانەوەی لەگەڵ دایك و باوکی کردە وەسیلە بۆ خزمەتی خوای گەورە، یەکێکی تریان دوورکەوتنەوەی لە خراپە کە توانای هەبوو بیکات کردیە وەسیلە، سێیەمەکەشیان پاراستنی ئامانەتەکەی کردە وەسیلەو تکاکاری بۆ خزمەتی خوای گەورە، خوای گەورەش دەرگای خێری لێ کردنەوە و ڕزگاریان بوو کە ئەمە جۆرێکە لە تەوەسول کە بە درێژی فەرموودەکە بەڵگەکانی لەسەری و لێکۆڵینەوەی ئەم باسەیەی کردووە شێخ ابن تیمیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە نوسراوەکەیدا بەتایبەت لە نامەکەیدا بەناوی (قاعدە جلیلە في التوسل والوسیلە)..

### شوێنی جیاوازی و خیلاف لەلای زانایان:

لەباسی تەوەسول دا شوێنی جیاوازی لەویادایە: کە تەوەسول بکەیت بەشتێك کە دوور بێ لەو کەسەوە کە تەوەسولەکەی بۆلا دەبەیت، وەك تەوەسول بۆ زات یان خەڵکی، وەك ئەوە بڵێیت: خوایە تەوەسولم بۆلای

تۆیە بە خاتری پێغەمبەرەکەت محمد ﷺ، یان تەوەسولم بۆلای تۆ بە ئەبی بەکری صدیقە، یان بە خاتری عومەری کوڕی خەتابە یان بە عثمان و بە عەلىیە (ڕەزای خوایان لەسەر) کە ئەمە لای هەندێك لە قەدەغەکراوەکانە.

ئەوەی ئێمە دەیبینین: ئەوەیە کە ئەو جیاوازىیە شکڵی و ڕووکەشىیەو جەوهەری نییە، چونکە تەوەسول بەزات لە هەقیقەتدا دەگەڕێتەوە بۆ تەوەسولی مرۆڤەکە بە کردەوەکانی، کە ئەمە لە سەر دروستی یەکڕایی لەسەرە، کە ئەگەر ئەو کەسانە کە بە قەدەغەکراویان داناوە بە چاوی بەصیرەتەوە لێی بکۆڵنەوە ئەو ڕاستیەیان بۆ دەردەکەوێ و ئەو فیتنەیەی کە بە هۆی ئەو باسەوە کەوتۆتەوە نامێنێ، کە لە پاڵیدا حوکمی شیرك و گومڕایىیان بەسەر زۆر لە موسوڵمانانەدا داوە..

لێرەدا ئەوە ڕوون دەکەمەوە کە ئەگەر پرسیرا کراو وترا: چۆن تەوەسول بە غەیری ئەو شتە دەکات، کە لە ڕاستیدا ئەو کەسە هاوار دەکات و خاتری ئەو کردەوە وەردەگرێ کە دراوەتە پاڵی کە لە کەسبی ڕۆژانەیەتی نەك کەسەکە؟ .

دەڵێم: بزانە کە گەر کەسێك تەوەسولی بە کەسێکی تر کرد، لەبەرئەوە کە خۆشی دەوێ و لە باوەڕیدا وایە کە مرۆڤێکی صاڵح و بۆ خوا گونجاوە و ویلایەت و ڕێزی خوای لەلایە کە ئەمە چاکی گومانە پێی، یان باوەڕی وایە کە ئەو کەسەیە خۆشەویستی خوای گەورەیەو لەپێناوی سەرخستنی ئەو دین و ڕێبازەدا ئەجەنگێ، یان باوەڕی وایە کە خوای گەورە ئەو کەسەی خۆش دەوێ وەك دەفەرموێ: ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ﴾ المائدة: ٥٤ یان ئەم هەموو باوەڕەی بەیەکەوە لەیەك کەسدا ئەبینێتەوە.

کە گەر وردبیتەوە دەبینیت کە ئەو خۆشەویستی و باوەڕەی کە بە کەسی تەوەسول بۆ لاکراودا هەیە لەبەر کردەوەکانیەتی، چونکە باوەڕ لەسەر ئەوە

دادەمـەزرێ کـە لـە دڵدایـە، کـە لەسـەری لێپرسـینەوە دەکـرێ و پاداشـتی لەسەر وەردەگرێتەوە، وەك ئەوە وایە وتبێتی: ئەی خوایە، مـن فلانـە کەسم خـۆش دەوێ وە لـەو بـاوەڕەدام کـە ئـەو فلانەیـە تـۆی خـۆش دەوێ، کـە دڵسۆزە بۆ تۆ و ئاینەکەت، لەپێناویا شەونخونی دەکات، وە لـەو باوەڕەدام کە تۆش ئەی پەروەردگار ئەو فلانەت خۆش دەوێ و لێی ڕازیـت، دەی خـوا بـەخاتری ئـەو خۆشەویسـتی‌یەم بـۆی و بـۆ خـاتری ئـەو بـاوەڕەم لەسـەری فلانە کردەوەو فلانەشتم بۆ بکە...

بـەلام زۆر لەوانـەی کـە تەوەسـول بـەکار دێـنن لـە دەربڕینـی ئـەم دەقـە (تەساموح) و چاوپۆشـی دەکـەن، وە ئـەزانن کە خـوای بالادەسـت ئاگـاداری دڵ و دەروون و نیەتەکەیانـە، کـە لـە هـیچ شـتێ لـە زەوی و ئاسمانـەکانی لێ ون نابێ ( يَعلمُ خائنةُ الأعين وما تخفي الصدور) ...

ئەگـەر کەسـێ وتـی: خوایـە مـن پێغەمبەرەکـەت دەکەمـە تکـاو ڕجـا بـۆ خزمەتت، ئەوە وەك ئەو کەسە وابوو کە وتـی: خوایە لەبەر خۆشەویستیم بـۆ پێغەمبەرەکـەت، ئـەم دووانـە یەکسـانن، چـونکە یەکـەمیان تـەنها لەبـەر خۆشەویسـتی و ئیمـان بـە پێغەمبەرەکەیـەو ئەگـەر خۆشەویسـتی و ئیمـانم نەبێ بە پێغەمبەرەکە هەرگیز نایکەمە وەسیلە بۆ خزمەت خوا...

کـە هـەر ئـەم بۆچـوونە بـۆ ئـەولیا و دۆسـتانی میللـەتی ئومـەی ئیسـلامی بەکاردێت..

لــەم ڕوانگــەو بۆچــوونەوە: ئــەو جیاوازی‌یــە کــە هەیــە لەڕاســتی دا جیاوازی‌یـەکی شـکڵی‌یەو پێویسـتی بـەم تەفرەقـە و دژایـەتی و حوکمـدانی کـوفر و کـافرکردنی ئەوانـەی تەوەسـول دەکـەن و دەرکردنیـان لـە سـنوری دائیرەی ئیسلام ناکات، بۆیـە دەڵێین: ﴿سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ﴾ النـور: ١٦.

## ئەو بەڵگانەی کە موسوڵمانان
## لەسەری کۆن سەبارەت بە تەوەسول

خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـواْ اتَّقُـواْ اللّـهَ وَابْتَغُـواْ إِلَيـهِ الْوَسِيلَةَ﴾ المائدة: ٣٥.

وەسیلە: بە هەموو ئەو شتانە دەڵێن کە هۆکارین بۆ گەیشتن بە خوا کە ناوەنـد و واسـیتەیەکن بـۆ جێبـەجێ کردنـی پێویسـتیەکان، کـە مەبەسـت تیایدا ئەو قەدر و حورمەت و ڕێزەیە بۆ وەسیلە لەلای ئەو کەسەیە..

وشەی وەسیلە وشەیەکی گشتیەیە وەك لە ئایەتەکەدا دیـارە، هـەموو ئـەو تەوەسـولانە دەگرێتـەوە کـە بـە زاتـی بـەڕێز و جـاهی پێغەمبـەران و پیاوچـاکانی ئومـەت چ لـەکاتی ژیـان و چ لـەدوای مردنیـان، وە هـەروەها کردەوەی چاکە کە تەوەسولی پێ دەکرێ لەدوای ڕوودانیان..

پشت بە خوا لێرەوە ئەو فەرموودانە و ئاسارانەی کە لـەم بارەوە هـاتوون کـە بـە شـێوەیەکی ڕوون کراوەیـی بـۆ ئایەتەکـە دەردەخـەن دەهێنینـەوە و دەیخەینـە بـەر دیـد و بسـتنتان تـا خۆتـان شـایەتی بـدەن کـە تەوەسـول و وەسـیلە و جـاه وەرگرتنـی پێغەمبـەر ﷺ تەنانـەت لـەپێش وەبونیـەوە و لەدوای بونیشی، لەدوای وەفاتی لە ژیانی بەرزەخ و لەدوای زیندوبونـەوەی ڕۆژی قیامەت دروستە..

با پێکەوە بگەینە خزمەت ئەو فەرموودانە.

## تەوەسول بە پێغەمبەرەوە ﷺ پێش بوون و وجوودی

### *تەوەسولی ئادەم پێغەمبەر بە پێغەمبەری ئاخر زەمانەوە:*

لە فەرموودەیەکدا هاتووە: کە ئادەم پێغەمبەر تەوەسولی بە پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی محمد ﷺ کردووە، (الحاكم) لە (المستدرك) هێناویەتی: بۆی گێڕاینەوە ئەبو سەعیدی عەمری کوڕی محمدی کوڕی مەنصوری عەدل، بۆی گێڕاینەوە ئەبولحەسەنی موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ی کوڕی ئیبراهیم ئەلحەنظەلی، بۆی گێڕاینەوە ئەبولحارث عەبدوڵلای کوڕی موسلیم ئەلفەهری، بۆی گێڕاینەوە ئیسماعیل کوڕی موسلەمە، هەواڵی داینێ عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکییەوە، لە باپیریەوە لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

((لما أقترف آدم الخطيئة قال: يا رب! أسألك بحق محمداً لما غفرتَ لي. فقال الله: يا آدم! وكيف عرفت محمداً ولم أخلُقْهُ؟ قال: يا رب! لأنَكَ لما خلقتني بيدك ونفختَ فيّ مِن روحِكَ، رفعتُ رأسي فرأيتُ على قوامِ العرشِ مكتوباً: لا إله إلا الله محمد رسول الله، فعلمتَ أنَكَ لم تضف الى إسمكَ إلاّ أحَبَّ الخلقِ إليكَ، فقال اللهُ: صدَقت يا آدم، إنهَ لَأَحَبُ الخلقِ إلَيَّ، أدعني بحَقهِ فقد غفرتُ لَكَ، وَلولا محمدِ ما خلقتكَ)) .

واتای فەرموودەکە:

(کاتێ ئادەم پێغەمبەر هەڵەکەی کرد، وتی: ئەی پەروەردگارا داوات لێ دەکەم بە هەقی محمد لەم گوناهەم خۆش بی، خوای پەروەردگار فەرمووی: ئەی ئادەم تۆ چۆن محمدت ناسی لە کاتێکدا خەلقم نەکردووە؟ وتی: ئەی پەروەردگار، بەوەدا ناسیم لە کاتێکدا منت خەلق کرد بە دەستی قودرەتی

خـۆت و فـوی موبارەکـت کـردە لاشـەم لـە ڕۆحـی خـۆت سـەرم بـەرزکردەوە نـواڕیم لەسـەر لاکـانی عـەرش نوسـرا بـوو (لا إلـه إلا الله ، محمـد رسـول الله) تێگەیشـتم کـە تـۆ نـاوی کـەس ناخەیتـە پـاڵ نـاوی خـۆت مەگـەر خۆشەویسـترین کەسـت نـەبێ لـە خـەلقانی خـۆت، خـوا فـەرمووی: ڕاسـت دەکـەیت ئـەی ئـادەم، ئـەوە موحەممـەدە خۆشەویسـترینی مەخلوقاتمـە، بەهۆی ئەوەوە داوات لێ کردم بۆیە ئەوا لێت خۆش بووم، وە بزانـە ئەگـەر ئەو موحەممەدە نەبووایە تۆم خەلق نەدەکرد).

ئـەم فەرموودەیـە (الحـاکم-لـە- المسـتدرك)یـدا هێناویـەتی و تـەخریجی کردووە و بەڕاستی داناوە (٦١٥/٢)[١]وە پێشەوا (السیوطي) لـە (الخصـائص

---

[١]- ئیمـامی (الحـاکم) هێناویـەتی و تـەخریجی کـردووە و بەڕاسـتی دانـاوە، ئـەڵێ (هذا حدیث صحیح الأسناد) کە ئەمە لە چەند ڕوویەکەوەیە:

یەکەم: لە کتێبی (المستدرك)دا باسی ئەم فەرموودەیەی کردووە کە ئەم کتێبە فەرموودەکانی لەسەر شەرت بە ڕاست داناوە کە هەموو فەرموودەکانی ڕاستە و پلەی (صحیح)ی هەیە لەسەر شەرتی دوو شێخەکەی فەرموودە: لێرەوە دروستە بۆ ئەو کەسەی ئەم فەرموودانە ئەگێڕێتەوە بڵێ (ئیمامی حاکم بەڕاستی داناوە) و پلەی (صحیح)ی داوەتێ.

دووەم: ئەوەی لە زانستی (أصول الحدیث)دا دانی پیانراوە: ئەوەیە کە وتراوە (الحافظ المعتمد) بێ، کە ئەمە حوکمی بەسەر صحەتی سەنەدێکدا ئەوە ئیتر دروستە بە شێوەی ڕەهاو موطلەق ئەو حوکمە بدەیت بەسەر مەتنەکەشدا، ئیتر با لەنێوان ئەو فرمانەدا ڕێکی نەبێت.

(العراقي) لە (الألفیة)دا دەڵێ:

والحکمُ للأسناد بالصحة أو..... بالحسن دون الحکم للمتن رأوا

واقبله إن أطلقه مَن یعتمد ..... ولم یعقبه بضعفٍ ینتقد

وە (السیوطي) لە (الفیته)ەکەیدا ئەڵێ: =

النبوية) داوه به ڕاستی داناوه.[1] وه پێشەوا (البيهقي) لـه (دلائل النبـوة) دا له (٤٨٩/٥)دا ڕیوایەتی کردووه، که (البيهقي) ناسراوه بەو کەسەی که هەر فەرموودەیەك لاوازبوو بێ نەیهێناوەو ڕیوایـەتی نەکردووه ئەگەر باسێکی لەسەر بێ له پێشەکییەکەیدا باسی لێوه کراوه.[2] هەروەها (القسطلاني)وه

---

= والحكم بالصحة للأسنادِ ..... والحسن دون المتن للنقادِ

لعلة أو لشذود واحكم ..... للمتن إن أطلق ذو حفظ نمي

وه له (طلعة الأنوار)دا دەڵێ:

واقبل لأِطلاقِ لصحة السندِ ... أو حسنة إن كان ممن يعتمد

سێیەم: ئەو زانایانەی کە ئەم فەرموودەیەیان لە (ئیمامی حاکم)ەوە هێناوە ئەڵێن: (صححه الحاكم) وەك (القسطلاني و الزرقاني) و (السُبكي)، که ئەمە ئەو ڕێگەیەیە لەبەرکارهێنان لە زۆرینی ئەو کەسانەوە کە مەنهەجی فەرموودە گێڕانەوەیان بووه.

[1]- (السيوطي) ئەم فەرموودەیەی لە ڕاڤەو تەفسیرەکەی خۆیدا کە ناوی (الدر المنثور)وه له (الخصائص) باسی کردووه.

وه له کتێبی (الرياض الأنيقة في شرح اسماء خير الخليفة ﷺ) لەلاپەڕە ٤٩وە تیایدا دەڵێ: ئیمامی حاکم لە (المستدرك)دا هێناویەتی بەڕاستی داناوه، وه (البيهقـي) لـه (دلائـل النبـوة)داهێناویـەتی وه ئـەڵێ: یـەکێك بـەناوی (عبـدالرحمن)ەوه هەیـە کـە لاوازه وه بـەهێزی کـردووه بـە شـاهیدەکەی لـە (الخصائص)دا که له (ابن عباس) وه ئەفەرموێ (أخرجه الحاكم وصححه)..

بەڵام قسەی هاتوو لە (مذاهل الصفا) که دەڵێ (لاوازه) واتە ئەو ڕێگەیەی کە له (ابن عمر)ەوه هاتووه هەروەك خۆی دەڵێ: رواه عن ابن عمر سند ضعيف.

بـەڵام ئـەوەی ڕاسـتە و هـاتووه کـە ئـەم فەرموودەیـە صـەحیحە بـە هـەموو شاهیدەکان و ڕێگاکانیەوه وه لەسەر ئەم وتەیە یەك دەنگن.

[2]- که له دوای ڕیوایەتەکەی دەڵێ: (تفردبه عبدالرحمن بن زيد وهو ضعيف).

الزرقـانی لـه (شـرح المواهـد اللدنیـد)دا بەڕاسـتیان دانـاوه[1]، وه پێشـەوا (السُبكي) لـه (شـفاء السقام)دا هێناویـەتی، وه پێشـەوا (الحـافظ الهیثمـي) ئەفەرمووێ: ئەم فەرموودەیه پێشەوا (الطبراني) له کتێبەکەیدا (الأوسط)و (الصغیر) دا ڕیوایەتی کردووه.[2]

وه لـه ڕێگەیـەکی تـرەوه لـه (ابـن عبـاس)ەوه بـەم شـێوەیه هـاتووه: (فلـولا محمد ما خلقتُ آدم، ولولا محمد ما خلقتُ الجنةِ ولا النار)[3]

---

[1]- (القسـطلاني) بەڕاسـتی دانـاوه لـه چـەند شـوێنێکی جیـاوازدا لـه کتێبـی (المواهب) کۆتاییەکەی ئەوەیانه (٣٩٢/٢) که چاپی (دار الکتب العلیة)یه، که بەم چاپه دەرکەوتووه بۆ هەموو ئەوانەی که وا گومانیان بردووه که قسگلانی وای نەوتبێ بەڵام (الزرقانی) له (شـرح المواهـب)دا بەڕاسـتی دائەنێ و له چەند ڕوویەکەوه باسی دەکات.

(لەلای وتـەی (مالـك) لـه ئـەبی جەعفـەر کاتـێ لێیـان پرسـی لەڕووکردنـه گـۆڕ لـه حاڵـەتی دوعـادا: کـه فـەرمووی: (دەی بۆچـی ڕووت لـەو زاتـه وەرئەچـەرخێنی لەکاتێکدا که ئەوەیه وەسیەله بۆ تۆ و بۆ باوکه ئادەمت)؟

الزرقانی ئەڵێ: (قاچی عیاچ) لـه (الشـفا)دا ڕیوایـەتی کـردووه بـه ئیسـنادێك کـه (لابـأس بـه) بـۆ بـەکارهێناوه بـەڵکو دەڵـێ: ئـەو فەرموودەیـه (صـحیح)ه لـه (ج٨ ص٣١٤) که مەبەست فەرموودەی تەوەسولی ئادەمه که باسمان کرد.

وه بنواره بۆ (الزرقانی) لەسەر گێڕانەوەکەی (ابن عباس) دەڵێ الحـاکم بەڕاسـتی داناوه وه السُبکی له (شفاو السقام)دا دانی پیاناوه وه (البلقینی) له فتاواکانیدا هێناویەتی که نموونەی ئەوانه ڕاست نەبێ نایڵێن ٤٤/١.

[2]- الهیثمي له (مجمع الزوائد ٣٥٣/٨)دا هێناویەتی.

[3]- الحاکم ڕیوایەتی کردووه له (المستدرك) ٦١٥/٢وه ئەڵێ (صحیح الأسناد) وه شێخ الأسلام البلقیني له فتاواکانی بەڕاستی داناوه وه ابن الجوزی لـه (الوفا)دا هێناویـەتی وه (ابن کثیر) له (البدایة) وا نەقڵی کردووه ٨١/١

لێرەدا هەندێ لە زانایان جیاوازی ڕایان دەربڕیوە و وتەیان لەسەر پلەی فەرموودەکە هەیە و هەڵبەستراو دانیان پیاناوە لەوانە (الذهبی) وە هەندێکی تریان حوکمی لاوازیان بەسەردا داوە وە هەندێکیان پلەی ئینکاریان هەیە بۆی، لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە یەك ڕاییان نییە بۆ یەك حوکم لەسەر ئەم فەرموودەیە:

کە ئەم باسەیە خۆی لە چەند باسێکدا ئەبینێتەوە کە قسەی لەسەر بکرێ لەنێوان (جێگیرکردن و ڕەدکردنەوە) یان (وەرگرتن و وەستان لەسەری) کە ئەمەش بەپێی جیاوازییانە لەسەر پلەی فەرموودەکە، ئەمە لەبارەی سەنەدی فەرموودەکەو جێگیربوونی بەڵام لەبارەی ماناکەیەوە با بوار بدەین بە شێخی ئیسلام (ابن تیمیة) خۆی بۆمان باس بکات.

## شایەتەکان بۆ فەرموودەی تەوەسولی ئادەم پێغەمبەر (علیه السلام)

زانا (إبن تیمیة) دوو فەرموودەی لەم باسەدا هێناوە کە ئێمە وەك شایەتێك دەیهێنینەوە.

ئەبولفەرەج (ابن الجوزي) ئەیگێڕێتەوە بە سەنەدی خۆی لە مەیسەرەوە دەڵێ: وتم: يا رسول الله! متى كنتَ نبيّاً؟

ئەی پێغەمبەری خوا تۆ کەی بوویەتە پێغەمبەرو نێراوی خودا؟

قال: لما خلق الله الأرض واستوى الى السماء فسواهن سبع سموات، وخلق العرش، كتب على ساق العرشِ، محمد رسول الله خاتم الأنبياء، وخلق الله الجنة التي أسكنها آدم وحواء فكتب إسمي على الأبواب والأوراق والقباب والخيام، وآدم بين الروح والجسد، فلما أحياهُ الله تعالى نظر الى العرش فرأى

إسمي وأخبره الله، إنَهُ سيد وُلِدك، فلَما غرّهما الشيطان تابا وآستشفعا إسمي إليه).

واته: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ خوای گەورە زەوی خەلق کرد و حەوت ئاسمانەکەی لەسەر راسەری دانا و بەرز کردەوە، وە عەرشی دروست کرد، لەسەر لایەکانی عەرشی نوسی: محمد پێغەمبەری خوایەو کۆتای پێغەمبەرانە، وە خوا بەهەشتی خەلق کرد کە ئادەم و حەوای تیادانا لەسەر دەرگاکانی بەهەشت و گەڵای درەختەکان و دیوار و شوێنەکان ناوی منی نوسی، لەو کاتەدا ئادەم لەنێوان رۆح و لاشەدا بوو، کاتێ خوای گەورە ئادەمی ژیان ئادەم نواڕی بۆ عەرش و ناوی منی بینی وە خوا هەواڵی دا بە ئادەم: ئەو موحەمەدە گەورەی ئەولادەکانی تۆیە، وە کاتێ شەیتان ئادەم و حەوای لەخشتە برد و خوا لێیان خۆش بوو بە خاتر و شەفاعەتی ناوی منەوە کە لەویادا بینیبووی تەوبەیان لێ وەرگیرا.

ئەبو نەعیم لە کتێبی (دلائل النبوة) ریوایەتی کردووە، وە لە رێگەی (شێخ ئەبی لفەرەج)ەوە، بۆی گێڕاینەوە سولەیمان کوڕی ئەحمەد، بۆی گێڕاینەوە ئەحمەدی رەشدەین، بۆی گێڕاینەوە ئەحمەدی کوڕی سەعیدی ئەلفەهری، بۆی گێڕاینەوە عەبدوڵلای کوڕی ئیسماعیلی ئەلمەدەنی، لە عەبدولرەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە، لە عومەری کوڕی خەطابەوە گێڕایەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی:

(لما أصابَ آدَمُ الخطيئة رفع راسهِ و قال: يا رَب بحقِّ محمدٍ الاّ غفرت لي، فأوحى إليه وَما محمد وَمن محمد؟ فقال: يا رَب إذ بِك لما أتممت خلقي رفعت راسي إلى عرشِكَ، فإذا عليه مكتوب! لا إله إلا الله محمد رسول الله، فعلمتُ انهُ أكرم خلقِكَ عليكَ إذ قرنتَ اسمه مع أسمِكَ فقال: نعم، فقد غفرتُ لك وهو آخر الأنبياء مِن ذريتكَ ولولاهُ ما خلقتُكَ) .

واتـە: کاتـێ ئـادەم پێغەمبـەر سەرپێچـەیەکەی کـرد سـەری بـەرزکردەوە وتـی: ئـەی پـەروەردگار تـوو هـەقی موحەمـەد لـێم خـۆش ببـە، خـوای پەروەردگار وەحـی بـۆ کـرد کـە ئـەو موحەمـەدە کێیـە؟ عـەرزی کـرد: ئـەی پەروەردگار تۆ کاتێ کە منـت بەدیهێنا سـەرم بلند کـرد بـۆ لای عەرشـی تـۆ بینیم نوسرا بوو (لا إله إلا الله محمد رسول الله) زانستم پەیدا کـرد کـە ئـەوە بـەڕێزترین مـەخلوقاتی تۆیـە بۆیـە نـاوت لـەپاڵ نـاوی خـۆت دانـاوە، خـوا فەرمووی: بەڵێ، ئەوە لێت خۆش بووم، ئەوە کۆتا پێغەمبەرانە لە نەوەی تۆ وە ئەگەر ئەو نەبووایە تۆشم دروست نەدەکرد.

کـە ئـەم فـەرموودە پشـتگیری فەرموودەکـەی پێشـوو دەکـات کـە هەردووکیشیان ڕوون کەرەوەو ڕاڤەی فەرموودە ڕاستەکانە.[1]

منیش دەڵێم: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەم فەرموودەیە لـەلای ابن تیمیـە جێگـەی ئیعتبـار و شـایەتی یـە، چـونکە هەڵبەسـتراو یـان بـەتاڵ بـە شـایەت وەرنـاگیرێ لـەلای زانایـانی فـەرموودە وە لێـرەدا زۆر بـە چـاکی دەبینیت چۆن شێخ بەڵگەی پێ هێناوەتەوە.

## ڕاستکردنەوەی ابن تیمیە بۆ مانای ئەم تایبە تمەندییە

ابـن تیمیـە لـەم باسـەدا بـە شـێوەیەکی جـوان وتەکـەی بـاس دەکـات کـە بەڵگەیە لەسەر ژیری و چاو ڕۆشنییەکی گەورە، چونکە ئەگەر نەفی بوونی فەرموودەیەك بکات لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ کـە لـەم مانایەدا بێ (کـە ئـەوەش بـەپێی ئـەو زانسـتەی ئـەو کاتـە هـەی بـووە) ئـەوە گەڕاوەتـەوەو تەئکیـدی لەسـەر کـردووە و پشـتگیری مانـا و ڕاڤەیـەکی ژیـری و عـەقڵی بـۆ هێنـاوە و وتەکەی خۆیی ڕاست کردۆتەوە، کە بەمەش بەرپەرچی ڕوونی داوەتەوە بۆ

---

[1]- بنوارە بۆ الفتاوی ۲/۱۵۰.

ئەو کەسانەی کە وا گومانیان بردووە کە ئەوە لە مانای شیرك یان کوفردا بوو بێ، و بۆ ئەوانەش کە ئەو مانایان بە بەتاڵ و خراپ دەزانن، وە بۆ ئەوانەش کە وا گومانیان بردووە کە ئەوە نزمی بۆ پلەو مەقامی تەوحید و مونەزەهیەت هەبێ، کە ئەمانە تەنها هەواو کوێری و خراپ تێگەیشتنە تەسکی ژێرو عەقڵیانە، خوا چاوی دڵمان ڕۆشن بکاتەوەو ڕێنومایمان بکات بۆ سەر ڕێگەی هەق و ڕاست، چونکە تەنها ئەوە ڕێنیشاندەر و هیدایەت بەخشە.

ابن تیمیە لە (الفتاوی) (٩٦/١١)دا دەڵێ: (موحەمەد گەورەی نەوەی ئادەمەو بەڕێزترین دروستکراوانە، لێرەوە هەیە دەڵێ: خوای گەورە دروست کراوانی جیهانی لەبەرئەو خەلق کردوە یان ئەگەر ئەو موحەمەدە نەبووایە خوا عەرش و کورسی و ئاسمان و ئەرز و مانگ و خۆری دروست نەدەکرد، بەڵام ئەمە فەرموودە نییە لە پێغەمبەرەوە نەبیستراوە، نە بە پلەی ڕاست نە بە پلەی لاواز وە کەسیش لە زانایانی فەرموودە نەیانهێناوە لە پێغەمبەرەوە بەڵکو ئەوە وتەیەکە لە یەکێکەوە دەردەچێ کە هەرگیز صەحابەش ناناسێ، بەڵکو خاوەنەکەی نازانێ چۆن وتوویەتی، وە ئەگونجێ لەسەر شێوەیەکی ڕاست ڕاڤە بکرێ، وەك خوا ئەفەرموێ: ﴿سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ لقمان: ٢٠، یان ﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنْهَارَ . وَسَخَّر لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَآئِبَينَ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ . وَآتَاكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ ابراهیم ٣٢-٣٤.

وە لە نموونەی ئەم ئایاتانە کە تیایدا ڕوون کراوەتەوە کە خوا مەخلوقاتی لەبەر مرۆڤ خەلق کردووە، وە زانراویشە کە بۆ خوا هەیە بەرنامە و یاسایەکی گەورە لەو زەویەدا...

ئەگەر وترا: فلان کردەوە و کردەوەی کرد، کە حیکمەتی تیا نەبێ یان بڵێ: ئەگەر فلان شت نەبووایە فلان شت خەلق نەدەبوو کە ناگونجێ شتێك لە حیکمەتەکان تیایدا نەبێ، بەڵکو گونجاوە لە کاتێکدا کە باشترین نەوەکانی ئادەم محمد بێ، وە خەلق بوونەکەی غایەیەکی داواکراو و پڕ پەند و حیکمەتێکە مەبەست پێ دراو بێ بەڵکو لەوەش گەورەتر بێ، بۆیە دەبێتە تەواوی خەلق و کۆتایی چاکی تەنها بۆ محمد پێغەمبەر ﷺ لێرەدا وتەکە تەواو بوو...

## ڕوون کردنەوەیەکی گرنگ بۆ ڕایەکی شێخ (ابن تیمیه) کە لای مێشکی شوێن کەوتوانی وونە

خوا هیدایەتت بدات بنواڕ بۆ وتەکەی (ابن تیمیه) و بە وردی لێی تێبگە کە چۆن ڕاڤە و تەفسیری ئەو تایبەتمەندییە ئەکات کە بڵاوبۆتەوە، چۆن فەرموودەی تەوەسولی ئادەم دەهێنێتەوە کە ئیمامی حاکم ڕیوایەتی کردووە و بەڕاستی دایناوە لە فەرموودە ڕاستەکاندا، کە وەرگێراو بووە لەلای وەرگێراوان کە لە پێشتر باسمان کردووە...

ئە ئەمە شیخ ابن تیمیەیە لەم بوارەدا دەڵێ: (إنّ هذا الكلام له وجه صحيح)..

ئەم وتەیە لەکوێ و وتەی ئەوانە لەکوێ کە لە دونیادا پاڵیان داوەتەوەو خاوەنی ئەو وتانە لە بازنەی ئیسلام دەردەکەن و وەسفداریان ئەکەن بە گومڕا و هاوەڵ بڕیاردەر، یان بە خاوەنی داهێنراو و دروستکەر لەقەڵەمیان ئەدەن، پاشان بوهتان و درۆ ئەکەن و خۆیان بە سەلەفیەکی تەیمیەیی دەناسێنن کە ئەوان زۆر دوورن لە ابن تیمیەوە و لە سەلەفیەتیشەوە.

که له شیعەی ابن تیمیەیە کە لەگەڵ هەموو باسەکاندا ڕێز و گەورەیی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات یان تەئید و پشتگیری کەرامەت و ڕێز و پلەی دەکات، کە بێدەنگ بووە بەڵام تێفکرینی بەکارهێناوە، بۆیە دەڵێین:
( سبحانَكَ هذا بُهتانٌ عظيم ) ...

## شایەتی سێیەم بۆ فەرموودەی تەوەسولی ئادەم

شاهیدی سێیەممان ئەو فەرموودەیەیە کە (ئیبنولمنزر) لە تەفسیرەکەیدا تەخریجی کردووە لە محمدی کوڕی علی کوڕی حسینی کوڕی عەلی‌یەوە ڕەزای خوایان لێ بێ وتوویەتی:

( لە کاتێکدا ئادەم تووشی ئەو هەڵەو ناڕەحەتیە گەورەیە بوو وە پەشیمانی دایگرت، جبرەئیل (علیه السلام) هاتوو پێی وت: ئەی ئادەم ئایا پێت بڵێم ئەو دەرگایەی تەوبەی تیا دەردەبڕی کامەیە تا خوا بەهۆیەوە لێت خۆش ببێ؟ وتی: بەڵێ ئەی جوبرەئیل... فەرمووی: هەڵسە بچۆ بۆ ئەو شوێنەی کە تیایدا موناجاتی پەروەردگارت دەکەیت (سوپاس و ستایش و سەنای) خوای خۆت بکە تیایدا، چونکە هیچ شتێك نییە کە خوا پێی خۆش بێ زیاتر لە مەدح و سەنا، وتی: ئەی جوبرەئیل بڵێم چی؟ فەرمووی: بڵێ (لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شريك له، لَهُ الملك وَلَهُ الحمد يُحي و يُميت وهوَ حيٌّ لا يموت بيدهِ الخير كله وهو على كُلِ شيء قدير) پاشان دان بە تاوانەکەتدا بنێ و بڵێ: سُبحانَكَ اللهمُ و بحَمدِكَ لا إله إلا انتَ رَبِّ إني ظلمتُ نفسي و علمتُ السُوءَ فاغفرلي إنَهُ لا يُغفِرِ الذنوبَ إلاّ انت) پاشان بڵێ:

خوایە داوات لێ دەکەم بە جاه و مەقامی پێغەمبەر محمد کە بەندەی تۆیە و ڕێزگیراوە لەلات کە لەم گوناهەم خۆش ببی، ئەفەرموێ ئادەم ئەمەی

خوێند، پاشان فەرمووی: ئەی ئادەم کێ ئەمەی فێر کردی؟ عەرزی کرد: ئەی پەروەردگارا، لەو کاتەدا رۆحت کردە لاشەم و هەڵسامە سەرپێ و بیستن و بینین و ژیریم تەواو بوو سەیری لایەکانی عەرشم کرد نوسرا بوو (بسم الله الرحمن الرحيم. لا إله إلا اللهُ لا شريك له محمد رسول الله) ، بینیم ناوی پاشایەکی نزیك ، یان پێغەمبەرێکی نێراوت جگە لە ناوی ئەو موحەمەدە نەبێ بۆیە بۆم دەرکەوت کە ئەو بەڕێزترینی مەخلوقاتی تۆیە و ڕێز لێگیراوە.. فەرمووی: ڕاستەکەیت (وقد تبتُ عليك وغفرتُ لَكَ خطيئتك) ئەوە لێت خۆش بووم و لە گوناهەکەت بورام.[1]

## شایەتی چوارەم بۆ فەرموودەی تەوەسولی ئادەم

شایەتی چوارەممان ئەو فەرموودەیەیە کە (أبو بكر الآجري) ڕیوایەتی کردووە لە پەرتوکی (الشريعة) لە (٢٤٦/٢)دا دەڵێ:

هارون کوڕی یوسفی تاجر بۆی گێڕاینەوە وتی ئەبو مەروانی عثمانی بۆی گێڕاینەوە وتی: باوکم بۆ باس کردم واتە (عثمان کوڕی خالد) لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی زەنادەوە وە ئەویش لە باوکیەوە وتی: لەو وتانەی ئادەم کە خوا بەهۆیەوە لێی خۆش بوو ئەوە بوو وتی: (اللهم إني أسألك بحق محمد عليك) خوایە داوات لێ دەکەم توو حەقی ئەو محمدە (تۆ ڕێزی ئەو محمدە) لەلای تۆ، خوا فەرمووی ئەی ئادەم تۆ چۆن محمد

---

[1]- بنوارە بۆ (الدر المنثور)ی السيوطي ٦٠/١، وە محمدی کوڕی علی کوڕی حسین کە ناسراوە بە أبو جعفر الباقر کە لە باوەڕپێکراوانی تابعین و سەرگەورەیانە، وە تەخریجی ئەم فەمودەشیان کردووە شەش کەسەکە، وە ڕیوایەتیان کردووە لە (جابر و أبی سعید و ابن عمرو غەیری ئەوانەوە)..

ئەناسی؟ وتی: ئەی خوایە، سەرم بەرز کردەوە بۆ عەرشی تۆ بینیم نوسراوە (لا إله إلا الله محمد رسول الله)
بۆیە تێگەیشتم کە ئەو لە بەرێزترینی دروست کراوانی خۆتە لەلای تۆ.
ئەم گێڕانەوەیە کە ئەدرێتە پاڵ فەرموودەکەی عبدالرحمن ی کوڕی زەید یەکتری بەهێز دەکەن و ئەمەش لای زانا شاراوە نییە.

## چوونە بەهەشت حەرامە لەسەر پێغەمبەران تا پێغەمبەر محمد نەچێتە ژوورەوە ﷺ

یەکێکی تر لە نموونەی ڕێزلێگرتنەکانی خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەری خۆشەویست ئەم فەرموودەیە کە نابێ هیچ کام لە پێغەمبەران بچنە بەهەشتەوە تا پێغەمبەر محمد ﷺ نەچێتە ژوورەوە.
عن عمر بن الخطاب (ر.ض) عن رسول الله ﷺ قال:
(الجنةُ حُرِّمَت على الأنبياء حتى أدخُلَها، وَ حُرِّمَتْ على الأُمم حتى تدخُلَهَا أمتي)[1] .
(بەهەشت حەرام گێڕاوە لەسەر پێغەمبەران بچنە ناوی تا من نەچمە ژوورەوە) وە حەرام گێڕراوە لەسەر ئومەتان بچنە ناوی تا ئومەتی من نەچنە ژوورەوە)..

---

[1]- الطبراني ڕیوایەتی کردووە لە (الأوسط) وە (الهیثمي) دەڵێ: ئیسنادەکە –حسن–ە بنواڕە بۆ (مجمع الزوائد–١٠/٦٩).

## پەیوەندی کەوون بە پێغەمبەرەوە ﷺ

نموونەیەکی تر لەو ڕێزداریەی پێغەمبەر ﷺ کە خوا پێی بەخشیوە: هاتووە لە گێڕانەوەکاندا کە ناوی (محمد ﷺ) بڵاوبۆتەوە لە هەموو شوێنە بەرزەکان واتە (الملأُ الأعلی)دا:

(کعب الأحبار) دەڵێ: (ئادەم پێغەمبەر بە پێغەمبەر (شیث)ی کوڕی وت: ئەی کوڕم! تۆ جێنشینی منی لەدوای من، ئەم ئەرکە بگرە ئەستۆ بە خواپەرستی و دەست گرتن بە (عروەتولوثقی) وە هەر کاتێ زیکرو یادی خوات کرد لە پاڵیا ناوی محمد-یش ببە چونکە بینیم ناوی محمد نوسرا بوو لەسەر ئەملاولای عەرشی خوا، لە کاتێکدا من لەنێوان ڕۆح و قوڕدا بووم، پاشان بزانە هەموو ئاسمانەکان گەڕاوم نەمبینی لە شوێنێکیدا ناوی محمد نەنوسرا بێ وە لە بەهەشتا کە خوا داینام، نەمبینی کۆشکێ یان ژوورێك ناوی محمدی لەسەر نەنوسراو بێ، وە بزانە ناوی محمدم بینی نوسرا بوو لەسەر ناوچەوانی حورولعەین، لەسەر پەڕەی درەختی طوبی، لەسەر پەڕەی سدرة المنتهی، وە لەسەر نێوچاوانی فریشتەکان، ئەی کوڕم زیکری پێغەمبەر بکە چونکە لە هەموو کاتژمێرێکدا فریشتەکانی یادی ئەکەن..)[1] .

دەڵێم: لە نموونەی ئەم گێڕانەوەیە (شیخ ابن تیمیه) هێناویەتی: دەڵێ (وَقد رُويَّ أنَ اللهَ كتبَ إسمُهُ على العرش وَعلى ما في الجنة مِنَ البَوارِ والقُباب والأوراق) .

واتە: ڕیوایەت کراوە کە خوای گەورە ناوی محمدی لەسەر عەرش و لەسەر ئەو شتانەی لە بەهەشتایە نوسیوە لەسەر دەرگا و درەخت و پایەو...)

---

[1]- بنوارە بۆ (المواهب اللدنية)ی القسطلاني ١/١٨٦.

وه زۆر لـەو ڕیوایەتانـەی تـر کـە گێڕاونەتـەوەو پشـتگیری ئـەم وتانـەی سەرەوەمانن لەوانە:

(ابن الجوزی) ئەیگێڕیتەوە لە مەیسەرەوە کە دەڵێ:

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا: متـی کنتَ نبیاً؟ تـۆ کـەی بوویتـە پێغەمبـەر (واتـە ڕوتبـەی پێغەمبـەرێتیت پـێ درا؟) فـەرمووی: (لمـا خلـق اللهُ الأرض وآستوی الی السماءِ فسواهُنَّ سبع سموات وخلق العرش، کتب علی ساقِ عرش (محمد رسول الله وخاتم الأنبیاء)، و خلق اللهُ الجنة التي آسکنها آدم وحواء فکتب إسمي علی الأبوابِ والأوراقِ والقباب والخیام وآدم بین الروح والجسد، فلما أحیاهُ الله تعالی نظر إلی العرشِ فرأي إسمي، فأخبَرهُ الله أنَهُ سیدُ وُلدِكَ، فَلما غرَّهُما الشیطان تابا و استشفعاً بإسمي إلیهِ)[1] .

واتـە: کاتـێ خـوای گـەورە زەوی دروسـت کـردو ئاسمانـەکانی کـرد بـە کۆڵەکە بۆی و حەوت چینی لەسـەر یـەك دانـا و عەرشـی خـەلق کـرد لەسـەر لایەکانی عەرشی نووسـی (محمـد پێغەمبـەری خوایـەو کۆتـای پێغەمبەرانە) پاشان بەهەشتی دروست کرد ئەو بەهەشتەی کە ئادەم و حەوای تیادانا نـاوی منـی لەسـەر دەرگاکـان و گـەڵای درەختـەکان و بەیداخـەکان نوسـی لەکاتێکدا کە ئادەم لەنێوان ڕۆح و لاشەدا بوو، کاتـێ خـوای گـەورە ئادەمی ژیاند سەری بەرزکردەوە بۆ عەرش ناوی منـی بینی، خـوای گـەورە هـەواڵی دا پـێی کـە ئـەو موحەمـەدە گـەورەی ئـەولادەکانی تۆیـە، وە کاتـێ تووشـی داوی شەیتان بوون بە شەفاعەتی ناوی من خوا لە هەردوکیان خۆش بوو.

---

[1]- بنوارە بۆ (الفتاوی) ابن تیمیة ١٥/٢.

## سووده گرنگەکان لە فەرموودەی تەوەسولی ئادەم

لە فەرموودەی تەوەسول بە پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی کە لاشەی بێتە دونیاوە، تێدەگەین کە ئەوەی تەوەسول بۆلا دەکەین ئەبێ خاوەنی پلەو مەقامێکی بەرز بێ لای خوا ئیتر بە مەرج نەگیراوە کە ئەوە زیندووبێ و لە دونیادا بێ، وە سودێکی تر: تێدەگەین: کە ئەوانەی ئەڵێن تەوەسول دروست نییە بە کەسەوە مەگەر کەسەکە لەژیاندا بێ و زیندووبێ و لە دونیادا بێ، ئەمەش وتەیەکی هەڵە دەردەچێ تەنها ئەوانەی دەیڵێن شوێن هەواو ئارەزووی دەروونیان کەوتوون و لەسەر ڕێنمایی خوایی نین.

**کورتەیەك بۆ پلەی فەرموودەکە :**

بە کورتی: ئەم فەرموودەیە بە کۆمەڵێ شایەتی تر بەهێز دەبێ و دەبێتە (صحیح) کە هەموو ئەو شاهیدانە لە زانایانی بەرزەوە گێڕاونەتەوە، لە زانایانی فەرموودەناس و پارێزەرانی فەرموودەوە هاتوون کە خاوەنی پلەو مەکانەتێکی دیار و ئاشکران و ناسراون بە (الأمناء على السنة النبوية)، لەوانە: (الحاكم، السيوطي، السبكي، البلقيني).

وە پێشەوا (البيهقي) لە کتێبی (دلائل النبوة)دا گێڕاویەتیەوە، کە ئەم زانایە بە شەرتی گرتووە کە ئەم کتێبەی فەرموودەی (موضوعات)ی تیا نەبێ، کە شێخی (الذهبي) لەبارەیەوە

دەڵێ: (عليكَ بهِ فإنَهُ كلُهُ هدى ونور)[1] .

لەسەرتە بەم کتێبەی البيهقي چونکە هەمووی هیدایەت و چاوڕۆشنییە.

وە پێشەوا (ابن كثير) لە کتێبی (البداية) دا باسی کردووە و وتەکەی (ابن تيمية) کە لە (الفتاوى)یدا هێناویەتی کراوە بە شایەت..

---

[1]- بنوارە بۆ (شرح المواهب) ٦٢/١

وه ئەوەش كە زانايان جياوازى ڕايان هەبووه لەسەرى، هەندێكيان ڕەدى فەرموودەكەيان داوەتەوەو هەندێكيشيان بە پەسەنديان زانيوەو قبوڵيان كردووه.. ئەمە شتێكى غەريب و نامۆ نييە، چونكە زۆرن ئەو فەرمودانە كە جىَ‌ى باس و خواست و جياوازى نێوان زانايان بووه زۆر لەمەش زياتر وتەيان لەسەرى هەبووه. وه بە هۆكارى ئەم جياوازيانە بووه كە چەندەها نوسراو و كتێبى بەهێز دانراوه و سەرى هەڵداوه، كە چەندەها بەڵگەى بەهێزو لێكۆڵينەوەو بەسەراچوونەوەو لێوەرگرتنى گەورەى بەخۆيەوه بينيوه، كە لە هيچ كامێكياندا نەگەيشتووەتە ئەوەى خوانەخواست پلەى (شيرك يان كافر كردن يان گومڕايى يان دەرچوون لە سنورى بڕوا) بدەنە پاڵ يەكێكى تريان، (كە ئەمە هەمووى خزمەت بووه). كە ئەمەش بەهۆى ئەو جياوازييەوه بوو كە لە فەرموودەكاندا ڕوويداوه، ئەم فەرموودەش كە لە سەرەوه باسمان كرد يەكێكە لەو فەرموودانە..

## تەوەسولى يەهوديەكان بە پێغەمبەرەوه ﷺ

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا جَاءهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَاءهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِ فَلَعْنَةُ اللَّه عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ البقرة: ٨٩.

پێشەوا القرطبي دەڵێ: فەرموودەى خوا (وَلَمَّا جَاءهُمْ) واتە يەهوديەكان كاتێ پێيان گەيشت، (كِتَابٌ) واتە قورئان (مِّنْ عِندِ اللّهِ مُصَدِّقٌ) ئەو كتێبەى كە لەلايەن خواوه بۆيان دێ ئەگونجێ غەيرى قورئان بێ لەسەر سيفەتى حاليەت بۆ ڕستەكە، (لِّمَا مَعَهُمْ) ئەوەى كە پێيانە واتە تەورات و ئينجيل كە هەواڵى هاتنى پێغەمبەرى ئاخر زەمانى تيايە، (وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ) واتە (سەريان دەخستن)، كە وشەى (الأسْتَفْتَاحُ الأستنصار)

(استفتحتُ: استنصرتُ) وه له فەرموودەکەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ (یستفتحُ بصعالیك المهاجرین) واتە مەبەست پێی (یستنصِرُ بدُعائهم و صلاتهم) وه هەروەها نموونەی ئەمە ﴿فَعَسَى اللّهُ أَن يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ﴾ المائدة: ٥٢، واتە (النصر: فتح شيء مغلق)...

(کە ئەمە ڕوونکردنەوەیەکی زمانەوانی یە) .

پێشەوا (النسائي) ڕیوایەتی کردووە لە (أبي سعيد الخدري)یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (إنّما نَصَرَ الله هذه الأمة بِضعَفائها بدعوتهم وصلاتهم وإخلاصهم) خوا ئەم ئومەتە سەر ئەخات بەهۆی لاوازەکانیانەوە بە پاڕانەوە و دۆعا و نوێژ و ئیخلاصی لاوازەکانیان).

وه لە ڕیوایەتێکی تریدا کە (النسائي) لە ئەبی دەردائەوە ئەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(ابغوني الضعيف، فإنكم إنّما ترزَقونَ و تنصَرونَ بضعفائكم) .

با لاوازەکانتان بگات پێم چونکە ئێوە بەهۆی ئەوانە خوا ڕزقتان ئەدات و لە ناڕەحەتیەکان سەرتان ئەخات.

(ابن عباس) (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەڵێ:

لە زوودا یەهودیەکانی خەیبەر جەنگیان لەگەڵ (غەطەفان) دەکرد، کاتێ شەڕ دەکرا یەهودییەکان ئەدۆڕان، ئیتر یەهودیەکان ئەم پاڕانەوەیەیان دەکرد و ئەیانووت: (إنّا نسألُكَ بِحَقِ النبيِّ الأمّي الذي وَعدتنا أن تخرجَهُ لنا في آخر الزمان) .

خوا داوات لێ دەکەین کە بەهۆی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەوە کە وادەت پێ داوین بۆمان ڕەوانە بکەی لە ئاخر زەماندا سەرمان بخەیت لەم شەڕەماندا. دەڵێ/ هەرکات ئەم دۆعایەیان دەخوێند خوا سەری دەخستن بەسەر عەتەفاندا وه کاتێ پێغەمبەر ﷺ ڕەوانە کرا ئەوانە خۆیان بێ بڕوا

کرد خوای گەورەش ئایەتی لەسەر نازڵ کردن و فەرموو: ﴿وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە: بە تۆ ئەی محمد داوای سەرکەوتنیان دەکرد... ئایەتەکە لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿فَلَعْنَةُ اللَّه عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ البقرە: ٨٩.[١]

## تەوەسول بە پێغەمبەرەوە ﷺ
## لە حاڵی ژیان و لەدوای وەفاتی

لە عثمانی کوڕی حونەیفەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە کە: پیاوێکی کوێر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و عەرزی کرد: دۆعام بۆ بکە لە خزمەت خوادا کە چاك ببمەوە، فەرمووی: (إن شئت أخرّت ذلك وإن شئتَ دَعوتُ) گەر ئارەزوو ئەکەی دۆعاکە دوا بخەم و گەر ئارەزووش دەکەیت ئێستا دۆعا دەکەم، وتی: بەڵکو ئێستا بپاڕێرەوە. دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فرمانی پێ کرد کە دەست نوێژێ بشوات بە جوانترین شۆردن پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات و دەستەکانی بەرز بکاتەوە و ئەم دۆعایە بخوێنێ و بڵێ: اللهم إني أسألك و أتوجهُ إليكَ بنبيكَ محمد ﷺ نبي الرحمة، يا محمد إني أتوجه بِكَ الى ربكَ في حاجتي هذه فتقضيها لي، اللهم شفعهُ فيَّ و شفعني فيهِ) کە ئیمامی (الحاكم) ئەڵێ: ئەم فەرموودەیە ڕاستە و (صحيح

---

[١]- بنواڕە بۆ (الجامع لأحكام القرآن)ی القرطبي ١/٢٦-٢٧.
ئەم گێڕانەوەیەی ابن عباس ڕوون ودیارە لای زانایان کە هەریەکە لە زانایانی تەفسیر لە فەرموودەناسە ناودارەکانمانە گێڕاویانەتەوە وەکو (ابن أبي حاتم، الطبري، البغوي، الآلوسي، الشوكاني، وابن كثير لە (البداية) دا بەبێ لێکۆڵینەوە هێناویەتی)... کە (البهقي) لە (الدلائل)دا هێناویەتی ئەمە بەس بێ چونکە هیچ (موضوعات) ێك لەخۆ ناگرێ.

الأسناد)ە[1]، وە (الذهبي) لە بارەی ئەم فەرمووودەیە ئەڵێ: حسن صحیح، وە (الترمذي) لە کۆتایی (السنن)دا ئەڵێ/ حدیث حسن صحیح غریب لا تعرفه إلاّ في هذا الوجه.

واتە: فەرمووودەیەکی ڕاستەو چاکە بەڵام نادیاریەکی تیایە جگە لەم ڕێگە ریوایەتە نەبێ کە ئەویش گێڕانەوەکەی (ابی جعفر)ە .. کە غەیری (الخطمي)یە .

منیش ئەڵێم: قسەی ڕاست ئەوەیە کە ئەو (أبی جعفر)ە بریتی یە لە (الخطمي المدني) هەروەك چۆن لە ڕیوایەتەکانی (الطبراني و الحاکم و البیهقي)دا هاتووە وە (الطبراني) لە (المعجم الصغیر)دا ئەوەش دەڵێ کە ناوی تەواوی (عمیدی کوڕی یەزید) و لە باوەڕپێکراوانە... وە زانای فەرمووودەناس (عبدالله ی کوڕی صدیق الغُماری) لە نامەکەیدا (إتحاف الأذکیاء) دەڵێ: هیچ ژیریەکی تیا نییە کە سەرجەم (حُفاظ) پارێزەرانی فەرمووودە لەسەر ڕاستێتی فەرمووودەیەك کۆنەبنەوە لە کاتێکدا کە سەنەدەکەی دیار نەبێ، بەتایبەت زانایانی وەك (الذهبي و المنذري و الحافظ).

(المنذري) ئەڵێ: (النسائي) و (ابن ماجه) و (ابن خزیمة) لە صحیحەکانیاندا ڕیوایەتیان کردووە.[2]

کە ئەم تەوەسول کردنە بە پێغەمبەرەوە ﷺ تەنها تایبەت نییە بە کاتی ژیانیەوە، بەڵکو هەندێ لە هاوەڵان (صەحابە) ئەم جۆرە وتەیەیان لە تەوەسول لەدوای وەفاتیشی ﷺ بەکارهێناوە.. لەوانە:

---

[1]- المستدرك: ٥١٩/١.

[2]- بنوارە بۆ (الترغیب والترهید) (کتاب النوافل) باب (الترغیب في صلاة الحاجه) ی المنذري (٤٧٤/١).

(الطبراني) ڕیوایەتی کردووە ئەم فەرموودەیە کە لەسەرەتاکەیدا چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە: پیاوێك جیاوازی ڕای هەبوو لەگەڵ عثماني کوڕی عەفان لە ئیشێکی بۆ خزمەتی (لە سەردەمی خەلافەتیدا) وە خەلیفە عثمان (ڕەزای خوای لێ بێ) ئاوڕێی لێ نەئەدایەوە و ئیشەکەی بۆ جێبەجێ نەدەکرد، گەیشت بە (عثمانی کوڕی حەنیف) پێی وت:

بڕۆ شوێنی دەست نوێژەکەو دەست نوێژێکی پاك و جوان بشۆ پاشان وەرە مزگەوتەوەو دوو ڕکعات نوێژ بخوێنە و بڵێ: اللهم إني أسألُكَ وأتوجَهُ إليك بنبيا محمد ﷺ نبي الرحمة، يا محمد! إني أتوجه بكَ الى رَبي فيقضي لي حاجتي) واتە ئەی خوایە داوات لێ دەکەم ڕوو دەکەمە تۆ بەهۆی پێغەمبەرمان (محمد)ەوە ﷺ کە پێغەمبەری ڕەحمەتە، ئەی محمد من ڕووی دڵم کردە زاتی تۆ بۆ لای پەروەردگارم تا ئەو ئیشەم بۆ جێبەجێ بکات. پاشان ئیشەکەی خۆت عەرز بکە.

پیاوەکە ڕۆیشت و ئەوەی پێی وترا جێبەجێی کرد، پاشان هاتە دەرگای خەلیفە عثمان و دەرگاوانەکان دەرگایان بۆ کردەوەو بردیانە بەردەم خەلیفە و لای خۆی داینیشان و لەسەر (جێگە تایبەتەکەی خۆی) کە پێی ئەوترا (الطنفسە) و فەرمووی: ئیشەکەت چییە؟ ئەویش ئیشەکەی خۆی پێ وت و بۆی جێبەجێ کرد، پاشان خەلیفە فەرمووی پێی: هەر کاتێ هەر ئیشێکت بوو لە هەر سەعاتێکدا بوو وەرە بۆ لام بۆت جێبەجێ دەکەم ، پیاوەکە لەلای خەلیفە ڕۆشتەدەرو گەیشتەوە بە عثمانی کوڕی حەنیف و وتی پێی: خوا جەزات بداتەوە نە سەیری ئیشەکەمی دەکرد و نە ئاوڕێی لە خۆم ئەدایەوە ، تا ئەو وتانەی تۆ فێرت کردم جێبەجێم کرد، عثمانی کوڕی حەنیف فەرمووی: وەڵڵاهی ئەوە وتەی من نییە، بەڵکو بینیم کە کابرایەکی کوێر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ

شکایەتی چاوەکانی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ئارام ناگری؟ کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەس نییە دەستم بگرێ و زۆر ناڕەحەت ئەبم، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (ائت المیضأة فتوضأ ثمَ صَلِّ رکعتین ثم ادع بهذه الدعوات) لێرەدا عثمانی کوڕی حنیف فەرمووێ: قەسەم بە خوا دانیشتنەکەمان چۆڵ نەکرد بوو درێژەی پێدرا، تا کابرا هاتەوە ناومان و وەك چاوەکانی کوێر نەبوو بێ وابوو..

(المنذري) دەڵێ: پێشەوا (الطبراني) ریوایەتی کردووە، وە دەڵێ لەدوای هەموو ڕێگاکان کە هێناویەتی (الحدیث صحیح)[1]

(شێخ ابن تیمیة) لێرەدا ئەڵێ: الطبراني وتوویەتی: ئەم فەرموودەیە (شعبة) ریوایەتی کردووە لە (أبی جعفر)ەوە کە ناوی (عمیری کوڕی یەزید)ە، وە لە (ثقة) و باوەڕپێکراوانە وە تەنها (عثمان کوڕی عومەر) بە تەنها هێناویەتی لە (شعبة)ەوە وە (عبدالله المقدسی) دەڵێ: والحدیث صحیح.

منیش دەڵێم: شیخ ابن تیمیة وتوویەتی: وە پێشەوا طبراني باسی ئەو بەتەنهایی‌یەی کردووە بەپێی زانستی خۆی وە نەیگەیانۆتە (ڕوحی کوڕی عبادە) کە لە (شعبة)ەوە هێناویەتی کە ئەمەش ئیسنادێکی تەواوە و تیایدا ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو تەنهایی یە نەگەیشتۆتە (عثمانی کوڕی عومەر).[2]

لێرەوە دەردەکەوێ کە ئەم چیرۆك و ڕووداوە (الطبراني) بەڕاستی داناوە و پلەی (صحیح)ی داوەتێ، وە (الحافظ) ئەبوعەبدوڵلای مەقدەسی بەو

---

[1]- بنوارە بۆ (الترغیب والترهیب)ی شێخی منذري ٤٧٦/١، وە بۆ (مجمع الزوائد)ی الهیثمي ٢٧٩/٢.

[2]- بنوارە بۆ (قاعدة جلیلة في التوسل والوسیلة)ی ابن تیمیة لا٩٨.

شێوە هێناویەتی، وە بەو شێوە ڕاستکراویی‌یە (شێخی المنذري) نەقڵی کردووە، هەروەها (نورالدين الهيثمي) و (ابن تيمية) وەك خۆی هێناویانە.[1]

کورتەی چیرۆکەکە: عثمانی کوڕی حەنیف کەڕاوی فەرموودەکەیە خۆی ڕووداوەکەی بینیوە، وە زانستیشی بەوە بووە کە ئەمە تەوەسولی تیایە بە پێغەمبەرەوە، وە زانیویەتی کە ئەمە تیایدا هاوار بۆ کردنە و لەدوای وەفاتەوەیە، وە کابراش هیچ گومانێکی تیا دەرنەبڕی وە ئیشەکەی جێ‌بەجێ کرد.

وە ئەگەر بچوکترین گومانی تیابووایە بەو شێوە وتەی نەدەفەرموو..

## بەکارهێنانێکی تر و پشتگیری (ابن تيمية) بۆی

ئیبن ئەبی دونیا ڕیوایەتی کردووە لە پەڕتووکی (مجابي الدُعاء) دەڵێ: ئەبو هاشم بۆی گێڕاینەوە کە بیستی لە کەثیری کوڕی محمدی کوڕی کثیر کوڕی ڕەفاعە وتی: پیاوێك هات بۆ لای عەبدولمەلیکی کوڕی سەعیدی کوڕی ئەبجەر، سکی ئەگووشی، پێی وت: تۆ ئازارێکت هەیە چاك بوونی نییە، وتی: چییە؟ پێی وت: (الدُّبَيلَة) کە بریتی یە لە دەرچوونی کێمێکی زۆر لە ناوەوەی لەش کە زۆرجار خاوەنەکەی دەکوژێ، پیاوەکە ڕووی وەرچەرخان و ئەیوت: (الله ، الله ، الله ربي لا أُشرِكَ بهِ شيئاً، يا محمد إني أتوجه بِكَ الى ربكَ و رَبي يَرحَمني مما بي) .

---

[1]- کە (المنذري) لە (الترغيب والترهيب)دا دەڵێ: طبراني لەدوای ڕێگەکانی وتوویەتی (الحديث صحيح)، هەروەها (المستدرك) ی الحاكم لە ٥٢٦/١ هێناویە وە هەندێ لە زانایان یەك ناوی تەواویان لەسەر ئەم فەرموودەیە داناوە و پشتگیریان کردووەو ناویان ناوە (المنار المنيف في حديث عثمان بن حنيف) خوا جەزایان بداتەوە.

واتــه: الله پەروەردگارمــه شــەریك و هــاوەڵی بــۆ بڕیــار نــادەم ئــەی پەروەردگارم ڕووم کردە تۆ کە بە خاتری پێغەمبەر محمد کە پێغەمبەری تۆیەو پێغەمبەری ڕەحمەتە... ئەی محمد ڕووی تۆم کردە لای پەروەردگارم کە ڕەحمم پێ بکات لەم ناڕەحەتیەی کە تیایدام) دەڵێ: دەستی لە سکی لاداو ئازارەکەی نەما، ئەویش پێی وت: ئیتر هیچ نەخۆشیەکت نەما.

شێخ ابن تیمیه دەڵێ: (وتم: لەم دۆعایەو هاو وێنەکانی سەلەفی ئێمە لە دۆعاکانیاندا ئەیانخوێند)[1] .

وە زانراوە کە (ابن تيمية) ئەم هەواڵەی هێناوە تا مەبەستەکەی کە چۆن ئەیەوێ ئاوا ڕوونی بکاتەوە، بەلاّم ئەوەی لێرەدا گرنگە بڵێین ئەوەیە: جێگیر بووە کە زانایانی سەلەف ئەم پاڕانەوە و تەوەسولەیان بۆ شیفاکانیان بەکارهێناوە، کە ئەمەش بە تەنها مەبەستی ئێمە بوو بیگەیەنین، ئیتر لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە ئەوە بۆچوونی خۆیانە، ئێمە بەلامانەوە گرنگ نییە مەگەر شتێ کە بە دەق جێگیر بوو بێ، تا بیکەینە بەڵگە بۆ ئەو شتانەی کە دەمانەوێ، ئەوانیش بۆیان هەیە بەڵگە بێننەوە بۆ ئەو شتەی کە دەیانەوێ..

## چەند هەوڵێکی نەزۆك

هەندێك هەڵسان بۆ خۆجولاّندنەوەو وتەوتن سەبارەت بە فەرموودەی تەوەسولی ئادەم و فەرموودەی عثمانی کوڕی حەنیف و غەیری ئەمانەش، هەوڵەکانیان خستەگەڕ بۆ ڕەد دانەوەیان بە هەموو هێزێك کە پێیان بوو کۆششیان کرد لەبەرانبەر وتەیان دەردەبڕی، موجادەلەیان کرد، هەڵسان و دانشتن پەڕەیان هەڵدایەوە سەبارەت بەم باسەیە، وە کە ئەمانەش هیچی

[1]- بنوارە بۆ (قاعده جليله) لا ٩١.

هیچ سودێکی نەگەیاند، چونکە هەرچەندە هەوڵ بدەن بۆ ڕەد دانەوەی فەرموودەکان کە لەم باسە کە هاتووە ئەوە کۆمەڵێ لە زانا بەرزەکانیان وتەی خۆیان لەپێش ئەمانەوە فەرمووە لەو بارەیەوە، کە ئەوان زۆر مێشکیان ساغ تر بووە و زانستیان فراوانتر بووە، باڵی لێکۆڵینەوەیان درێژتر بووە و تێگەیشتنیان بۆ باسەکان قوڵتر بووە، تەقواو ئیخلاص و خوا پەرستیشیان زیاتر بووە، لە نموونەی (ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)ە، کە دان دەنێ بە بوونی تەوەسول دا هەروەك چۆن ابن تیمیە بۆ خۆی لە قسەیەکیدا تەوەسولی تایبەتی خۆی هەیە، پاشان لە کۆتایی باسەکەدا، شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب کە ئینکاری دەربڕی بەرانبەر ئەو کەسانەی کە نسبەتی ئەو شتانەیان داوەتە پاڵی لە بە کافرکردنی ئەوانەی تەوەسول ئەکەن، بەڵکو زۆر بە ڕوونتر لە فەتاواکانیدا دەڵێ کە تەوەسول بەشێکە لە (الفروع) نەك لە (الأصول) کە هەریەکە لەمانە بە ڕوونتر لێی ئەدوێین لەم کتێبەدا پشت بەخوا ..

بۆ ئەم باسە: شێخ ی خواناسی ناوداری فەرموودەناس (عبدالله الغماري) نامەیەکی بە تایبەتی لەسەر ئەم قسەیەو فەرموودەیە نووسیوە و ناوی ناوە (مصباح الزجاجة في فوائد صلاة الحاجة) کە ئەوەی سەیری بکات سودی لێ دەبینێ ئەوی نەخۆش بێ شیفای تیایەو هۆکاری دەوڵەمەندییە خوا پاداشتی تەواوی بەخێر بداتەوە.

## تەوەسول کردن بە پێغەمبەرەوە ﷺ لە ڕۆژی قیامەت

تەوەسول کردن بە پێغەمبەرەوە ﷺ لە ڕۆژی قیامەتدا پێویست بەوە ناکات زۆر بنوسین، چونکە فەرموودەکانی شەفاعەت دیارن و گەیشتوونەتە پلەی (متواتر)، کە هەموو ئەمانە لە دەقەکاندا بەڕوونی باسکراوە ، لەسەر ئاپۆڕای زۆری خەڵکی مەحشەر کە وەستانیان لەو ڕۆژەدا زۆر درێژەی کێشاوە و، غەم و ئازار و دژوارییەکان لەسەریان توند کراوە، بۆ فریادڕەسیان لەم ناڕەحەتیە هاوار بۆ پێغەمبەران دەبەن داوا لە حەزرەتی ئادەم (علیە السلام) دەکەن فریایان بکەوێت، پاشان لە نوح، پاشان لە ئیبراهیم پاشان لە موسا، پاشان لە عیسا (سەلامی خودا لە هەموویان) بەڵام وەڵامی هەموویان ئەوە دەبێت کە ڕووی خۆیان بکەنە گەورەی پێغەمبەران پەنا بەرنە بەر پێغەمبەری ئاخر زەمان (د.خ) ، ئەوانیش هاواری خۆیان بردە لای حەزرەت (د.خ) بەخێرایی فریایان کەوت و فەرمووی (أنا لها، أنا لها)) بە واتای (من بۆ ئەو فریاد ڕەسی و شەفاعەتە هاتووم) پاشان دەکەوێتە سوجدەوە و دەمێنێتەوە هەتا بانگ دەکرێت و پێی دەوترێت ((سەرت بەرزبکەرەوە و شەفاعەت بکە بۆ ئوممەتەکەت تا لێت وەربگیرێت، کە ئەمە یەکڕای پێغەمبەران و سەرجەم موسڵمانانی لەسەرەو وتەو بەڵێنی پەروەردگاری جیهانیانە کە بە هانا هاتن و فریاد ڕەسی لەکاتی تەنگانە زۆر گەورەکاندا لە نزیکترین و ئازیزترین دۆستەوە وەردەگرێت، ئەمەش گەورەترین کلیلی کرانەوەی دەروازەی سۆز و میهرەبانی و خۆشنودی پەروەردگارە بۆ بەندەکانی.

کە ئەمە یەکڕایی سەرجەم موسڵمانانی لەسەرەو تەقریری تەواوی لەلایەن خواوە لەسەر هاتووە، کە لە ناڕەحەتی گەورەدا هاوار بۆ لای نزیکترین کەس دەبرێت، کە ئەمەش بەرەو ڕەزای خوای دەبات..

## دروستی تەوەسول لەسەر ڕێگەی شێخ ابن تیمیە

شێخ ابن تیمیة لە کتێبی (قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة) لە لاپەڕە (٥)دا کاتێ ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَابْتَغُواْ إِلَيهِ الْوَسِيلَةَ﴾ المائدة: ٣٥. دەهێنێتەوە ئەڵێ: داواکردنی وەسیلە بۆ لای خوای پەروەردگار بە شێوەیەك دەبێ کە تەوەسول بێ بۆ لای خوا بە بڕوا و ئیمان بە موحەمەد و شوێنکەوتنی کە ئەم تەوەسولە، بە بڕواو ئیمان بە پێغەمبەر و بە ئیطاعەکردنی کە ئەمە فەرزە لەسەر هەموو تاکێکی ئومەت لە هەموو حاڵەتەکان چ ناوەڕۆك و چ ڕووکەش، لەکاتی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ و چ لەدوای مردنیشی، لەکاتێ لە خزمەتیا بێ لە کاتێکیش لێی دوور بێ، وە تەوەسول بەو ئیمانە بە پێغەمبەر و بە گوێڕایەڵی بە کەسێك لە مەخلوقات لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر لەدوای هێنانی بەڵگە لەسەری ئەو هەقە بەتاڵ ناکاتەوە، وە نە بە هیچ پاساوێك لە پاساوەکان وە هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ گەیشتن بە پلەی ڕێزی پەروەردگار و ڕەحمەتی و ڕزگاربوون لە سەختی سزاکانی ڕۆژی دوایی، مەگەر بە تەوەسول بە ئیمان پێی و بە ئیطاعەکردنی کە ئەوەش پێغەمبەرە ﷺ کە تکاکاری هەموو مرۆڤەکانە، خاوەنی مەقامی مەحمود کە هەموو کەسەکان غیبطەی پێ دەبەن، کە گەورەترین شەفاعەتکارەو خاوەنی بەرزترین پلەی جاه و مەقامە لەلای خوای پەروەردگار، وە خوای پەروەردگار لەبارەی موسا پێغەمبەر دەفەرموێ ﴿وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهاً﴾ الأحزاب: ٦٩، وە لە بارەی عیسی پێغەمبەر دەفەرموێ ﴿وَجِيهاً فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ﴾ آل عمران: ٤٥. وە پێغەمبەر موحەممەدﷺ لەو جاهەدا لە سەرجەم پێغەمبەران و نێراوانی خوا گەورەترە، بەڵام داوای شەفاعەت و تکاکاری و پاڕانەوەکانی کاتێك سوودی پێ دەگەیەنێ کە پێغەمبەر ﷺ شەفاعەتی بۆ کردبێ و

پاڕانەوەکانی بۆی بوو بێ، چونکە هەرکەس پێغەمبەر ﷺ بۆی پاڕابێتەوە و قبوڵی تکاکەی کرد بێ و ئەمیش پێغەمبەری کردبێتە شەفاعەتکارو بەهۆیەوە پاڕابێتەوە، هەروەك چۆن هاوەڵان تەوەسولیان بە پێغەمبەر ﷺ دەکرد بۆ لای خوا بە پاڕانەوەکانی و بە شەفاعەتەکەی، وە هەروەك چۆن خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ خزمەت خوای پەروەردگار تەوەسول ئەکەن بە دۆعا و بە شەفاعەتی پێغەمبەری سەردار (صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ) ، لێرەدا وتەکەی (ابن تیمیە) تەواو بوو...

وە لە کتێبی (الفتاوای الکبری) (١٤٠/١) هاتووە لە کاتێکدا پرسیاریان کرد لە (شیخ ابن تیمیة) ڕحمەتی خوای لێ بێ، کە ئایا دروستە تەوەسول کردن بە پێغەمبەرەوە ﷺ یان نا؟ لە وەڵامدا وتی: ((الحمدلله، أما التوسل بالأیمان بە محبتهِ و طاعته والصلاة والسلام علیه وبدعائه وشفاعته ونحو ذلكَ مما هو من أفعالهِ وأفعال العبادِ المأمور بها في حقهِ فهو مشروع بإتفاق المسلمین) ، واتە: سوپاس بۆ خوا ، تەوەسول بە بڕوا بە پێغەمبەر و خۆشەویستی بۆی و ئیتاعە و گوێڕایەڵی کردنی و صەڵەوات لەسەر خوێندن و سەلام بۆ خزمەتی ناردن و تەوەسول بە پاڕانەوەکانی و تکاکاریەکانی و غەیری ئەمانە لە کردەوەکانی و کردەوەی بەندەکان خۆیان کە فرمانیان پێ کراوە لە هەقی ئەو پێغەمبەرەدا بیکەن ئەوانە هەموو شەرعی و دروستن بە یەکڕایی سەرجەم زانایان).

منیش دەڵێم: لەو وتەیەی شیخ ابن تیمیە لە دوو فرمان سوود وەردەگرین:

یەکەم: موسڵمانی ڕاستی گوێڕایەڵ کە خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر ﷺ هەبێ کە باوەڕی تەواوی بە شەفاعەتی هەبێ، ئەوە بۆی دروستە کە

تەوەسول بکات بە خواپەرستی و خۆشەویستی و ڕاستگۆیەتی حەزرەتی پێغەمبەرﷺ.

وە ئێمە کاتێ تەوەسول دەکەین بە پێغەمبەرەوە ﷺ خوا دەزانێ تەوەسولمان بە ئیمان و بڕوا پێی و بە خۆشەویستمان بۆی و بە فەزڵ و شەرەف و گەورەیی ئەو زاتەیە، کە ئەمەش مەبەستی بنەڕەتییە لە تەوەسولدا... ئیتر هیچ بۆچوونێك نەبیستراوە کە یەکێك تەوەسولی کردبێ بە پێغەمبەرەوە بۆ شتێ غەیری ئەمانە کە ناکرێت هیچ یەکێ لەو موسڵمانانەی تەوەسول دەکەن جگە لەم جۆرە تەوەسولە بکەن کە مەبەستی بنەڕەتی تەوەسولە کە باوەڕبوون و خۆشەویستی ئەو پێغەمبەرەیە (د.خ)، جا ئەگەر وتەیان لەسەری دابێت یاخود نا ئەوان پشتیان هەر بەم تەوەسولە دروست و شەرعییە بەستووەو هیچی تر..

دووەم: ئەوەی سود لە وتەکەی ابن تیمیە وەردەگرێ: کە هەرکەس پێغەمبەر ﷺ دۆعای بۆ کردبێ، دروستە کە تەوەسول بکات بەو دۆعایەی پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ خزمەت خوای پەروەردگار، وە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ پاڕاوەتەوە بۆ ئومەتەکەی هەروەك لە فەرمودە ڕاستەکاندا هاتووە لەوانە:

لە خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ لەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بینیم لە دڵ خۆشی وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دۆعام بۆ بکە.. فەرمووی (اللهم اغفر لعائشة ما تقدم من ذنبها وَما تأخر وما أسرّت وما أعلنت) خوایە خۆش ببە لە عائشە لەوەی لەپێش کردونی و لەوەش لە دوایدا ئەیکات لەوەی کە بە نهێنی کردونی و لەوەش کە بە ئاشکرا ئەیکات... خاتوو عائیشە ئەفەرمووێ: پێکەنینێکی زۆرم کرد (لە خۆشی دۆعاکە) هەتا سەری تەواو کەوتە کۆشی لە زۆری پێکەنین، پێغەمبەر ﷺ

فەرمووی (أيسَرك دعائي) زۆر دڵ خۆش بووی بەم دۆعايەم؟ وتم: ئەی چۆن دڵخۆش نابم بەو پاڕانەوەيەی تۆ، حەزرەت ﷺ فەرمووی: (والله إنها لَدَعَوتي لأمتي في كل صلاةٍ)[1] .

قەسەم بە خوا ئەوە دۆعا و پاڕانەوەی منە بۆ ئومەتەکەم لە دوای هەموو نوێژێکمدا.

لەبەرئەمە دروستە بۆ هەموو موسوڵمانێ کە تەوەسول لە خزمەت خوادا بەکاربهێنێ و بڵێ: اللهم إنَّ نبيك محمد ﷺ قد دَعا لأمَتِه، وأنا من أفراد هذهِ الأمة، فأتوسَلُ إليكَ بهذا الدُعاء أن تغفِر لي وأن ترحَمني) ، خوايە پێغەمبەرەکەت حەزرەتی محمد ﷺ پاڕاوەتەوە بۆ ئومەتەکەی منیش يەکێکم لە ئومەتی ئەو، خوا بە تکاو خاتری ئەو دوعايە داوات لێ دەکەم کە لێم خۆش بی و وە هەر شتێك کە بيەوێت، ئەگەر ئەمەی وت، ئەوە لەو فرمانەی کە لەنێوان زانايانی ئيسلام دا لەسەری ڕێکەوتون و کۆن دەرناچێ، ئەگەر وتی: (اللهم إني أتوسل إليك بنبيك محمد ﷺ) ئەوا ئەو نيازو مەبەستەی پێغەمبەر (د.خ) فەرموويەتی لە دەستی ئەچێ، وە هەر ئەو داواو پاڕانەوەی لە دڵی خۆيدايە بۆی دەنوسرێت. کە ئەمەش مەبەستی موسوڵمانە لەو دوعايەدا و لەو سنورەش دەرناچێ، چونکە (المتوسل) کە پێغەمبەرە ﷺ مەبەستی هەر ئەوە بووە کە ئەو مانايانە ببەخشێ کە پەيوەندی بە زاتی خۆيەوە هەبووە لە محبەت و خۆشەويستی و نزيکی و جاه و مەقامی و ڕوتبەو فەزڵ و شەفاعەتی لەلای پەروەردگار بەتايبەت کە پێغەمبەر ﷺ لە ژيانی بەرزەخيدا گوێ بيستی صەڵات و

---

[1]- ئەم فەرمووده ئيمامی (البزار) ڕيوايەتی کردووە، وە پياوەکانی ڕاستن جگە لە (احمدی کوڕی منصور الرمادی) نەبێ، کە ئەويش جێگەی سيقەو متمانەيە... بنواڕە بۆ (مجمع الزوائد ٢٤٣/٩)..

سەلامەکان دەبێ و وەڵامی ئەداتەوە بە شێوەیەك کە لەگەڵ مەقام و پلەی بەڕێزیدا بگونجێ وە لەگەڵ سەلام و لێخۆش بووندا بگونجێ...

ئەوەتا لەم فەرمووددەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (حياتي خيرٌ لكم، تُحْدِثونَ وَ يُحدَثُ لكم، وَ وَفاتي خيرٌ لكم، تَعْرَضُ عليَّ أعمالكم، فما رأيتُ مِنْ خير حمدتُ الله عليه، وما رأيتُ من شرٍّ استغفرتُ الله لكم)[1] ،

واتە: ژیانی من بۆ ئێوە خێری تیایە، قسەم لە خزمەتدا دەکەن و منیش قسەتان لەگەڵدا دەکەم، وە مردنیشم بۆ ئێوە خێری تیایە، کردەوەکانتان دەخرێتە بەردەستم، کە چاکەم تیا بینی سوپاسی خودای لەسەر دەکەم، وە کە خراپەم بینی داوای لێخۆشبوونتان لە خوا بۆ دەکەم.

کە ئەمە دەقێکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆشبوون بۆ ئومەتەکەی دەکات لە کاتێکدا لە ژیانی بەرزەخیدایە، کە داوای لێخۆش بوونیش پاڕانەوەیە، بە پاڕانەوەش ئومەت سوودی لێ دەبینێ.

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:
(ما مِن أحدٍ يسَلِّمُ عليَّ، إلاّ رَدَ اللهُ عليَّ روحي حتى أرادَ عليه السلامَ)[2] ،

واتە: هیچ کەس نییە کە سەلامم لێ بکات مەگەر خوای پەروەردگار ڕۆحەکەم بۆ دەگێڕێتەوە تا وەڵامی سەلامەکەی ئەدەمەوە.

---

[1]- (حافظ اسماعیل القاضي) ڕیوایەتی کردووە لە (فضل الصلاة على النبي ﷺ) و(الهيثمي) لە (مجمع الزوائد) هێناویەتی لە ٢٤/٩ و فەرموویەتی البزاز ڕیوایەتی کردووە.

[2]- ئیمامی أبو داود لە أبی هریرەوە ڕوایەتی کردووە وە (النووی) دەفەرموێ (ئیسنادی ئەم فەرموودە تەواوە).

کـه ئەمـەش دووبـارە زۆر ڕوون و ئاشـکرایە کـە پێغەمبـەر ﷺ وەڵامـی سەلامی موسڵمانان ئەداتەوە لە ژیانی بەرزەخیدا، وە سەلامیش بریتـی یـە لـە ئەمینی، کـە ئەمـەش پاڕانـەوەی پێغەمبـەرە ﷺ بـۆ ئـەمین بـوونی ئـەو موسڵمانە... کە ئەو موسوڵمانەش سودی لێ دەبینێ.

## دروستی تەوەسول بە پێغەمبەرەوە ﷺ لەلای پێشەوایان أحمدی کوڕی حەنبەل و ئبن تیمیە

لەسەر ئەوەی کە (شیخ ابن تیمیـە) لە هەندێ لـە شوێنی کتێبـەکانی دا تەوەسول بە پێغەمبەر ﷺ بە شتێکی باش دەزانـێ و دانـی پیـا دەنـێ، بـێ ئەوە جیاوازی بکات لە کاتی ژیان و وەفاتی پێغەمبەر ﷺ ، بەبێ جیاوازی خسـتنە نێـوان کـاتی ئامـادەبوون یـان دووری لـە مـەقامی وە هـیچ ڕوون کردنەوەی زیاتر نادات، وە هەڵساوە بە گێڕانـەوەی ڕای پێشـەوا ئەحمـەدی کوڕی حەنبـەل و زانـای نـاودار (عیـزی کـوڕی عبدالسلام) لەسـەر دروسـتی تەوەسـول، لـە (الفتـاوی الکـبری)کەیـدا شـێخ دەڵـێ: لـە تەوەسـولدا هـەروەها دروسـتە تەوەسـول کـردن بـە پێغەمبـەرەوە ﷺ لـە کـاتی پاڕانەوەمانـدا، هەروەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە ئیمامی ترمزی ڕیوایەتی کردووە و بە ڕاستی داناوە کە پێغەمبەر ﷺ دۆعای فێری کابراکـە کـرد کـە بڵـێ: (اللهمَ إنـي أسـألُكَ و أتوسَلُ إليـكَ بنبيـكَ محمـد ﷺ نـبي الرحمـة، يـا محمد رسول الله، إني اتوسل بِكَ الى ربي في حـاجتي ليقضـيها، اللـهم فشَـفعِه فيَّ) کە ئەمە تەوەسولێکی چاکە [1] .

هـەروەها دەڵـێ: وە تەوەسـول کـردن بۆ لای خـوا بـە غـەیری پێغەمبـەرمان ﷺ ئیتر یەکسـانە نـاوی بنـێی یارمـەتی و فریاکـەوتن یـان هـەر شـتی تـر

---

[1]- بنواڕ بۆ (الفتاوی الکبری)ی ابن تیمیة ٢٧٦/٣.

نازانین کەسێ لە پێشینەکانمان شتی وای کردبێ، وە هیچ ڕووداوێك بۆمان ڕیوایەت نەکراوە لەو بارەیەوە، وە هیچ زانیاریمان لەسەری نییە تەنها ئەوەندە نەبێ کە (شیخ عزالدین ی عبدالسلام) فتوای داوە بە نەکردنی، بەڵام تەوەسول کردن بە پێغەمبەرەوە ﷺ دروستە و فەرموودەی لەسەر هاتووە لە (سوننەتەکاندا) کە ڕیوایەتیان کردووە هەریەك لە (النسائي ، الترمذي) و غەیری ئەمانیش کە پیاوێکی ئەعرابی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من تووشی ناڕەحەتی چاوم بووم دوعام بۆ بکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێ ی: (بڕۆ دەست نوێژێ بشۆو دوو ڕکعات نوێژ بکە پاشان بڵێ: (اللهمَ إني أسألُكَ و أتوجَهُ إليكَ بنبيكَ محمد، يا محمد رسول الله، إني أشَفَعُ بِكَ فِي رَدِّ بَصَري، اللهمَ شَفِّع بنبيك فِيَّ. ئەفەرمووێ: ئەگەر هەر فرمانێکی ترت بوو بەو شێوە بکە، ئیتر خوا چاوەکانی بۆ گێڕایەوە) ئیتر لەبەر ئەم فەرموودە شێخ تەوەسولی بە پێغەمبەری خوا لە گشتی یەکە دەرکردووە [1] .

هەروەها (شیخ ابن تیمیە) لە شوێنێکی تردا دەڵێ: (هەر لەبەر ئەمەشە کە ئیمامی أحمد لە کتێبی (مِسكُ أمام أحمد) دا دانی پیاناوە کە (المروزی) هاوڕێ ی بۆی نوسیوەتەوە کە تیایدا دەڵێ: پێشەوا ئەحمەد تەوەسولی کردووە بە پێغەمبەرەوە ﷺ لە کاتی پاڕانەوەکانیدا، بەڵام غەیری ئەحمەد دەڵێ: ئەمە سوێندە لەسەر خوا بە پێغەمبەر ﷺ وە سوێندیش لەسەر خوا ناخورێ بە مەخلوق، وە ئیمامی ئەحمەد لە یەکێ لەو دوو ڕیوایەتەدا دروستی سوێند خواردنی بە پێغەمبەر ﷺ بە شتێکی چاك پێناسە کردووە) [2] .

---

[1]- بنواڕە بۆ (الفتاوی الکبری)ی (ابن تیمیة) ١/١٠٥.

[2]- بنواڕە بۆ (الفتاوی الکبری)ی (ابن تیمیة) ١/١٤٠.

## دروستی تەوەسول لەلای ئیمامی الشوكانی

پێشەوای فەرموودەناس كە یەكێكە لە زانایانی پێشین (شیخ محمدی كوڕی عەلی شەوكانی) لە نامەكەیدا بەناوی (الدُر النضید في إخلاص كلمة التوحید)دا دەڵێ:

(سەبارەت بە تەوەسوڵێ كە بۆ لای خوا بێ بە یەكێ لە مەخلوقانی خوا بۆ داواكاریەك كە مرۆڤ لە پەروەردگاری بكات، ئەوە شێخ عزالدین ی كوڕی عبدالسلام فەرموویەتی: دروست نیە تەوەسول كردن بۆ لای خوا مەگەر بە پێغەمبەرەوە ﷺ نەبێ كە ئەوە فەرموودەی تەواوی لەسەر هاتووە) كە ئاماژەیە بەو فەرموودەیەی كە (النسائي) لە سوننەتەكەیدا هێناویەتی و (الترمذي)یش تەصحیحی كردووە و ابن ماجە و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان كردووە، كە پیاوێكی نابینا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و باسی فەرموودەكەی كرد.. وە وتی: بۆ خەڵكی هەیە دوو مانا لەو فەرموودە وەربگرن:

<u>یەكەم</u>: ئەو تەوەسولەیە كە عومەری كوڕی خەطاب باسی كردووە كاتێ ئەڵێ: (كنا إذا أجدبنا نتوسل بنبینا إلیكَ فتسقینا، وَ إنا نَتَوَسكُ إلیكَ نعم نبینا) ئەی پەروەردگار كاتی خۆی ناڕەحەتیمان توش بووایە تەوەسولمان بە پێغەمبەرەكەمان دەكرد بۆ خزمەتت، بەڵام ئێستا تەوەسول بە مامەی پێغەمبەرەكەمان دەكەین بۆ خزمەتت كە بارانمان بۆ ببارێنی، كە ئەم فەرموودە (ڕاستەو ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی كردووە) خەلیفە عومەر باس لەوە دەكات كە ئەوان تەوەسولیان بە پێغەمبەر ﷺ كردووە لە حاڵی ژیانی پێغەمبەرداﷺ بۆ باران بارین، پاشان تەوەسولیان بە مامەی پێغەمبەر كردووە كە (ئیمامی عەباس)ە لە دوای وەفاتی پێغەمبەر، وە تەوەسولەكەشیان بۆ بارینی باران بووە بە شێوەیەك كە ئەو دۆعا بخوێنێ

و ئەمانیش لە خزمەتیا دۆعا بکەن، تا ئەو (مامەی پێغەمبەر ﷺ بکەنە وەسیلەیەك بۆ خزمەت پەروەردگاریان، وە پێغەمبەریش ﷺ لەکاتی ئەم جۆرە فرمانانەدا باشترین کەسێك بووە کە تکا بکات و بپاڕێتەوە).

دووەم: تەوەسول کردن بە پێغەمبەرەوە ﷺ لەکاتی ژیانی پێغەمبەر و لەکاتی وەفاتیدا وە لە کاتێ لە خزمەتیا بی و لەکاتی دووریدا، هیچ شاراوە نیە لەلای تۆ کە جێگیر بووە تەوەسول پێیەوە لە حاڵی ژییانی و جێگیر بووە تەوەسول بە غەیری ئەوەوە لەدوای وەفاتی ئەمەش بە ئیجماع و یەکڕایی هەموو هاوەڵان (صحابە) بە شێوەیەك کە پلەی (إجماع سکوتی) وەرگرتووە، چونکە کەسیان ئینکارییان دەرنەبڕی بۆ ئەم ئیشەی خەلیفە عومەر کە تەوەسول بوو بە مامەی پێغەمبەرەوە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ).

وە لەلای من: هیچ ڕوویەك نییە کە تایبەتمەنی بدات بە دروستی تەوەسول بە پێغەمبەرەوە هەروەك شیخ عزالدین وا گومانی بردووە لە بەر دوو هۆکار: یەکەم : لەوەوە کە فێر بووین لە یەکڕایی صەحابەکانەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ).

دووەم : تەوەسول بۆ خزمەتی خوای گەورە بە کەسانێ کە ئەهلی زانست و گەورەیی بن لە دین دا، ئەچێتە ناو ئەو باسەوە کە تەوەسول بە کردەوەی چاکە و ئاکاری بەرزی تیا بکرێ، کە هیچ کەس ڕێزدار نابێ مەگەر بە کردەوەکانی نەبێ...

لێرەدا ئەگەر یەکێ وتی: (خوایە فلانە زانا ئەکەمە تکا بۆ لای تۆ) ئەمە لەو ڕووەوە کە بە زانست و عیلمەکەی بێ، ئەمە جێگیر بووە لە (الصحیحین)دا و غەیری ئەوانیش، کە پێغەمبەر ﷺ چیرۆکی ئەو سێ کەسەی بۆ گێڕاینەوە کە چۆن بەردە گەورەکە دەمی ئەشکەوتەکەی لێ گرتن وە هەریەکە لەوانە تکاکاریان لە خزمەت خوادا دەربڕی بە باشترین

کردەوەیەکی چاکە کە کردبێتیان، لە کۆتایشدا بەردەکەیان بۆ لابرا، ئەگەر تەوەسول کردن بە کردەوەی چاکە دروست نەبووایە یان لە شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان بووایە (هەروەك توندڕەوەکان وا گومان دەبەن) ئەوە لە خواوە هیچ وەڵامێکیان نەئەدرایەوە و بەردەکە بەرز نەدەبۆوە، یان حەزرەت ﷺ بێدەنگی دەرنەدەبڕی لەدوای گێڕانەوەی چیرۆکەکەی، یان لەسەر کردەوەکەی ئەوان هیچ ئینکاریەکی دەرنەبڕی، لێرەوە تێدەگەین کە ئەو بەڵگانەی دەیهێنێتەوە لەسەر دروست نەبوونی تەوەسول بە پێغەمبەران و پیاوچاکانەوە لە ئایەتەکانی ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ الزمر: ٣ وە ﴿فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَداً﴾ الجن: ١٨، وە ﴿لَهُ دَعْوَةُ الْحَقِّ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ لاَ يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيْءٍ﴾ الرعد: ١٤ هیچ لە جێی خۆیدا نییە و وارد نەبووە بۆ ئەو باسەیە نەهاتووە بەڵکو ئەو ئایەتانە بە بەڵگە هاتوونەتەوە بۆ شوێنی (دووبەرەکی و ناکۆکی) لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بێگانەن و بێ باوەڕن بە بناغەی ئایین، وتەی ئەوانە کە ئەڵێن: ئایەتی یەکەم مانای وایە کە بەندایەتیان بۆ دەکەن، وە تەوەسول کردنیش بە زانایەکەوە بۆ نموونە بۆ بەندایەتی نییە، بەڵکو ئەزانێ کە ئەو کەسەیە نزیکیەکی هەبێ لە خزمەت خوادا بەهۆی ئەوەوە کە هەڵگری زانستی خواییە، تەوەسولەکە بە عیلم زانستەکەوەیە، هەروەها ئایەتی ﴿فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَداً﴾ الجن: ١٨یش بە هەمان شێوەیە، ئەو نەهی دەکات لەوە کە لەگەڵ خوادا کەسی تر بانگ بکرێ یان ناو ببرێ وەك ئەوە بوترێ (یا الله و یا فلان)، وە تەوەسول کردن بە زانایەکەوە بۆ نموونە هیچ هاوارێکی تیا نیە مەگەر تەنها بۆ خوا نەبێ کە تیایدا تەوەسول کردنی تیایە بە کردەوەی چاکەی هەندێ لە بەندەکانی، وەك تەوەسولی سێ کەسەکەی ناو ئەشکەوتەکە..

هەروەها لە فەرموودەی خودا کە دەفەرموێ ﴿وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ﴾ الرعد: ١٤.

ئەوە ئەو کەسانەن کە دۆعاو پاڕانەوە دەکەن و وەڵامیان نادرێتەوە، واتە هاوار لە یەکێك دەکەن کە وەڵامی لێوە نابیستێ هاوار لە خوا ناکەن کە وەڵامیان ئەداتەوە، ئەوە (المتوسل)ە واتە هاواری بۆ لا دەکرێ بۆ نموونە زانایەك، کە زاناکە لە خوا دەپاڕێتەوە و لە غەیری خوا ڕجای تری نیە، ئەگەر تۆ ئەمەت ئەزانی ئیتر وتەی ئەوانەی ئینکاری تەوەسول دەکەن لە تۆ شاراوە نابێ و هەموو ئەو بەڵگانەی کە دەیهێننەوە لە لای تۆ نابێتە جێگەی نیزاع و دوبەرەکی، بۆ نموونە ئەو بەڵگەیەیان کە دەیهێننەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ . ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ . يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئاً وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِلَّهِ﴾ الأنفطار: ١٧-١٩.. کە ئەم ئایەتە پیرۆزە تەنها ئەوەندە ئەگەیەنێ کە لە ڕۆژی دواییدا تەنها زاتی پەروەردگارە خاوەنی یەکەمی ئەو ئەمرو فرمانانەیەو کەسێکی تر غەیری زاتی پەروەردگار هیچی بەدەست نابێ، ئەوەش کە تەوەسولەکەی کردووە بە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران یان بە زانایەك لە زانایان، لەو بڕوایەدا نییە کە ئەمەی کردبێتە هاوەڵ بۆ پەروەردگار لە فرمانەکانی ڕۆژی دواییدا، کە هەر کەس ئەو بڕوایەی ببێ کە پێغەمبەرێك یان غەیری ئەو لە بەندانی خوا خاوەنی ئەمر و نەهی دەبێ ئەوە لە گومڕاییەکی تەواودا ئەژی، ئایا ئەمە ئەبێتە بەڵگە لەسەر نەبوونی تەوەسول و ئایەتی ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾ آل عمران: ١٢٨ چی پەیوەندییەکی هەیە بە باسەکەمانەوە... وە ئایەتی ﴿لاَّ أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرّاً وَلاَ نَفْعاً﴾ یونس: ٤٩، کە ئەم ئایەتە و ئایەتی پێشووش دوو بەڵگەی زۆر ڕوونن کە پێغەمبەر ﷺ هیچ فرمانێکی لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی ئەهوالی

قیامەتە بەدەست نی‌یە، کە ئەو خاوەنی سودێك نەبێ بۆ نەفسی خۆی یان نەتوانێ زیانێ لە خۆی دوور بخات ئیتر چۆن دەبێتە خاوەنی بۆ کەسانی تر، کە ئەم دوو ئایەتە مەنعی تەوەسولی تیادا نی‌یە نە بە پێغەمبەر و نە بە غەیری ئەو لە پێغەمبەران و پیاوچاکان و زانایان، لە کاتێکدا کە خوا مەقامی مەحمود و مەقامی شەفاعەتی گەورە (العظمی)ی پێ بەخشیوە، وە ڕێگەی نیشانی دروستکراوانی خۆی داوە کە بڕۆن بۆ خزمەتی و داوای لێ بکەن، وە فەرمووی پێی: ((سَلْ تُعْطَهْ وَاَشْفَعْ تُشَفَعْ)) داوا بکەو پێت ببەخشم شەفاعەت بکە و شەفاعەتەکەت لای ئێمە وەرگیراوە، کە ئەمەی لە قورئاندا بەستۆتەوە بەو حاڵەتەوە کە ناتوانێ شەفاعەت و تکا بکات مەگەر لەدوای ئیزنی پەروەردگاری یان شەفاعەت نی‌یە مەگەر بۆ کەسانێ کە خوا خۆی ڕازی لەسەر بێ کە پێیان ببەخشێ..

وە ئایا بەڵگە لەسەر نەبوونی تەوەسول بەوە دێننەوە کە خوا فەرموویەتی: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ﴾ الشعراء: ٢١٤... کە وتوویێتی (ئەی فلانی کوڕی فلان) من هیچ ناتوانم بۆت بکەم لەلای خوا، (ئەی فلانی کچی فلان) ناتوانم هیچت بۆ بکەم لەلای خوا، کە ئەم ئایەتە و ئەم وتانە هیچی تیا نیە مەگەر دان نان بێ بەوەدا کە پێغەمبەر ﷺ ناتوانێ سوود بگەیەنێ بە کەسێ کە خوا ئیرادەی زیانی پێ‌ی ببێ، وە ناتوانێ زەرەر دوور بخاتەوە لە کەسێ کە خوا بیەوێ سوودی پێ بگەیەنێ، وە ئەو پێغەمبەرە خاوەنی هیچ ڕێزێك بۆ خزمەکانی نی‌یە کە جیاوازیان بخات لە هەر شتێکدا لەلای خوا، کە ئەمە بۆ هەموو موسوڵمانێ ڕوون و ئاشکرایە وە ئەوەشی تیا نی‌یە کە بڵێ تەوەسول بە پێغەمبەرەوە مەکەن بۆ لای خوا، کە ئەمانە داواکردنی فرمانێکە لە کەسێکەوە کە خاوەنی ئەمر و نەهی‌یە، وە ئەوەی داواکار داوای دەکات و ئەیخاتە بەردەستی داوالێکراو شتێکە لە

شیاوی یان هۆکاری وەڵامی تیا بێ، لە کەسێکەوە کە بەخشین و ڕەد کردنەوەی لەلایە، کە ئەویش خاوەنی ڕۆژی قیامەتە)... (لێرەدا وتەکەی الشوکانی تەواو بوو..)...

## شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب دەڵێ تەوەسول دروستە

پرسیاریان کرد لە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب ئایا ئەو قسەیە و دۆعایەی لە کاتی نوێژە بارانەیە دەوترێت حوکمی چۆنە؟ کە ئەڵێن: (لا بأس بالتوسل بالصالحين) واتە لە کاتی پاڕانەوەکەدا تەوەسول بە پیاو چاکانەوە هیچ خراپی‌یەکی تیا نییە.. وە وتیان ڕەئتان سەبارەت بە فەرمایشتی ئیمامی ئەحمەد کە وتوویەتی: (يتوسل بالنبيّ ﷺ خاصة مع قولهم: إنه لا يُستَغاثَ بمخلوق).. چیە؟ ..

لە وەڵامدا وتی[1]: ((جیاوازی‌یەکە زۆر ئاشکرایە، وە ئەمە جێگە باسی وتەی ئێمە نی‌یە، ئەوەی (کە هەندێکیان ڕوخسەتیان بە تەوەسوی پیاوچاکان داوەو، هەندێکی تریان تەوەسولیان تایبەتمەند کردووە بە پێغەمبەرەوە ﷺ وە زۆرێك لە زانایانیش وتوویانە کەراهەتی هەیە)، بۆ ئەمانە ئەڵێین: ئەمە مەسئەلەو باسێکە لە بابەتە فیقهی‌یەکان، کە هەرچەندە ڕاست لەلای ئێمە وتەی زۆرینەی زانایانە کە کەراهەتی هەبێ، بەڵام نکوڵی لە کردنەکەشی ناکەین، وە هیچ جۆرە نکوڵی‌یەك لە بابەتە ئیجتیهادی‌یەکاندا دروست نی‌یە و ناکرێ) بەڵام نکوڵی و ئینکاری ئێمە بۆ ئەوانەیە کە هاوار لە دروستکراوێکی خوا دەکەن بەو شێوەی کە هاوار لە

[1]- بنوارە بۆ (مجموعة مؤلفات الشيخ محمد بن عبدالوهاب) بەشی سێیەم: لا ٦٨ کە (جامعة الأمام محمد بن سعود الأسلامية) بۆی بڵاوکردۆتەوە لە (اسبوع الشيخ محمد بن عبدالوهاب)...

خـوا دەكـەن، وە ئەوانـەی كـە دەچـنە سـەر گـۆڕ بـۆ پاڕانـەوە لـەلای شـێخ عبدالقادر و غەیری ئەو، كە داواكەن ئەو مردووە نارەحەتیەكانیان لەسەر هەڵبگرێ و ئارەزووەكانیان بۆ جێبەجێ بكات، ئەمە لەكوێ و ئەو بەندەیە لەكوێ كە داوا لە خوا بكات بە ئیخلاصی تەواو، كە لەگەڵ خوادا هاوار لە كەسی تر ناكات بەڵام لە پاڕانەوەكەیدا دەڵێ: ((أسألُك بنبيك أو بالمرسلين أو بعبادك الصالحين)) خوایە داوات لێ دەكەم بە خاتری پێغەمبەرەكەت یان پێغەمبەرانت یان بەندە چاكەكانت، یان دەچنە پاڵ گۆڕێكی ناسراو یان نەناسراو دۆعای لەپاڵدا دەخوێنن بەڵام دۆعا و پاڕانەوەكانیان لە خزمەت خوادایە، ئەمەی دووەمیان ئێمە لە كوێ ئەیانبینین و پێیان دەگەین))..

لێرەدا وتەكەی تەواو بوو...

كە ئەمەی سەرەوە بەڵگەیە لەسەر دروستی تەوەسول لەلای ئەو شێخە، كە ئەوەی ئەو ئەیبینێ بەلای زانایانەوە پلەی كەراهەتی هەیە، بەڵام هەموو دەزانین كە شتێك كەراهەتی لەسەر بێ بەوە حەرام نابێت، وە داینەناوە بە داهێنراو یان هاوەڵ بۆ خوا دانان...

## شێخ محمد كوری عبدالوهاب تەبەڕا دەكات لەو كەسانەی كە خاوەن تەوەسولەكان كافر دەكەن

لەو نامەیەدا كە شێخ محمد عبدالوهاب ناردویەتی بۆ خەڵكی (القصيم)دا هاتووە كە زۆر بە توندی نكوڵی خۆی دەردەبڕێن بەرامبەر ئەو كەسانەی كە وتویانە گوایە محمدی كوڕی عبدالوهاب حوكمی بێ بڕوایی و كوفری داوە لەو كەسانەی كە پیاوچاكان دەكەنە وەسیلە، وە لە نامەكەیدا دەڵێ:

(بزانن كه سليمانی كوڕی سەحيم درۆی بە دەم منەوە هەڵبەستووە كە من نەمووتوون، وە بگرە زۆر لەوانە بە مێشكيشمدا نەهاتووە، لەوانە: گوايە من ئەوانەم بە كافر ناساندووە كە تەوەسول بە پياوچاكانەوە دەكەن، يان گوايە من شێخی بوەيصريم كافر كردبێ لەبەر وتەی (يا أكرم الحق) وە گوايە من كتێبی (دلائل الخيرات) دەسوتێنم، وەڵامی من بۆ ئەم باسانە ئەوەيە كە دەڵێم: ((سبحانَكَ هذا بُهتان عظيم)) (ئەوە بوختانە و بە دەم منەوە كراوە)..

وە بۆ پشتگيری ئەم وتەيەی لە نامەيەكی تريدا كە ناردويەتی بۆ خەڵكی (المجمعة) كە تيايدا دەڵێ: ( كە ئەمەتان بۆ ڕوون بوويەوە بزانن كە زۆر باس هەيە لە ناوتانا بڵاوبۆتەوە، كە زۆرێكيان بوهتانێكی زۆر ئاشكران، لەوانە: من ئەوانەم بەكافر ناساندبێ كە تەوەسوليان بە پياو چاكانەوەيە، يان من (البويصری)م كافر كردبێ (... تا كۆتايی نامەكە)، پاشان دەڵێ: وەڵامی من بۆ ئەوانە (سبحانك هذا بهتان عظيم) دەبێ [1] .

## تەوەسول بە ئاسارەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ

جێگير بووە كە هاوەڵان –الصحابة– تەبەروكيان وەرگرتووە بە (ئاثار)و پاشماوەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ، كە ئەم تەبەروك وەرگرتنە لە يەك مانا زياتر نابەخشێ ئەويش (تەوەسول كردنە بە ئاساری پێغەمبەر ﷺ، بۆ خزمەتی خوای پەروەردگار ) ، چونكە تەوەسول لەسەر زۆر شێوە دەبێ نەك تەنها لەسەر يەك شێوە...

---

[1]– بنوارە بۆ نامەی يەكەم و نامەی يانزە لەو كۆمەڵە نامەيەی لەژێر ناوی (رسائل الشيخ محمد بن عبدالوهاب)دا بڵاوكراوەتەوە لە بەشی پێنجەم لا١٢١ و لا ٦٤.

ناحەزان : وا بڵاویان کردۆتەوە یان وا ئیفترایان کردووە کە گوایە هاوەڵان تەوەسولیان بە ئاسارەکە کردووە نەك بە خودی پێغەمبەرەوە ﷺ؟ ئایا دروستە تەوەسول بکرێ بە فەرع و لقەوە و دروست نەبێ بە ئەصلەکەوە؟ ئایا دروستە تەوەسول بە ئەسەرێکەوە کە گەورەیی و ڕێز و بەرزێتی وەرگرتبێ لەوەوە کە موڵکی حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ بەڵام بوترێ تەوەسول بە پێغەمبەر ﷺ خۆیەوە ناکرێ؟ ..

سبحان الله ؟ ئەمە بوهتان و هەڵبەستراوێکی گەورەیە...

بەڵگە و دەقەکان لەم باسەدا زۆر زۆرن، بەڵام لێرەدا لەسەر ناودارەکانیان ئەوەستین و ئەیانهێنین... ئەوەتا جێنشینی ئیسلام و فەرمانڕەوای موسوڵمان عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) زۆر مەبەستیەتی و زۆر سوورە لەسەر ئەوە کە بنێژرێ لە نزیك خۆشەویستەکەیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا کە وەفاتی نزیك دەبێتەوە، عەبدوڵڵای کوڕی نارد بۆ خزمەت خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لەسەر) تا ئیزنی بۆ وەربگرێ و ئا لەو شوێنەدا لە ژوورەکەدا لەدوای مردنی بنێژرێ، بەڵام خاتوو عائیشە ئەو شوێنەی بۆ خۆی دانا بوو، بۆیە لە وەڵامی عبدالله دا فەرمووی: (ئەو شوێنەم بۆ خۆم داناوە بەڵام ئەمڕۆ ئیسار لە نەفسی خۆم دەکەم و پێی دەبەخشم) کاتێ گەڕایەوەو ئەو هەواڵە خۆشە و مژدەیەی گەیاند بە پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب! (ڕەزای خوای لێ بێ) هەستا بەرەو پیری و فەرمووی: سوپاس بۆ خوا هیچ شتێ نەبوو لەلام گرنگتر بێ لەو مژدەیە زیاتر...)

بۆ درێژی ئەم ڕووداوە بنواڕە بۆ (البخاري) ئێستا دەپرسین: مانای ئەم پەرۆشیەی حەزرەتی عومەر چیەو ئەو وەڵامەی خاتوو عائشە چی دەگەیەنێ؟؟!

بۆچـی دەبـێ لـە نزیکـی پێغەمبـەر ﷺ ناشـتن لـە گـرنگترین شـت و خۆشەویسترین شت بێ لەلای خەلیفە عومەر؟..

ئەمانە هیچ جۆرە ڕاڤە و تەفسیرێك هەڵناگرێ مەگەر تەوەسول کردن بە پێغەمبـەرەوە ﷺ لـەدوای وەفـاتی و تەبـەروك کـردن بـە نزیکـی لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ نـەبێ. اُمُ سلیم (ڕەزای خـوای لەسـەر) شـوێن دەمـی ئـەو کوپەڵەیـەی بڕیـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـاوی تیـا دەخـواردەوە، أنـس (ڕەزای خـوای لەسـەر) دەیگـوت بـۆ پـیرۆزی و تەبـەروك لای خۆمـان هێشتمانەوە. هاوەڵان –الصحابە– پێشبڕکێیان دەکرد بۆ وەرگرتنی تاڵێك لە مووەکانی سەر و قژی پێغەمبەری سەردار ﷺ لە کاتێکدا کە دادەنیشت قژی بۆ کورت بکەنەوە...

ئەوە خاتوو ئەسماء کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خوایان لێ بێ) پارێزگاری لەو جوبەیـەی پێغەمبـەر ﷺ دەکـات و لای خـۆی هەڵیـدەگرێ و دەڵـێ: (ئێمـە جوبەکە لەئاو هەڵدەکێشین و ئاوەکە بە نەخۆشـەکانمان دەدەین و بۆ شـیفا بەکاری دەهێنین..)...

ئەوە مۆرەکەی پێغەمبەرە ﷺ لەدوای خۆی هەریەکە لە (أبوبکر و عمر و عثمان) (ڕەزای خوایـان لێ بـێ) پارێزگـاری لێ دەکـەن، کـە پاشـان کەوتـە نـاو بیرەوە... کـە هـەموو ئـەم فەرموودانـە ڕاسـتن و پلـەی –صـحیح–یـان هەیـە، هەروەك لە باسی (التبرك) لە سوننەتەکاندا هاتووە...

ئەوەی لێرەدا مەبەستمە بیڵێم:

( ئـەو پرسـیارەیە کـە بۆچـی ئـەو پارێزگـاری یـە لـە هاوەڵانـەوە (ڕەزای خوایان لەسەر) بۆ هەموو ئەو ئاسار و کەلوپەلانـەی پێغەمبـەر ﷺ؟ (شـوێن دەمـی پێغەمبـەر، تاڵـە مووەکـانی، عارەقی بـۆن خۆشـی، جوبەکـەی بـەری، مۆرەکەی، بەرماڵەکەی...) مەبەست چی‌یە لەمەدا؟!

ئایا تەنها بۆ یادگاری هەڵیان گرتووە؟ یان بۆ پارێزگاری لەو ئاسارانە تا بمێنێتەوە بۆ مێژوو وەك کەلەپور لە مۆزەخانەکان دا هەڵبگیرێن؟

ئەگەر مەبەستی یەکەم و یادگاری‌یە، ئەی بۆچی بۆ کاتی دوعا و نزیکی لە پەروەردگار و تووش بوونی ناڕەحەتی و نەخۆشی بەکاریان دەهێنا؟ خۆ ئەگەر بۆ دوومیشە، ئەوا کوا ئەو مەتحەفە، ئەو کردنەوەی متحفە بیرو مێشکی کام هاوەڵ بوو، لە کوێوە ئەو بیرکردنەوە داهێنراوی یە سەری هەڵدا؟!..

هیچ نەماوە بیڵێین تەنها ئەوە نەبێ کە:

مەبەست تەبەروك وەرگرتن بووە بە کەل و پەل و ئاساری پێغەمبەرەوە ﷺ وە گێڕانی بە تەوەسول بۆ خزمەت خوای پەروەردگار لە کاتی پاڕانەوەکانیان، چونکە خوای پەروەردگار تەنها خۆی دەبەخشێ و خۆیشی بەرپرسی کردەوەکانە، وە هەمووانیش بەندەی ئەوین و لەژێر فرمانی ئەودا ئەژین، کە ناتوانرێت ببیتە خاوەنی هیچ شتێك چ بۆ خۆت مەگەر ئەوەی کە خاوەنێتی تەنها بە ویست و ئیرادەی خوای پەروەردگار نەبێ)...

# تەوەسول كردن

## بە ئاساری پێغەمبەرانەوە ( عليهم السلام )

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نِبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ البقرة: ٢٤٨.

(ابن كثير) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە (البداية والنهاية)دا دەڵێ:

ئیبن جورەیر لەبارەی ئەم تابوتەوە دەڵێ: هەر کاتێ شەڕیان لەگەڵ هەر دوژمنێکیاندا بکردایە، ئەو تابوتەیان لەگەڵ خۆیان دەبرد، کە بەهۆی ئەو تابوتەوە و بە بەرەکەتی ئەوەوە داوای سەرکەوتنیان دەکرد، ئەمەش بەوەی کە خوای گەورە دڵئارامی تایبەتی پێ بەخشیبوو، وە پاشماوەی (آل موسی و آل هارون)ی تیا بوو، بەڵام لە هەندێ لە شەڕەکانیان لەگەڵ خەڵکی غەزەو و عەسقەلان، توانرا لە دەستیان دەربهێنرێت و تابوتەکەیان لێ بسەنرێت [١] .

(ابن كثير) دەڵێ: ئەوان بەهۆی ئەو تابوتەوە سەرئەکەوتن بەسەر دوژمنەکانیاندا، کە لەناو ئەو تابوتەدا ئەو تەشتە ئاڵتونیەی تیا بوو کە سنگی پێغەمبەرایەتی پێ ئەشۆرا)[٢] .

وە (ابن كثير) لە (التفسير)دا دەڵێ: (لەو تابوتەدا دارعەصاکەی پێغەمبەر موسا و هاروونی تیا بوو، لەگەڵ دوو لەوح لە تەورات، وە پۆشاکی هارون پێغەمبەر، وە هەندێکیش دەڵێن: درا عەصا و دوو جووت نەعل بووە کە تیایدایە) [٣] .

---

[١]- بنوارە بۆ (البداية والنهاية)ی (ابن كثير) ٢/٥...

[٢]- بنوارە بۆ (البداية والنهاية)ی (ابن كثير) ٢/٨.

[٣]- بنوارە بۆ (تفسير القرآن العظيم- ابن كثير) ١/٣١٣.

وه (القرطبي) دهڵێ:

(ئهو تابوته ئهوهیه كه خوا نازڵی كرد بۆ پێغهمبهر ئادهم وه لهلای ئهو بووه، تا گهیشتۆته دهستی پێغهمبهر یهعقوب (علیه السلام) كه لهناو بهنی ئیسرائیلیهكان بههۆیهوه سهرئهكهوتن بهسهر ئهوانهدا كه شهڕیان لهگهڵ دهكردن، ههتا له خوا یاخی بوون و دهست گیرا بهسهر ئهو تابووتهدا و (العمالقه) تابووتهكهیان برد)[1].

كه ئهمه له ڕاستیدا تهوهسول كردن بووه به پاشماوهی ئهو پێغهمبهرانه، كه هیچ مانایهكی تیا نیىیه بۆ ناو جهرگهی شهڕهكهیان ئهم تابووته لهگهڵ خۆیاندا ببهن مهگهر تهوهسول پێكردن نهبێ، وه خوای پهروهردگاریش ڕهزامهندی لهسهر ئهو كاره بووه، به بهڵگهی ئهوه كه بۆی گێڕانهوه و گێڕای به نیشانه و بهڵگهیهك لهسهر ڕاستیهتی دهسهلاتی طالوت، وه ئهو كردهوهیهیانی به خراپ له قهڵهم نهدا و نهیداوه به ڕوویاندا..

## تهوهسولی پێغهمبهر ﷺ به جاهی و به جاهی پێغهمبهران و پیاوچاكان

له باسی (مهناقب)ی فاطیمهی كچی ئهسهد، كه دایكی پێشهوا عهلی كوڕی ئهبی طالبه -كرم الله وجهه- وه ڕهزای خوای لێ بێ- هاتووه، كه له كاتێكدا وهفاتی كرد، پێغهمبهر ﷺ به دهستی خۆی گۆڕهكهی بۆ ههڵكهند و گڵهكهی دهردههێنا، له كاتێكدا گۆڕهكه ئاماده بوو، حهزرهت ﷺ چووه ناو گۆڕهكه و لهناویدا پاڵكهوت و فهرمووی:

[1]- بنواره بۆ (الجامع لأحكام القرآن – القرطبي) ٢٤٧/٣.

(الله الذي يحيى وَ يُميتُ وهو حي لا يموت) خوايه له دايكم فاطمەی کچی ئەسەد خۆش ببه، بەڵگەکانی بەهێز بکه و گۆڕەکەی بۆ فراوان بکه تو جاهی پێغەمبەرەکەت و جاهی پێغەمبەرانی پێش من، تۆ زۆر بەڕەحم و میهرەبانی، (آغفر لِأُمي فاطمة بنت أسد، وَ لقنها حجتها وَ وسع عليها مدخلها بحق نبيك والأنبياء الذينَ مِنْ قبلي، فإنَكَ أرحم الراحمين)، پاشان چوار جار (الله أكبر)ی کرد و لاشەکەی خستە گۆڕەکە، لەویادا ئیمامی عەباس و ئەبوبەکری صدیق یارمەتیان دا..[1]... ڕەزای خوایان لەسەر بێ..

جیاوازی ڕا هەیە لەسەر (ڕەوحی کوڕی صەلاح) کە یەکێکە لە ڕاویەکانی، بەڵام (ابن حبان) لە پەرتووکی (الثقات) ناوی بردووە، وە (الحاكم) دەڵێ: لەلای مەئمون پیاوێکی باوەڕپێکراوە، وە هەردووە (الحافظ) ئەم گێڕانەوەیان بە ڕاست داناوە، هەروەها (الهيثمي) لە کتێبی (مجمع الزوائد) دەڵێ: (ڕەوحی کوڕی صەلاح)ی تیایە و لە (ابن حبان) بە باوەڕپێکراو دانراوە، وە (الحاكم) لەلای جێی متمانەیە وە لاوازییەکی تیایە، وە باقی پیاوەکانی تری پیاوی چاکن و بە (رجال الصحيح) ناسراون.

وە هەروەها (ابن عبد البر) لە (ابن عباس)ەوە ڕیوایەتی کردووە، وە (ابن أبی شیبه) لە (جابر)ەوە ڕیوایەتی کردووە، وە (الديلمی) و (أبو نعيم) ڕێگەی فەرموودەکەیان دەرهێناوە، وە ڕێگەکانی یەك یەکتری بەهێز دەکات بە لێکۆڵینەوە لەسەری کراوە...

زانای بەڕێز -الحافظ- عەبدوڵڵای کوڕی صدیق ی غوماری[2] دەڵێ:

---

[1]- (الطبراني) ڕیوایەتی کردووە لە (الكبير) و لە (الأوسط) وە هەروەها لە (مجمع الزوائد) ٩/٢٥٧.

[2]- بنواڕە بۆ (إتحاف الأذكياء) الغماري لا٢٠.

(ئەم ڕەوحە لاوازیەکەی سووکە لەلای ئەوانەی کە فەرموودەکە بە لاواز دەزانن هەروەك لە داڕشتنەکانیدا دەردەکەوێ، وە (الهیثمي) وا باس دەکات کە تێگەیشتبێ لاوازی سووك بێ، کە هەروەك چۆن شاراوە نیيە لەلای ئەوانەی ناميلكە و کتێبی هونەر دەخوێننەوە، فەرموودەکە لە پلەی – حسن– (واتە چاك) کەمتر نیيە، بەڵکو لەسەر شەرتی ابن حبان بە فەرموودەیەکی –صحیح– ڕاست دادەنرێ)..

وە تێبینیەکی تر لێرەدا دیارە ئەویش:

ئەو پێغەمبەرانەی کە حەزرەت ﷺ کردونی بە تەوەسول بۆ لای خوای گەورە هەموویان لە حاڵی وەفاتا بوون ... کەواتە جێگیر بوو تەوەسول کردن بۆ لای خوا بە جاه و بە کەسانێ کە ئەهلی جاه و مەقام بن چ زیندوو بن یان مردوو...

## تەوەسولی پێغەمبەر ﷺ بە جاهی ئەوانەی کە داوا لە خوا دەکەن

لە أبی سعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێ بێ– دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(هەرکەسێ لە ماڵی خۆی بێتە دەر بۆ نوێژ، وە بڵێ: اللهم إني أسألُكَ بِحقِ السائلينَ عليك، وَ بحقِ ممشاني هذا، فإني لم أُخرج أشراً وَلا بطراً، وَلا رياءً وَلا سمعةً، خرجتُ اتقاء سخطِكَ وآبتغاءَ مَرضاتِكَ، فأسألُكَ أن تعيذني مِنَ النار، وَأن تغفرلي ذنوبي، إنَهُ لا يغفر الذنوبَ إلا انتَ، ئەوە خوای پەروەردگار بەرەو پیری دەچێ و حەفتا هەزار لە فریشتەکان داوای لێخۆش بوونی لەخوا بۆ دەکەن).

(المنذري) دەڵێ: (ابن ماجه) ڕیوایەتی کردووە بە ئیسنادێك، وە (أبو الحسن)ی حافظ پلەی -حسن-ی داوەتێ[1] .

وە ئیبن حەجەری حافظ دەڵێ: ئەم فەرموودە -حسن-ە، ئیمامی ئەحمەد ڕێگەکەی هێناوە، وە (ابن خزیمة) لە (کتاب التوحید)دا هێناویەتی و وە (أبو نعیم) و (ابن السنی) هێناویانە[2] .

وە (العراقی) دەڵێ: ئەم فەرموودە پلەی -حسن-ی هەیە[3] .

وە (الحافظ البوصیري) دەڵێ: ابن خزیمة لە -صحیح-ەکەیدا ڕیوایەتی کردووە[4] .

وە (الحافظ شرف الدین الدمیاطي) دەڵێ: ئیسنادی ئەم فەرموودەیە إن شاء الله پلەی -حسن-ە[5] .

وە (زانای لێکۆڵەری فەرموودەناس: سید علی ی کوڕی یەحیای عەلەوی) لە نامەکەیدا کە ناوی (هدایة المُتخبطین)ە باسی کردووە کە (عبدالغنی المقدسی) حافظ پلەی -حسن-ی پێ داوەو پێش ئەویش (ابن أبی حاتم) وتوویەتی کە -حسن-ە..

لێرەوە بۆت دەردەکەوێ: کە ئەم فەرموودە ڕاستە و کۆمەڵێکی زۆر لە زانا بەرزەکانی فەرموودەو پێشەواکانیان پلەی (حسن)یان داوەتێ لەوانە (ابن خزیمة ، المنذري ، أبو الحسن-کە مامۆستای (المنذري)یە، العراقي،

---

[1]- بنواڕە بۆ (الترغیب والترهیب) المنذري ٤٥٨/٢.

[2]- بنواڕە بۆ (نتائج الأفکار)ی ابن حجر ٢٧٢/١.

[3]- بنواڕە بۆ (المغني) العراقي وە (تخریج أحادیث الأحادیث) ٣٢٣/١.

[4]- بنواڕە بۆ (مصباح الزجاجة) البوصیری ٩٨/١.

[5]- بنواڕە بۆ (المتجر الرابح)ی الدمیاطي لا ٤٧١.

البوصيری –غەيری خاوەنی (البردە)يە، ابن حجر، الدمياطي، عبدالغني المقدسي، ابن أبي حاتم)..

ئيتر لەداوی وتەی ئەو بەڕێزانەوە هيچ وتەی تر ئەمێنێ تا بووترێ؟ وە ئايا دروستە و ئەگونجێ لە کەسێکەوە کە ژێر و فاميدە بێ کە واز لە حوکمی ئەو کەڵە پياوانە بێنێ کە شارەزاو پارێزەری فەرموودەن و جێگەی بڕوای زانايانن و بێت گوێبيستی کۆمەڵێ وتە بێ لە کەسانێکەوە کە بخۆری سەر سفرەکانی فەرموودەن؟[1] .

﴿أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ أَدْنَى بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ﴾ البقرة: ٦١.

﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ الحج: ٤٦.

---

[1]– فەرموودەيی (ابي سعيد الخدري) ڕەزای خوای لێ بێ، (اللهم إني أسألك بحقِ السائلين) شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لە کتێبی (آداب المشي الى الصلاة)دا هێناويەتی وە هانی موسوڵمانانی داوە لەسەر خوێندنەوەی...

لێرەوە هيچ ماوەيەك نەماوە بۆ بەرانبەرانمان لەدوای ڕاست کردنەوەکان و لەدوای بە چاك زانينی ابن خزيمە و ئەو زانايانەی تر کە پێشەوايانی بانگەوازەکەی ئيسلام ڕەحمەتی خوايان لێ بێ و بەدوورمان بخات لە خراپی تێنەگەشتوان.

## تەوەسول بە مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ
## بە ڕێنومایی خاتوو عائیشە

پێشەوا –الحافظ الدارمي– لە کتێبی –السنن– دا دەڵێ: لە بەشێکی تایبەتی لەژێر ناوی (باب ما اکرَمَ اللهُ تعالى نبيه ﷺ بعد موتِه) ((بۆی گێڕاینەوە ئەبو نعمان، بۆی گێڕاینەوە سعیدی کوڕی زەید، بۆی گێڕاینەوە عەمری کوڕی مالك ی ئەلنەکری، بۆی گێڕاینەوە ئەبو ئەلجەوزاء ئەوسی کوڕی عەبداللە دەڵێ: گرانیەکی زۆر توند خەڵکی مەدینەی گرتەوە، خەڵکی شکایەتی حاڵی خۆیان بۆ لای خاتوو عائشە برد، ئەویش فەرمووی: (انظروا قبر النبيّ ﷺ فاجعلوا منه كُواً الى السماءِ، حتى لا يكون بينَه و بين السماء سقف) سەیری مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ بکەن، لە ئاستی مەرقەد بۆ ئاسمان دەروازە یان پەنجەرەك دروست بکەن، هەتا نێوان ئەو و ئاسمان هیچ سەقفێ نەمێنێ، فەرمووی: ئەوەیان جێبەجێ کرد (فَمُطرنا حتى نَبَتَ العَشبُ وَ سمنت الأبِلُ حتى تفتقت مِن الشحم، فُسُمي عام (الفتق) [1] .

بارانێکمان بۆ هات لە ئاسمانەوە بە شێوەیەك گیایەکان بوژانەوە، وشترەکان قەڵەوبوونەوە هەتا وایان لێ هات چەوریەکانیان لە ئاوساندندا خەریك بوو دەتەقی، بۆیە ئەو ساڵەیان ناو نا (ساڵی الفتق) ساڵی تەقینەوە و بوژانەوە.

کُوّا : وشەیەکی کۆیە، بریتی یە لە پەنجەرە...

ئەمە تەوەسول بوو بە مەرقەدی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ نەك لەبەر ئەوە کە گۆڕێکە، بەڵکو لەو بارەوە سەیر دەکرێ کە لاشەی بەڕێزترینی دروستکراوانی خوای لەباوەش گرتووە، کە خۆشەویستی پەروەردگارە،

---

[1]- بنوارە بۆ –سنن الدارمي– ٤٣/١.

بەهۆی ئەم لەخۆگرتنە ئەو گۆڕەش پیرۆز بووە و شیاوی ئەو ڕێزلێگرتنە گەورەیەیە.

تەخریج و دەرهێنان و ڕێگاکانی فەرموودەکە:

ئەبو نعمان: ناوی محمدی کوڕی فەضلّە، لەقەب و کونیەی -العارم-ە کە شێخی بوخارییە، کە (الحافظ) لە کتێبی -التقریب-دا لەبارەیەوە دەڵێ: (ثقةٌ ثبت، تَغَيَر فِي آخر عُمرهِ) واتە: جێگەی متمانەیە، بەڵام لە کۆتایی تەمەنیدا گۆڕاوە...

منیش دەڵێم: ئەمە هیچ زیانێکی تیا نییە و زەرەر لە ڕیوایەتەکە نادات، چونکە ئیمامی بوخاری لە -صحیح-ەکەی خۆیدا زیاد لە سەد فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە، وە لە دوای ئەو حاڵەی ئیتر فەرموودەی تری لێوە ڕیوایەت نەکردووە، کە پێشەوا -الدار قطني-یش هەمان ڕای (حافظ)ی هەبووە لەبارەیەوە دەڵێت وەکو شارەزایەك هەواڵ و فەرموودەی لێوەرناگیرێ.

شێخی -الذهبي- بەرانبەر بە -ابن حبان- ڕاوەستاوە لەسەر ئەو وتەیەی کە دەڵێ: فەرموودەی مونکەری گێڕاوەتەوە، کە -الذهبي- دەڵێ: (ولم يقدر ابن حبان أن يَسوقَ لَهُ منكراً فأينَ ما زعيمَ)[١].

وە سعیدی کوڕی زەید، ئەوە کەسێکی ڕاستگۆ بووە، وە (عەمری کوڕی مالك)یش بەهەمان شێوە، کە (ابن حجر) لە -التقریب-دا وا باسیان دەکات. وە زانایان بڕیاریان لەسەر ئەم دێڕە داوەو وتوویانە: (صَدُوقٌ يَهِمُ) کە ئەمەش لە ڕووی باوەڕ و متمانەی تەواوە نەك لە ڕوانگەی لاوازییەوە، کە ئەمە لە -تدریب الراوی- بە جوانی لێی دواوە..

---

[١]- بنوارە بۆ -میزان الأعتدال- ٤/٨.

بەڵام ئەبولجەوزاء- ئەوە: ئەوسی کوڕی عبداللە ی ئەلرەبعیيە، کە جێی متمانەو ثقەداری ناو هەردوو صەحیحەکەیە..

کە ئەم سەنەدەی فەرموودەکە هیچی لەسەر نییە، بەڵکو لەلای من بە سەنەدێکی باش دادەنرێ، زانایان ئەو سەنەدەیان وەرگرتووە و بە شاهید هێناویانەتەوە لە زۆر لە نموونەکانیان...

## خاتوو عائشە و بیروباوەڕی سەبارەت بە مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ

هەندێ لە بەرانبەرانمان دەڵێن: ئەم ئەثەرە و ڕووداوەی خاتوو عائشە ڕاوەستێنراوە لەسەر خاتوو عائشە و کە یەکێکە لە هاوەڵان، کردەوەی هاوەڵیش نابێ بە حوجە و بەڵگە..

وەڵامی ئەوانە ئەمەیە: ئەو ڕووداوەیە با تەنها ڕاوبۆچوونێکی خاتوو عائشە بێ (ڕەزای خوای لێ بێ) بەڵام بەس خاتوو عائشەیە ناسراوە بە (غزاره العلم) (خاوەن لێشاوی زانست) وە ئەو ڕووداوەش کە ڕووی دا لە شاری مەدینە بوو لەنێوان زانایانی صەحابەدا بوو، وە تەنها ئەوەش بێ کە ئەم چیرۆکەیە بەڵگە دەبێ لەسەر ئەوەی کە دایکی موسوڵمانان خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) چاك ئەزانێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام لە دوای وەفاتیشی میهرەبانە و شەفاعەتکار و تکاکاری دەبێ بۆ ئومەتەکەی، کە هەرکەس زیارەتی بکات و داوای شەفاعەتی لە خزمەتدا بکات تکاکەی قبوڵ دەکات، وەکو خاتوو عائشە جێبەجێی کرد، کە ئەمە لە بەشی هاوەڵ بۆ خوا دانان یان لە هۆکارەکانی شیرك نییە، هەروەك زۆر لەوانەی کە بە ئارەزووی خۆیان خەڵك بێ بڕوا دەکەن و خەڵکان بە گومڕا دەزانن، کە خاتوو عائشە (ڕەزای خوای لەسەر) و ئەوانەش کە بە خزمەتی

گەیشتوون، نە نەزان بوون بە شیرك و حوكمەكەی و بەشەكانی نە لەوانەش بوون..

ئەم ڕووداو و چیرۆكە هەموو بینیویانە و جێگیریش بووە كە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ گرنگی بە ئومەتەكەی ئەدا لەو كاتەدا كە وەفاتی كردووەو لە مەرقەدیایەتی وە جێگیر بووە كە دایكی ئیمانداران خاتوو عائشە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەیفەرموو: ((هەموو جار ئەچوومەماڵەكەی خۆم كە پێغەمبەری خوا ﷺ و باوكم تیایدا نێژراون پۆشاكم دادەناو خۆم ئەگۆڕی، ئەمووت: ئەمەیان هاوسەرم بووە و ئەوەشیان باوكمە، بەلام كاتێ خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) لەویادا تەسلیم كراو لە خزمەتیاندا بووم، قەسەم بە خوا نەچوومەتە ماڵەكەی خۆم مەگەر پۆشاكەكانم تونتر لە خۆم پێچاوەتەوە لەبەر شەرم لە عومەر))[1] .

ئایا خاتوو عائشە (ڕەزای خوای لێ بێ) نەیئەزانی ئەمە هەڵەیە ئەگەر هەڵە بووایە، یان چاك ئەیزانی كە حەزرەتی خۆشەویست و هەردوو هاوەڵی ئەزانن كێ بەسەر گۆڕەكانیانەوەیە.

وە خۆشەویست ﷺ فەرمووی بە (مەعاذ) لە كاتێكدا ناردی بۆ یەمەن، فەرمووی پێی: ((لَعَلك تَمُرَّ بقبري وَ مَسْجدي))[2] .

---

[1]- ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە (الحافظ الهیثمي) دەڵێ: پیاوەكانی ڕاست و چاكن، بنواڕە بۆ (مجمع الزوائد) ٢٦/٨، وە (الحاكم) لە (المستدرك) ڕیوایەتی كردووە ٧/٤ وە دەڵێ لاصحیح علی شرط الشیخین وە (الذهبي) هیچ ئیعترازێكی لێ نەگرتووە.

[2]- ئیمامی ئەحمەد و الطبراني ڕیوایەتیان كردووە وە پیاوەكانیان جێگەی متمانەن مەگەر یەزیدی كوڕی قطیب نەبێ كە لە معاذي نەبیستووە. بنواڕە (مجمع الزوائد) ٥٥/١٠

(پێ دەچێت بدەی بەلای گۆڕ و مزگەوتەکەمدا)) پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و مەعازیش گەڕایەوە و هاتە خزمەت مەرقەدی خۆشەویستەکەی و دەستی کرد بە گریان، عومەری کوڕی خەطاب لەسەر ئەو حاڵەتە بینی چوو بۆ لای و ئەم وتووێژە کەوتە نێوانیانەوە کە زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە ئەیگێڕێتەوە ئەڵێ:

عومەر دەرچوو بۆ مزگەوت بینی وا مەعازی کوڕی جەبەل گەڕاوەتەوەو لە خزمەت مەرقەدی پێغەمبەردا ﷺ یەو ئەگری، فەرمووی پێ ی:

چی ئەتگرێنێ؟ وتی: فەرموودەیەك كە بیستم لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: (اليسيرُ مِنَ الرياء شِرك) ڕوپامایی و ڕیابازی ڕێگە بۆ هاوبەش دانان ئاسان ئەکات..

کە ئەم فەرموودە (الحاكم) دەڵێ: ڕاستە (صحيح)ە و هیچ عیلەتێك لەسەری نییە[1] وە (الذهبي)یش دەڵێ (صحيح و لاعلة له) وە (المنذري) دەڵێ: ئیمامی ئیبن ماجە و بەیهەقی و حاکم ڕیوایەتیان کردووە وە حاکم دەڵێ: ( صحيح ولا علة له) [2] و خۆیشی (المنذري) دانی بە فەرموودەکەدا داوە..

---

[1]- بنوارە بۆ (المستدرك)ی پێشەوا الحاكم ١/٤.

[2]- بنوارە بۆ (الترغيب والترهيب) المنذري ١/٦٨.

## تەوەسول کردن بە مەرقەدی پێغەمبەرەوە ﷺ لە خەلافەتی عومەردا (ڕەزای خوای لێ بێ)

هەروەها (الحافظ أبوبكر البيهقي) دەڵێ: هەواڵی داینێ ئەبو نەصر کوڕی قەتادە و ئەبوبەکری فارسی، وتیان: هەواڵی پێدایین ئەبو عومەر کوڕی مەطەر، هەواڵی پێدایین ئیبراهیمی کوڕی عومەری ذەهلی، هەواڵی داینێ یەحیای کوڕی یەحیا، هەواڵی داینێ ئەبو معاویە لە ئەعمەشەوە، لە ئەبی صالح لە مالکەوە، دەڵێ:

لە زەمانی عومەری کوڕی خەطابدا خەڵکی تووشی گرانی و قاتی هاتن، پیاوێك هاتە لای مەرقەدی پێغەمبەرەوە ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (آستسق الله لأمتكَ فإنهم قد هَلكوا) داوا بکە لە خوای پەروەردگار بارانمان بۆ ببارێنێ چونکە ئومەتەکەت نزیکە کە بە هیلاکا بچن... پێغەمبەر ﷺ هاتە خەوی کابراو فەرمووی پێی: بچۆ خزمەت عومەر و سەلامی منی پێ ڕابگەیەنە و هەواڵیان پێ بدە کە بارانیان بۆ دەبارێ، وە پێی بڵێ (عليك بالكيس الكيس) پیاوەکە هاتە خزمەتی و هەواڵەکەی دا بە خەلیفە، ئەویش فەرمووی: (یا رب! ما آلو الا ما عجزتُ عنه).. کە ئەم ئیسنادە ئیسنادێکی ڕاست و تەواوە [1] .

وە ابن أبی شیبە بە سەنەدێکی ڕاست گێڕاویەتیەوە دەڵێ: بۆی گێڕاینەوە ئەبو معاویە، لە ئەعمەشی ئەویش لە ئەبی صالح ی سەمان، لە مالك الدار، کە خازنی خەلیفە عومەر بووە دەڵێ: (خەڵکی تووشی گرانی

---

[1]- بەم شێوە (ابن کثیر) لە (البدایة) هێناویەتی لە ۹۱/۷ وە لە ڕووداوەکانی ساڵی هەژدەدا بوو...

بوو بوون له زه‌مانی خه‌لیفه عومه‌ردا، پیاوێ: هاته لای مه‌رقه‌دی پێغه‌مبه‌ر و.....) فه‌رمووده‌كه.

سه‌یف له (الفتوح)دا گێڕاویه‌تیه‌وه كه ئه‌وه‌ی خه‌وه‌كه‌ی بینی (بلالی كوڕی حارثی موزنی) بوو كه یه‌كێ بوو له هاوه‌ڵان.... وه (ابن حجر) ده‌ڵێ: (إسنادهُ صحیح)[1]...

ئیتر كه‌س له پێشه‌وایانمان كه فه‌رمووده ئه‌گێڕنه‌وه یان ڕیوایه‌ت ده‌كه‌ن نه ئه‌وان و نه له‌دوای ئه‌وان نه‌یانوتووه له دانراوه‌كانیاندا كه ئه‌و شته‌یه بێ بڕوایی یان گومڕایی بێ، ته‌نانه‌ت كه‌س قسه‌ی له‌سه‌ر مه‌تنی فه‌رمووده‌كه‌ش نی‌یه...

وه ئه‌م فه‌رمووده (ابن حجر العسقلانی) هێناویه‌تی و سه‌نه‌ده‌كه‌شی وه‌ك خۆی به ڕاستی داناوه، كه ئه‌م زاته‌یه به‌زانستی و ڕێز و قورسایی نێوان شاره‌زایان و پارێزه‌رانی فه‌رمووده ناسراوه، كه پێویست به ڕوون كردنه‌وه له‌سه‌ری ناكرێ.

## ته‌وه‌سولی موسوڵمان به پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ له ڕۆژی یه‌مامه

بۆمان ده‌گێڕێته‌وه (پێشه‌وا ابن كثیر) كه كۆمه‌ڵی موسوڵمانان له ڕۆژی یه‌مامه‌دا هاواریان كرد و وتیان (وا محمداه...)

كه ئه‌مه‌ی خواره‌وه ده‌قی ڕووداوه‌كه‌یه:

(خالیدی كوڕی وه‌لید) پێشه‌وایه‌تی كرد تا له‌و شوێنه ده‌ربازی كردن و تا بردنیه سه‌ر كێوێك ئه‌ینواڕی به‌سه‌ریاندا و له‌وێوه چاودێری ده‌كردن تا

---

[1]- بنواره بۆ –فتح الباري ٢/٤١٥.

ئەوان بێنە پێشەوە و لێیان بدەن، پاشان گەڕایەوە پاشان وەستا لە (صەفەین)دا وە (بەڕان)ی بانگ کرد و وتی: (أنا ابن الوليد العود، أنا ابن عامر و زيد) پاشان بە دروشمی موسوڵمانانەوە هەموو بەیەکەوە ئەیانووت (یا محمدا)[1] .

## تەوەسول بە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی نەخۆشی و ناڕەحەتیەکاندا

لە (هەیثەمی کوڕی خەنەس)ەوە دەڵێ: (ئێمە لە خزمەتی عەبدوڵلای کوڕی عومەر -ڕەزای خوای لەسەربێ- دانیشتبووین، قاچەکانی سڕ بوو بوو، پیاوێك پێی وت: ناوی خۆشەویسترین کەس لەلات ببە... ئەویش فەرمووی (یا محمد)، سڕەکەی نەما هەروەك لەداو بەر ببێ چاك بوویەوە).
وە لە (مجاهد) ەوە دەڵێ: قاچی پیاوێك سڕ بوو کە لەلای ابن عباس دانیشتبوو -ڕەزای خوای لێ بێ- (ئیمام ابن عباس) پێی فەرموو: ناوی خۆشەویسترین کەست ببە، ئەویش وتی محمد ﷺ ، قاچەکانی چاك بوو سڕیەکەی نەما)[2] .
ئەم تەوەسولە لە جۆری نیدا و هاوار بۆلا کردنە..

---

[1]- بنواڕە بۆ (البداية والنهاية)ی ابن كثير ٣٢٤/٦.
وتەی ابن كثير: کە دەڵێ هوتافیان لەو ڕۆژەدا (یا محمداه) بووە، هەندێ وا گومانیان بردووە کە ئەم باسە باسێکی بیروباوەڕییەو لە مێژووەوە وەرناگیرێ، کە ئەمە تێکەڵ بوونی تیایە، چونکە شێخ محمد عبدالوهاب لە (الفتاوى)دا دەڵێ: تەوەسول لە بیروباوەڕ نیيە بەڵکو باسێکی فیقهییە.
[2]- (ابن تيمية) لە کتێبی (الكلم الطيب) بەشی چل و حەوت باسی کردووە لا ١٦٥.

# تەوەسول بە غەیری پێغەمبەرەوە ﷺ

لە عوتبەی کوڕی غەزەوان، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی:

(إذا أضل أحدكم شيئاً أو أراد عَوْناً وهُوَ بأرضٍ لَيس بها أنيسَ فليقل: يا عباداً الله أعنيوني، فإن لله عباداً لا نراهم)[1] .

واتە: گەر کەسێ لە ئێوە شتێکی لێ ون بوو، یان پێویستی بە یارمەتی بوو لە شوێنێکی بێ کەس دا، با بڵێت: ئەی بەندەکانی خوا بێن بە یارمەتیمەوە، چونکە بۆ خودا هەیە چەند بەندەیەك لە ئێوە نایان بینن..

کە ئەمە تاقیکراویشتەوە..

لە (ئیبن عەباس)ەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: بۆ خوا هەیە کۆمەڵێ فریشتە جگە لەوانەی کە پارێزەرن، ئەنووسنەوە ئەوەی لە گەڵای درەختەکان ئەکەوێت، گەر کەسێ لە ئێوە لە زەوییەکی چۆڵەوانیدا قاچی بە شتێکەوە گیرا با بڵێ: (أعينوني يا عبادالله)[2]...

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ئەگەر ئاژەڵی یەکێکتان لە دەستان ڕۆیشت لە دەشتێکی چۆڵەوانیدا هاوار بکەو بڵێ (يا عباد الله أحبِسوا، يا عبادَ الله أحبسوا، فإنَ للهِ حاضراً في الأرضِ سيحسبه)[3]...

کە ئەم تەوەسولەش لە شێوە هاوار کردنە.

---

[1]- ئیمامی طبراني ڕیوایەتی کردووە، وە پیاوەکانی جێگەی متمانەن، تەنها یەزیدی کوڕی عەلی نەبێ کە نەگەیشتووە بە عوتبە.

[2]- ئیمامی طبراني ڕیوایەتی کردووە..

[3]- ئیمامی أبو يعلى و طبرانی ڕیوایەتیان کردووە، وە ئەمەی بۆ زیاد کراوە (سیحسبه علیکم) کە معروف ی کوڕی حسان ی تیایە وە لاوازە بنواڕە بۆ (مجمع الزوائد) ١٣٢/١٠.

وە لە فەرمووددەدا هاتووە کە حەزرەت ﷺ لەدوای دوو ڕکعاتی بەیانی ئەیفەرموو:

(اللهم رب جبريل و إسرافيل و ميكائيل، و محمد النبي أعوذُ بكَ من النار) ئەی خوایە پەروەردگاری جبرەئیل و ئیسرافیل و میکائیل و پێغەمبەر محمد پشت و پەنا بە تۆ دەگرم لە دۆزەخ.

ئیمامی —نەوەوی— لە (الأذكار)دا دەڵێ: ئەم فەرمووده (ابن السُني) ڕیوایەتی کردووە، وە (الحافظ) لە دوای دەرهێنانی فەرموودەکە دەڵێ: (هو حديث حسن)[1].

کە تایبەتمەند کردنی ئەو کەس و ناوانە بەم زیکر و دۆعایەوە، لە مانای تەوەسول کردنە پێیانەوە، وەك ئەوە وایە فەرموویێتی:

(اللهُمَ إني أسألُك و أتوسَلُ إليك بجبريل و...) ألخ.

(ئیبن علان) لە شەرحەکەیدا ئامارژەی بەوە کردووە دەڵێت: (تەوەسول بکەن بە خودای گەورەوە بە پەروەردگارێتی بۆ گیان و ڕۆحە مەزنەکان کە خودا (جل جلاله) گێڕاونی بە بریکاری ژیان و کاریگەری گەورەیان هەیە لەسەر بەدەستهێنانی پێداویستیەکان و گەیشتنی بە کار و نیازە گرنگەکان، وە هەر لە (شرح الأذكار) ئیبنو علان باسی لە دروستی وەسیلە دەکات و بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر فەرموودەی (اللهم إني أسألُك بحقِ السائلين) دەڵێت: تەوەسولی تیایە بە هەق و جاهی پیاوچاکان و خێر خوازان بە شێوەیەکی گشتی کە پێغەمبەران و نێراوانی خودا زۆر لە پێشترن بۆ ئەو تەوەسولە.

[1]- بنوارە بۆ (شرح الأذكار)ی ابن علان ١٣٩/٢.

## مانای تەوەسول پێکردنی خەلیفە عومەر
## بە ئیمامی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لەسەر)

پێشەوا -البخاري- لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە: کە عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێ بێ) هەر کاتێ گرانی ڕووی تێبکردایە هاواری بۆ عەباسی کوڕی عبدالمطلب دەبرد تا بە هۆیەوە خوا بارانیان بۆ ببارێنێ و لە خزمەتیا دەپاڕایەوە و دەیوت: (اللهُمَ إنا كُنا نَتَوسلُ إليكَ بنبينا فَتسقينا، وإنا نتوسلُ إليكَ بعَمِ بنينا فاسقنا) خوایە ئێمە پێغەمبەرەکەتمان ئەکردە تکا بۆ خزمەتت تۆش بارانت بۆ دەباراندین، وە ئێستا مامەی پێغەمبەرەکەت دەکەینە تکا بۆ خزمەتت تا تۆش بارانمان بۆ ببارێنی..

تەخریجی ئەم ڕووداوە بەم شێوەیەیە:

زوبەیری کوڕی بەکار لە (الأنساب)دا تەخریجی کردووە لە چەند ڕێگەیەکەوە، وە غەیری ئەویش ئەم چیرۆکەیان هێناوە بە ئاسانتر لەمە، لە کورتەی ئەمەیە: لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە وتی: عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لێ بێ) نوێژ و دوعای بارانی بۆ کردین لەو ساڵەدا کە ناسراو بوو بە -عام الرمادة- واتە ئەو ساڵەی کە خۆڵ بارین بوو لە بەر بێ بارانی، وە عومەر تکاکاری بە عەباسی کوڕی عبدالمطلب کردو وتاری خوێندەوە فەرمووی:

(ئەی خەڵکینە، پێغەمبەرمان ﷺ وا سەیری عەباسی دەکرد، وەك سەیری باوك بۆ منداڵەکەی، ئەی خەڵکینە شوێن پێغەمبەر ﷺ بکەون بەهۆی مامەیەوە کە عەباسە، وە بیگێڕن بە وەسیلە و تکاکار بۆ لای خوای پەروەردگارتان، ئەی عەباس دۆعامان بۆ بخوێنە)). کە یەکێ لە پاڕانەوەکانی (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەوە بوو کە فەرمووی:

((اللهُمَ إنَهُ لَمْ ينزِل بَلاءٍ إلا بذنب، ولَمْ يَكشفْ إلاّ بِتَوبة، وَقَدْ تَوَجَهَ القومُ بي إليكَ لِمكاني مِنْ نَبِيكَ، وَهذهِ أيدينا إليكَ بالذنوُب، ونواصينا إليكَ بالتَّوبة، فآسقنا الغيثَ وآحفَظِ اللهُمَ بنيكَ في عَمه)).

خودايه، ئەی پەروەردگار، هیچ بەلایەك نازڵ نابێ مەگەر بەهۆی گوناهەوە نەبێ، وە ئەو بەلایەش لاناچێ مەگەر بە تەوبە نەبێ ئەی پەروەردگار ئەوا قەومەکەم داوا لە خزمەتت دەکەن بەهۆی منەوە لەبەر نزیکایەتیم لە پێغەمبەرەکەتەوە، ئەوە دەستەکانمانە بەرزی دەکەینەوە بە گوناهەوە بۆ خزمەتت، ئەوە پێشە سەرەکانمان دائەنەوێنین بۆ لای تۆ بە تەوبەوە، تۆش بارانمان بۆ ببارێنە و پێغەمبەرەکەت بپارێزە لە مامەکەیدا (واتە لەبەر پێغەمبەر دەست مەنێ بە ڕووی مامەکەیەوە) .

(فَأرْخَتِ السماءُ مثل الجبال حتى أخصبت الأرضُ و عايش الناس) تا ئاسمانەکان پەڵە هەورەکان تیایدا یەکیان گرت و وەك کێوی بەرز ئەیانواڕی، بارانێك هات هەتا زەوی سەوز بوو، وە خەڵکی بوژانەوە...

(و أقبل الناسُ على العباس يتمَسَحوُنَ بهِ و يقولون له: هَنيئاً لَكَ يا ساقي الحَرَمين) ، خەڵکی پۆل پۆل دەچوونە خزمەت ئیمامی عەباس و دەستیان ئەهێنا بە گیانی عباس داو پێیان ئەوت: موبارەکت بێ پیرۆزت بێ ئەو پلە بەرزەیە کە ئاودێری حەرەمەینە...

وَقال عمر (رضي الله عنه) عند ذلك: هذا واللهِ الوسيلةُ الى الله وَ المكان منهُ) ، حەزرەتی عومەر ئە لەو کاتەدا ئەیفەرموو: قەسەم بە خوا ئە ئەمە وەسیلەیە بۆ لای خواو پایەو پلەکەیەتی...

لەسەر ئەم ڕووداوە عباسی کوڕی عوتبە کوڕی برای ئیمامی عەباس ئەم پارچەیەی وت:

بِعَمِّي سَقى اللهُ الحِجازَ واهلَهُ          عَشَيةً يَسْتَسْقي بِشَيبَتهِ عُمَرُ

* (ابن عبدالبر) دەڵێ: لە هەندێ لە ڕیوایەتەکاندا بەم شێوە هاتووە:

(فأرخَتِ السماءُ عزاليها فجاءَتْ بأمثالِ الجبال حتى استوت الحفر بالآكامِ وأخصبت الأرضُ وعاش الناس. فقال عمر: هذا واللهِ الوسيلةُ الى الله عزوجل والمكان منه)..

(حەسان کوڕی ثابت)یش فەرمووی:

سَأَلَ الأِمامَ وَقد تتابعَ جُدْبُنا ..... فَسقى الغَمامُ بِغُرَّةِ العَبّاسِ

عَمِّ النبيِّ وَصِنْوِ والدِهِ الذي ..... وَرِثَ النبيَّ بِذاكَ دوُنَ الناسِ

أحْيا إلا لَهُ بهِ البِلادَ فأصبَحَتْ ..... مَخَضَرةُ الأَخبابِ بَعْدَ اليَأسِ

واتە: پرسیاریان کرد و داوایان کرد لە ئیمام کە عومەری کوڕی خەطابە کە ووشکە ساڵی و بێ بارانی و گرانی لەسەریان کەڵەکە بووە، ئەویش بۆ بارینی باران فێری کردن کە پاکی ناوچەوانی ئیمام عەباس بکەنە وەسیلە، کە مامەی پێغەمبەرەو پشتی باوکێتی و لە پێغەمبەرەوە میراتێکی وەرگرتووە کە بە کەسی تر نەدرابێ، کە بە هۆیەوە خوای پەروەردگار وڵاتی بۆ بوژاندنەوە و لە دوای تووش بوونیان بە نائومێدی تووشی خۆشی و زەوی سەوزبوونی کردن..

وە لەم بارەوە فەزڵی کوڕی عباس کوڕی عوتبە دەڵێ:

بِعَمِّي سَقى اللهُ الحِجازَ واهلَهُ .... عَشَيةً يَسْتَسْقي بِشَيبَتهِ عُمَرُ

تَوَّجَهَ بالعبّاسِ في الجذبِ راغباً.... فَما كرَّ حتى جاءَ بالدِّيمةِ المَطَرُ

لە گێڕانەویەکی تردا هاتووە: (وَطفقَ الناسُ بالعباسِ يَمسحونَ أركانَهُ وَ يقولون: هنيئاً لَك ساقي الحَرَمين) .

کە ئەمە لە کتێبی (الأستيعاب)ی (ابن عبدالبر)دا لە بەشی گەورەیی عەباس دا هاتووە.

لەکاتی هاتنە پێشەوەی ئاوا قاتی یەکدا هەق وابوو حەزرەتی عومەر کە خەلیفەی موسڵمانان و پێشەوایانە خۆی ئیمامەتی نوێژ و دوعاکانی بکردایە، بەڵام هەقی خۆی پشت گوێ خست و ئیمامی عەباسی پێش خست تا نوێژە بارانەیان بۆ بکات و دوعاکان بخوێنێ، لەبەر ڕێز و گەورەیی پێغەمبەر بوو ﷺ وە مامەی پێغەمبەری پێش خست لە سەر خۆی، کە زیادە ڕەوی و موبالەغەیەك بوو لە تەوەسول کردن بە پێغەمبەرەوە ﷺ بەپێی توانای خۆی وە هاندانی خەڵکی بۆ قبوڵ کردنی تەوەسول بە ئیمامی عەباسەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، وە گێڕانی عەباس بە وەسیلەیەك و پێش خستنی بۆ پاڕانەوە و دۆعاکان لەبەر نزیکی لە مەقامی پیرۆزی پێغەمبەرەوە ﷺ لە کاتێکدا کە زیندوبووەو بە لاشە لەناو هاوەڵاندا بووە و نوێژە بارانەی بۆ کردون، کە ئەمە خۆی بریتی یە لە چۆنیەتی ڕێزگرتن لە پێغەمبەرو ئال و بەیتی پیرۆزی...

کە پێشەوا عومەر (ڕەزای خوای لەسەر) لە پاڕانەوەکەیدا ئەوەی بە جوانی ڕوون کردەوە کە فەرمووی: (اللـهُمَ إنـا كُنـا نَتَوسـلُ إليـكَ بنبينـا فَتسقينا، وإنا نتوسلُ إليكَ بعَمِ بنينا فاسقنا) لەو مانایەدا کە وتوویەتی: (ئێمە ئەهاتینە دەر لە ماڵ و جێگەکانمان و بۆ نوێژ و شوێنی پاڕانەوەکانمان بەهۆی تەوەسول کردنمان بە پێغەمبەرەکەتەوە دەستی پاڕانەوەمان بەرز دەکردەوە، بەڵام ئێستا ناتوانین چونکە پێغەمبەرەکەت وەفاتی کردووە بۆیە ئێستا یەکێ پێش دەخەم کە ڕێزدارەو لە ئال و بەیتی پێغەمبەرەکەتەوە هیوام وایە ئەو ڕەجایەمان لێ قبوڵ بفەرمووی...

وە کاتێ ئیمامی عەباس (ڕەزای خوای لەسەر) دەپاڕێتەوە تەوەسول دەکات بە پێغەمبەرەوە ﷺ لە کاتێکدا کە وەفاتیشی کردووە و دەڵێ:

(قەومەکەم هاتوون بۆ لام لەبەر نزیکیم لە پێغەمبەرەوە ﷺ خوایە دۆعاکەم گیرا بکە لەبەر پێغەمبەرەکەت ﷺ) .

لێرەدا دەڵێین: باسی نوێژە بارانە و تەوەسول دوو شتی جیاوازن و هیچ پەیوەندی‌یەکی بە باسەکەمانەوە نی‌یە، ئەوەی پێویستە بیڵێین: ئەوەیە کە ئەم فرمانی تەوەسول لەلای هەموو کەسێك کە خاوەنی دوو چاوی سەر بێ ئاشکرایەو پێویستی بە جیاوازی بیروڕا نی‌یە، چونکە ئەم ڕووداوە بەڵگەیەکە لەسەر دروستی تەوەسول: خەڵکەکە گرانییان تووش بووە و بێ بارانیان هاتووە بەسەردا، خۆڵ بارینێکی بەهێز ناوچەکەیانی گرتووە، پێویستیان بەوە بووە کە نوێژە بارانە بکەن، تا خوا دەرووی خێریان لێ بکاتەوە، کە ئەمەش پێویستی بە پێشەوایە کە نوێژیان بۆ بکات و ئەم شەعائیر و دروشمە ئیسلامی‌یانەی بۆ زیندوو بکاتەوە و بۆیان بپارێتەوە کە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ هەروەك نوێژ و جومعە و جەماعەتە، کە پێغەمبەر ﷺ لە حاڵی ژیانی بەرزەخیدا ئەو تەکلیفەی لەسەر نەماوە تا خۆی نوێژەکەیان بۆ بکات، لەبەر پچڕانی تەکلیف و ئەرکە ئاینییەکان و خەریك بوونیان بە حاڵ و پلەیەك مەزنتر لەو ژیانەی دونیا.

ئەوەی لە وتەکەی ئەمیری موسوڵمانان وا تێگەیشتووە کە تەوەسولی بە ئیمامی عەباس کردووە و بە پێغەمبەری نەکردووە، لەبەرئەوەی عەباس زیندووە و پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە، بەڵام ئەوان بەم بۆچوونەیان تێگەیشتنیان خامۆش کرد و خەیاڵ و ئەندێشەی خۆیان زاڵ کرد، بەمەش بانگەشەی نەفامی ئاشکرای خۆیان کرد، یان دەمارگیری لە ڕاوبۆچوونەکانیان دەرخست، حەزرەتی عومەر کە تەوەسولی بە عەباس (ڕ.خ) کرد لەبەر نزیکی و خزمایەتی بوو بە پێغەمبەرەوە ﷺ هەروەك لە پاڕانەوەکەیدا دەردەکەوێت کە فەرمووی: (وإنا نتوَسَلُ إليك بِعَمِّ نبينا

فاسـقنا) كـه ئەمـه مانـای تەوەسـوله بـه حـەزرەتی پێغەمبـەرەوە لەسـەر جوانترین شێوه..

ئیتر زۆر زۆر له ڕاستیەوه دوورن ئەوانەی که تانەو توانج له موسوڵمانان ئەدەن و به هاوەڵ بۆ خوا بڕیاریـان لەسەر ئەدەن بەهۆی ئـەوەوه کـه بڵێن تەوەسول دروسته به یـەکێکی زینـدووەوه، خۆ ئەگەر تەوەسـول کـردن ئـەو حوکمـەی هـەبێ و خاوەنەکـەی –مشـرك– بـێ، ئـەوه نـه بـه زینـدوو نـه بـه مردوو دروست نەدەبوو، ئەی نابینی که له بیروباوەڕدا به ڕبوبیـەت هـاتووه که بەندایەتی تەنها بۆ پەروەردگار دەبێ، بۆ غەیری خوا له پێغەمبەران و له فریشتەکان و ئەولیاکان به شیرك و کوفر دانراوه کـه ئـەم حوکمـه دروست نییه نه له کاتی ژیانی دونیا و نه له ڕۆژی قیامەتیشدا؟!

ئەی گوێت لەو وتەیه نەبووه که دەڵێ: (إن اعتقاد الربوبيـة لغيرِ اللهِ جائز إذا كان حيّاً، (اما بعد وَفاتهِ فشرك)؟!.

کەواتـه تێگەیشـتین کـه گێڕانـی گـەورەیی وەسـیله بـۆ لای خـودا، نابێتـه بەندایەتی بۆ ئەو کەسەی که هاناکەی بۆ دەبەیت، مەگەر وا گومانت بێ کـه ئـەو کەسـه یـان ئـەو شـته لـه پلـەی پـەروەردگاریا بـێ، کـه ئەمـه وێنـەی بتپەرستەکان بوو، خۆ گەر وا بێ که باسمـان کـرد تـەنها وەسـیلەیەك بـێ بـۆ یارمەتیدان ئەوه دروسته و کێشەی لەسەر نییه..

# چیرۆکەکەی –عوتبی- بۆ تەوەسول

پێشەوا شێخ عمادالدین ناسراو بە (الحافظ ابن کثیر) دەڵێ:

(کۆمەڵێك باسیان کردووە لەوانە شێخ ئەبو مەنصور ئەلصەباغ لە کتێبی –الشامل–، ڕووداو و چیرۆکە ناودارەکە لە –عوتبا– وە دەڵێ: من لە خزمەت مەرقەدی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دا دانیشتبووم کە پیاوێکی ئەعرابی هات و وتی:

(سەلامی خوات لەسەر ئەی پێغەمبەری خوا، گوێم لە خواوە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّاباً رَّحِيماً﴾ النساء: ٦٤. واتە: هەر کاتێ ئەوان واتە ئومەتەکەت ظوڵمیان لە نەفسی خۆیان کرد بەوەی تاوانیان ئەنجام دا، پاشان هاتنە خزمەت تۆ و داوای لێخۆشبوونیان لە خوا کرد و پێغەمبەرەکەش داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن ئەوە نزیکە و ئەبیننەوە کە خوا بەخشندە و میهرەبانە..

پاشان کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە هاتوومەتە خزمەت تۆ تا تۆ تکاکارم بی بۆ خزمەت خوا و لە گوناهم خۆش بێ، (وَقَدْ جئتكَ مستغفراً لِذنبي مستشفعاً بِكَ الى رَبي..)

پاشان ئەم پارچەیەی وت:

يا خيرَ مَنْ دُفِنَتْ بالقاعِ أَعْظُمُه

فَطابَ مِنْ طيبِهِنَ القاعُ وَ الأَكَمُ

نفسي الفِداءُ لِقَبْرٍ انتَ ساكنُهُ

فيهِ العَفافُ وَفيهِ الجوُدُ والكَرَمُ

پاشان ئەعرابیەکە ڕۆیشت و منیش چاوەکانم قورس بوو گەیشتم بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە خەودا و فەرمووی پێم: (إلحَقِ الأَعرابيَ فَبَشِّرهُ انَ

الله قد غفرَ لَهُ) ، ئەی عوتبی بگە بەو پیاوە ئەعرابیە و مژدەی بەدەرێ کە خوای پەروەردگار لیێی خۆش بوو).

ئەم چیرۆکە پێشەوا نەوەوی لە پەرتوکە ناودارەکەی خۆی (الأیضاح)[1] ریوایەتەکەی هێناوە، هەروەها (عمادالدین ابن کثیر) لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ﴾النساء: ٦٤. هێناویەتی.

هەروەها شێخ ئەبو محمد ابن قُدامة لە کتێبی (المُغني)[2] ریوایەتەکەی گێڕاوەتەوە، کە (ابو الفرج ابن قدامە)ش لە کتێبی (الشرح الکبیر)[3] نەقڵی کردووەو، شێخ منصور کوڕی یونس ی ئەلبەهوتی کە کتێبە ناودارەکەی خۆی (کشف القناع)[4] گێڕاویەتیەوە، کە دادەنرێ بە باشترین و ناودارترین کتێب لە مەزهەبی حەنبەلی دا [5] .

وە پێشەوا –القرطبي– لە تەفسیرە ناودارەکەی خۆی (الجامع لأحکام القرآن) بەم شێوە باسی کردووە [6] .

---

[1]– بنواڕە بۆ –الأیضاح– النووي– لا ٤٩٨.

[2]– بنواڕە بۆ –المغني– ٣/٥٥٦.

[3]– الشرح الکبیر ٣/٤٩٥.

[4]– کشاف القناع ٥/٣٠.

[5]– زانایانمان ڕەزای خوایان لەسەر زۆر ڕوداو و بەسەرهات و ئاسارمان بۆ دەگێڕنەوە بەبێ ئەوەی باسی سەنەدەکی بکەن وەك (معلقات)ی بخاری (منقطعات و بلاغات)ی موطأ. کە هەندێکیان لە سەرەتای سەنەدەکەوە لێی تەرك کراوە، وە هەندێکیش باسی سەنەد تیایدا نەکراوە لەوانە وتوویانە بخاری ڕیوایەتی کردووە یان مالك ڕیوایەتی کردووە، کە –النووي–یش لەو شێوەی هێناوە.

[6]– بنواڕە بۆ تەفسیری (الجامع لأحکام القرآن) ٥/٢٦٥.

(ئەبو صادق ڕیوایەتی کردووە لە عەلی یەوە ئەڵێ: ئەعرابیەك هاتە ناومان کە ئێمە لە دوای دفنی پێغەمبەر ﷺ بووین بە سێ ڕۆژ، خۆی خستە سەر گۆڕەکە و خۆڵەکەی کردە سەر سەری و ئەیووت:

(ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرمووت پێمان، ئێمەش گوێمان لە وتەکانت گرت، وە لە پەروەردگارتەوە بۆت ڕوون کردینەوە ئێمەش لێتمان وەرگرت، یەکێ لەوانە ئەو ئایەتەیە کە بۆ تۆ نازڵ بووە ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ﴾ النساء: ٦٤ ئەوە من زوڵمم لە نەفسی خۆم کردووە و هاتومەتە خزمەتت تا تۆ لێم خۆش ببی دەنگێ لە گۆڕەکەوە هات و وتی: ئەوە لێت خۆش بوو..)..

ئەمە چیرۆکەکەی عوتبا بوو، ئەوەش ئەو زانایانە بوون کە ڕووداوەکەیان بۆ گێڕاوینەتەوە، یەکسانە ڕووداوەکە ڕاست بێ یان لاواز بێ لە ڕووی سەنەدەوە کە موحادیثەکانمان پشتگیری دەخەنە سەر..

ئێمە لێرەدا پرسیار دەکەین و دەڵێین:

(ئایا ئەو پیاوانە کوفر و گومڕایی ئەگێڕنەوە؟ یان ئەوەی ئەوان ئەیگێڕنەوە خەڵکی بەرەو بەندایەتی گۆڕەکان ئەبات؟؟!

ئەگەر فرمانەکە بەو شێوەیەیە، ئەی کوا ئەو متمانەیەی کە پێیان دراوە لە کتێب و نوسراوەکانیاندا؟

تەنها ئەوەندە دەڵێین:

سُبحانكَ هذا بُهتان عظيم..

## دێڕە شیعرەکانی عوتبی

## لەسەر پە نجەرەی مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ دادەنرێ

لە پێشدا ئەو دوو دێڕە شیعرەمان باس کرد کە ئەعرابیەکە لە کاتی زیارەت کردنی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺدا عەرزی کرد کە (عوتبی) بۆی گێڕاینەوە کە ئەمەیە:

**يا خيرَ مَنْ دُفَنَتْ بالقاعِ أَعْظُمُه**

**فَطابَ مِنْ طيبهِنَ القاعُ وَ الأَكَمُ**

**نفسي الفِداءُ لِقَبْرِ انتَ ساكنهُ**

**فيهِ العَفافُ وَفيهِ الجوُدُ والكَرَمُ**

کە ئەم دوو پارچەیە بە فەزڵی خوا لەسەر پێشەوەی ئەو دوو پایەدا کە ئەکەوێتە ئەملاولای مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ نوسراوەتەوە کە هەموو کەس لە دۆست و لە نەیار بە درێژایی هەزارەها ساڵ ئەیانبینی هەتا لە سەردەمی مەلیك عەبدولعەزیز و مەلیك سعود و مەلیك فەیصەل و پاشان مەلیك خالد و مەلیك فەهد ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێ بووە و بینراوە، وە لەسەر فرمان و تەوجیهاتی خادمی هەردوو حەرەمە پیرۆزەکە ئەبێ هەر بمێنێ تا پارێزگاری لە تایبەتمەندیەکانی مزگەوتی پیرۆزی مەدینە بکرێ و ئەو ڕەونەقە نورینە کۆنەی پێوە دیاربمێنێ..

### کورتەی باسەکە:

کورتەی باسەکەمان ئەوەی کە هیچ گومانێ هەڵناگرێ..

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ خاوەنی قەدرێکی گەورە و پلەوپایەیەکی بەهێز و جاهێکی پایە بڵندە لەلای خوای گەورە، ئیتر چ ڕێگرێکی شەرعی یان عەقڵی ڕێگری تەوەسول پێکردنە؟ بەتایبەت کە بەڵگەکان لەسەری

هاتووه كه ئەو پلەيەی بۆ جێگیر كردووه له دونیاو له پاشەڕۆژدا، كه ئێمه لەو تەوەسولەماندا داوامان تەنها له خزمەت خوای پەروەردگارمانه، تەنها له زاتی هەق داواكارین، كه ئەپاڕێینەوه لێی به خۆشەویستترین شتێ كه لای خوا خۆشەویست بێ.

هەندێ جار لێی ئەپاڕێینەوه به كردەوه چاكەكانمان چونكه خوا كردەوەی چاكەی خۆش دەوێ، وه جارێكی تر داوای لێ دەكەین. به كەسێ كه خوا خۆشی بوێ له مەخلوقاتی خۆی، هەروەك فەرموودەكەی ئادەم پێغەمبەر ﷺ (وەك له پێشتر هێنامان)، وه هەروەك فەرمودەكەی (فاطمەی كچی ئەسەد) ڕەزای خوای لەسەر (وەك له پێشتر هێنامان)، وه هەروەك فەرموودەكەی (عثمانی كوڕی حەنیف) ڕەزای خوای لەسەر (كه پێشتر هێنامان) وه هەندێ جار له خوا دەپاڕێینەوه بەناوه جوانەكانی خوا خۆی وەك داواكەی پێغەمبەر ﷺ كه فەرمووی (أسألك بأنك أنت الله) یان بەهۆی سیفاتێكی‌یەوه یان كردەوەیەكی‌یەوه، وەك له فەرموودەكەی حەزرەتدا ﷺ هاتووه كه فەرمووی: (أعوذُ بِكَ برضاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَ بِمَعافاتِكَ مِنْ عُقوبَتِكَ).. ئیتر ئەم داوایانه له خزمەت خوادا كورت نەهێڵراوەتەوه له سنورێكی تەسك دا هەروەك كۆمەڵێك وا گومان دەبەن.

نهێنی لەمەدا:

هەر شتێ خوا خۆشی بوێ دروسته و ڕاسته كه بكرێته تەوەسول و خاترانه بۆ خزمەت خودا، هەروەها هەر شتێ له دروست كراوانی كه خۆشی بوێ وەك پێغەمبەرانی و پیاوچاكانی، كه ئەمه بەلای ئەوانەی خاوەنی فیترەتێكی پاكن ڕوون و ئاشكرایه، كه نه بەڵگەكان و نه ژیری و عەقڵ له دژی ئەمه نین، بەڵكو ددان به دروستییدا دراوه، كه بەرپرسی یەكەم لەم فرمانەدا خوای تاك و تەنها خۆیەتی كه هیچ پەرستراوێ نی‌یه

غەیری زاتی خوا نەبێ، کە سەرجەم پێغەمبەران و پیاوچاکان و زیندوو مردوان لەژێر حوکم و ئیرادەی زاتی خوای پەروەردگارن.

﴿ قُل كُلٌّ مِن عِندِ اللهِ فَمالِ هـؤُلاءِ القَومِ لا يَكادونَ يَفقَهُونَ حَديثاً ﴾ النساء: ٧٨.

کەواتە مادەم تەوەسول بە کردەوەی چاکە دروستە، ئەوە بە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەپێشترە، چونکە باشترین مەخلوقاتی خودایە، باشترین کردەوەش کردەوەی پێغەمبەرە ﷺ کە خوا خۆی خۆشەویستی خۆیی بۆ پێغەمبەر دەرخستووە، چ بۆ کەسی پێغەمبەر و چ بۆ کردەوەکانی..

کە وشەکان تەنها ئەوەندە ئەسەلمێنن کە پێغەمبەر ﷺ خاوەنی قەدر و ڕێزێکی تایبەتی‌یە لەلای خوای پەروەردگار، کە ئەو کەسەی تەوەسول دەکات تەنها ئەم مەبەستەی هەیە، کە هەرکەس ئەم پلەو ڕێزەی پێغەمبەر ﷺ ئینکاری بکات، ئەوە بێ دینە و لە سنوری ئیسلام دەردەچێ..

لە دوای ئەمەوە دەڵێین: مەسئەلەی تەوەسول بەڵگەو دەلالەتە لەسەر گەورەیی ئەو کەسەی کە تەوەسولەکەی پێ دەکرێ لەلای خوا خۆی، کە داواکردن بە پێغەمبەرەوە ﷺ دادەنرێ بە گەورەیی پێغەمبەری خوا لە خزمەت خوادا، یان خۆشەویستی خوا بۆی، کە ئەمە هیچ گومانی تێدا نی‌یە کە تەوەسول بە کردەوەکانەوە یەکڕایی زانایانی لەسەرە، ئیتر بۆ نەوترێت:

تەوەسول بە پێغەمبەران یان بە پیاوچاکان تەنها تەوەسولە بە کردەوەکانیان کە خوا ای‌ی وەرگرتوون، کە لەم بارەوە فەرموودەی هاوڕێیانی ئەشکەوت کە یەکڕایی لەسەرە باشترین بەڵگەیە...

وە هیچ گومان لەوەشدا نی‌یە کە تەوەسول بە پیاوچاکانەوە تەنها تەوەسولە بەوەوە کە ئەوانە کردەوەی چاکیان پێشکەش بە خوا کردووە

کەواتە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ کردەوەکان کە چاکن و یەکڕایی زانایان لەسەری هەیە بۆ دروستی تەوەسول پێیان، کە هەروەك لە سەرەتاوە باسمان کردووە..

## گومانە وەرنەگیراوەکە

ئەو فەرموودانە و ئەو ئاسارانەی کە باسمان کرد لەبارەی تەوەسولەوە هەمووی جێگیر بووە و پشتگیری کراوە...

ئەگەر یەکێ وتی: ڕاستە ئەو فەرموودانە جێگیرە و پشتگیری کراوە بەڵام ئەوانە تایبەتمەندی تیایە بە کات و زەمەنی ژیانی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەی ئەمە چۆنە؟ ..

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم تایبەتمەندی کردنە نابێتە بەڵگە بۆ یەك زەمەنی تایبەتمەندی پێغەمبەر ﷺ، وە ئەو ڕۆحە باقیە و هەر ئەمێنێ کە خاوەنی هەست و ئیحساس و ئیدراك و شعورە...

وە لەلای زانایانی ڕێڕەوی ئەهلی سوننەت و جەماعەت:

(مردوو ئەبیستێ و هەست ئەکا و شعور پەیدا دەکات، وە سوودمەند دەبێ بەهۆی ئەو خێرانەوە کە بۆی دەکرێ و دڵخۆش دەبێ پێی، وە ئەزیەتی پێ دەگات بەهۆی خراپەکاری لەخۆدان و شیوەن و ناڕەحەتیانەی بەسەریەوە دەکرێ و خەفەتبار دەبێ پێیان، وە ئەمە بۆ هەموو مرۆڤێکە، بۆیە دەبینین حەزرەتی خۆشەویست ﷺ کاتێ لەسەر مردوانی (قولەیب) ڕاوەستا کە کافرە کوژراوەکانی شەڕی بەدری لێ کەوتبوو، هاواری لێ کردن و فەرمووی: (یا عُتبە، یا شیبە، یا ربیعە) ئەی عوتبا، ئەی شەیبە، ئەی ڕەبیعە، (کە ئەمانە سەرگەورەی قورەیشیەکان بوون و کوژرا بوون)..

هاوەڵان عەرزیان کرد: (وَکیف تُنادیهمْ وقد جَیَّفوُا؟) ئەی پێغەمبەری خوا چۆن بانگیان دەکەیت و هاوار لە کەسانێ دەکەیت کە لاشەیان نەمانەوە و پوکاوەتەوە؟..

حەزرەت ﷺ فەرمووی: (ما أنتم بأسمعَ منهم لکنهم لا یستطیعُون الجواب) ئێوە لەوان باشتر گوێتان لێ نییە، بەڵام ئەوەندەیە ئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە..

کە ئەمە گشتی بێ و بۆ هەموو مرۆڤێ بێ، ئەی ئەبێ ئەو حاڵە بۆ باشترین مرۆڤ و بەڕێزترینیان و ڕێزدارترینیان چۆن بێ؟ .

هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەو لە پلەی باشترین هەست و ئیحساس و بەهێزترین ئیدراك و هەستێکی سەر بڵند دایە، کە ئەمەش دەبێتە بەڵگە کە لە فەرموودەی بەهێزدا هاتووە کە گوێبیستی وتەکان دەبێ و وەڵامی سەلامەکانیان ئەداتەوە، وە کردەوەی ئومەتەکەی دەخرێتە بەر دەستی، وە داوای لێخۆش بوون لە خوا دەکات بۆ خراپەکانیان، وە حەمد و سەنای خوا دەکات لەسەر کردەوە چاکەکانیان...

نرخ و ڕێزی مرۆڤ لە ڕاستیدا بەقەدەر ئەو شعور و ئیحساس و هەستەیەتی کە خاوەنیەتی نەك بە بوونی ژیان لە لاشەکەیدا..

کە تەنها لەبەر ئەمەیە دەبینین کە زۆر لە مرۆڤەکان زیندوون و لەژیاندان بەڵام هەست و شعور و ئیدراکاتی ئینسانیان لێ حەرام کراوە، لەگەڵ ئەوەدا خاوەنی سروشتێکی نەرم و کەم هەست و ئارەزوودان ئەوانە هیچ سودێکیان لێ وەرناگیرێ، بەڵکو لە ڕیزی مردواندا هەژمار دەکرێن، خوا پەنامان بدات..

## نەزان دووەكان وا گومان دەبەن كە خۆشەویستمان ﷺ
## نە گوێبیستمان دەبێ ، نە دەمان بینێ، نە ئەماننناسێتەوە

لەو مردووانە: كە وا گومان دەبەن كە خۆشەویستمان ﷺ گوێ بیستی و بینینی نىیە و ناماننناسێتەوە، وە داوامان لە خوا بۆ ناكات، ئایا ئەمە چ جورئەتێكە كە بەرانبەری دەردەبڕێ؟ .

ئایا چ جاهیل و نەزانێك لەوە خراپ ترە؟ .

لەگەڵ ئەو بێ ئەدەبی و خراپ تێگەیشتن و كەمكردنەوە ڕوتبەی پێغەمبەرە ﷺ بەرانبەر ئەو زاتە و ئەو هەموو فەرموودە ڕاستانە و ئاسارە بەهێزانە كە جێگیر بووە كە سەرجەم مردووەكان خاوەنی بیستن و هەست و ناسینەوەن، جا یەكسانە ئەو مردووە ئیماندار بوو بێ یان بێ بڕوا...

سەبارەت بەم سێ حاڵەتە بۆ مردووان:

(ئیبنُ قەیم) لە كتێبی –الرواح– دا دەڵێ: (والسلف مجمعُونَ على هذا، وَقد تواترت الآثار عنهم) ، واتە زانایانی پێشین هەموو كۆن لەسەر ئەوەو ئاسارەكان گەیشتوونەتە ئەو پلەیەی كە شوبهەی تیا نەماوە..

وە پرسیاریان كرد لە (ئیبن تیمیە) لەسەر ئەم باسە، ئەویش فتوای پشتگیری نیشان دا [1] .

كە ئەمە وەك وتمان مافێكی گشتی سەرجەم مرۆڤەكانە، دەبێ بەرانبەر بە سەرجەم باوەڕدار گومانت چۆن بێ، بەڵكو بۆ بەندە ڕاستەكان لە ڕاستگۆیان و پیاوچاكان یان بۆ گەورەی یەكەمەكان و دواینەكان حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ چۆن بێ، (كە بۆ هەر كامیان بەنیسبەتی پاكێتی و چاكێتی ڕۆحەكەیە نەك لاشەكەیان).

---

[1]- بنوارە بۆ (الفتاوى) ابن تیمیة: ٣٣١/٢٤ بۆ ٣٦٢.

که ئەم باسە لە بەشێکی سەربەخۆ لە کتێبەکەی خۆمان (الحياه البرزخيه حياهُ حقيقيه)دا لەژێر ناوی (حياة خاصة بالنبي ﷺ) بە ڕوونی و تەفصیل باسم کردووە.

## ناوی ئەو کەسانەی کە تەوەسولیان کردووە لە زانایانی موسوڵمانان

لەم بەشەی نوسراوەکەماندا ناوی هەندێ لەو زانایانە دەنوسین کە دانیان بە تەوەسول پێکردن دا داوە، یان بەڵگەکانیان لە گەورە زانایان و پارێزەرانی فەرموودەوە نەقڵ کردووە:

١- پێشەوای پارێزەری فەرموودە: (أبو عبدالله الحاكم) لە کتێبی: (المستدرك على الصحيحين) کە تیایدا فەرموودەی تەوەسولی ئادەم بە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت دەکات و سەنەدەکانی بە پلەی -صەحیح- دێنێ.

٢- پێشەوای پارێزەری فەرموودە: (أبو بكر البيهقى) لە کتێبی (دلائل النبوة) کە تەوەسولی ئادەم و غەیری ئەویشی هێناوە، کە ئەم زاتەیە پابەندی هەیە بەو حاڵەوە کە هیچ فەرموودەیەك نەهێنێ کە لاوازی تیا بێ.

٣- پێشەوای پارێزەری فەرموودە: (جلال الدين السيوطي) لە کتێبی (الخصائص الكُبرى).

٤- پێشەوای پارێزەری فەرموودە: (أبو الفرج-ابن الجوزى) لە کتێبی (الوفاء).

٥- پێشەوای پارێزەری فەرموودە: (القاضي عياض) لە کتێبی (الشفا في التعريف بحقوق المصطفى-ﷺ) کە لە بەشی (باب الزيارة) و (باب فضل النبي ﷺ) بە ڕوونی باسی کردووە.

٦- پێشـەوا: (شـێخ نورالـدین القـارئ) ناسـراو بـە (مُـلا علـی القـارئ) لـە شەرحی لەسەر (الشفا) لە چەند شوێنیدا ڕوون کردنەوەی داوە.

٧- پێشەوا: (أحمد شَهاب الدین الخفاجي) لە شەرحی بەسەر (الشفا)ەوە کە ناوی ناوە (نسیم الریّاض)..

٨- پێشـەوای پـارێزەری فـەرمودە: (شـهاب الـدین القسـطلاني) لـە کتێبـی (المواهب اللدینة) لە (المقصد الأول) دا باسی کردووە.

٩- پێشەوا (شێخ محمد عبدالباقی الزرقانی) لە شەرحی لەسەر (المواهب) لە بەرگی یەك و لاپەڕە ٤٤ دا.

١٠- پێشەوا (شیخ الاسلام: أبو زکریا یحیی النووي) لە کتێبی (الأِیضـاح) لە (الباب السادس) لەلاپەڕە ٤٩٨دا..

١١- پێشـەوا (ابـن حجـر الهیثمـي) لـەو حاشـیەیدا کـە لەسـەر (الأیضـاح) نوسیویەتی لاپەڕەی ,٤٩٩

١٢- پێشەوا (شهاب الدین محمد بن محمد بن الجزري الدمشـقي) لە کتێبی (عدة الحصن الحصین) لە بەشی پارانەوەکان .

١٣- پێشەوا (محمد بن علي الشوکاني) لە کتێبی (تحفة الذاکرین) لە لاپەڕە ١٦١ دا.

١٤- پێشەوای فەرموودەناس (علي بن عبدالکافي السُبُکی) لە کتێبی (شـفاء القسام في زیارة خیر الأنام) ﷺ.

١٥- فـەرموودەناس و پێشـەوا (عمـاد الـدین -ابـن کـثیر) لـە تەفسـیری فـەرموودەی خـوا ﴿وَلَـوْ أَنَّهُـمْ إِذ ظَّلَمُـواْ أَنفُسَـهُمْ﴾ النسـاء: ٦٤ کـە بـاس لـە چیرۆك و ڕووداوەکـەی -عوتبا- دەکات کە چۆن کـابرای ئـەعرابی هـات و زیارەتی کرد و پێغەمبەری کردە تکاکار و هیچ کام لـە هـاوەڵانیش نکوڵیـان نەکرد..

وه باس له تەوەسولی ئادەم ئەكات به پێغەمبەری ئاخر زەمانەوه ﷺ له كتێبی (البداية والنهاية) ١/١٨٠.

وه له (البداية والنهاية) ٩١/١ دا باس له چیرۆكی ئەو پیاوه دەكات كه هاته سەر گۆڕی پێغەمبەر ﷺ و تەوەسولی كرد و لێرەدا ئەڵێ (إن اسنادها صحيح) وه له هەمان كتێب و له (٣٢٤/٦)دا باس لەو ئاڵاو هوتافەی موسوڵمانان دەكات كەله شەڕی (ڕۆژی اليمامه)دا ئەیانووت: (يا مُحَمَداه).

١٦- پێشەوای پارێزەری فەرمووده: (ابن حجر العسقلاني) كه له كتێبی (فتح الباري) له (٤٩٥/٢) دا باس له چیرۆكی پیاوەكه دەكات كه هات و تەوەسولی كرد.

١٧- پێشەوای ڕاڤەكاری قورئان (ابو عبدالله القرطبي) له تەفسیری ئایەتی ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ﴾ النساء: ٦٤ له بەرگی (٢٦٥/٥)دا باس له تەوەسول دەكات.

## هاوەڵان داوای شەفاعەت له خۆشەویست دەكەن ﷺ

له بەرانبەرانمان هەندێكیان وا گومان دەبەن: كه دروست نی یه داواكردنی شەفاعەت له پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ له دونیادا، بەڵكو هەندێكیان كه دەغەزاریان هەیه دەڵێت ئەوه شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانه یان پلەی گومڕایی یه، وه بەڵگەش به ئایەتی ﴿قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعاً﴾ الزمر: ٤٤ دەهێننەوه.

ئەم بەڵگەیەیان بۆ ئەو باسەیه بەتاڵە، وه بەڵگەیه لەسەر تێگەیشتن و فەهمی خراپیان: ئەمەش له دوو ڕووەوه:

یەكەم: هیچ دەقێك نەهاتووه نه له قورئانی پیرۆز وه نه له سوننەتدا كه نەهی بكات له داواكردنی شەفاعەت له پێغەمبەر ﷺ له دونیادا.

دووەم: ئەم ئایەتە بەڵگە نیيە لەسەر نەهی ئەو حاڵەتە، بەڵکو شەئنی ئەم ئایەتـە وەك هـەموو ئایەتـەکانی تـر هـاتوون بـۆ ڕوون کردنـەوەی ئـەو تایبەتمەندیانەی کە موڵکی خوای پەروەردگارن و بۆ کەسی تر ناشێن، بەو مانایەی تەنها زاتـی خوا تەصـەروفیان تیا دەکات، کە ئەمەش نەفی لەوە ناکات مالیك و لموڵکە ئەبەخشێ بە ئارەزو و ئیرادەی خۆی و (حەرامیشـی) ئەکات بە ئارەزووی خۆی...

نموونەی ئەم ئایەتە وەکو ئایەتی ﴿لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ﴾ التغـابن:١ وایە، وە وەصـفداری نەفسـی خـۆی دەکـات کـە (مالِكُ الملكَ)ە لـە ئایـەتی ﴿تُـؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء﴾ آل عمـران: ٢٦. وە لە ئایەتێکی تردا ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْعِزَّةَ فَلِلَّـهِ الْعِزَّةُ جَمِيعاً إِلَيْـهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّـبُ وَالْعَمَـلُ الصَّـالِحُ يَرْفَعُـهُ وَالَّـذِينَ يَمْكُـرُونَ السَّـيِّئَاتِ لَهُـمْ عَـذَابٌ شَـدِيدٌ وَمَكْرُ أُوْلَئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾ فاطر:١٠

لەگەڵ فەرموودەی خوا کە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّـهِ الْعِـزَّةُ وَلِرَسُـولِهِ وَلِلْمُـؤْمِنِينَ﴾ المنافقون:٨.

هـەروەها ئایـەتی شـەفاعەت: دەفـەرموێ: ﴿قُـل لِّلَّـهِ الشَّـفَاعَةُ جَمِيعـاً﴾ الزمر:٤٤ لەگەڵ فەرموودەی قورئان کە دەفەرموێ ﴿لَـا يَمْلِكُونَ الشَّـفَاعَةَ إِلَّـا مَـنِ اتَّخَـذَ عِنـدَ الـرَّحْمَنِ عَهْـداً﴾ مـريم: ٨٧، وە فـەرموودەی قورئـان کـە دەفەرموێ ﴿وَلَا يَمْلِـكُ الَّذِينَ يَـدْعُونَ مِن دُونِـهِ الشَّـفَاعَةَ إِلَّـا مَن شَـهِدَ بِـالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ الزخرف: ٨٦.

کـە ئـەو مانایـەمان تێدەگەیـەنێ، کـە پـەروەردگار (جـل شَـأنُه) خـاوەنی هەموو موڵکەکانە بە کێی ئەبەخشێ بە ئارەزوو و مەشیئەتی خـۆی، وە لـە غیرەت ی خۆی بە مەشیئەتی خۆی ئەبەخشێ بـە پێغەمبـەر و موسـوڵمانان، هـەروەها شـەفاعەت هـەمووی بـۆ خۆیـەتی، ئەیبەخشـێ بـە پێغەمبـەران و

بەنــدە ڕاســتە صــاڵحەکانی خــۆی، بــەڵکو بــۆ زۆرێــك لــە ئیمانــدارە ڕاســتەقینەکانیش، کــە وەك لــە کتێبــی فــەرموودەدا هــاتووە بــە پلــەی فەرموودەی (متواتر)..

ئیتر چی خراپییەکی تیایە کە مرۆڤ داوا بکات لە کەسێك کە لە خاوەنی یەکەمەو کە خوایە شتێکی پێدرابێ، کە ئەو کەسە بەشێ ببەخشێ بە ئێمە، لە کاتێکدا کە کەسەکەی داوای لێ دەکەیت خۆی بۆ خۆی خوا سیفەتی بەخشندەیی پێ فەرمووە، وە تۆیش کە مرۆڤەکەیت لە کاتێکدایت کە زۆر پێویستیت بەو داوایەیە... وە ئایا شەفاعەت تەنها دۆعا و پاڕانەوە نی‌یە، کە دۆعاو پاڕانەوەش خوا ئیزنی لەسەر فەرمووە؟ وە لە تواناشی دا هەیە، وە لە باوەڕدارانەوە داوای پاڕانەوە لە یەکتر دەکرێ ئیتر ئەگەر کەسەکەی داوای لێ دەکەیت پێغەمبەران بن یان پیاوچاکان ئەوە باشترە و یەکسانە لەژیاندا بن یان لە حاڵی وەفاتیاندا لە گۆڕەکانیا ن و لە ڕۆژی دواییدا... شەفاعەتیش بەخشراوە بەوانەی کە بەڵێنیان بەخوای خۆیان داوە، وە خوا لێیان ڕازی‌یەو شەفاعەتەکانیان لێ وەردەگرێ بۆ هەموو کەسێ کە لەسەر ئیمان و یەکتاپەرستی مردبێ..

وە جێگیر بووە کە هەندێ لە هاوەڵان داوای شەفاعەتیان لە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ کرد، ئیتر پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: (ئەو داوایە مەکەن ئەوە شیرکە، یان نەیفەرموو: شەفاعەت تەنها لە خوا داوا بکەن و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار مەدەن).

ئەوەتا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) عەرزی پێغەمبەری کرد ﷺ: (ئەی پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەتم بۆ بکە) پێغەمبەر

ﷺ لە وەڵامدا فەرمووی: (أنا فاعلٌ)[1] من شەفاعەتت بۆ دەکەم. هەروەها غەیری ئەمەش ئەو داوایەیان کردووە لەوانە:

(سەوادی کوڕی قارب) لەنێوان دوو دەستەی پێغەمبەردا ﷺ وەستاو ئەم دێڕە شیعرانەی فەرموو (کە ئەمە کەمێکیەتی):

واشهَدُ انَ اللهَ لا رَبَّ غَيرُهَ وأنَكَ مأمونٌ عَلى كُلِّ غائِب

وأَنَكَ ادنى المُرْسَلينَ وَسيلةً الى اللهِ ابنَ الأكرِمينَ الأطايبِ

تا گەیشتە ئەوەی ئەیووت:

(فَكُنْ لي شفيعاً يَومَ لا ذو شفاعَةٍ سِواكَ بِمُغْنٍ عَنْ سَوادِ بْنِ قارِبِ)[2] ،

کە بە ئاشکرا پێغەمبەری خوای کردە وەسیلەو تکاکار بۆ خزمەت خواو پاشانیش داوای شەفاعەتی لە پێغەمبەری خوا کرد بۆ ئەو ڕۆژەی کە هیچ کەسێ خاوەنی ئەو پلەیە نیە تەنها پێغەمبەری خوا نەبێ، وە حەزرەت ﷺ خۆشی لەسەر دێڕە شیعرەکانی دەربڕی و ئینکاری نەکرد و ئیقراری شەفاعەتی بۆ کرد.

وە دەبینین کە (مازن کوڕی الغضوبة) کاتێ هاتوو موسوڵمان بوو ئەم شیعرانەی لەبەردەم دوو دەستەی پێغەمبەردا ﷺ عەرز کرد:

إلَيكَ رَسُول اللهِ خَبَّتْ مطيَّتي تَجُوبُ الفَيافِي مِنْ عُمانَ الى العَرْجِ

لِتَشفَعَ لي يا خَيرَ مَن وَطيءَ الحَصا فَيَغفِرِ لي رَبي فَأرجِعُ بالفَلَجِ [3] .

واتە: لە عومانەوە تا عەرەج (کە شوێنێکە لەنێوان مەککە و مەدینە و ماوەی ٧٨ میل لە مەدینەوە دوورە) بە شمشێرەکەم شەرم کرد و دوژمنانم

---

[1]- رواه (الترمذي) له (السنن) (كتاب صفة القيامة) باب (ما جاء في شأن الصراط).

[2]- (البيهقي) له (دلائل النبوة) وه (ابن عبدالبر له الأستيعاب) وه إبن حجر له (فتح الباري) ٧/١٨٠ له باب (اسلام عمر –رضي الله عنه) هێناویانة.

[3] رواه أبو نعيم في دلائل النبوة ٢\٢٥٧

لەبەر تۆو گەیشتنم بە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ئەجەنگان و ئەو هەموو بیابانە فراوانەم بڕی، هەموو مەبەستیشم بۆ ئەوە بوو تا تۆ شفاعەتم بۆ بکەیت ئەی ئەو کەسەی کە باشترین کەسێکی کە پێیەکانت لەسەر زەوی دانابێ، دە داوای لێخۆش بوونم لە خوا بۆ بکە تا بگەڕێمەوە بۆ ناو کەس و ناوچەکەم بە سەرکەوتن و سەرفرازی و ڕەزا بوونی تەواوەوە).

هەروەها عوکاشەی کوڕی محصن لەو کاتەدا کە پێغەمبەرمان ﷺ باسی لەوە دەکرد کە حەفتا هەزار بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە داوای شەفاعەتی لە پێغەمبەر کردو وتی: بپاڕێرەوە بۆم بەڵکو خوا بمگێڕێ بە یەکێ لەوانە، ڕاستەوخۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أنتَ منهم) تۆ لەوانەی.. زانراوە کە هیچ کەسێ ئەو ڕێزەی پێ نادرێ مەگەر لەدوای شەفاعەتی گەورەی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ خەڵکانی ئەو مەحشەرە کە چۆن جێگیر بووە بە فەرموودەکان کە ئەمەش لە مانای داواکردنی شەفاعەتدایە..

نموونەی ئەو داواکردنانە لە کتێبەکانی فەرموودەی پیرۆزدا زۆرن و هاتوون، کە هەموویان بەڵگەن لەسەر دروستی داواکردنی شەفاعەت لە حەزرەت ﷺ لە دونیادا، هەیانە ڕاستەوخۆ ناوی شەفاعەتیان بردووە وتوویانە: شەفاعەتم بۆ بکە، هەیانە داوای چوونە بەهەشتی کردووە، هەیانە داوای کردووە کە خوا بیگێڕێ لەوانە کە خوا بە (السابقین) ناوی بردوون، یان داوایان کردووە لەسەر حەوزی کەوثەر بن، یان داوای ڕەفاقەت و هاوڕێیەتی پێغەمبەر ﷺیان کردووە لە بەهەشتدا، هەروەك (ڕەبیعەتی ئەسلەمی) عەرزی کرد: داوات لێ دەکەم کە ببمە هاوەڵت لە بەهەشتدا، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نیشان داو فەرمانی پێکرد کە زۆر سەجدە ببات بۆ خودا تا ئەو پلەی بە نسیب ببێ..

له هەموو ئەمانەدا نەیفەرمووە ئەوانە حەرامن وا مەڵێن، وە نەیفەرمووە: ئەم وتانە لێرە لە دونیادا داوا مەکەن دروست نىيە، یان نەیفەرمووە: کاتی ئەو وتانە نەهاتووە، یان نەیفەرمووە: چاوەڕێ بکەن تا خوا ئیزنی شەفاعەتم ئەدا لە مەحشەردا، یان ئیزنم ئەدا بۆ چوونە بەهەشت کە هەمووش دەزانین ئەو حاڵەتانە هیچی ڕوونادات مەگەر لە دوای شەفاعەتی گەورە نەبێ، کە ئەمانە هەموو لە مانای داواکاری شەفاعەتن، وە حەزرەت ﷺ مژدەی پێداوین و وادە و بەڵێنی پێداون و دڵیانی خۆش کردووە و چاوەکانیانی پێ گەشاندۆتەوە..

کە حاشا لە پێغەمبەر ﷺ کە شتێکی یان فرمانێکی نەهی لێ کراو لە خواوە باس بکات بۆ موجاملە یان مودارات کردن، چونکە ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەترسا و کە نەفسی هاوەڵانی خۆش دەکرد بە شتێك بوو کە لە بازنەی هەق و ڕاستیدا دەرنەچێ و، لە ئەسڵی دینەوە بناغەی داگرتبێ و دوور بێ لە هەموو بەتاڵی یان لە هەموو دوو ڕوویی و نیفاقێ..

کە داواکردنی شەفاعەت دروست بێ لە دونیادا لە پێش کۆتایی ژیان، مانای وایە ئەو کەسە ئەو شەفاعەتەی بە نسیب ئەبێ لە شوێنی خۆی لە ڕۆژی قیامەت دا، وە لە دوای ئەوەی کە خوای پەروەردگار ئیزنی شەفاعەتکاران ئەدات بۆ شەفاعەت کردن، لە دونیادا بەو پلەیە ناگات لە پێش کاتی خۆی، بەڵکو گەیشتنەکە لە ڕۆژی قیامەتدایە..

کە ئەمە هەقیقەتی دینە، ئەوەتا مژدەی بەهەشتی بە زۆرێك لە موسوڵمانان بەخشیوە، کە مانای وایە دەچنە بەهەشتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، وە لە دوای ئەوەی کە خوای پەروەردگار ئیزنی چوونە ژوورەوە دەدات لە کاتی دیاری کراودا، نەك بەو مانایە کە هەر لەو ساتەوە چۆتە

بەهەشت یان لە ژیانی بەرزەخی لە بەهەشتدا دەبێ، وە هیچ گوومان نابەم کە کەسێکی ئاقڵ و ژیر تەنانەت لە عەوامی موسوڵمانانیش باوەڕی غەیری ئەوەیان هەبێ..

داواکردنی شەفاعەت لە پێغەمبەر ﷺ لە دونیادا و لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ خۆیدا ڕاستە و هیچ شتێکی تیا نییە..

ئێمە لێرەدا دەڵێین: هیچ خراپییەکی تیا نییە کە داوای شەفاعەت لە پێغەمبەر ﷺ بکرێ لە دوای وەفاتیشی، بینا لەسەر ئەو فەرمووده دان پیانراوانەی کە لەسەر مەزهەبی سوننەتی و جەماعەت دامەزراوە لە ژیانی پێغەمبەران ولە ژیانی بەرزەخیاندا، وە خۆشەویستمان محمد ﷺ بەرێزترینی هەموو پێغەمبەرانە و گەورەی هەموویانە، کە وتەکانمان دەبیستێ، کە کردەوەکانی ئومەتەکەی ئەخرێتە بەر دەستی وە داوای لێخۆش بوونیان بۆ دەکات وە هەموو سوپاسی پەروەردگاری لەسەر دەکات، کە صەڵەوات خوێندنی موسوڵمانان ئەگەیەنرێ پێی، با ئەو کەسەش کە صەڵەواتەکە دەخوێنێ لە دوورترین شوێن بێ، هەروەك لەو فەرمووده ڕاستانەدا هاتووە کە پارێزەرانی فەرمووده کۆیان کردۆتەوە ئەفەرمووێ:

(حياتي خيرٌ لكم تُحدِثونَ وَ يُحَدث لكم، وَ وَفاتي خيرٌ لكم تُعْرَض علي أعمالكم، فَما رأيتُ من خير حمدتُ الله عليهِ وَما رأيتُ من شرٍّ استغفرتُ الله لكم).

ژیانم بۆ ئێوە خێرە، ئێوە پرسیار دەکەن و منیش بۆتان ئەدوێم، وە مردنیشم دووبارە خێری تیایە بۆ ئێوە، کردەوەکانتان دەخرێتە بەردەستم، کە خێر و چاکەم تیا بینیبێ سوپاسی خوای لەسەر دەکەم وە گەر خراپەم تیا بینی، داوای لێخۆشبوونتان لەخوا بۆ دەکەم.

ئەم فەرموودەیە لەلایەن ئەم پارێزەرانەی فەرموودەوە بەڕاست دانراوە: (العِراقي، الهيثمي، القسطلاني ، السيوطي، اسماعيل القاضي) کە لە زیاد لە شوێنێك تەخریجی ئەم فەرموودەمان کردووە لە غەیری ئەم شوێنەدا.

کە تۆ داوای شەفاعەتی لێ دەکەیت، ئەو زاتەیە لە توانایدا هەیە کە داوات لە خودا بۆ بکات، هەروەك چۆن لە حاڵی ژیانیدا کردوویەتی، پاشان ئەو کەسەیە لە ڕۆژی قیامەتدا بە پاداشتی دۆعاکەی پێغەمبەر ﷺ دەگات، هەروەك گەیشتن بە بەهەشت بۆ کەسێ کە لە دونیادا مژدەی پێ درا بێ، کە لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا و لە و دونیا و لەدوای ئیزنی پەروەردگاری دەخرێتە بەهەشت، کە ئەمەو ئەوەی پێشوو یەکسانن..

کە ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە بیروباوەڕمان لەسەری دامەزراوە و دڵمان لەسەری گۆش کراوە...

## ئیبن تەیمیە و تەفسیرکردنی بۆ ئایەتەکانی شەفاعەت

لەم ووتانەی خوارەوەی (ابن تيمية) دروستی داواکردنی شەفاعەت لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە دونیادا سوود وەردەگرین..

شێخ ابن تیمیە لە کتێبی (الفتاوى) لێکۆڵینەوەیەکی وردی هێناوە بۆ ئەو ئایەتانەی کە باس لە نادروستی شەفاعەت دەکەن و مانای سوود لێوەرنەگرتن لە شەفاعەتی تێدایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو ئایەتانە خۆشیان دەبنە بەڵگە بۆ دروست نەبوونی شەفاعەت لە دونیادا..

لەو وتانەی (ابن تيمية)وە وا دەری خستووە کە ئەو ئایەتانە لە غەیری شوێنی خۆیدا هاتوون و دەستکاری لە بەکارهێنانەکەیدا کرابێ..

بۆیە دەڵێ: (ئەوانەی ئینکاری شەفاعەت دەکەن بەڵگە بە فەرموودەی خوا دێننەوە کە دەفەرمووێ: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ وَلاَ يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ﴾ البقرة: ٤٨.

وە بە ئایەتی: ﴿وَاتَّقُواْ يَوْماً لاَّ تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئاً وَلاَ يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلاَ تَنفَعُهَا شَفَاعَةٌ﴾ البقرة: ١٢٣.

وە بە ئایەتی: ﴿مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ﴾ غافر: ١٨.

وە ئایەتی: ﴿فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ﴾ المدثر: ٤٨.

وە وەڵامی ئەهلی سوونەت: ئەفەرموون:

ئەمە مەبەست پێی دوو فرمانە:

يەكەم: ئەو شەفاعەتە هیچ سوودێ بە موشریك و بێ بڕواکان ناگەیەنێ، وەك خوای گەورە لە سەرزەنشتیاندا دەفەرموێ: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ . قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ . وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ .وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ. وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ . حَتَّى أَتَانَا الْيَقِينُ . فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ﴾ المدثر: ٤٢-٤٨.

ئەوانە هیچ سوودێ لە شەفاعەت نابینن چونکە بێ بڕواو کافرن.

دووەم: نەفی کردنی ئەو شەفاعەتەیە کە ئەهلی شیرك دایان ناوە و یان ئەوانەی کە ئەهلی داهێنراوین و بە ویستی خۆیان ڕاڤەو مانای دەکەن، لەوانەی کە ئەهلی کیتابێن و موسوڵمانن وا گومان دەبەن کە بۆ خەڵکی هەیە لەلای خوا ڕێزو پلەیەك کە ببێتە شەفاعەتکاریان بەبێ ئیزنی خوای پەروەردگار، وەك ئەوەی خەڵکان لەنێوان خۆیاندا تکا بۆ یەکتری بکەن.

بێ بڕواکان و موشریکەکان بەبێ خوا فریشتەکان و پێغەمبەران و چاکەکانیان دەکردە شەفاعەتکارو هەڵدەسان کۆمەڵە بتێکیان لە شێوەیاندا

دروست دەکرد و شەفاعەتیان پێ دەکردو ئەیان وت: ئەوانە پاڵفتەکانی خوان...

منیش دەڵێم: ئەمە وتەکەی شێخ (ابن تیمیە)یە بەبێ دەستکاری، کە تیایدا زۆر بە ڕوونی هەقیقەتی ئەو ئایەتانەمان بۆ دەردەخات کە ئەو کەسانەی ئینکاریان دەکرد ئەیانکردە بەڵگە بۆ داواکردنی شەفاعەت لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە دونیادا، یان بۆ ئەوانەی کە ئەیانوت شیرکە یان گومڕاییە.

کورتەی وتەکان:

مەبەست لەم وتانەمان ئەمەیە: کە شەفاعەت هیچ سوودێ بە موشریکەکان ناگەیەنێ، وە ئەو ئایەتانەش کە هاتوون و باس کران مەبەست پێیان: نەفی کردنی شوفاعەتە بۆ ئەو کەسانەی کە ئەهلی هاوەڵ بۆ خودا دانن، ئەوەش ئەوانەن کە عەقیدە و بیروباوەڕیان وایە کە ئەو کەسەی داوای شەفاعەتی لێ دەکرێ بەبێ ئیزنی خوا شەفاعەت بکات، کە ئەمەش مەبەستی ڕوونی (ابن تیمیە)یە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە ئەمەش بیروباوەڕی ئێمەی موسوڵمانە سوپاس بۆ خوا..

وە دەڵێین: ئەو کەسەی کە داوای شەفاعەت لە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەکات ئەگەر بیروباوەڕی وابوو یان گومانی بوو لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ شەفاعەت دەکات بەبێ ئەوەی ئیزن لە خوای پەروەردگارەوە وەربگرێ، ئەوە یان شەریك و هاوەڵی بۆ خوا داناوە یان کەسێکی گومڕایە کە ئەمە هیچ گومانمان لەسەری نییە... کە (حاشا و کلا) پاشان (حاشا و کلا) وە جارێکی تریش (حاشا و کلا) کە ئێمە باوەڕمان وابێ یان گومانمان لەسەری هەبێ، وە بەرین لەو جۆرە بیروباوەڕە، وە خۆمان بۆ لای پەروەردگارمان دەگێڕینەوە..

وه ئێمه كاتێك داوای شەفاعەت دەكەین، له بیروباوەڕێكی پتەوی وادایـن كه كەس بۆی نی‌یه شەفاعەت بكات مەگەر بە ئیزنی خوای پەروەردگار نەبێ. وه هیچ شتێ ڕوو نادات مەگەر به ڕەزا و ئیرادەی ئەو نەبێ..

نمونەی ئەمە وەك داواكردنی چوونه بەهەشت و خواردنەوه لـه ئاوی كەوسەر و ڕزگاربوون لـه پردی سیرات و....، كه ئەمانه هیچی ڕوو نادەن مەگەر بە ئیزنی خوا نەبێ و لەو كاتەدا نەبێ كە خوا بۆیانی دیاری كردووه، ئایا كەسێ كه كەمێ ژیری هەبێ یان بچوكترین زانستی ئیسلامی هەبێ، یان لەبەردەم كەمترین قوتابی زانایانی پێشین زانستی وەرگرتبێ هیچ گومانی لەو وتەیەی سەرەوەمان هەیە؟؟ پەروەردگار دڵمان بكەرەوه و بینایمان ڕۆشن بكەرەوه بۆ ناسینی هەق و ڕاستی..

* * *

﴿ إِيَّــاكَ نَعْبُــدُ وإِيَّــاكَ نَسْتَعِيــنُ ﴾

## هەر تۆ دەپەرستین و كۆمەك و پەنامان هەر له تۆوەیه

ئێمه بیروباوەڕ و عەقیدەمان دامەزراوه و جێگیرەو هیچ گومانێكمان نی‌یه لەمەدا كه دەڵێین: ئەسڵ له یارمەتیدان و هاوار بۆ كردن و داواكردن و پرسیاركردنمان تەنها لـه خوای پەروەردگارەو تەنها ئەو زاتەشە كە فریادڕەس و یارمەتیدەرەو دێته هاوار و یارمەتیمانەوه..

خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَدْعُ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَنفَعُكَ وَلاَ يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذاً مِّنَ الظَّالِمِينَ . وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ﴾ یونس: ١٠٦-١٠٧.

واته: له غەیری خوا داوا مەكه چونكه ئەوانه نه سوود و نه زەرەری تۆیان بەدەست نی‌یه، ئەگەر وات كرد ئەوه تۆ لەوانه دادەنرێیت كه زوڵم و ستەمیان كردووه.

وه یان دەفەرموێ: ﴿فَابْتَغُوا عِندَ اللَّهِ الرِّزْقَ وَاعْبُدُوهُ﴾ العنكبوت: ١٧.
ڕزق و ژیانت لە خوا داوا بكە و بەندایەتی ڕاستەقینەی بۆ ئەنجام بدە..
وه یان دەفەرمویێت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَومِ الْقِيَامَةِ﴾ الأحقاف: ٥..
وه دەفەرمویێت: ﴿أَمَّن يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ﴾ النمل: ٦٢.

كه بەندایەتی بە هەموو جۆرییەوه تەنها بۆ ڕووی پەروەردگار ئەكرێ، وه دروست نی‌یه كه تیایاندا بچوكترین لاكردنەوه تیا بێ بەڕووی غەیری خوادا ئیتر هەر كەس و شتێك بێ،
﴿قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ . لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَاْ أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ﴾ الأنعام: ١٦٢-١٦٣.

كەواته نەزر نی‌یه مەگەر بۆ خوا، پاڕانەوه و دوّعا نی‌یه مەگەر بۆ ئەو، ئاژەڵ سەربڕین و قوربانیەكانمان نی‌یه مەگەر بۆ زاتی خوا، هاوار و بانگ كردن و داوای یارمەتی و سوێندمان نیه مەگەر بە زاتی خوا، تەوەكول و پشت و پەنامان تەنها زاتی پەروەردگاره و هاوەڵ و شەریكی بۆ بڕیار نادەین، (سُبحانَهُ جَلَ شَأنُه)..

وه ئێمه بڕواو عەقیدەمان دامەزراوه لەسەر ئەوه كە خوای پەروەردگار بەدیهێنەری بەندەكانه، خالقی كردەوەكانیانه، هیچ شتێكی تر هیچ جۆره كاریگەریەكی لەسەر نی‌یه، نه مردوو نه زیندوو، نی‌یه لەگەڵ خوا بۆ هیچ كەسێ نەكردەوەی نه واز لێهێنانی نه ڕزق و ڕۆزی نه ژیانی نه مردنی، نه توانایی بەسەر جێبەجێ كردنی كردەوەكانی یان هەوڵدان بۆ نەكردن و تەرك كردنی بەبێ خوای پەروەردگار یان بە یارمەتیدانی لەگەڵ پەروەردگار یان كەمتر لەوه..

ئەوەی ئیش لەم كەون و دونیایەدا ئەكات تەنها خوای پەروەردگارە، كەس خاوەنی هیچ شتێ نیی بە موڵكایەتی و خاوەنداریەتی و ئیزن لە ئیش تیاكردندا، نە خاوەنی زیان و سوود و مردن و ژیانی نەفسی خۆیەتی مەگەر بە ئیزنی خودا، سود و زیان ئە لێرەدا یەكسانن.

وە نیسبەت لە هەقیقەتدا مەجازیە نەك هەقیقی هەقیقەت، بەڵام خەڵكان جیاوازیان هەیە لە ڕاوبۆچوون دەربڕین لەسەر ئەو هەقیقەتانە لەوانە: ئەگەر كەسێ ئیسراف و زیادەڕەوی كرد لە بەكارهێنانی مەجازێكدا بە شێوەیەكی فراوان، هەتا دەكەوێتە ناو شوبهەیەكی سەرزارەكیەوە كە ئەوە لەمە بەریە، وە دڵی پاك و دامەزراوە لەسەر یەكتاپەرستی ڕاست و پاك و مونەزەهی خوای پەروەردگار...

وە لەوانە: ئەگەر كەسێ دەستی گرت بوو بە هەقیقەتیەكەوە زیاد لە سنوری خۆی، تا گەیشتە زیادەڕەوی و خراپە بەرانبەر بە خەڵكی كە پێچەوانەی بیروباوەڕیان بوو، كە زۆری لێ دەكردن بە كردنی شتێ كە ئەوان نەیاندەویست وە حوكم بدات بەسەریاندا بەو شتە كە ئەوان لەو فرمانانە بەرین..

بۆیە بە ئەرك دانراوە كە میانەڕەوی و دوركەوتنەوە لە هەموو شتێ كە ئەوە دین پارێزەو داچوونە لەپارێزگاری پلەی یەكتاپەرستی، خواش ئەزانێ..

(شێخ ابن تیمیە) بە كورتەیەكی سود بەخشی لە ڕوون كردنەوەی ئەو شتانەی تایبەتمەندی خوای پەروەردگارن باس دەكات كە هەر ئەو شتانەیە كە ئێمە وەك موسوڵمان باوەڕمان لەسەری دامەزراوە، كە بیروباوەڕی زانایانی پێشینمانە، كە ڕێگەی موحەمەدیە، وە ئێمەش هەر ئەوە دەڵێین لەو بارەیەوە كە ئیبن تیمیە دەیڵێت.

که (ابن تیمیه) دەڵێ:[1]

(خوای پەروەردگار کۆمەڵێ لە مافەکانی بۆ خۆی بڕیار داوە و هیچ کام لە مەخلوقەکانی بەشداری لەو مافانەدا ناکات، بەندایەتی دروست نییە مەگەر بۆ زاتی خوا نەبێ، پاڕانەوەمان تەنها لە زاتی خوایە، تەوەکول و پشت بەستنمان لەسەر زاتی خوایە، دەرووی خێرمان لەسەر خوایە، چاکەکان تەنها لەلای خواوە دێ، خراپەکان تەنها زاتی خوا لێمان دوور دەخاتەوە، (لا حول ولا قوة إلا بالله) خواش دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ﴾ سبأ: ٢٣.

﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ البقرة: ٢٥٥.

﴿إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً . لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَداً . وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْداً﴾ مريم: ٩٣-٩٥

﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ النور: ٥٢

گوێڕایەڵی و تاعەتی گێڕاوە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی، تەقوا و ترسانیشی تەنها بۆ زاتی خۆی بڕیار داوە، هەروەك لەم ئایەتەشدا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوْاْ مَا آتَاهُمُ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ سَيُؤْتِينَا اللّهُ مِن فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ إِنَّا إِلَى اللّهِ رَاغِبُونَ﴾ التوبة: ٥٩. کە تیایدا خواو پێغەمبەرەکەی ئەیهێنن، بەڵام تەوەکول تەنها لەسەر خوایە، گەڕانەوەش تەنها بۆ لای زاتی پەروەردگارە))..

---

ی) ابن تيمية ٩٨/١١.

## داواکردن و ڕوو کردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ

وەك لە پێشەوە باسمان کرد، کە ئێمە بیروباوەڕمان جێگیرە و هیچ شك و گومانێکمان نییە لەسەر ئەوە کە بنەڕەتی یارمەتی وەرگرتن و ئیستیعانە و داواکردن و پرسیار و داوا تەنها لە خوای پەروەردگار دەکرێ، تەنها زاتی خوایە یارمەتیدەر و فریادڕەس و وەڵامدەری داواکانمان، وەك دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ غافر: ٦٠، لێرەوە هەر کەسێ داوای یارمەتی لە دروستکراوێکی خوا بکات یان هاواری لێ بکات، یان داوای لێ بکات جا یەکسانە زیندو بێ یان مردوو، بە مەرجی ئیعتیقاد و باوەڕی وابێ کە ئەو مەخلوقی خوایە سوود ئەبەخشێ یان زیاد دووردەخاتەوە بە شێوەیەکی سەربەخۆ بەدەر لە خوا، ئەوە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوە (بەڵام خوا خۆی بە دروستی داناوە بۆ یارمەتی وەرگرتنی خەڵکی لە یەکتری، کە کەسانێك ئیستیعانە لە یەکتری و کەسانی تر داوا بکەن، وە فرمانی پێداوین کە هەر کەس داوای یارمەتی لێکردین بچین بە هانایەوە و یارمەتی بدەین) وە فەرموودەکان لەم بارەیەوە زۆر زۆرن، کە هەموویان بەڵگەن لەسەر یارمەتیدان و چوون بە هانای داواکار و لێقەوماوانەوە و هەوڵدان بۆ لابردنی ناڕەحەتیەکانیان، وە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ باشترین کەسێکە کە هاواری بۆ لا بکەین تا خوا بەهۆی ئەوەوە ناڕەحەتیەکانمان لەسەر لاببات و پێداویستیەکانمان بۆ جێبەجێ بکات.

خوا، هەروەك خۆشەویست ﷺ ئەفەرموێ: ((وبینما هُمْ كذلك استغاثوا بآدم)... فەرموودەكە.. كە ئەو یارمەتی داواكردنە پێغەمبەر ﷺ بە وشەی (إستغاثة) باسی كردووە.. كە ئەم فەرموودەیە لە (صەحیحی ئیمامی بوخاری)دایە..

وە دەبینین چۆن هاوەڵان (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) داوای یارمەتیان لە پێغەمبەرەكەیان كردووە و ئیستیغاثەیان لە خزمەتدا كردووە و داوای شەفاعەتیان لە خزمەتدا كردووە، وە سكاڵای حاڵی خۆیان بۆ لا بردووە لە لابردنی نەخۆشی و بەڵاو ناڕەحەتیەكان، لە لابردنی قەرز و نەمانی كوێری و نابینایی و لاوازی لە كاتی هاتنی ناڕەحەتیەكاندا، داوایان لە پێغەمبەر كردووە و پێغەمبەریان كردووە بە تكاكار بۆ لای خوا، كە زۆر بیروباوەڕیشیان جێگیر بووە لەسەر ئەوە كە پێغەمبەر ﷺ تەنها هۆكارو ناوەندێكە بۆ هاتنی سوود و لاچوونی زیانەكان، وە بكەری ڕاستەقینە تەنها زاتی خوای باڵادەستە..

## ئەبو هورەیرە سكاڵای لەبیرچوونەوە دەكات

ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) شكایەتی حاڵی خۆی بردە خزمەت پێغەمبەر ﷺ كە هەر شتێك ئەبیستێ بیری دەچێتەوە بەتایبەت فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ كە ئەبو هورەیرە دەیویست ئەو حاڵەتەی نەمێنێ و فەرموودەكانی بیر نەچێتە بۆیە عەرزی پێغەمبەری كرد و وت

پێغەمبەر ﷺ بە دەستە موبارەکەکانی هەوای دەخستە ناو کراسەکەو، فەرمووی پێی (ضُمُهُ) واتە کراسەکەت دابخە، ئەویس دایخست، ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: (فَما نَسيتَ شيئاً بَعدَهُ)[1] ئیتر لەدوای ئەمە هیچم بیر نەدەچووەوە).

ئەبو هورەیرەیە داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکات تا شتەکانی بیر نەچێتەوە، کە ئەمە جگە لە خوا ناتوانێ بیکات، ئیتر پێغەمبەر ﷺ نکوڵی نەکرد و نەیفەرموو ئەمە شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە.

ئەمە هەموو کەس دەزانێ کە یەکتاپەرست ئەگەر داوای شتێك بکات لە کەسێك کە خاوەنی ڕێزو جاه بێ لەلای خوای باڵادەست، نایەوێ کە شتێکی تازەی بۆ بێنێتە بوونەوە، کە ئەویش هیچ ئەو بڕوایەی نییە، بەڵکو دەیەوێ لەو هۆکارەی کە خوای پێی بەخشیوە و ئیرادەی تیا کردووە بۆی لە پاڕانەوەو هەڵسوڕانی کاروباری کە مۆڵەتی خودای لەسەرە بەکاربهێنێ. ئەوەتا دەبینی کە پێغەمبەر ﷺ هات بە هانایەوەو داواکەی بۆ جێبەجێ کرد، کە هیچ جۆرە دۆعا و پاڕانەوەیەك لەم چیرۆکەدا نەهاتووە، بەڵکو کۆبوونەوەی هەواو خستنە ناو کراس و فرمان کردن بە ڕاکێشانی هەوایەکە بۆ سنگی هاتووە، کە خوای گەورە ئەو حاڵەی گێڕا بە هۆکارێك تا فرمانەکەی بۆ جێبەجێ بکات..

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: بۆ داوا لە من دەکەی، خوا لە من [illegible] لەلای، هەموو کەسێ کە ئەو کەسەی

## قەتادە (ر . خ ) داوای یارمەتی لە پێغەمبەر ﷺ دەکات بۆ چاکبوونەوەی چاوەکانی

لە فەرموودەدا جێگیر بووە کە قەتادەی کوڕی نوعمان لە شەڕدا چاوی پێکراو چاوی هاتبووە دەرەوە، کە ئەیویست دەریبهێنێت وتی: نەخێر واناکەم تا پرس بە پێغەمبەر ﷺ نەکەم، کاتێ چووە خزمەتی و داوای مۆڵەتی لێ کرد کە چاوی دەربهێنێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، بە دەستی موبارەکی چاوی خستەوە شوێنی خۆی و دەستی پیا هێنا کە دەفەرمووێ: لە جاران چاکتر چاوی دیار بوو و ئەیبینی)[1] .

## هاوەڵێکی تر داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکات تا کەلوپەلی نەفەوتێ

لە (موخلەدی کوڕی عەقبەی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی شەرحەبیلەوە، لە باپیریەوە کە (عبدالرحمن)ە لە باوکیەوە کە (شەرحەبیلە) دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و کەلوپەلێك بە دەستمەوە بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ:

(هذه السلَعة قد أورمتني، تحول بيني وَ بين قائم السيف أن أقبضُ عليهِ، وعن عِنانِ الدابة) ، حەزرەت ﷺ فەرمووی: لێم نزیم ببەوە، نزیك بوومەوە، پاشان فەرمووی: دەستەکانت بکەرەوە، کردمەوە، پاشان فەرمووی: بینوقێنە، نوقاندم، پاشان فەرمووی: زیاتر نزیك ببەرەوە، نزیك بوومەوە،

هۆرەیرە دەیویست ئەو حاڵەتەی نەمێنێ و فەرموودەکانی بیر نەچێتە بۆیە عەرزی پێغەمبەری کرد و ...

کردە ناو دەستەکانم و فوی کردە سەر شانم، پاشان دەستی کردە سەر ئەو کەلوپەلەو دەستەکانی لابرد و منیش دەستەکانم داخست.
(فما زال يطحنها بِكَفّهِ حَتى رَفعها عَنها وَما أرى أثرها)[1] .
والسلَعة: غُدَةٌ تظهُر بين الجلدِ واللحِمِ)

## مەعاذ (ڕەزای خوای لێ بێ) داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە دەستی چاك بکاتەوە

لە ڕۆژی بەدرا، عەکرەمەی کوڕی ئەبی جەهل شمشێرێکی دا لە قۆڵی مەعاذی کوڕی عەمری کوڕی جەموح، مەعاذ دەڵێ: قۆڵم لێبوویەوە تەنها بە پێستەکەیەوە مابوو ڕامدەکێشا لەگەڵ خۆمدا و شەڕم دەکرد، تا ناچاری کردم قۆڵەکەم خستە ژێر پێکانم لێم کردەوە تا ئازارم نەمێنێ و بتوانم شەڕ بکەم.

لە (المواهب)دا دەڵێ: مەعازی کوڕی عەمر قۆڵەکەی بە دەستەکەی تری هەڵگرتوو هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وە پێغەمبەر ﷺ قۆڵەکەی خستەوە شوێنی خۆی و بە تفی موبارەکی خۆی پێوەی لکاندەوە [2] .
هەروەك (قاضي عياض) لە (ابن وهب)ەوە هێناویەتی.

---

[1]- ئیمامی طبرانی ڕیوایەتی کردووە، وە الهيثمي لە (مجمع الزوائد)دا هێناویەتی لە ٢٩٨/٨دا.

[2]- ئەم ڕووداوە (الزرقاني) هێناویەتی، وە ئیسنادی داوەتە پاڵ (ابن اسحاق)ەوە وە لە ڕێگەی (الحاكم)ەوە ئەیبەستێتەوە.

## پاڕانەوە بۆ لای خوا بەهۆی یارمەتی و فریادڕەسی پێغەمبەری خواوە ﷺ لە کاتی ناڕەحەتیەکاندا

دەقە ڕاستەکان ئەوەیان سەلماندووە کە هەر کاتێ خەڵکی و هاوەڵان تووشی گرانی و بێ بارانی بووبن، هاواریان بۆ لای ئەو پێغەمبەرە ﷺ بردووە و ئەو زاتەیان کردووە بە تکاکار بۆ لای خوای پەروەردگار، تا لە خزمەت ئەو پێغەمبەرەدا شکایەتی حاڵی خۆیان عەرزی پەروەردگار بکەن.

ئەوە پێغەمبەری خوایە و لەکاتی خوێندنەوەی وتاری هەینی دایە، پیاوێکی ئەعرابی هاواری لێ کرد و وتی: (یا رسولَ الله هلكتِ الأموال وانقطعَتِ السُبل، فادعُ الله أن يُغيثَنا) ئەی پێغەمبەری خوا ماڵ و سەروەتمان بە هیلاکا چوو (مەبەست پێی ئاژەڵەکانە) هیچ دەروویەك نەما بپاڕێرەوە لە خوا کە بارانمان بۆ ببارێنێ..

پێغەمبەر ﷺ پاڕایەوە بۆیان و بارانیان بۆ بارا، تا هەینی داهاتوو لە ناوەڕاستی وتارەکەدا پیاوەکە هاواری کرد و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خانووەکان ڕوخان و ئاژەڵەکانمان خەریکە بە هیلاکا ئەچن لەبەر باران زۆری بپاڕێرەوە بۆمان، پێغەمبەر ﷺ پاڕایەوە لە خوا تا بارانەکە بکەوێتە ناوچەکانی دەوری مەدینە[1]

ئەبو داود بە سەنەدێکی چاك ڕیوایەتی کردووە لە خاتوو عائشەوە (ڕەزای خوایان لەسەر) فەرمووی: (شكا الناس إلى رسول الله ﷺ قحوط المطر)[2] خەڵکی شکاتی حاڵی خۆیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ نەبوونی باران.

---

[1]- بخاری ڕیوایەتی کردووە لە (الأسسقاء–باب سؤال الناس الأمام إذا قحطوا)

[2]- ابو داود ڕیوایەتی کردووە لە (الصلاة–باب رفع اليدين في الأسسقاء)

وه (البيهقي) له (دلائل النبوة) دا هێنایەتی به سەنەدێك كه هيچ گرانيەك و خراپيەكی لەسەر نىيە (بنواڕە بۆ فتح الباری)[1] له ئەنەسی كوڕی مالیكەوه (ڕەزای خوای لێ بێ) كه پیاوێكی ئەعرابی هاته خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (أتيناك وَما لنا بَعير يَئط، ولا صَبي يَغط)..

هاتووين بۆ خزمەتت له كاتێكدا وشترێكمان نىيە دەنگی لێوه بێ وه منداڵێكمان نىيە كه دابنيشێ (كه ئەمه كينايەيه لەسەر زۆری فەقيری و هەژاری و برسێتی و گرانی..

پاشان ئەم شيعرانەی خوێندەوه:

| | |
|---|---|
| أتيناكَ وَالعَذراءُ يدمي لَبانُها | وَقَد شُغلَت أم الصَبىّ عَنِ الطفلِ |
| والقى بِكَفَيه الفَتيُّ إستكانةً | مَنَ الجُوعِ ضعفاً ما يُمِرُّ وَلا يُحْلي |
| وَلا شيءَ مِما يأكَل الناسُ عِندَنا | سوى الحَنظلِ العامي والعِلهِزِ الفَسْلِ |
| وليس لنا إلا إليكَ فِرارُنا | وأينَ فِرارُ الناسِ إلَّا الى الرُسُلِ |

واتای شيعرەكان:

(هاتين بۆ خزمەتت له كاتێكدا كه ئافرەتانمان لەبەر نەبوونی خزمەتكاريان نىيە و كەس نىيە خزمەتيان بكات، وه دايكی منداڵەكان (شيره خۆرەكان) نازانن چۆن منداڵەكانيان تێر شير بكەن، لاوەكانمان دەڕۆن بەڕێ دا لاوازن و دەنگيان لێوه نايەت، وه ئەو خەڵكه ئەوەی ئەيخۆن تەنها بريتىيە له (حەنزەڵ و ئەو خوێنەی كه له برسێتيدا لەسەر پێست دروست دەبێ)، وه ئێمە نىيە ڕێگەييەك كه بۆی بڕۆين تەنها ڕێگەی تۆ نەبێ، ئاخۆ ڕاكردنی خەڵكی بۆ دەربازبوونيان لەو ناڕەحەتيانە جگە له پێغەمبەران بۆ لای كێ بێ).

---

[1]- (ابن حجر) له (فتح الباري) ٢/٤٩٥.

کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەم وتانەی بیست، هەڵسایە سەر پێ‌ی و عەباکەی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا و چووە سەر مینبەر و دەستەکانی بەرزکردەوە و پاڕایەوە و فەرمووی:

(اللهمَ اسقنا غيثاً مُغيثاً، مُريعاً، غَدَقاً طبقاً، نافعاً غيرَ ضار، عاجلاً غير رائث، تملأُ بها الضَرَعَ، وَتنبتُ بهِ الزرعُ، وتُحيي بهِ الأرض بعد موتها ) ،
خوایە بارانمان بۆ ببارێنی، بارانێك کە فریادڕەس بێ، تۆو چێنەر بێ، زۆر بێ و ناوچەکان هەموو بگرێتەوە، سوودمەند بێ و بێ زیان بێ ئێستا بینێری و دوا نەکەوێ، شیوەکانمان پڕ بکاتەوە، بەرووبومەکان زیاد بکات، ئەرز بژێنێتەوە لەدوای ئەوەی کە مردووە..

دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی دانەگرت تا ئاسمان ئاوێکی ڕوونی هێنایە سەر زەوی.. پاشان خەڵکی هاواریان لێ هەڵسا و هاتن و وتیان: خنکاین خنکاین، ئەی پێغەمبەری خوا فریامان بکەوە ، پێغەمبەر ﷺ دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی: (حوالينا ولا علنيا) خوایە لە چواردەورماندا نەك لەسەرمان، هەورەکە بۆ چواردەوری شاری مەدینە ڕۆیشت.

خوێنەری بەڕێز: بنواڕە چۆن ئسنادی باران و سوود و سەوزبوونی زەوی دراوەتە پاڵ باران لە ڕێگەی مەجازەوە؟ وە چۆن شاعیر دان دەنێ بەوەدا کە فیرار و ڕاکردنی خەڵکی بۆ لای پێغەمبەری خوایە، وە پێغەمبەر ﷺ پێ‌ی نەفەرموو: وا مەڵێ موشریك بووی، ئایا ئایەتی پیرۆزی ﴿فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ﴾ لەلای پێغەمبەر شاراوە بوو، خۆ ئەو ئایەتە زووتر هاتبووە خوارەوە..؟

ماناکەی بەم شێوەی لێ دێ: ڕاکردن و فیرار داواکراوە بۆ لای کەسێ کە سوودی خۆتی تیا ببینیتەوە، بۆ لای تۆ ئەی پێغەمبەری خوا نەك بۆ لای

کەسێ کە خوار تۆ بێ، بۆ لای پێغەمبەران نەك غەیری پێغەمبەران، چونکە پێغەمبەران پایەیان بەرزە و تەوەسولیان پێ دەکرێ بۆ خزمەتی خوا پاڕانەوەیان گیرایە و لەلای خوا ناز و ڕێزیان هەیە..

بنواڕە چۆن پێغەمبەر ﷺ ئەو دێڕە شیعرانە کاریگەری تێ دەکات و زۆر بە پەلە هەڵدەستێ و عەباکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێ و بە پاڕانەوەیەکی بە پەلە دێتە هانایانەوە [1] .

---

[1]- ((هەزاران صەلات و سەلامت لەسەر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆی دالدەی بێنەوایان، تەنها تۆی فریادڕەسی هەژاران و لێقەوماوان، بە ڕەحم و سۆز لە دوای خوا بە منداڵ و شیرەخۆرەکان، بە ئاژەڵ و بێ زوبانان، بێ ڕەنگی و زەردی گژوگیا، خۆڵ بارینی بەردەوامی دەشت و چیا، چۆن خۆی دەگرێ لەبەردەم پاڕانەوەی بەکوڵی پڕ بە دڵی عەشقی ڕاستی تۆی خاوەن پلەو پایە ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە موسوڵمانانی کورد زوبان، ئەوە ناڵە و فرمێسك و گریانی شەوانی خواناسانی ئەم میللەتە، ئەوە ناڵەی دەروونی ڕیش سپیان، ئەوە منداڵی شیرە خۆری بەستەزوبان، ئەوە ئاژەڵی بێ زوبانی ڕوو لە ڕەحمی خوای یەزدان، ئەوە داوای ڕاستەقینەی دۆستان و ئەولیا و پیاوچاکان، پێش دەخەم بەسەر هەموو گوناه و تاوان و خەجاڵەتی و خراپەکاری ئەم میللەتە و دەیکەمە تکایەك و ئەیخەمە بەردەستی پێغەمبەری ئاخر زەمان، عەرزت دەکەم: ئەی پێغەمبەرم ئەی تاجی سەرم، لە سەدەی بیست و یەکدا ژیان بەسەر دەبەین ، نەوەکانت، شوێن کەوتوانت، لە خەوی غەفڵەت و لە دەریای پڕ گوناهی ڕەش دا نوقم بووین، کورد زوبانین تەنها هاوارمان، تەنها فریادڕەسمان ، تەنها تکاکارمان، تۆی ئەی پێغەمبەری خۆشەویستمان، داواکارم لە خزمەتدا ئەو پاڕانەوەیە دووبارە بکەیتەوە بۆ ئەم میللەتە داماوە نەزانەیە ، دەوری خێریان لەسەر بێ و زەوییمان سەوز بێتەوە وشکە ساڵە، بێ ئاوییە، گرانییە، دەردەسەری و نەهامەتی چواردەوری نەوەی تۆی داوە، لەلایەك بێ یاسایی و پشت کردنە بەرنامەی خوا، لە لایەکیش گوێ نەدانە سوننەتی تۆ، ئەزانین کە هەڵەین و گوناهبارین بەڵام ئەوە فەرمانی خوایەو بەجێی دێنم، ئایەتی ﴿ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا

## پێغەمبەر ﷺ بۆ ئێمە

## ( پایەو ڕاگرە، قەڵای پارێزە، پشت و پەنایە )

حەسانی کوڕی ثابت لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ ئەم چەند دێڕە شیعرەی خوێندەوە کە تیایدا سیفەتەکانی (روکن و عیصمەت و مەلاذ) ئەداتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەریش ﷺ ئینکاری لێ ناکات و بەڵکو بە شاعیری خۆی پێناسەی حەسان دەکات، ئەم چەند دێڕە شیعرەی فەرموو:

يا رُكنَ مُعتَمَدٍ وَعِصمَةَ لائذٍ

وَملاذَ مُنْتَجِعٍ وَ جارَ مُجاوِرِ

يا مَنْ تَخَيَّرَهُ إلا لَهُ لِخَلقه

فَحَباهُ بالخُلُقِ الزَّكيِّ الطاهِرِ

أنت النبيُّ وَ خَيرُ عُصَبَةِ آدَمِ

يا مَن يَجودُ كَفَيضِ بَحْرٍ زاخِرِ

---

اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَحِيمًا﴾ ئەکەمە دیاری دەستم عەرزت دەکەم:

ئەی خۆشەویست: ئەوە منم، بەندەی خوامە، ئەوەی ئومەتی تۆی سەردارم زوڵم و ستەمم لە نەفسم کردووە، گوناهبارم، دان ئەنێم بە سەرپێچیەکانمدا، هاتوومەتە خزمەتت کە لێم خۆش بی، داوام بۆ بکەی لە پەروەردگارم کە بە کەرەمی خۆی و بە تکای تۆی سەردارم لێم خۆش بێ...

هەزاران صەڵات و سەلامی خوات لەسەر ئەی پێغەمبەری خوا...

داواکارم لە خزمەتتدا کە دەروی خێر لەم میللەتە بکرێتەوەو موسوڵمانان دووربن لە فیتنە و شەڕەنگێزی، دوور بن لە بیروبۆچوونی دوژمنانی دین، دوور بن لەو بیرو فیکرانەی کە بەناو شوێنکەوتوانی ئیسلام بەناوی دینەوە ئەیکەنە بەرنامەی دین...

ئامین. وەرگێڕ.

میكالُ مَعَكَ وَجبرَئیلُ كِلاهُما

مَدَدٌ لِنَصْرِكَ مِنْ عَزیزٍ قاهِرِ[1]

مانای هۆنراوەكەی حسانی كوڕی ثابت (ڕ.خ)

ئەی پایەی پشت پێ بەستراو و قەڵای تۆكمەی پارێزگاری ، پشت و پەنای لێقەوماو و دراوسێی خەڵكی دەوروبەرت ، ئەی هەڵبژێراوی خودا بۆ هەموو بەدیهێنراوانی ، خۆشەویستی كردووی بە ئاكاری بەرز و پاكت ،تۆ پێغەمبەری خودا و باشترین نەوەی ئادەمی ، ئەی ئەوەی دەبەخشیتەوە وەك لافاوی هەڵچوی دەریایی ، میكائیل و جوبرائیل هەردوو هاوەڵی ڕێكاتن ، لە پەروەردگاری بالآ دەستەوە مەدەدكاری سەركەوتنی تۆن

## پێغەمبەر ﷺ حەمزەی مامی وەسفدار دەكات

## ( هەمزە بكەری كارە چاكەكان ولابەری غەم ونەهامەتیەكان )

لە فەرموودەی ئیبن مسعودەوە لەلای ابن شاذان هاتووە:

(نەمانبینیوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە گریابێ وەك ئەو گریانەی لەسەر حەمزەی مامی بوو، لاشەكەی مامی ڕوو لە قیبلەكەی دانا، پاشان لەسەری ڕاوەستاو بۆ ماوەیەكی زۆر گریا و هەنسكی قوڵی گریانەكەی ڕەنگی گۆڕیبوو وە پاشان فەرمووی: ((یا حمزة، یا عَم رسول الله، وأسد الله و أسد رسوله، یا حمزة یا فاعلِ الخیرات، یا حمزة یا كاشف الكربات، یا حمزة، یا ذابّاً عن وجه رسول الله...))[2] .

---

[1]- بنوارە بۆ (الأستیعاب) ٢٦٤/١..

[2]- بنوارە بۆ (المواهب اللدنیة)ی (القسطلاني ٢١٢/١.

# جیاوازی نی یه لەنێوان ژیان و مردن دا

ئەگەر یەکێ وتی: ئەم فریادڕەسی و سکاڵای حاڵ و داواکردنی شەفاعەت و یارمەتی‌یە لە پێغەمبەر ﷺ وە هەموو ئەو شتانەی لەم باسەدا هاتووە، دروست بووە و تایبەت بووە بە حاڵی ژیانی پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵام لەدوای وەفاتی ئەو کوفرەو بەشێکە لە بێباوەڕی، لەوەش دەچێ کەمێ نەرمی دەرببڕێ و بڵێ: ئەوە مەشروع نیە یان بڵێ دروست نی‌یە.

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: ئیستغاثە و تەوەسول ئەگەر دروست بێ داواکردنیان وەك دەڵێن لە زیندوو ئەوە پێغەمبەران زیندون لەناو گۆڕەکانیاندا، تەنانەت لە بەندە ڕاستەکانی خوا کە پەروەردگاریان لێیان ڕازی بووە و بە ئیمانەوە مردون زیندون لە گۆڕەکانیان...

خۆ گەر بۆ کەسێکی شارەزا و فەقیە هیچ بەڵگەیەك نەبێ لەسەر ڕاستێتی تەوەسول و ئیستغاثە بە پێغەمبەرەوە ﷺ لە دوای وەفاتی، مەگەر بە قیاس کردنی لەسەر دروستی تەوەسول پێکردنی لە کاتی ژیانیدا نەبێ ئەوە تەنها بەسە بۆی، چونکە ئەو پێغەمبەرە زیندووە لە هەردوو حاڵەتەکەدا چ ناو هاوەڵانی و چ پاش لە دونیا دەرچوونی، بەردەوام لە غەمی میللەت و ئومەتەکەیدایەتی، بە ئیزنی خوا فرمانی ئومەتەکەی بەڕێوە دەبات شارەزا و ئاگادارە بەو صەڵەواتانەی کە نوێژ خوێنانی ئومەتی لە کاتی تەحیاتی نوێژەکەیاندا بۆی دەنێرن، سەلامی هەموو یەکێکی ئومەتەکەی پێ دەگەیەنرێ.

گەر کەسێکی سادە زانستی فراوانی پەیدا بکات و بە فرمانە ڕۆحیەکان ئاشنا ببێ و کۆمەڵێ تایبەتمەندی لە خواوە پێ ببەخشرێ، ئەوە دڵیشی فراوان دەبێ بۆ وەرگرتنی ئیمان و بڕوایەکی زیاتر و پێ بەهرەمەند دەبێ.. ئەمە ڕۆحی کەسێکی سادەیە ئاوا بەرز دەبێتەوە..

ئەی ئەبێ گەورەی ڕۆحەکان کە هەڵگری نوری پێغەمبەرایەتیە چۆن بێ صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ؟...

دەمێنێتەوە سەر ئەوە کە بڵێین:

( ئەگەر داواکردنی شەفاعەت و تەوەسول و خاترانەی پێغەمبەری خوا ﷺ شیرك و کوفر بێ –وەك گومانیان وا بردووە– ئەوە بە هیچ شێوەیەك نەئەبوو دروست بووایە لە هیچ حاڵێکدا، نە لە کاتی ژیانی دونیایدا، نە لە ژیانی قیامەتیدا، لە ڕۆژی قیامەتی، نە لە پێش و نە لە پاشی لێپرسینەوەدا، چونکە شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان یان بێ بڕوا بوون لە هیچ حاڵێکدا دروست نیە، وە ئەم یاسایە بۆ هیچ کەسیش هەڵناوەشێتەوە ) .

## بانگەوازێکی بەتاڵ

بانگەشەی ئەوە دەکەن کە مردوو توانای هیچی نامێنێ، ئەوەیش بانگەوازێکی بەتاڵە، چونکە ئەم بۆچوونەیان بۆ ئەوە بێ کە مردوو ئەبێتەوە بە خۆڵ بۆیە توانای نامێنێ، ئەمە خودی نەزانینە بەو بەرنامەیەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، بەڵکو نەزانینی تەواوە بە قورئان و کەلامی خوا، چونکە خوای پەروەردگار جێگیری کردووە مانەوەی ڕۆحەکان بە زیندوویی لەدوای دەرچوونی لەلاشە، وە بانگ کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ کوژراوانی بێ بڕواو قورەیشیەکان لە ڕۆژی بەدرا کە فەرمووی: ((ئەی عەمری کوڕی هیشام، ئەی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، ئەی فولانی کوڕی فلان، ئەوەی خوا بەڵێنی بە ئێمە دا ئەوە پێی گەیشتین، ئەی ئێوە گەیشتن بەو وادانەی کە خواکەتان پێی دابوون؟)) عەرزیان کرد: چۆن ئەمە دەبێ قسە کردن لەگەڵ مردوواندا؟ فەرمووی: (ما أنتم بأسمع لما أقول

لهم) ئێوه لەوان باشتر گوێتان لێوه نییە، واتە ئەوان لە ئێوه باشتر ئەیبیستن.

وه لە جارێکی تردا و لەسەر گۆڕستانی موسوڵمانان دا وتەی فەرموو لەگەڵ مردووەکاندا و سەلامی لێ کردن و فەرمووی: (السلام علیکم یا أهل الدیار) .

هەر لەم بارەیەوە ئاینی ئیسلام بەڵگەی زۆری تیا هاتووە لەسەر سزا و ئازاری ناو گۆڕ و خۆشی و نیعمەتەکانیشی، وه هاتن و چوونی ڕۆحەکان لەنێوان خۆیاندا بە دەقە ئاینیەکان سەلماوە، هەروەك چۆن لە فەلسەفە دێرین و تازەکانیش جێگیر بووە و باس کراوە.

با بەکورتی لەم پرسیارە بدوێین:

ئایا ئەوانە لەو باوەڕەدان کە شەهیدەکانی ئیسلام زیندون و لە خزمەت پەروەردگاران هەروەك قورئان وای فەرمووە یان ئەو بڕوایەیان نییە؟

ئەگەر ئەم باوەڕەیان نییە، ئەوە وتەی ئێمە لەگەڵ ئەوانەدا نییە، چونکە لە ڕێوە قورئان بەدرۆ دەخەنەوە کە دەفەرموێ:

﴿وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبيلِ اللّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاء وَلَكِن لاَّ تَشْعُرُونَ﴾ البقرة: ١٥٤، وه ئایەتی: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ آل عمران: ١٦٩.

ئەگەر باوەڕیش بەم ئایەتانە جێگیرە، ئەوە پێیان دەڵێین:

سەرجەم پێغەمبەران و زۆرێك لە چاکانی موسوڵمانان کە شەهیدیش نین وەك گەورە صەحابەکان کە باشترن لە شەهیدەکان و پلەیان لەوان بەرزترە و بێ شك و گومان لای خوای گەورە ڕێزدارترن..

ئەگەر ژیان و زیندوویەتی بۆ شەهیدەکان جێگیرە، ئەوە بە ڕێگەی باشتر و لەپێشتر بۆ ئەوانی پێشتر باسمان کردن جێگیر تر دەبێ، کە ژیانی پێغەمبەران و زیندویەتیان بە فەرموودە ڕاستەکان جێگیر بووە و چەسپاوە.

ئەگەر بڵێین: جێگیر بوونی ژیانی ئەرواحەکان بە بەڵگەی دانپیانراو هاتووە، ئەوە هیچ شتێ ڕێگرمان ناکات کە ئەو ژیانە جێگیر بکەین بە جێگیر بوونی تایبەتمەندیەکانی ژیان بۆی.

وە هیچ ڕێگرێکی عەقلی نیە لەسەر ئیستغاثە و هاوار لە پێغەمبەری خوا و تکا پێکردنی بۆ خزمەتی خوای پەروەردگار، هەروەك چۆن پیاوێك داوای یارمەتی لە مەلائیکەیەك بکات بۆ جێبەجێ کردنی ئیشێکی، یان یارمەتیدانی پیاوێك بۆ پیاوێکی تر، (کە تۆ بە ڕۆح مرۆڤ بی نەك بە لاشە)...

وە هەڵسوڕانی ڕۆحەکانیش وەك هەڵسوکەوتی فریشتەکان وایە پێویستیان بە هەست کردن و ئامێرەکان نیە، وەك ئەو یاسا و ئامێرانەی کە لەو یاسا دونیایانەدا ئێمە هەستیان پێ دەکەین، کە ئەوە جیهان و ژیانی دونیایە وەك دەفەرموێ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي﴾ الأسراء: ٨٥. وە ئێوە چی تێئەگەن لە هەڵس و کەوتی فریشتەکان، یان هەڵسوکەوتی پەرییەکان لەم دونیایەدا؟

هیچ گومانی تیا نیە کە ڕۆحەکان ڕێگایان بۆ والا کراوە بە ئازادی هەڵسوکەوت و ڕۆشتن و هاتنیان هەیە و ئەتوانن بێن بە هانای ئەوەوە کە هاواریان لێ دەکات، وەك زیندووەکان چۆن بەرەو ڕووی یەکتری دەچن و بە هانای یەکتریەوە دێن ، ئەوانیش بەو شێوەن بگرە زیاتر و بەهێزتریشن لەوان دەتوانن.

ئەگەر ئەوانەی ئینکاری ئەم باسە دەکەن، تەنها دان بەو شتانەدا بنێن کە دەستی لێوە ئەدرێ یان لە (المحسوسات)ن، وە بەو شتانە تەنها باوەڕ دەکەن کە دەیبینن، ئەوە بڕوای ئەوانە کە خۆیان بە (طەبیعی) و سروشتی‌یەکان پێناسە کردووە نەك بە بڕوای موسوڵمانەکان.

ئێمە لەگەڵ ئەوەداین کە ڕۆحەکان دوای بەجێهێڵانی لاشەکان ناتوانن هیچ کردەوەیەك بکەن، بەڵام ئێمە بەو کەسانە دەڵێین: گریمان ئەوە وایە و ڕاستە، بەڵام بۆ ئێمە هەیە وەك دانپیانراوە کە ئەوە هیچ یارمەتیەکی پێغەمبەران و پیاوچاکانی تیا نی‌یە ، کە یارمەتی یەکتر بدەن لە ڕێگەی ڕۆحەکانەوە لەم دونیایەدا، بەڵکو یارمەتیان ئەدەین لە کاتێکدا کە دێن بۆ لامان و داواکاری دۆعای خێرمان لێ دەکەن، هەروەك پاڕانەوەی پیاوێکی چاك و صاڵح بۆی لە کاتێکدا کە ئەو کەسەی دۆعاکەی بۆ دەکرێ ئامادە نی‌یە واتە (ظهر الغیب)ە، کە ئەمە کەمترین پلەی پاڕانەوی برای موسوڵمانە بۆ یەکتری، وە ئەشزانین کە ئەو کەسە زیندووەو پێی ئەزانێ، کە لەو شعور و هەست پێکردنە و زانیاریەی گشتی تر دەبێ لەدوای بەجێهێڵانی ڕۆحەکاندا، لەبەر نەمانی پەردەی گڵی (حجاب الترابیة) وە لەبەر نەبوونی ئارەزووە مرۆڤیەکان).

هەروەك لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە کە کردەوەکانمان دەخرێتە بەردەستی ئەو سەردارەمان، کە چاکە و خێری تیا ببینێ سوپاسی خوای لەسەر دەکات، ئەگەر غەیری ئەوەی تیا ببینێ ئەوە داوای لێخۆشبوونمان بۆ دەکات [١] .

بۆ ئێمە هەیە کە بڵێین: ئەوەی هاواری لێ دەکەین و داواکاریەکانی پێشکەش دەکەین تەنها زاتی خوای پەروەردگارە، بەڵام داواکار داوا لە

---

[١]– ئەو فەرموودەمان لە زۆر شوێنی ئەم نوسراوەماندا هێناوە.

کەسێکی تر دەکات کە پێغەمبەرە ﷺ و ئەیکاتە وەسیلەیەك بۆ بەجێهێنانی ئیشەکانی، ئەوەی ئیشەکەمان بۆ جێبەجێ دەکات تەنها خوای پەروەردگارە، بەڵام داواکار ئەیەوێ داواکەی لە ڕێگەی یەکێکەوە پێشکەش بە خوا بکات کە لە نزیکانی خوا بێ و ڕێز لێگیراو بێ لەلای زاتی خوا، وەك ئەوە وایە بڵێ: (من لە خۆشەویستانی ئەوم، لەبەرئەو ڕەحمم پێ بکە) خوای پەروەردگار زۆرێکی لە ڕەحمی خۆی ڕژاندووە بەهۆی حەزرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ یان بەهۆی پێغەمبەران و دۆستانی و ئەولیاو زانایانەوە..

به کورتی:

ڕێزگرتنی پەروەردگار بۆ کەسانێ کە خۆشەویستی پێغەمبەرن ﷺ لەبەر خاتری پێغەمبەرەکەی یا بگرە ڕێزی کەسانێ دەگرێ و بەرزیان دەکاتەوە لەبەر کەسانی تر کە فرمان بە چاکە دەکەن و شاراوە نیە.

ئەوانەی نوێژ دەکەن لەسەر جەنازەیەك و داوا لە خوا دەکەن کە لێی خۆش ببێ و لە سزاکان بیپارێزێ کە لە پاڕانەوەکەیاندا ئەڵێن:

(هاتووین ئەی خوایە تکا دەکەین کە لێی خۆش ببی و بیبەخشی بەم نوێژەی ئێمە کە دەیکەین)

## داواکردنی شتێك کە لە توانای خوادایە
## ئایا ئەبێتە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان؟

یەکێکی تر لەو بانگەشانەی کە دەیکەن و ئەڵێن: ( خەڵکی داوا لە پێغەمبەران و پیاو چاکانێك دەکەن کە مردوون و دەسەڵاتیان نیە، وە داوای شتێکیان لێ دەکەن کە تەنها بە خوا دەکرێ، کە ئەم داوایە شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە ) .

وەڵامی ئەوانە بەم شێوەیەیە:

ئەمەش یەکێکی ترە لەو خراپ تێگەیشتنەی کە خەڵکی لە سەردەمانی کۆن و نوێ لەسەری دەڕۆن، خەڵکی کە داوا دەکەن داواکەیان تکاکارییە بۆ جێبەجێ کردنی ئیشەکەیان لەلای خوای گەورە، تا خوای پەروەردگار کار و پێویستیەکانیان بۆ بەدیبهێنێت بەهۆی تکا و شەفاعەت و پاڕانەوەی ئەوانەوە، هەروەك چۆن کابرای کوێر و غەیری ئەویش هاتن و هاوار و تکایان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و کردیانە تکاکار بۆ خزمەت خوای گەورە، وە پێغەمبەریش ﷺ هات بەدەم ئیشەکەیانەوەو نیاز و مەبەستەکانی بۆ جێبەجێ کردن و خوای پەروەردگاریش بەهۆی شەفاعەت و تکای پێغەمبەرەوە چاوی کابرای چاك کردەوە و فرمانەکانی بۆ ئەوانی تر هێنایە پێشەوە، وە پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو بە کەسیان: وام لێ داوا مەکەن ئەوە گوناهە یان شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە.

بەم شێوەیە هەر شتێ داوا بکرێ کە لە سنوری پێناسەی کارە دەرئاساکان (خارق العادە) بێ وەك شیفای نەخۆشییەك بەبێ دەرمان، باران هاتنە خوارەوە لە ئاسمان لە کاتی پێویستی دا و بەبێ هەور، هەڵقوڵانی ئاو لەنێوان پەنجەکانەوە، زۆرکردنی و بەرەکەت خستنە خواردن، وە غەیری ئەمانە ناچنە ژێر توانای مرۆڤێکەوە بە عادەتی مرۆڤایەتی، کە ئەمانەیان داواکردووە لە پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: ئێوە بەم داوایەتان هاوەڵتان بۆ خوا بڕیار داوە بڕۆن ئیسلامەکەتان تازە بکەنەوە، یان ئێوە داوا لە من لە شتێك دەکەن کە کەس توانای لەسەر جێبەجێ کردنی نییە مەگەر زاتی خوا نەبێ.

ئایا ئەم جۆرە کەسانەی کە بانگەشەی یەکتاپەرستی دەکەن و خەڵکی لە دائیرەی ئیسلام دەردەکەن زاناتر بوون بە شەرعی خوا لە پێغەمبەرو هاوەڵانی؟ کە ئەمە نەزانێکیش ئەو بۆچوونەی نابێ نەك زاناکانیان...

قورئانی پیرۆز چیرۆکی پێغەمبەری خوا سلیمان -علیه السلام-مان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن لە دانیشتنەکەیدا کە جینی و مرۆڤی تیا بوو فەرمووی پێیان:

﴿يَا أَيُّهَا المَلَأُ أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ﴾ النمل: ٣٨. داوایان لێ دەکات کامیان ئەو عەرشە گەورە بەهێزەی کە لە یەمەنەوە بۆی ئامادە دەکات کە ئەمان خۆیان لە (شام) بوون، لەسەر شێوەیەك کە (خارق العادة)یە تا ببێتە بەڵگەیەك لەسەر سولەیمان بۆ بڕوا هێنانی خاوەنی عەرشەکە کە بەلقیسە.

یەکێ لە جینییەکان کە (عفریت) بوو وتی: ﴿أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ﴾ النمل ٣٩، من بۆت ئامادە دەکەم پێش ئەوەی تۆ لەم دانیشتنەت هەڵسیت، واتە لە چەند کاتژمێرێکی کەمدا، حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: لەوە پەلەتر ئەمەوێ، یەکێك لەویا کە ئامادە بوو زانستی (کیتاب)ی دەزانی، یەکێ بوو لە ڕاستگۆیان (الصدیقین) و لە مرۆڤەکان بوو، وتی: ﴿أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾النمل: ٤٠. واتە من بۆت ئامادە دەکەم پێش ئەوەی پێڵوی چاوەکانت بەرز بکەیتەوە (واتە لە چاو تروکانێکدا)، فەرمووی: منیش ئەوەم ئەوێ کە چاوی داخست و بەرزی کردەوە عەرشەکە لەبەردەمیدا ئامادە بوو ، هێنان و ئامادە کردنی عەرشێك بەم شێوەیە لە توانای کەسدا نییە مەگەر زاتی خوا نەبێ، بە عادەت ناچێتە ژێر توانای نە مرۆڤ ونە جینییەکانەوە. وە حەزرەتی سولەیمان داوا دەکات لە کەسانی دانیشتنەکەی کە بەو شێوە بۆی بهێنن،

ئـەو پیـاوە ڕاسـتگۆیە دەڵـێ: بـەو شـێوە بـۆت ئامـادە دەکـەم ئایـا ئـەم پێغەمبـەری خـوا-سولەیمان بـەم داوایـەی کـافر بـوو وە شـەریکی بـۆ خـوا بڕیاردا ؟ وە ئەو پیاوەش هاوەڵی بۆ خوا بڕیاردا ؟ کە بە یەکێ لـە ئـەولیای خـوا دادەنـرێ؟ حاشـا بـۆ هـەردووکیان، کـە ئەمـە ئیسـنادی کردەوەیـە لـە هـەردوو قسـەکەدا لەسـەر ڕێگـەی مـەجازی عـەقڵی کـە ئەمـە لای زانایـان شتێکی بڵاوەو لە دەقە ئاینییەکاندا سەلمێنراوە.

لابردنـی پـەردە لەسـەر شـتە نادیارەکـان (ئەگـەر نادیـار بـن) ئەوەیـە کـە خەڵکی داواکاری شەفاعەت دەکەن لەوانەوە بۆ خزمەت خوا، کە ئەو پلەیە خوا بەوانی بەخشیوە و ئەو تاوان و بەهرەیەی پێ خەڵات کردوون.

یەکێك دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا، شیفام بدە، قەرزەکانم لەسەر سووك بکە، مەبەست پێی: تکام بۆ بکە لە خزمەت خوادا تا خوا شیفام بدات، یان قەرزاریم لەسەر نەمێنێ یان سوك ببێ، وە ڕوو بکە خوا بـۆ مـن تـا خـوا ئـەو ئیشـانەم بـە چـاك بـۆ بهێنێتـە پـێش، ئـەوان داوا لـە شـتێك دەکـەن، وە پێغەمبەرەکـەش شـتێك جێبـەجێ دەکـات کـە خـوا ئیزنـی داوە و توانـای داوەتێ لەسەر جێبەجێ کردنی.

ئەمە ئەو شتەیە کە ئێمە باوەڕمان پێیەتی، کە ئەمە ئیسنادی کردەوەیە کـە خـەڵکی ئەیدەنـە پاڵیـان لـە مـەجازی عەقڵیـە، وەك خـوا لـە قورئانـدا دەفەرموێ: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾ یس:٣٦ یان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: ((إنَّ مِمَّا ينبتُ الربيعُ ما يقتُلُ حَبْطاً أو يَلم)) .

کە ئەمانە مەجازی عەقڵین ئەینا بەهار گیا ناڕوێنـێ و زەوی خـۆی خـۆی سەوز ناکات و بەرهەم فرێ نادات.

که ئەم جۆرە بەکارهێنانە لە وتەکانی پێغەمبەرو خاص و عام و خەڵکی زۆردا دەبینرێ، وە هیچ شتێکیشی لەسەر نیە، کە وتنی ئەو جۆرە وتانە لەلایەن کەسانی موسوڵمان و یەکتاپەرستەوە قەرینەیەکە لەسەر مەبەستەکەیان، هیچ بێ ئەدەبیەکی تیا نیە، کە پشت بە خوا بە شتێکی تەواو لەم کتێبەمان تایبەت کردووە بەو باسەوە..

## داوا لە خودا بکە و پشت بە خوا ببەستە

## (إذا سألت فسألِ الله وإذا استعنت فاستعن بالله)[1]

ئەم فەرموودەیە لەسەر تێگەیشتنەکەی زۆر کەس کەوتوونەتە هەڵەوە تیایدا، کە ئەیکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە کە داواکردن نیە، کۆمەك و یارمەتی وەرگرتن نیە بەڕەهایی بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان تەنها لە زاتی خوا نەبێ...وە پرسیار و یارمەتی وەرگرتن و پشت بەستن لە کەسانی غەیری خوا بە موشریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەر و دەرچوو لە میللەتی ئیسلام لە قەڵەم دەدەن، کە بەمەیان وەرگرتنی هۆکار و ئامڕازەکان و یارمەتیدان و پشت بەستن بە یەکتری نەفی دەکەن و زۆر لە دەقە پیرۆزەکان بەتاڵ دەکەنەوە کە لەم بارەوە هاتوون.

لە ڕاستیدا: مەبەست ئەوە نیە کە نەهی بکات لە پرسیار و داوا و پشت بەستن لە غەیری خوا هەروەك لە ڕوکەشی دەربڕینەکەدا دیارە...

بەڵکو مەبەست پێی:

---

[1]- ئەمە بەشێکە لەو فەرموودەیە کە ابن عباس هێناویەتی و ئیمامی ترمذی ڕیوایەتی کردووە.

نەهی کردنە لەو غەفلەتەی: کە هەر خێرێك لە هۆکارەکانەوە بەدەستت گەیشتن لەلایەن خواوەیە، فرمانە بە ئاگادار کردنەوەمان کە هەر نیعمەتێك لە دەستی مەخلوقاتی خواوە بەدەستمان ئەگات ئەوە لە خواوەیەو بە خواوەیە..

کەواتە ماناکەی بەم شێوەی لێ دێ:

(ئەگەر ویستت یارمەتی لە یەکێك لە بەدیهێنراوەکانی خودا وەربگریت، کە ئەمەش کارێکی ئاسایی و شیاوە بۆ هەمووان، دەبێت پشت و پەنای راستەقینەت هەر خودای تاك و تەنها بێت، هۆکارەکان پەردەیەکی تاریك نەکێشن بەسەر بینایتدا بۆ نەبینینی خاوەنی هەموو هۆکار و ئامرازەکان (جل جلالە)، وە لەو کەسانە نەبیت کە تەنها رووکەشی دەرەوەی پەیوەندییەکانی نێوان بابەتەکان دەبینن و کاری لەسەر دەکەن، ئەوان لە بەدیهێنەری هەموو هۆکارەکان و بەستنی پەیوەندییەکانی نێوانیان بێ ئاگان و دەرکی پێ ناکەن).

کە ئەم فەرموودەیە بۆ خۆی مانای ئەوە ئەسەلمێنێ کە لە دوای ئەوەدا ئەفەرموێ: ((واعلم أنَّ الأمَةَ لَوِاجتَمعَتْ على أن ينفَعُوكَ بِشَيءٍ لم ينفعُوك إلاّ بشيءٍ قد كَتَبَهُ اللهُ لَك، وإن اجتمعت على ان يضرُوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَضرُوكَ إلا بِشيءٍ قد كتَبَهُ الله عليك)) ، واتە: بزانە گەر خەڵکی هەموو کۆببنەوە تا سودێکت پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر ئەو سوودە کە خوا بۆتی نوسیوە، وە ئەگەر کۆببنەوە تا زیانێکت پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر ئەو شتانە نەبێ کە خوا لەسەرتی نوسیوە) .

بەم فەرموودەیە بۆیان سەلما کە هیچ بەندەیەك سود یان زیان ناکات بەوە نەبێ کە خوا بۆی نوسیبێ ئا بەمە پێغەمبەر ﷺ مەبەستەکەی روون دەکاتەوە، چۆن نکوڵی لە یارمەتیدانی یەکتری بکەین، لە کاتێکدا کە لە زۆر

شـوێنی قورئـان و فـەرموودەدا فرمانمـان پێکـراوە پـێ ی.. ئـەوەتا خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: ﴿وَاسْتَعِينُواْ بِالصَّبْرِ وَالصَّلاَةِ﴾ البقـرة: ٤٥، یـان ئەفەرموێ: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ﴾ الأنفال: ٦٠، یان قورئان باسـی بەندەیـەکی چـاکی خـۆی دەکـات –ذي القـرنين– کـە دەفـەرموێ: ﴿فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ﴾ الکهف: ٩٥، یان لە کاتێکدا نوێژی ترس واجب دەبێ بە قورئان و سوننەت باس لەوە دەکات هەندێکیان پشت دەبەستن بە هەندێکی تریان تا نوێژەکە دەکەن، یان خوا فرمانمان پێ دەکات کە حەزەری خۆمان لە دوژمنەکانمان وەربگرین.

یان دەبینین کە چۆن حەزرەت ﷺ هانی ئیمانداران دەدات تا بچن بەدەم هەژارانەوە و پێویستیەکانیان بۆ جێبەجێ بکەن، فرمانی قورس لەسەریان سوك بکەن و نارەحەتییان لا ببەن بەپێی توانا، وە ئەمانترسێنێ بەو سزایانەی کە لە پشتگوێ خستنی ئەو فرمانانەوە بەدەست دەکەون، کە نموونەی ئەوە لە فەرموودەکانا زۆرن، بۆ نموونە: پێشەوایان بخاری و مسلم ڕیوایەتیان کردووە کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: ((من کان في حاجة أخیه، کان الله في حاجته)) ئەوەی بچێت بە دەم پێداویستی براکەیەوە، خوای گەورەش دەچێت بەدەم پێویستیەکانیەوە.

وە ڕیوایەتیان کردووە هەریەك لە (مسلم، وە ابو داود و غەیری ئەوان) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (واللهُ في عَوْنِ العبدِ ما کانَ العبدُ في عونِ أخیهِ) وە (الطبراني) ڕیوایەتی کردووە کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی:
((إنَّ اللهِ خلقاً خلقهُمْ لِحَوائِجِ الناس یَفزَعُ الناسُ إلیهِمْ في حوائِجِهم اولئك الآمنُونَ من عذابِ الله)).

واتـه: خـوای پـەروەردگار کۆمـەڵێ عەبـدی خـۆی هەیـە خـەلقی کـردوون بـۆ جێبـەجێ کردنـی پێویـستیەکانی خـەڵکی، خـەڵکی ڕوویـان تـێ دەکـەن لـە ئیشەکانیاندا، ئەوانە ئەمینن لە سزای خوا...

بنوارە بۆ ئەو وتەیە کە دەفەرموێ (خەڵکی ڕوویان تێ دەکەن) نەیگێڕاون بە موشریك و گوناهبار...

وە الطبراني دووبارە ڕیوایەتی کردووە و بەرزی کردووەتەوە بۆ پێغەمبـەر کـە فەرموویـەتی: ((إنَّ للهِ عنـدِ أقـوامٍ نِعَمـاً أقرهـا عنـدَهم مـا كـانوا في حـوائجِ المسلمين ما لَم يُمَلِوُهُمْ، فإذا مَلّوُهم نقلها الى غيرهم))

وە هـەر طبرانـی و ئین ئەبی دونیـا ڕیوایـەتیان کـردووە کـە حـەزرەت ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ للهِ أقواماً اختَصَهُمْ بالنّعم لَمنـافعِ العبـاد، يَقرُهُمْ فيهـا مـا بذلوُها، فاذا منعوُها نزعها مِنهم فحَوّلَها الى غيرهم)).

لێـــرەدا (حـــافظ المنـــذري) دەڵـــێ: ئەگـــەر بوترێـــت ئـــەم فەرموودەیـــە ئیسنادەکەی چاکە دروست دەبوو.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(لَأنِ يَمشي أحدُكم مَعَ أخيهِ في قضاءِ حاجته –وأشارَ بأصنعِهِ– افضل مِنْ أن يعتكِفَ في مسجدي هنا شَهرين)[1] .

واتـە: (گـەر لەگـەڵ برایـەکی موسـوڵمانتدا بـڕۆی بـۆ جێبـەجێ کردنـی پێویستیەکی، ئـەوا باشـترە بـۆت کـە بەنیـەتی ئیعتیکـاف لـەم مزگەوتـەی مندا بمێنیتەوە دوو مانگ).

---

[1]– ئیمامی حاکم ڕیوایـەتی کـردووە و ئـەڵێ: ئەسـنادی تـەواوە وە لـە (الترغیـب)دا بـەو شێوە هاتووە ٣/٢٧٢.

# که داوات کرد تەنها لە خوا داوا بکە

## ( و إذا سألت فسألِ الله )

وە ئـەم فەرموودەیـەی کـە فـەرمووی: (وإذا سـألت فسـألِ الله) هـیچ بەڵگەیەکی تیا نیـیە لەسەر نـەبوونی تەوەسـول و پرسیار کردن، کـە زۆر هەن لە ڕووکەشی وتەکەوە پرسیار لە غەیری خوا بە شێوەیەکی ڕەهایی قەدەغـە دەکـەن، یـان تەوەسـول بـە خـراپ دادەنـێن، ئەوانـە ڕێگـەیان وون کـردووە، وە نەفسـی خۆیـان تێکـەڵ بە دونیـا کـردووە، چـونکە هـەر کـەس پێغەمبـەران و پیاوچاکان بگێڕێ بە وەسیلەو تکاکاری بۆ خزمـەت خـوای پـەروەردگار، تـا خێـری لـە خـواوە بـۆ بێـت، یـان شـەڕ و خراپـەی لێ دوور بکەوێتەوە کە داواکەی تەنها لـە خـوا کـردووە و تـەنها هەڵساوە بە گرتنـی سـەبەب و هۆکارێـك کـە خـوای پـەروەردگار ڕێگـەی پێـداوە کـە بەنـدەکانی خۆی بۆ جێبەجێ کردنی ئیشەکانیان بیگرنە بەر، هەر کەس ئەو سەبەب و هۆکارانـە بگـرێ کە خـوا فرمـانی پـێ کـردووە، ئـەوە داوای و پرسیاری لـە سـەبەب و هۆکارەکـە نیـیـە، بـەڵکو داوای لـەو کەسـەیە کـە سـەبەب و هۆکارەکەی داناوە..

وتەی ئەو کەسەی کە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمەوێ چاوەکانم بـۆ بگەڕێنیتەوە، یان فلانە بەلاّم لەسەر هەڵبگری، یان نەخۆشیەکەم نـەمێنێ، مانـای ئەمـە وایـە کـە داوا لـە خـوا دەکـات بـە واسـیتەی شـەفاعەتی پێغەمبـەرەوە ﷺ کـە ئەمـە وەك ئـەو وتەیەیـە کە دەڵـێ: بپـاڕێرەوە بـۆم بـۆ فلانە شت، یان شەفاعەت و تکام بۆ بکە لە فلانە ئیشما، کە هیچ جیاوازی یـەك لـەنێوان ئـەم دوو حاڵەتـەدا نیـیـە، وە لـە نموونـەی ئەمانەیـە کـە بـە ڕوونترت بووترێ، خوایە داوات لێ دەکەم بە خاتری پێغەمبەرەکەت کە فلانـە ئیشم بۆ ئاسان بکەیت، یان فلانە سودم پێ بگات، یـان خراپەیـەکم لێ دوور

بکەوێتەوە... کە لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا ئەو کەسە تەنها داوای لە خوا کردووە.

لێرەوە ئەو زانیاریەمان پەیدا کرد: کە ئەگەر لە فەرموودەکەوە (إذا سألت فَاسأل اللهِ) وا تێگەشتبێ کە مەنعی تەوەسولی تیا بێ ئەوە ، تێگەیشتنێکی زۆر هەڵەیە و خاوەنەکەشی بەهەڵەدا چووە یان بە هەڵەدا براوە.

ئەوەندە بەس بێ بۆ ڕوون کردنەوەی ئەوهەڵەیە بڵێین:

(ئەم فەرموودەیە خۆی وەڵامێکە بۆ ئیبنو عەباس کە بە ئاواتەوە بوو پرسیاری لێ بکات کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (یا غُلام اَلا اُعلمك کلمات ینفعك اللهُ بهن) ئەی منداڵەکە ئایا چەند وتەیەکت فێر بکەم کە خوا بەهۆیەوە سوودت پێ بگەیەنێ، عەرزی کرد بەڵێ، حەزرەتیش ﷺ لە وەڵامی ئەوەدا ئەم فەرموودە جوانەی فەرموو:

ئەگەر لەسەر ئەو وەهم و هەڵەیە بڕۆن کە پرسیار کردن لە غەیری خوا نەهی لێ کرابێ، ئەوە دروست نەبوو کەسێکی نەزان پرسیار لە زانایەك بکات، وە کەسێ کە لێی قەوماوە دروست نەبوو هاوار بۆ کەس ببا تا فریای بکەون و لە مردن ڕزگاری بکەن، وە کەسێکی قەرزدار کە خاوەن ماڵەکان هاتوون و داوای ماڵەکەیان لە کەسێکی تر بکات تا بە قەرز پارەیەکی تر وەربگرێ، وە نە ئەبوو دروست بێ لە ڕۆژی قیامەتدا خەڵکی هاوار و پرسیاریان بۆ لای پێغەمبەران ببەن تا شەفاعەتیان بۆ بکەن، وە ئەبوایە دروست نەبوایە کە پێغەمبەر عیسی بفەرموێ بڕۆن پرسیار و داواتان لە گەورەی پێغەمبەران حەزرەتی محمد ﷺ بکەن.. کە ئەو وەهمەی ئەوانە باسی دەکەن گشتی یەو هیچ شتێکی لێ دەرناچێ نە دونیایی و نەقیامەتی، لەوەی کە یادمان خستنەوە و لەوانەش کە یاداشت نەکراون.

خۆ ئەگەر وتیان: ئەم قەدەغە کردنە بۆ ئەو پرسیار و داوایەیە کە لە پێغەمبەران و پیاوچاکان دەکرێ لە گۆڕەکانیاندا چونکە ئەوانە توانایان نەماوە، ئەوە لە پێشتر وەڵامی ڕوونی ئەمەمان داوەتەوە، بەڵام بە کورتی دەڵێین:

(ئەوانە زیندون و گوێبیستییان هەیە، توانایان هەیە لەسەر شەفاعەت کردن و دۆعا خوێندن، وە ژیانیان بە شێوەی ژیانی بەرزەخی یە کە بگونجێ بەو پایەو پلەیان کە خوا پێی داون، وە ئەوەی کە ئینکاری ئەمە دەکات کە زۆر نەزان و جاهیلە بەو هەموو فەرمووده متەواترانە کە لە سوننەتدا هاتوون، کە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە مردوی موسوڵمانان لە ژیانی بەرزەخیاندا ئاگادارن و توانایان هەیە لەسەر دۆعاو پاڕانەوە و گوێ لێوە بوون، ئەمە حاڵی موسوڵمانێکی سادەبێ ئەی گومان بەرانبەر گەورەیانمان لە پێغەمبەران و پیاوچاکانمان لە بەرزەخدا ئەبێ چۆن بێ؟!

وە لە فەرموودەی ئیسرا و میعراجدا کە زۆر ڕوون و ئاشکرایە تیایدا کە پلەی –صحیح–ی وەرگرتووە کە چۆن پێغەمبەران (علیهم السلام) لە خزمەتی پێغەمبەری ئاخرزەماندا بوون، نوێژیان لە پشتەوە کرد و وتەیان لەنێوان دوو دەستەیدا فەرموو، وە پاڕانەوە بۆی لە ئاسمانەکاندا، تەنانەت بە وتوێژی نێوان پێغەمبەران نوێژی ئەم ئومەتە لە پەنجا نوێژەوە کرا بە پێنج نوێژ لە شەو و ڕۆژێکدا کە ئەوترێت ئەو ئاسانکاریە بە شەفاعەتی پێغەمبەر بوو لە خزمەت خوادا و بە ئاماژەی کەلیموالله پێغەمبەر موسی کوڕی عیمران بووە.

کەواتە لێرەوە تێگەیشتین کە مەبەست لە فەرموودەکە ئەوە نیە کە گومانی لەسەر براوە، ئەوە خراپەو دژی فەرموودەکەیە، بەڵکو مەبەست پێی هاندانی خەڵکی یە کە بەدەم کێشەی یەکتریەوە بن و داوای

یارمەتی لە یەکتری بکەن، وە هانمان ئەدا بەوە کە قەناعەتمان ببێ بەو کردارانە کە خوا بۆمان ئاسان بکات با کەمیش بێ، ئەوەی کە بە دەستی خەڵکییەوە پێمان دەگات خوا ناردوویەتی و ئەوانە تەنها هۆکارن، وە فێرمان دەکات کە داوای شتێ نەکەین کە موڵکی خەڵکی یەو هی ئێمە نییە، داوامان لە خوا بێ کە فەزڵ و کەرەمی خۆیمان بەسەردا برژێنێ، چونکە خوای گەورە ئەوانەی زۆر خۆش دەوێ کە زۆر ئەپاڕێنەوە لە خوا، کە خەڵکی بە پێچەوانەی ئەم حاڵەتەن، وەك شاعیر دەڵێ:

اللهُ يَغْضَبُ إِنْ تَرَكتَ سُؤَالَهُ　　　وَبُنَيُّ آدَم حِينَ يُسْأَلُ يَغْضَبُ

واتە: خوای پەروەردگار لە کاتێکدا ببینێ بەندەکەی داوای لێ ناکات تووڕە دەبێ بەڵام بەندەکانی کاتێ کەسانی تر داوای لێ دەکەن تووڕە دەبن...

بەو مانایە دێ، تۆ هەر کاتێ لە دەستی کەسێکدا ماڵێکت یان پارەیەکت بینی بێ گومان پێت خۆشەو داوای دەکەیت بۆ نەفسی خۆت، داوای لێ ناکەیت و دەگەڕێیتەوە بۆ لای خوا و خۆت بێ نیاز دەکەیت لەوەی لە دەستی خەڵکیدایە و تەنها پرسیار و داوا لە فەزڵ و کەرەمی خوا دەکەیت.
فەرموودەکە ڕێگەمان نیشان ئەدات بۆ بوونی قەناعەت لە ژیاندا، بۆ پاکێتی نەفسمان لە تەماع، ئەمە لە کوێ و داواکاری لە پێغەمبەران و پیاوچاکانەوە یان داوا لە شەفاعەتی پێغەمبەران لە کوێ؟ لە کاتێکدا کە خوا خۆی ئیزنی پێغەمبەران و پیاوچاکانی داوە کە تکایان وەربگیرێ و کردونی بە باشترین و بەهێزترین هۆکار و سەبەب بۆ ئاسان کردنی ئیشی بەندەکانی، بەڵام مرۆڤ هەر کاتێ سواری کەشتی هەواو ئارەزووەکان بوو، لە وەهم و خەیاڵەکانی دا نوقم دەبێ و کاتێ دێتە دەر لە کەشتیەکی جاهل و نەزان و لەسەر ڕێگەی کات بەفیڕۆدەران و نەفاماندا خۆی دەبینێتەوە..

## فەرموودەی (إنَّهُ لا يُسْتغاثُ بي )

## کۆمەك و فریادڕەسی لە من ناکرێ

لـە فەرموودەکـەدا هـاتووە کـە لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ دووڕو و منافقەکان ئەزیەتی موسوڵمانانیان ئەدا، ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی بەوانەی لە چواردەوری بوون کە ئەزیەتیان لە دووڕووەکان دیبوو: ( قومُوا بنا لِنَستغيثَ بِرَسولِ اللهِ ﷺ من هذا المنافق ) هەڵسن با بچین ئیستغاثە و یارمەتی لە پێغەمبەر وەربگرین لە دژی ئەم دووڕووە.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: ( إنهُ لا يُسْتغاثُ بي، إنّما يُستغاثُ بالله )[1] ،

کە ئەم فەرموودە کراوەتە بەڵگە بۆ نەهی کردن لە داوای یارمەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەم بەڵگەیە لە بناغەوە بەتاڵە، چونکە ئەگەر لەسەر ڕوکەشەکەشی بڕوین، دەبینین مەبەست پێی نەهی کردنی کۆمەك و فریاکەوتن بە شێوەیەکی ڕەها لە پێغەمبەری خودا ﷺ کە ئەمە ڕووی دەرەوەی وتەکەیە، کە ئەم تێگەیشتنە بەتاڵە بە کردەوەی هاوڕێیان کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کردوویانە، کە ئەو هاوەڵانە ئیستغاثەشیان بە خزمەتی کردووە و داوای بارانیان کردووە و داوای پاڕانەوەشیان لە خزمەتیدا کردووە، کە ئەویش ﷺ هاتووە بە پیریانەوەو بە ڕوو خۆشی و دڵ خۆشیەوە وەڵامی داونەتەوە..

کەواتە دەبێ تەئویلێك بۆ ئەم فەرموودە بکەین کە لەگەڵ گشتی فەرموودەکاندا بگونجێ و لەگەڵ فەرموودە و دەقەکاندا ناکۆك نەبێ..

دەڵێین: مەبەست لەم فەرموودەیە ئەمەیە:

---

[1]- طبرانی ڕیوایەتی کردووە لە (الكبير)، وە لە (مجمع الزوائد)دا لە ١٥٩/١٠ دا دەڵێ: پیاوەکانی لە پلەی (صحيح)دان وە عبدالله ی کوڕی لوهەیعەی تیایە..

جێگیر کردنی هەقیقەتی یەکتاپەرستی کە بناغەی بیروباوەڕە، کە بزانن یارمەتی دەری هەقیقی خوای گەورەیە، بەندە تەنها ناوەندێکە بۆ ئەو بڕوایە، یان حەزرەت ویستویەتی فێریان بکات کە داوای شتێك لە بەندەیەکی خوا ناکرێ کە لە توانایدا نەبێ جێبەجێی بکات، وەك بردنەوەی بەهەشت یان ڕزگار بوون لە دۆزەخ، هیدایەتی یەکجاری کە ئیتر پارێزراو بێ لە تاوان و گومڕایی و سەرکەشی یان گرنتی بداتێ کە لە سەرەمەرگدا سەرفراز دەبێ..

فەرموودەکە بەڵگەی ئەوەی تیا نییە کە تایبەتمەندی ئەو کۆمەك کردن و هاوار بۆ کردنە لە زیندووەوە و لە مردوو دروست نەبێ، بەڵکو ڕووکەشی وتەکە قەدەغە کردنێتی بە شێوەیەکی ڕەها لە غەیری خوا، بێ جیاوازی خستن لەنێوان زیندوان و مردوان، کە ئەمەش هیچ مەبەستێکی ڕوون کردنەوەکەی تیادا نییە وەك لەپێشتر وتمان.

وە (ابن تيمية) لە (الفتاوى) دا لەم مانایەدا دەڵێ: ( ڕێ دەکەوێ لە وتەکانی خواو پێغەمبەرەکەیدا ووتەیەك هەبێ کە مانایەکی تەواوی هەبێ، بەڵام هەندێ لە خەڵکی غەیری ئەو مەبەستەی خواو پێغەمبەری خوا لێی تێبگەن، کە ئەمە ئەدرێتەوە بە ڕووی تێگەیشتنەکەی خۆیاندا، وەك (الطبراني ) ڕیوایەتی کردووە لە (معجم الكبير) : کە لە سەردەمی پێغەمبەردا دوو ڕووەکان ئەزیەتی موسوڵمانانیان ئەدا، ئەبو بەکر وتی: با بچین هاوارمان بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ببەین لەم دووڕووە، پێغەمبەریش فەرمووی: (تەنها هاوار بۆ لای خوا ببەن..)

کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ دووەمەکەیانە، کە داوای شتێك مەکەن کە تەنها جێبەجێ کردنەکەی لە توانای خوادا بێ، خۆ گەر وا نەبێ چۆن هاوەڵان داوایان دەکرد کە دۆعایان بۆ بکات یان بە هۆیەوە بارانیان داوا

دەکرد هەروەك لە ( صحيح البخاری ) دا هاتووە کە (ابن عمر) دەڵێ: بیرم کەوتەوە کە یەکێك لە شاعیرەکان شیعریان لە مەدحی پێغەمبەردا ئەوت و منیش سەیری ناوچەوانی پێغەمبەرم دەکرد لەو کاتەدا کە بە دۆعای پێغەمبەر ﷺ بارانمان بۆ هات و هەتا لە (میزاب) واتە ئاوە چۆڕەی کەعبەی پیرۆزەوە ئاو ئەهاتە خوار، لەو کاتەدا شاعیر ئەیوت:

وأبيضَ يُسْتَسقى الغَمامُ بِوَجْهِهِ.... ثِمالُ اليَتامى عِصْمَةٌ لِلأرامِلِ

واتە بەهۆی ڕووی ئەو پێغەمبەرەوە ﷺ هەور هات و بارانمان بۆ هاتە خوا کە ئەو پێغەمبەرە فریادڕەسی هەتیوەکان و پارێزەری هەژارەکانە.

## چەند زاراوەیەکی بەکارهاتوو کە لەم بابەتەدا هاتووە:

چەند جۆرە زاراوە و دەربڕینێك لە کاتی ستایش کردنی پێغەمبەری خوا ﷺدا بەکاردەهێنرێت، کە بە هۆیانەوە جۆرە تێکەڵیەکی وشەیی لەلای هەندێ کەس دروست دەبێ، کە بە هۆی ئەمانەوە یاسای کافر بوون ئەدەن بەسەر ئەو کەسەدا کە ئەو وتەیەی وتووە ، نموونەی ئەو وتانە کە دەوترێت:

((ئێمە هیچ پشت و پەنایەکمان نی‌یە جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ))

((ڕجا و تکامان تەنها بۆ لای پێغەمبەرە ﷺ ..))

((لە کاتی ناڕەحەتیەکەمدا تەنها مەگەر پێغەمبەری خوا بێتە فریامەوە..))

((ئەگەر بوەستم لە کێ پرسیار بکەم...))

کە مەبەستیان لەم جۆرە بەکارهێنانە، کە دەڵێن پشت و پەنا واتە لەناو خەلقانی خوادا، ڕجاو تکا لەناو بەندەکانی خوادا، لە ناڕەحەتیەکەمدا تەنها ڕێزدار بێ و تکام بۆ بکات لە خزمەت خوادا شەفاعەتی پێغەمبەرە ﷺ، گەر بوەستم لە کێ پرسیار بکەم واتە لە بەندانی خوا..

لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە لە کاتی پاڕانەوە و وەسیلەکانماندا ئەو جۆرە وتانە بەکار ناهێنین، وە بە کەسیش ناڵێین بەکاری بهێنێ، تا وەهم و گومان لەلای کەس دروست نەکات و دوور بکەوێتەوە لەو جۆرە وتانەی کە جیاوازی لەنێوان موسوڵماناندا دروست بکات، وە پابەند بین بەو دەقە ڕوون و ئاشکرایانەوە کە ناکۆکی لەسەر نی یە. بەڵام ئێمە وا دەبینینەوە کە فرمان دەرکردن بەبێ بڕوابوونی ئەو کەسانەی ئەو وتانە بەکاردەهێنن بەبێ بیرکردنەوە باش نییە و هیچ حیکەمەت و پەندیاریەکی تێدا نابینین، ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ئەو کەسانەی ئەو جۆرە وتانە بەکاردێنن ئەبێ ئەو ڕایە وەربگیرێ کە ئەوانە لە موسوڵمانانن و لە یەکتاپەرستەکانن، شایەتی ئەدەن بە یەکتایی خوا و بە نێرراوی پێغەمبەری خوا، نوێژ دەکەن و چاکە دەکەن و باوەڕیان بە هەموو بنەماکانی دین هەیە، لەو باوەڕەدان کە خوا پەروەردگاریانە، محمد پێغەمبەریانە، ئیسلام ئاینیانە، کە بەم بڕوایەیان دەچنە ناو سنوری پاراستنی زیمەتەوەو حورمەتیان لە ئیسلامدا پارێزراوە، لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مَن صَلى صلاتنا واستقبَلَ قبلتنا و أكل ذبيحتنا، فذلك المسلمُ الذي لَهُ ذِمَّةُ الله و ذمةُ رسُولِهِ، فلا تخفروا الله في ذمته))[١] ،

واتە: هەرکەسێ وەك نوێژی ئێمە نوێژ بکات، وە ڕوو بکاتە قیبلەکەمان، وە لەسەربڕاوەکانمان بخوات، ئەوە موسوڵمانە و لە زیمەتی خواو پێغەمبەرەکەیدایە، نەکەن ئەو زیمەتی خوایە بڕوخێنن..

لێرەوە: پێویست و واجب لەسەرمان ئەوەیە، کە هەرکات لە وتەی باوەڕدارێکەوە شتێکمان بینی کە درابوویە پاڵ غەیری خوا، پێویستە

---

[١]- ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ژمارە فەرمودەی ٣٩١ ( باب : فضل استقبال القبلة ) ..

وتەکەی بگێڕینە سەر مەجازی عەقڵی و خۆمان بپارێزین لە بێ بڕوا کردن و بە کافر گێڕانی، کە ئەم مەجازی عەقڵی‌یە بەکارهاتووە لە قورئان و سوننەتدا، کە لە مرۆڤێکی یەکتاپەرستەوە ئەو ئیسنادەیە بەسە بۆ ئەوەی بیگێڕێتەوە سەر ئیسنادێکی مەجازی، چونکە بیروباوەڕی ڕاستەقینە ئەوەیە کە باوەڕی ببێ بەوە کە خوای پەروەردگار خالیق و بەدیهێنەری بەندەکانی و کردەوەکانیەتی کە هیچ شتێکی تر لە کەسێکی ترەوە کاری تێ ناکات چ لە زیندو و چ لە مردووەوە ، کە ئەم باوەڕە بریتی یە لە تەوحید و یەکتاپەرستی، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە باوەڕی بە غەیری ئەمە هەیە، کە ئەمە دەکەوێتە ناو شیرك و هاوەڵ بڕیاردەرەوە ، کە بە شێوەیەکی ڕەها لەناو موسوڵماناندا کەسێ نی‌یە کە باوەڕی وابێ لەگەڵ خوادا بۆ کردەوەکاِن و بۆ نەکردن و بۆ ڕزق و بۆ ژیان و بۆ مردن کەسێکی تر هەبێ، کە هەریەکە لەو وتە گومان لێکراوانە کە وتراوە لە موسوڵمانەوە تەنها مەبەست پێ‌ی شەفاعەت و تکاکاری‌یە بۆ خزمەت خوای گەورە بەهۆی ئەو وەسیلەوە، کە خاوەنی ئیشەکان تەنها خوایە، وە نی‌یە لەناو موسوڵماناندا کەسێ کە باوەڕی وابێ ئەو کەسەی ئەم داوای لێ دەکات خۆی خاوەنی شتەکەیە، بە شێوەیەك ببەخشێ و نەیبەخشێ، بێ ئەوەی لا بەلای خوادا بکاتەوە نە لە نزیك نە لە دوور، یان لەگەڵ لاکردنەوەیەکی کەمدا هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدا، کە پشت و پەنا بە خوای گەورە دەگرین کە موسوڵمانێ بە کافر و بێ بڕوا یان بە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدەین، بەهۆی هەڵەیەك یان نەزانین یان لە بیرچوونەوە یان بەهۆی ئیجتیهادەوە...

ئێمە دەڵێین: هەرچەندە ئەو کەسانە زۆرن کە لە وتەکانیاندا بە هەڵە بۆچوونەکانیان دەردەبڕن، بە داواکردنی لێخۆش بوون و بەهەشت و شیفا و سەرکەوتن و پرسیارەکانیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بە شێوەیەکی

ڕاستەوخۆ، کە لەژێر پێناسەی تەوحید و یەکتاپەرستی دەرناچن، چونکە مەبەستیان گەیشتن و داوایە لە خوا بەهۆی وەسیلەو شەفاعەتیانەوە، وەك ئەوە وایە وتبێتی: ئەی پێغەمبەری خوا، داواکارم لە خوا کە لێم خۆش ببێ و ڕەحمم پێ بکات، وە من تۆ دەکەمە وەسیلەیەك و خاترانەیەك بۆ خزمەتی خوا لە بەجێهێنانی ئیشەکەمدا، یان لە کردنەوەی دەرووی خێر بۆم...

دەبینین کە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) ئەهاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و داوای شەفاعەت و باران و نەمانی هەژاری و نەخۆشی و قەرز و بەلاو ناڕەحەتیەکان، وەك باسمان کرد.. وە ئەشزانین کە پێغەمبەر ﷺ بە سەربەخۆیی هیچی نەکردووە ئەوەی هاتووە لێوەی بە ئیزنی خوای پەروەردگار بووە و بە فرمان و هێز و قوەتی زاتی خواوە بووە، کە تەنها بەندەیەکی ئەمر پێکراو بووە و خاوەنی جاه و مەقامی بەرزی لای خوا بووە، بەسەر هەموو مرۆڤەکانی تردا بەرزی کردۆتەوە، وە ئێمە باوەڕمان وایە: کە هەرکەس غەیری ئەو باوەڕەی هەبێ ئەوە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوە و هیچ گومانێکیشی تێدا نییە.

بۆیە دەبینیت پێغەمبەر ﷺ، لە هەندێ کاتدا موسوڵمانان و ئومەتەکەی ئاگادار دەکاتەوە بە شێوەیەك چاوەڕێی نیگا و وەحی دەکات، یان سەیری حاڵی ئەو کەسەی کردووە کە پرسیارەکەی کردووە، لە هەندێ فەرموودەدا هەواڵ ئەدات کە خۆی سەیدە و گەورەی هەموو مرۆڤەکانە، لە شوێنێکی تردا ئاگادارمان دەکاتەوە کە سەید و گەورە تەنها خوای گەورەیە، لە هەندێ کاتدا ڕازی بووە بە وتەی هاوەڵان و بە ڕاشکاوانە فێری تەوەسول کردون و ئیستغاثە و یارمەتی خۆی بۆ ئومەتەکەی بە کردەوە دەرخستووە، لە شوێنێکی واشدا دەفەرموێ کە پشت بە من مەبەستن،

پشت بەستن تەنها لەسەر خوایە، لە هەندێ حاڵەتی تریشیدا دەبینین کە هاوەڵان داوایان لێ کردووە و کردویانە بە تکاکار و پرسیاری حاڵی تایبەتی یان لێ کردووە، ئەویش سەرپشکی کردون لەنێوان دوو فرماندا، یان ئارام گرتن لەسەر ئەو حاڵە و بەهەشت پچرین، یان لابردنی نارەحەتیەکەی هەر ئێستا، وەك هەواڵی کابرای نابینا، چاك بوونەوەی چاوەکانی قەتادە، لە فەرموودەیەکیشدا ئەفەرموێ: ئەگەر داواتان کرد داوا لە خوا بکەن، پشت بەستنتان ویست بە خوای ببەستن، لە فەرموودەیەکی تریدا هانمان ئەدات کە نارەحەتی سەر یەکتری هەڵبگرین و پاداشتی گەورەی بەهەشت و ڕەزابوونی خوا بۆ ئەوانە بێ کە پشتی موسوڵمانێ دەگرێ لە کاتی نارەحەتیەکانیدا، لە شوێنێکی کەدا ئەفەرموێ: کەس ناتوانێ خێر بۆ کەسێکی تر دابین بکات تەنها زاتی خوا نەبێ..

لێرەوە بۆت دەردەکەوێ: کە بیروباوەڕی ئێمە پاك و بێگەردە، بەندەی خوا هیچ شتێ بە نەفسی خۆی ناکات با پلەوپایەی لە هەر ئاستێکدا بێ، تەنانەت بەڕێزترینی مەخلوقاتی خوا کە حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ بەڵکو خوای گەورە خاوەنی فرمانەکانە، ئەبەخشێ و ئەیگرێتەوە، سوود دابین دەکات و زیانەکان دێنێتە پێشەوە، دێتە هانای لێقەوماوانەوە و شیفا بەخشە ، هەرکات داواکاریت هەبوو، ڕوو بکە مەولا و گەورەی خۆت –جل جلالە– داوا بکە و بپاڕێرەوە، داوای شەفاعەت بکە خوا بەر شەفاعەتی پێغەمبەرت ئەخات، چونکە شەفاعەت و تکای پێغەمبەرەکەی ڕەت ناداتەوە.

لەنێوان تۆو پەروەردگارتا هیچ پەردە و حیجابێك نی‌یە، دەرگای خوای گەورە کراوەیە و نزیك و فریادڕەستە... خوا پێویستی بە کەس نی‌یە..

## ڕای شێخ محمدی عبدالوهاب سەبارەت بەو وتانەی که گومانی گومڕاییان لەسەره

شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب ڕایەکی پەسەند و هەڵوێستێکی گەورەی لەم بابەتەدا هەیە ، بەتایبەت بۆ هەندێ لەو وتانه کە لەسەر زوبانی خەڵکی دا ئەیڵێن و زۆر لەوانەش وا گومانیان بردووه کە پارێزەری تەوحید و یەکتاپەرستین و جگە لە خۆشیان بێ باوەڕ و موشریکن، وە دەڵێن هەر کەس ئەو وتانه بڵێ ئەوه هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوه، ئەوه پێشەواکەیان بەهۆی ئەو وته هەڵانەوه کە بەناوی ئەمەوه واته بە ناوی شێخ محمدی عبدالوهابەوه بڵاویان کردەوه کە لەنێوان هەموو خەڵکی‌یدا ئەو وتانە بڵاوه، گوێ بگره بۆ وتەی محمدی عبدالوهاب لەو نامەیەدا کە بۆ عبدالله ی کوڕی سەحیم ی نوسیوه لەلای خەڵکی (المَجمَعَة)یه، تیایدا دەڵێ:

((هەرکات ئەمەتان بۆ ڕوون بوویەوه، ئەو باس و مەسئەلانەی کە لە ناوتانا بڵاوبۆتەوه، لەوانە زۆرێکیان درۆ و بوهتانێکی زۆر گەورەیە و دیاره، وەك وتەی: من وتبێتم و کتێبی مەزهەبەکانم بەتاڵ کردبێتەوه، یان وتراوه: گوایە من وتوومە: خەڵکی لە شەش سەد ساڵەوه تا ئێستا هیچ دینێکیان نىیه، یان گوایە من بانگەشەی ئیجتیهادێتی دەکەم، یان من لە تەقلیدکردنی زانایان دەرچووم و باوەڕم پێی نىیه، یان گوایە من ئەوانە بە بێ بڕوا دەزانم کە تەوەسول و خاترانەی پیاوچاکانیان هەیە، یان وتبێتم: جیاوازی نێوان زانایان بەڵاو کارەساته، وە گوایە من وتوومە: شێخی بوەیصری بێ بڕوایە لەسەر ئەوەی وتوویەتی: (یا أکرم الخلق)، یان وتەی ئەوه کە من وتبێتم: گەر توانام ببێ ماڵەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەڕوخێنم و تێکی ئەدەم، یان گەر توانام ببێ شوێن ئاوەچۆڕی سەربانی کەعبە لائەبەم و بە تەختە بۆی دروست دەکەمەوه، یان گوایە من وتبێتم: من

ئینکـاری زیـارەت کـردن و سـەردانی گـۆڕی پێغەمبـەر ﷺ بکـەم، وە مـن وتبێتم ئینکاری ئەوانە بکەم کە زیارەتی گۆڕی دایك و باوکیـان و غـەیری ئەوانە دەکەن، وە من ئەوانە بە کافر و بێ بڕوا دەزانم کە سوێند بە غـەیری خـوا دەخـۆن، ئەمانـە هـەمووی دوانـزە بـاس و مەسـئەلەن، وەڵامـی مـن بـۆ ئەوانـە ئەوەیـە دەڵـێم: پـاك و مونـەزەهی بـۆ زاتـی خـوا ئەوانـە بوهتـانێکی گەورەیە بە دەمی منەوە ﴿سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ﴾ النور: ١٦، وە بـەڵام بزانن لە پێش ئەمەشدا هەبووە کـە دژایـەتی پێغەمبـەری کـردووە و (عیسـی ی بە کوڕی خوا زانیوە و وتەی ناشرینی بە پیاو چاکان وتـووە، ﴿تَشَابَهَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ البقرة:١١٨))[1]..

## ((بە کورتی))

کورتەی ئەم بەشە:

ئەو کەسەی کە (ئیستیغاثە) دەکات کافر و بێ بڕوا نابێ، مەگـەر بیروبڕوای وابـێ کـە دروسـت کـردن (خـەلق) و هێنانـە کایـە (الأیجـاد) لـە دەسـەڵاتی غەیری خوا بێ، وە جیاوازی نێوان ژیان و مردن یان زیندوانی سـەرزەوی و زیندوانی ژێر زەوی هیچ مانایەکی نەبێ، کە هەر کەس بیروڕای وابوو ئـەوە بـێ بڕوایـە مەگـەر موعتەزیلـەکان ڕایـان وا ذیـیە لەسـەر دروسـت کردنـی کردەوەکـان (خلـق الأفعـال)، وە ئەگـەر بـیروڕای جـێگیر بـێ لەسـەر بـوونی سەبەب و هۆکار و هەوڵ دان بۆ دەست کەوتنی پلەکان ئەوە بێ بڕوا نابێ.

---

[1]- ئەمە دەقی ئەو نامەیەیە کە لە (نامەی یانزە)دا تۆماری کردووە لە نامـەکانی شـێخ، لە بەشی پێنج لا ٦١، کە کۆلێژی محمدی کوڕی سعودی ئیسلامی بڵاوی کردۆتەوە لە هەفتەی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب دا..

تۆ ئەزانی مەبەست لەو بڕوایەی کە خەڵکی بەرانبەر بە مردوان هەیانە ئەمەیە: (ئەوان تەنها هۆکارن، نەشت هێننە دروست کردن و خەلقەوە تا ئیلاه و خوا بن، کەواتە هیچ ژیریەکی تێدا نییە کە بڕوا وابێ پێیان کە لە زیندوو زیاتر دەسەڵاتیان هەبێ، خەڵکی بەرانبەر بە مردووەکان تەنها هۆکاری یەو هیچی تر، خۆ بۆ زیندوانیش هەمان بڕوا هەیە، ئیتر ئەو تێکەڵ کردن و بە هەڵە تێگەیشتنە بۆچی؟

کەواتە نە بێ بڕوان و نە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دەریشن...

وە بەردەوام ئەیدەنەوە بە گوێیەکاندا: کە هیچ ژیریەکی تێدا نییە کە بڕوات بە مردوان زیاتر بێ لە بڕوات بە زیندووان، کە جێگیری بکەی کردەوە بۆ زیندوان لەسە ڕێگەی هۆکارەکان، وە ئەوەش بۆ مردوان جێگیر بکەی لەسەر ڕێگەی ئەوە کە بە زاتی خۆیان ئیش دەکەن و خاوەنی هێنانە کایەی هەقیقین، کە ئەمە بەبێ گومان ناچێتە ژێر پەردەی ژیرییەوە و قبوڵ ناکرێ.

تەنها مەبەست لەو هاوارکردنە لە مردوو داوای دۆعای خێرە لە خوا بەهۆی ئەو مردووەوە، چونکە ئەڕواحی مردووەکان دۆعا بۆ نزیکەکانیان ئەکەن، ئەویش بەم بەڵگەیە:

هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((إنّ أعمالُكُمْ تُعْرَضُ على أقاربِكم و عَشائِركُمْ مِنَ الأموات، فإن كانَ خيراً إستبشروُا بهِ، وَ إن كانَ غير ذلك قالوا: اللهُمَ لا تُمِتْهُمْ حَتى تهديهم كما هَديتنا))[1] .

---

[1]- ئیمامی ئەحمەد هێناویەتی و تەخریجی کردووە، وە چەند ڕێگەیەکی هەیە کە یەکتری بەهێز دەکەن ، بنواڕە بۆ (الفتح الرّباني في ترتيب مسند إمام أحمد بن جبل الشيباني) ٨٩/٧. وە بنواڕە بۆ (شرح الصدور)ی ئیمام سیوطی..

واته: کردەوەکانتان دەخرێته بەر دەستی نزیکەکانتان و هۆزەکانتان لە مردوانتان، گەر چاکەیان تیا بینی مژدە ئەدەن بە یەکتر، گەر بە پێچەوانەوەیان تیا بینی (واته گوناه و خراپە) دەڵێن: خوایە مەیانمرێنە تا هیدایەت وەردەگرن وەك چۆن هیدایەتی ئێمەت دا..

وە ڕیوایەتی کردووە (ابن المبارك) بە سەنەدی خۆی تا (ئەبی ئەیوب) ڕەزای خوای لەسەر، دەڵێ: لە فەرموودەدا هاتووە: کردەوەی زیندووان دەخرێتە بەر دەستی مردوان، گەر چاکەیان تیا بینی دڵ خۆش دەبن و مژدە بە یەکتری دەدەن، وە گەر خراپەیان بینی دەڵێن: خوایە لەسەریان هەڵبگرە...)[1] .

## ((کۆتایی بەشی یەکەم))

---

[1]- بنوارە بۆ (الروح)ی ابن القیم لە لاپەڕە ٧.

# بەشی دووەم

# چەند ڕوون کردنەوەیەك لەسەر پلەی پێغەمبەرایەتی

**کە تایبەتمەندییەکانی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺی لەخۆ گرتووە، لە هەقیقەتی پێغەمبەرایەتی و هەقیقەتی مرۆڤایەتی، وە تێگەیشتن لە تەبەروك وەرگرتن بە پێغەمبەرەوە ﷺ وە تەبەروك کردن بە ئاثار و بەجێماوەکانی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ.**

# تایبه تمەندیيەكانی پێغەمبەرو ڕای زانایان لەسەری

زانایان گرنگیيەكی فراوانیان داوە بەو تایبەتمەندیانە، چ بە نوسین و چ بە ڕاڤە و شەرح كردن و كۆكردنەوەو لێكۆڵینەوە لەسەر نوسین، لەناویاندا كتێبی (الخصائص الكبرى)ی ئیمامی جەلالەدینی سیوطیيە، كە كۆكەرەوەیە بۆ سەرجەم تایبەتمەندیەكانی خۆشەویست ﷺ.

تایبەتمەندیيەكان زۆر زۆرن، هەیانە لەڕووی سەنەدەوە تەواوە، هەشیانە سەنەدەكەی وتەی لەسەرە، هەندێكیشیان جیاوازی ڕا لەلایەن زانایانەوە لەسەری هاتووە، كە هەندێكیان بەڕاستی دەبینن و كۆمەڵێكیشیان بە پێچەوانەوە، كە ئەمە بووەتە باسێكی جیاوازی و مەسئەلەیەكی خیلافی...

كە لەلایەن زانایانەوە و لە دێر زەمانەوە قسەی لەسەر كراوە، لەنێوان ڕاست و هەڵە و دروست و نا دروست دا هاتووە، نەك لەنێوان بڕواو بێ بڕواییدا. زانایان جیاوازیيان هەیە لەنێوان زۆر لە فەرموودەكان و هەندێ بە ڕاست و كۆمەڵێ بە لاواز و بێ هێز و كۆمەڵێكیش لە ڕێگەوە ڕەدی دەكەنەوە، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی تێگەیشتنیان لە كاتی هەڵسەنگاندنی سەنەد و ئەو پیاوانەی كە هێناویانە، ئەگەر لاوازێك گەیانرایە پلەی بەهێز و بەهێزێكیش خرایە پلەی لاوازەوە، یان فەرموودەیەكی ڕەدكراویان جێگیر كرد و جێگیركراوێكیان ڕەد كردەوە بەهۆی بەڵگەیەك یان تەئویل كردنێك یان شوبهە بەڵگەیەك ، ئەوە ڕێگای زانایانی لە ڕاڤە كردن و تێڕامان (البحث والنظر) یان گرتووە، كە ئەمەش وەك مرۆڤێك كە خاوەنی ژیری و تێگەیشتنە مافی خۆیی ئەدرێتێ، وە ماوەش بەجێماوە و گۆڕەپان فراوانە و زانستیش بڵاوە لەناو هەمواندا.

کە ئەم ڕێگەیە پێشەوای هۆشداران و گەورەی زانایان پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ڕێگەی پێداوە و بەرنامە ڕێژی بۆ کردووە، کە ئەگەر موجتەهید ڕایەکی پێکا دوو پاداشتی هەیە و گەر هەڵەی تیا کرد پاداشتێکی بۆ دەنوسرێ..

لە دێر زەمانەوە زانایانمان لە کاتی گێڕانەوەی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەردا ﷺ لەخۆبردوییان نیشان داوە و وا سەیریان کردووە کە لەناو کردەوە پەسەندەکان (فضائل الأعمال)دایە وە هیچ پەیوەندیەکی بە حەڵاڵ و حەرامەوە نییە، لەسەر ئەم ڕاو بۆچوونەیانەوە زانایان ئەو یاسایەیان دامەزران کە ئیش بە فەرموودەی لاواز دەکرێ بە مەرجێ لە (فضائل الأعمال)دا بێ و هەڵبەستراو یان بەتاڵ نەبێ، وە بەو مەرجانە کە لەم باسەدا هێناویانە، ئیتر ئەوەیان بە شەرت نەگرتووە کە ڕاست (الصحیح) بە مانا زاراوەکەی دابنێن، کە ئەگەر ئەم شەرتە بە مەرج دابنێن ئەوە شاز و نەیار دەردەکەوێ، ئەو کاتە نەماندەتوانی هیچ باسێك لە سیرەت و ژیانی سەردارمان ﷺ لەپێش ڕەوانە کردنی و لە دوای ڕەوانە کردنیشیدا وەربگرین و باس بکەین..

لە کاتێکدا کە زانایانمان لە پلەی زانستی بەرزدا بوون و دروست و نادروستیان لە یەك جودا کردۆتەوە و پلەی فەرموودەی لاواز و بەهێزیان بە چاکی زانیوە، لەگەڵ ئەمەشدا کە سیرەت و ژیانی پێغەمبەریان ﷺ هێناوە ژمارەیەکی زۆر لە فەرموودەی پچڕاو (مقطوع) و نەبوونی سەنەد یان (المراسیل) تێدایە، بەتایبەت ئەوانەیان کە لە کاهین و هاوشێوەکانیان لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەریان تێدایە، کە ئەمە دروست بووە لەم پلەو مەقامەدا بهێنرێتەوە..

## کتێبەکانی پێشین و تایبەتمەندییەکان
## (کتب السلف والخصائص)

گەر بگەڕێنەوە بۆ نوسرا و کتێبەکانی زانایانی پێشین –السلف– ئەوە کۆمەڵێکی زۆر لە زانایانی ئوممەت ، لە فەرموودەناس و شەرع زان دەبینین کە چۆن بە کۆمەڵ لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەریان ﷺ باس کردووە و هەندێ تایبەتمەندی سەرسوڕهێنن و نامۆ دەهێنن، کە گەر لێکۆڵەر لەسەر سەنەدەکانیان ڕابوەستێ ڕاستێتیان نابینێ، کە ئەمە هەموو بە پشت بەستن بووە لەسەر ئەو بنەماو یاسایانە کە زانایان لەم باسەدا بۆیان داناون و ئەمان لەسەری ڕۆیشتوون.

## ئیبن تەیمیە و تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ﷺ

شێخ ئیبن تەیمیە –کە ناسراوە بە توندڕەو– لە کتێبەکەی خۆیدا[1] لەم باسەدا هەندێ فەرمایشتی هێناوە کە ( سەنەدەکانیان ڕاست نین ) ، وە کردونی بە شاهید لەسەر زۆر لە باسەکان، وە وای داناوە کە ئەو وتانە باوەڕپێکراون و لە ڕوون کردنەوەی ئەو بابەتانەدا پێویستن و ڕاڤەی فەرموودەی پێ دەکرێ، لەو وتانە بە نموونە هەندێکی دێنین لە کتێبی (الفتاوی الکبری) دەڵێ:

(ڕیوایەت کراوە کە خوای گەورە ناوی پێغەمبەری ﷺ نوسیوە لەسەر عەرش و لەسەر شتەکانی بەهەشت لە دەرگاکان و قوباب و وەرەقەکان))، وە لەم بارەوە زۆر لە ئاسارەکانی ڕیوایەت کراون کە ڕوون کردنەوەیەکی تەواون بۆ دەرخستنی ناوی موبارەکی و بەرزڕاگرتنی لەو شوێنانەدا –

---

[1]– بنوارە بۆ (الفتاوی الکبری) ابن تیمیە ۲/۱۵۱.

صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ- لە پێشتردا ئەو فەرموودەمان هێنایەوە لە (المسند)دا لە مەیسەرەی ئەلفەجرەوە کاتێ پرسیاری کرد: کەی بوویت بە پێغەمبەر؟ فەرمووی: (وآدم بين الروح والجسد) لە کاتێکدا ئادەم پێغەمبەر لەنێوان ڕۆح و لاشەدا بوو.

وە ئەبولحسین ی کوڕی بشران ڕیوایەتی کردووە لە ڕێگەی شێخ ئەبی لفەرەج ی کوڕی ئیبنو جەوزی یەوە لە کتێبی (الوفا بفضائل المصطفى ﷺ) کە دەڵێ: بۆی گێڕاینەوە ئەبو جەعفەر موحەمەدی کوڕی عەمر، دەڵێ بۆی گێڕاینەوە ئەحمەدی کوڕی ئیسحاق ی کوڕی صالح، دەڵێ بۆی گێڕاینەوە محمدی کوڕی صالح، دەڵێ بۆی گێڕاینەوە محمدی کوڕی سنانی ئەلعەوفی، دەڵێ: بۆی گێڕاینەوە ئیبراهیمی کوڕی طەهمان، لە یەزیدی کوڕی مەیسەرەوە لە عبدالله ی کوڕی سفیانەوە، لە مەسیەرەوە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا کەی بوویت بە پێغەمبەر؟ فەرمووی:

(لما خلق اللهُ الأرض و استوى الى سماء فسواهن سبع سموات وخلق العرش، كتب على ساق العرش: محمد رسول الله خاتم الأنبياء، و خلق الله الجنة التي أسكنها آدم و حواء، فكتب إسمي على الأبواب والأوراق، و القباب والخيام، وآدم بين الروح والجسد، فلما أحياهُ الله تعالى نظر إلى العرشِ فرآى إسمي، فأخبرهُ اللهُ أنَهُ سيدُ وُلِدك، فلما غرّهما الشيطان تابا و استشفعا بإسمي إليهِ).

واتە: کاتێ خوای گەورە لە خەلق کردنی ئەرز لێبوویەوە ئاسمانەکانی بۆ ڕایەڵ کرد و حەوت ئاسمانەکانی دانا، وە عەرشی خەلق کرد، لەسەر ئەملا و لاکانی عەرش نووسی: موحەممەد پێغەمبەری خوایە کۆتای پێغەمبەرانە، وە خوای گەورە بەهەشتی خەلق کرد کە ئادەم و حەوای تیا نیشتەجێ کرد، پاشان ناوی منی نوسی لەسەر دەرگاکان و وەرەقەکان و

قوباب و خێمەكانی بەهەشت، وە لەو كاتەدا ئادەم لەنێوان ڕۆح و لاشەدا بوو، وە كاتێ خوای گەورە ئادەمی هێنایە ژیان ئادەم سەیری عەرشی كرد ناوی منی بینی، خوا هەواڵی دا بە ئادەم كە ئەوە گەورەی ئەولادەكانی تۆیە، وە كاتێ شەیتان فریوی دان و تۆبەیان كرد ناوی منیان كردە تكاكار بۆ لای خوا..

## ئیبنو تەیمیە و كەرامات

گەر سەیری تایبەتمەندیەكان و كەرامەت بكەین، دەبینین لەلایەنی حوكمدان بەسەردا و گێڕانەوە و نەبوونی توندڕەوی تیایدا لەیەك ڕەگەزن، هەروەك چۆن توندی بەكاردێت لە گێڕانەوە یان هێنانی یاسا و حوكمەكان لە حەڵاڵ و حەرامدا، كە ئەمانە هەموویان لە دەوری هەردوو مەناقیب و فەضائیل دەسوڕێنەوە..

لێرەوە دەبینین كە ڕاوبۆچوونی شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە لە گێڕانەوەی كەراماتی ئەولیا و دۆستانی خوا هەمان ڕاوبۆچوونە بۆ تایبەتمەندیەكانی پێغەمبەران.. بۆیە لە كتێبەكەیدا ژمارەیەكی زۆر لە كەرامات و خەواریقولعادەی بەرز دەگێڕێتەوە كە لە سەدەی یەكەمدا ڕوویان داوە..

كە ئەگەر لێكۆڵینەوە لەسەر پلەو ئیسناد و گێڕانەوەكانی ئەو بكەین، دەبینین تیایاندا هەیە كە پلەی -صحیح-و چاك و حەسەنی هەیە، تیاشیاندا هەیە كە لاوازە و هەشیانە تەنها وەرگیراوە، وە هەمیشە لەلای زانایان ڕەد كراوەتەوەو هەندێكیشیان لە پلەی مونكەردایەو لە شازەكانن.
كە هەموو ئەمانە لەم باسەدا وەرگیراون و لای زانایان پلەی (مقبول)یان هەیە، وە لەلای زانایان دوو ڕێگەی (محمول و منقول)یان بەسەردا داون، كە

له نموونه‌ی ئه‌و گێڕانه‌وانه له كه‌رامه‌ت بۆ هه‌ندێ له هاوه‌ڵان –الصحابة– ده‌گێڕێته‌وه له‌وانه:[1]

١– كاتێ (أمُ أيمن) هیجره‌تی كرد خواردن و ئاوی پێ نه‌بوو، نزیك بوو له تینواندا گیانی له‌ده‌ست بدا، به‌ڕۆژوو بوو كاتێ به‌ربانگی هاته پێشه‌وه، گوێی له ده‌نگێك بوو له‌سه‌ر ڕاسه‌ری، سه‌ری بڵند كرد بینی گۆزه‌یه‌كی گه‌وره له‌سه‌ر ڕاسه‌ری وه‌ستاوه، ئاوی لێ خوارده‌وه و تینویه‌تی شكا، كه ده‌ڵێ ئیتر ئه‌و ته‌مه‌نه‌ی كه مابووی هه‌ستی به تینویه‌تی نه‌كرد.

٢– كه‌شتی‌یه‌كی خزمه‌تكاره‌كه‌ی پێغه‌مبه‌ر ﷺ كه له شوێنێكدا لایاندا شێرێك هاته ڕێگه‌یان ئه‌میش وتی به شێره‌كه كه ئه‌مه نێراوی پێغه‌مبه‌ری خوایه، ئیتر شێره‌كه شان به شانی ڕۆشت تا گه‌یاندیه شوێنی مه‌به‌ستی.

٣– (به‌راء ی كوڕی مالك) ئه‌و كه‌سه‌ی كه سوێندی له‌سه‌ر خوا بخواردایه بۆی جێ‌به‌جێ ده‌كرا، كه هه‌ركات شه‌ڕ و پێكدادان ڕوویبدایه، له‌ناو جیهاد و شه‌ڕ كردنه‌كه‌دا موسوڵمانان ئه‌یانوت پێی : ئه‌ی به‌راء سوێند بخۆ له‌سه‌ر په‌روه‌ردگارت. ئه‌ویش ئه‌یفه‌رموو: ئه‌ی په‌روه‌ردگارا، سوێندت ئه‌ده‌م كه شانه‌كانی ئه‌وانمان پێ ببه‌خشی و منیش بگێڕی به یه‌كه‌م شه‌هید له‌م شه‌ڕه‌دا..

ئه‌وه‌بوو موسوڵمانه‌كان سه‌ركه‌وتن و بارو ماڵی شانی ئه‌وان بوو به موڵكیان و به‌رائیش تیایدا یه‌كه‌م كه‌س بوو كه شه‌هید بوو..

٤– خالیدی كوڕی وه‌لید گه‌مارۆی قه‌ڵایه‌كی سه‌ختی دابوو كه موسوڵمان نه‌ده‌بوون، بێ باوه‌ڕه‌كان وتیان: موسوڵمان نابین ئه‌ی خالد تا ئه‌و ژه‌هره

---

[1]– بنواڕه بۆ (الفتاوى الكبرى) ابن تيمية (٢٨١/١١) كه چۆن ئه‌و (ده) كه‌رامه‌تانه ده‌گێڕێته‌وه.

نەخۆیتـەوە، خالـد ڕازی بـوو ژەهرەکـەی خـوارد و زیـانی پـێ نەگەیانـد و سەلامەت بوو.

٥- عومەری کوڕی خطاب (ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ سوپاکەی ڕێکخست، فرمانی ئەو سوپایەی دا بەسەر (ساریە)دا، لە کاتێکدا عومەر وتاری هەینی دەخوێندەوە لەسەر مینبەرەکەوە دەنگی بەرز کرد و فەرمووی: (یا ساریةُ الجبل، یا ساریة الجبل) ئەی ساریە ئاگات لە کێوەکە بێ، کاتێ نوێنەری سوپاکە گەڕایەوە وتی: ئەی پێشەوای موسوڵمانان، بەرەو ڕووی دوژمن بوینەوە و لە شکانا بووین، کە گوێمان لە دەنگی تۆ بوو فەرمووت ئەی ساریە شاخەکە، ئیتر پشتی خۆمان بە شاخەکە توند کرد و خواش سوپای کوفری بۆ شکاندین..

٦- عـەلاء ی کـوڕی حـەضـرەمـی، پێغەمبـەر ﷺ داینـابوو لەسـەر (وڵاتـی بەحرەین)، هەموو جار لە پاڕانەوەکەیدا ئەیفەرموو: (یا علیم، یا حلیم، یا عليُّ، یا عَظیم) خوا دەهات بە هانایەوە، لەکاتی بێ بارانیەکەدا پاڕایەوە کە خوا ئاویان بۆ بنێرێ تا بیخۆنەوەو دەست نوێژی لێ بشۆن، خـوا دوعاکەی گیرا کرد، وە کاتێ خۆی و کۆمەڵەکەی ئاویـان هاتـە سـەر ڕێگـە نـەیانتوانی بەسەر ڕووبارەکـەدا تێپـەڕبن ، پاڕایـەوە لـە خـوا کـە خۆی و کۆمەڵەکەی بـە ئەسپەکان و بارەکانیانەوە بەسەر ئاوەکەدا بڕۆن و سەلامەت بن، هـەموویان پەڕینەوەو تەنانەت زینی ئەسپەکانیان تـەڕ نـەبوو، وە پاڕایـەوە لـە خـوا کـە مرد کەس لاشەکەی نەبینێ، خوا دۆعاکەی گیرا کرد کە وەفاتی کـرد لەسـەر تاتیەشەرۆکە لاشەی دیار نەما تا شۆرا بە تەواوەتی..

٧- هـەمان ڕووداو بۆ ئەبی موسلیمی ئەلخەولانی ڕویـدا کاتێ هەڵیاندایـە نـاو ئاگرەکـەوە ، کاتـێ خـۆی و سـوپاکەی بەسـەر دیجلـەدا ئەڕۆیشـتن، کـە ئاوەکە زۆر بوو هەموو شتێکی هەڵئەدایەوە، ئاوڕێکی لە هاوەڵانی دایەوە و

فەرمووی: کەلوپەلەکانتان کەم بکەنەوە بیدەن بەدەم ئەو ئاوەوە تا خوا بێت بە هانامانەوە، یەکێ لە پارچەکانی خۆی کە پێی دەوترا -مخلاة- ئاوەکە بردی، فەرمووی شوێنم کەون، بەناو ئەو ئاوەدا ڕۆیشت تا بینیەوە گیربوو لە سوچێکدا..

ئەسوەدی عەنەسی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، پێی وت: شایەتی ئەدەی کە من پێغەمبەری خوام؟ فەرمووی: گوێم لێوە نییە.. وتی: شایەتی ئەدەی کە محمد پێغەمبەری خوایە؟ فەرمووی: بەڵێ. ئەسوەد فرمانی دەرکرد بە کردنەوەی ئاگرێکی گەورە و هەموویانیان فڕێ دانە ناوی، بینیان وا لەناو ئاگرەکەدا نوێژ دەکات، ئاگرەکە لە چوار دەوریان پاسیان ئەکەن و خوا گێڕاویەتی بە ساردی و سەلامەتی ، کاتێ گەڕایەوە شاری مەدینە لەدوای وەفاتی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ عومەری کوڕی خەتاب داینیشان لەنێوان خۆی و خەلیفە ئەبوبەکردا -ڕەزای خوایان لەسەر- وە عومەر فەرمووی: سوپاس بۆ خوا کە نەمردم هەتا بە چاوی خۆم کەسێکم دی لە ئومەتی پێغەمبەر ﷺ کە وەك پێغەمبەر ئیبراهیمی لێ بکرێ و وەکو ئەویش سەلامەت بێ.

وە جارێکی تر جاریەیەك ژەهری بۆ کردە خواردنەکەیەوە خواردی و زیانی پێ نەگەیاند، ئافرەتێك بە فێڵ دۆعای کرد لە مێردەکەی چاوی کوێر بوو، هات بۆ لای أبو مسلم و لە بەردەمیا تەوبەی کرد ئەمیش دۆعای بۆ کرد و چاوەکانی چاك بوونەوە..

٨- سەعیدی کوڕی موسەیب کاتێ لە مەدینەدا و لە مزگەوت مایەوە لە ڕۆژانی سەختی گەرمادا، کەس لە ماڵ نەدەهاتە دەر، مزگەوت چۆڵ بوو جگە لە خۆی کەسی تیا نەبوو هەموو کاتێکی نوێژ گوێی لە بانگەوە بوو

که له مەرقەدی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەخوێنرا، ئەیفەرموو بەو بانگەدا ئەمزانی که کاتی نوێژ هاتۆتە پێشەوە.

٩- عەمری کوڕی عەقبەی فەرقەد، بە هاوەڵانی وت که شەرتی کردووە ئەم پارێزگاری کەلوپەلەکانیان بێ، زۆر گەرم بوو، لەلای شتەکان نوێژی دەکرد تا لە گەرما بورایەوە و کەوت، کۆمەڵێ ئاژەڵی ترسناکی ناوچەکە هاتن و پارێزگاریان کرد تا هۆشی هاتەوە.

١٠- مەطرەفی کوڕی عبداللە ی کوڕی ئەلشەخیر، هەرکات دەچووەوەماڵەوە قاپ و کەلوپەلەکەی لەگەڵیدا تەسبیحاتیان دەکرد، ئەم و هاوڕێیەکی بە تاریکیەکدا ئەڕۆیشتن، سەری گۆچانەکەیان بوو بە نور و ڕۆشنایی و ڕێگەی بۆ ڕۆشن کردنەوە [١] .

---

[١]- نوسەر لە هێنانی ئەم باسەیدا دوو خاڵی گرنگی مەبەستە:

یەکەم: زانا بەرزەکانمان ئەوانەیان که ناسراون بە توندڕەو وەك ئیبنوتەیمیە باوەڕی تەواویان بە کەرامەت و تایبەتمەندی هەبووە، ئەوەتا ئەیانگێڕێتەوە بێ ئەوەی سەرچاوەیەك بڵێ، که ئەمە نیشانەی متمانە و باوەڕە بەباسەکە.

دووەم: ئەوانی لەم سەردەمانەدا که خۆیان بێ باوەڕ کردووە بە کەرامەت، خۆیان وا نیشان داوە که شوێنکەوتەی ئیبنوتەیمیەن و درۆ ئەدەنە پاڵ ئەو زانایە، بۆیە بەم شێوە باسی دەکات تا بزانن که ڕاست ناکەن و درۆیان بە دەمی شێخەکەیانەوە هەڵبەستووە.. (وەرگێڕ)

## شێخ ( ابن القیم ) و
## دانیشتنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر عەرش

شـێخی ئیسـلام –ابـن القـیم– تایبەتمەندیـیەکی سەرسـوڕهێنەری نـامۆ دێنێتەوەو ئەیداتە پاڵ کۆمـەڵێکی زۆر لـە زانایانی سەلەف (ڕەزای خوایـان لێ بێ) وەك دەڵێ:[1]

(فائدة: قاضي دەڵێ: شـێخی مـەزوری کتێبێکـی داناوە لەسـەر گەورەیـەتی پێغەمبـەر ﷺ وە تیایـدا باسـی دانیشـتنی پێغەمبـەری کـردووە لەسـەر عەرش، قاضي دەڵێ: ئەمە وتەی ئەبی داود و ئەحمـەدی کوڕی ئەصـرەم و یەحیای کـوڕی ئەبی طالـب و ئەبی بەکری کوڕی حمـاد و ئـەبی جەعفـەری دمشقی و عیاشی ئەلدوری و ئیسحاقی کوڕی ڕاهویەو عبدالوهابی وەراق و ئیبراهیمی ئەصبەهانی و ئیبراهیمی ئەلحەربی و هارونی کـوڕی مـەعروف و موحەمـەدی کـوڕی ئیسـماعیلی ئەلسـەلەمی و محەمـەدی کـوڕی مەصـعەبی ئەلعابـد و ئـەبی بـەکری کـوڕی صـەدەقە و، محەمـەدی کـوڕی بشـری کـوڕی شەریك و ئەبی قەلابەو عەلی کوڕی سەهل و ئەبی عبـدالله ی کـوڕی عبـدالنور و، ئەبی عوبەید و حەسەنی کوڕی فەضڵ و هارونی کوڕی عباسـی هـاشمی و ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی هاشمی و محەمەدی کوڕی عمرانـی فارسـی ئەلزاهد و موحەمـەدی کوڕی یوسـفی ئەلبەصـری و عبـدالله ی کـوڕی ئیمـام ئەحمەدی مروزی و بشری حافی یە...).

ئیبنو تەیمیە دەڵێ: منیش دەڵێم: ئەوە وتـەی ئیبنو جەریری ئەلطـەبەرییـە کـە پێشـەواو مامۆسـتای ئەوانەیـەو پێشـەوای تەفسـیرە، وە وتـەی ئـەبی ئەلحەسەن ئەلدار قطنییە کە لەیەکێ لە شیعرەکانی دەڵێ:

---

[1]– بنوارە بۆ –بدائع الفوائد– ابن القیم ٤/٤٠.

حديثُ الشفاعةِ عن احمَدِ — الى أحمَد المصطفـى مُسْنَدهُ
وجـاءَ حديث بـإقعـادهِ — على العرشِ أيضاً فلا نجحَدُهُ
أَمِرّوا الحديثَ على وَجهه — ولا تُدْخِلُوا فيه ما يُفْسِدهُ
وَلا تُنْكِـروا انَهُ قاعِـدُ — وَلا تنكِـرُوا انَّـهُ يقعِـدُهُ

## کتێبی ( کشاف القناع ) دۆزینەوەی دەمامکەکان و تاییە تمەندییە سورهێنەرەکان

زانـای نـاودار شـێخ مەنصـوری کـوڕی یونسـی ئەلبـەهوتی لـە کتێبـی (کشـاف القنـاع) دا باسـی لـە کۆمـەڵێ لـە تایبەتمەندیـەکانی حـەزرەتی پێغەمبەر ﷺ کردووە، کە لەلای زۆر لەوانەی بیر تەسکن لە تێگەیشتنی دەقەکان، شتێکی نامۆیەو ناتوانن ئەو شتانە وەربگرن.

لەوانە: دەفەرموێ: هـەر شتێ لـە مرۆڤـەوە بـێ وپاك نـەبێ بۆ پێغەمبـەر و سەرجەم پێغەمبەران پاکە، وە دروستە شیفا و چارە وەربگێرێ بە میز و خوێنی موبارەکی، هەروەك الدار القطني ڕیوایـەتی کـردووە دەفـەرموێ: کـە ئومـو ئەیمـەن لـە میـزی پێغەمبـەری خـواردەوە و ئـەویش فـەرمووی پـێی: (إذن لا تلـج النـارُ بطنـك) کەواتـە ئاگری دۆزەخ سـکت ناسـوتێنێ، بـەڵام لـە پلەی –لاواز–دایە..

وە هەروەها (ابن حبان) لە زنجیرەی –الضعفاء–دا ڕیوایەتی کردووە کە: هـەرزەکارێك خـوێنی حیجامـەی پێغەمبـەری گـرت، کاتـێ کـە لێبوویـەوە خوێنەکـەی خـواردەوە، فـەرمووی: (ئـەوە چیت لـە خوێنەکـە کـرد؟) عـەرزی کرد: لە سکمدا شاردمەوە، فەرمووی: (إذهـب فقد أحـرزتَ نفسـك مـن النـار) بـڕۆ ئـەوە نـەفسی خۆتـت پاراسـت لـە ئاگر.. حـافظی ئیبنـو حەجـەر دەڵێ:

نهێنی ئەمە ئەوەیە کە دوو فریشتەکە ناو سنگ و لاشەی پێغەمبەریان شتووە چەند جارێك..

لەوانە: حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ سێبەری نەبووە، نە لەبەردەم ڕۆژ و نە لەبەردەم مانگ دا، چونکە حەزرەت نورانیـیەو سێبەریش جۆرێکی تاریکیـیە، ئیبنو عەقیل و غەیری ئەمیش باسیان کردووە و شایەتیان داوە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ داوای کردووە لە خوا لە سەرجەم لاشەی و ئەملاولاکانی بگێڕێ بە نور، لە کۆتایی پاڕانەوەکەیدا کە فەرمووی: (واجعلني نوراً).

لەوانە: پلەی سوپاسکراوی (مقام المحمود) و دانیشتنی حەزرەت لەسەر عەرش، وە عبدالله ی کوڕی سەلام دەڵێ لەسەر (کورسی) کە (البغوي) هەردووکیانی هێناوە...

وە لەوانە: کە حەزرەت ﷺ هەرگیز باوێشکی نەداوە..

لەوانە: حەزرەت ﷺ هەموو مەخلوقاتی خوا لە ئادەمەوە تا دواترینیانی خراوەتە بەردەم، هەروەك چۆن ناوی هەموو شتەکان فێری ئادەم کرا، لە فەرموودەی (الديلمي)دا دەڵێ:

(مُثلتُ لي الدُنيا بالماءِ والطينِ، فعلمتُ الأشياءَ كلها كما علم آدمَ الأسماءَ كلها) واتە: (دونیام بە ئاو و خاکەکەوە بۆ نمایش کرا، هەموو شتومەکەکانی ناویم فێر کرا، هەروەك چۆن ناوەکانی فێری ئادەم کرا).. وە هەموو ئومەتەکەی خرایە بەرچاوی و هەموویانی بینی وەك لە فەرموودەی –الطبراني– دا دەفەرموێ:

(عرضتُ عليَّ أُمتي البارحة لدى هذه الحجرة أولها وآخرها، صّوروا لي بالماءِ والطين، حتى إِني لَأعرِفُ منهم من أحدِكَمْ بصاحبِه) واتە: (دوێنێ لەم ژوورەمدا هەموو ئومەتەکەم هەر لەسەرەتاوە هەتا کۆتاییەکەی لە

وێنەی ئاو و خاك دا پیشانم درا، بە شێوەیەك هەتا مرۆڤم ناسی و ئاشنا بووم پێیان کە باشتر لە هاوڕێ نزیکەکەی ئەو کەسەم دەناسیەوە). وە ئەوەش خرایە بەردەستی کە لە ئومەتەکەیدا چی ڕوو دەدات و پەیدا دەبێت تا ڕۆژی قیامەت ئەوەیش لە گێڕانەوەی -ئەحمەد-دا کە دەفەرموێ:

(رأيتُ ما تلقى أمتي بعدي وسفك بعضهم دماء بعض) بينيم لە دوای خۆم چۆن ئومەتەکەم لەنێوان خۆیاندا تووشی خوێن ڕشتنی یەکتر دەبن.

لەوانە: زیارەت کردنی مەرقەدی پیرۆزی شتێکی سوننەت و موستەحەبە چ بۆ پیاوان و چ بۆ ئافرەتان، ئەوە لە فەرموودەی -الدار القطني- کە گێڕاویەتەوە لە -ابن عمر-ەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(من حج و زار قبري بعد وفاتي فكأنما زارني في حياتي) هەر کەس حەج بکات و زیارەتی گۆڕم بکات لە دوای مردنم، وەك ئەوە وایە زیارەتی کردبم لە کاتی ژیانمدا...[1]

ئەم تایبەتمەندیانە کە لێرەدا هێنامان، تیایاندا هەیە لە پلەی -صحيح- دایەو تیاشیدا هەیە لاوازە، تیایاندا هەیە هیچ بەڵگەیەك لەسەری نییە.

بریا دەمانزانی نکوڵی کارانی چی لەسەر ئەو تایبەتمەندیانە دەڵێن کە گەورە پێشەوایان ئەهلی سوننەت باسیان کردووە و هیچ بەرهەڵستیەکیان لەو بابەتانە نەبووە، بە لەخۆبوردووییەوە وەریان گرتووە و گواستویانەتەوە، پشت ئەستور بە بنەمای لەخۆبوردوویی و ئەمەکناسیەوە لە گواستنەوەی ئاکارە بەرزەکانی، لەگەڵ ئەوەی لەو ((تایبەتمەندییانە)) هەندێك وتە

---

[1]- تا ئێرە وەرگیرا بوو لە کتێبی -كشاف القناع-ی البهوتي ٣٠/٥ کە بە فرمانی پاشا فەیصەلی کوڕی عبدالعزيز آل سعود بە چاپ گەیانراوە.

یاداشت كراوه كه نكوڵی كاران دەیبیستن حوكمی له كوفر گەورەتر لەسەر بێژەرەكانیا دەدەن..

ئێمە چیمان گێڕاوەتەوە لەو گێڕانەوەیە قورستر بێ كە دەڵێ: گەورەی ئێمە محمد ﷺ خوا له ڕۆژی قیامەتدا لەسەر عەرشی خۆی دایدەنیشێنێ هەروەك (شێخ ابن القیم) هێناویەتی كە لە گەورەی زانایانی سەلەفه و كتێبه ناودارەكەیدا بەناوی (بدائع الفوائد) گێڕاویەتیەوە و تۆماری كردووه بێ دەلیل و بەڵگە لە هیچ كتێبێكی سوننەت یان تەنانەت بە پلەی (مرفوع)یش نەیهێناوه...

ئێمە چیمان هێناوه لەو گێڕانەوە زیاتر كە لە كتێبی (كشاف القناع)ی البهوتی دا هاتووه كە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نوور بووه، سێبەری نەبووه، وه هەر شت لە پاشەڕۆی دەربچێ زەوی هەڵیدەلوشێ و هیچ شتێكی لەسەر زەوی دا نامێنێ..

ئایا چ تایبەتمەندیەك كە ئێمە گێرابێتمانەوه لەوه گەورەتره كە (ابن تیمیه) لە تایبەتمەندی‌یەكاندا هێناویەتی كە دەڵێ: ناوی پێغەمبەر ﷺ لەسەر لاكانی عەرش نوسراوه، لەسەر درەخت و گەلاكانی بەهەشت و دەرگاكانی و بەروبومەكانی و دروست كراوەكانی نوسراوه.

كوان ئەوانەی ڕەخنە دەگرن یان لێكۆڵینەوه دەكەن، چۆن ئەم باسانە بەسەریاندا تێپەڕیوه و هیچ ڕەخنە و وتەیەكیان لەسەری نەبووه؟

نەك ئەوانەی كە دەقەكان زیاد و كەم دەكەن بۆ گونجانیان لەگەڵ هەواو ویستی خۆیاندا، كە ئەوه گەورەترین تاوان و خاوەنەكەی تووشی حەد دەكات.

بەڵکو پێویست وایە ئەو دەقە کە هاتووە وەك خۆی تۆماری بکەیت با لەگەڵ بیروبۆچوونی لێکۆڵەریش دا نەگونجێ، دەبێ بنوسرێ پاشان بەڕاوبۆچوونی خۆی چی لەسەر ئەنوسێ ئازادە..

## بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە
## ئیتر چۆن لەژێر فرمانی پێغەمبەردا نابێ؟ ﷺ

یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەرایەتی کە لەلایەن ئەهلی عیلم و زانستەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە ئەوەیە کە: هاتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە زەوی بەهەشتی بڕیوە و چووەتە ناوی.

ئەم تایبەتمەندی یە هەریەکە لە (الحافظ السیوطي، قەسطەلانی، زەرقانی لە شەرحی لەسەر —المواهب اللدنیه)دا هێناویانە.

کە ئەم چوونە بەهەشت و بڕینی زەوییەی زانراوە بۆ کەسێکە کە ئەهلی یەکتاپەرستی بێ و بە ئیزنی خوا بیکات، یان لە ڕێگەی وەحییەوە یان ئیلهامەوە، یان ڕێزلێنانێکی خوایی، کە پێغەمبەر ﷺ ئامارژەی پێ دەکات و دەفەرموێ: ((إنّما أنا قاسم والله یعطي)) خوا داویەتی و من دابەشی دەکەم..

ئەگەر ئەو وتەیە بە ڕاست بگێڕێ کە بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە ئیتر چۆن ئەو دەربڕینەمان ڕاست ناگێڕێ کە بەهەشت لەژێر فرمانی بگرە پێی پێغەمبەری خوادا بێ، ماناکان یەك شتن و لەلای قوتابیانی زانستی ئیسلامی شاراوە نییە، کە ئەمە دانانێکی مەجازییە بۆ مەبەستەکە، کە گەیشتنە بە بەهەشت لە ڕێگەی چاك جوڵانەوە لەگەڵ دایك و باوکدا و خزمەتکردنیان بەتایبەتی دایك، بەڵام بە نسبەت پێغەمبەرەوە ﷺ لە

ڕێگـەی ئیطـاعـە کردنـی فرمانـەکانی و خۆشەویسـتی و بـەگوێکردن و جێبەجێ کردنی سوننەتەکانیەوە دەبێ.
کـە بـۆ ئـەم تایبەتمەندییانـە چـەندەها نموونـەمان هەیـە کـە لێـرەدا گرنگەکانیان دەهێنینەوە:

## پێغەمبەری خوا ﷺ ضەمانەتی بەهەشت دەکات

لە مانای بڕینی زەوی بەهەشت بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەوەش وەردەگیرێ کە پێغەمبەر ﷺ ضەمانی بەهەشتی کردووە بۆ هەندێکی زۆریان لە هاوەڵان کە ئەمە ڕویداوە بۆ ئەوانەی کە بەیعەتی عەقەبەی یەکەمدا ئامادەبوون، وە تیایدا هاتووە کە دەڵێ:

بەیعەتمان کرد بە پێغەمبەرەوە ﷺ کە شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نەدەین، نەدزین و شەرواڵ پیسی نەکەین، مناڵەکانمان نەکوژین و بوهتان و ناتۆری گەورە دروست نەکەین لەنێوان دوو دەست و قاچەکانماندا، وە بێ فرمانی خوا نەکەین لە چاکەکاندا، فەرمووی: (فإن وفّيتم فلكَم الجنة، وإن غشيتم من ذلِك شيئاً، فأمركم الى الله إن شاء عذب وإن شاء غفر) ئەگەر وەفاتان بەو بەڵێنانە کرد ئەوە بەهەشت بۆ ئێوەیە، وە ئەگەر لەوانە سەرپێچیتان کرد، ئەوە فرمانتان بۆ لای خوایە، بە ویستی خوا یان سزا دەدرێن یان لێتان خۆش دەبێ.

(ابن كثير لە – باب بدء اسلام الأنصار–) دا هێناویەتی[1] :

لە ( صحيح مسلم ) دا هاتووە کە دەڵێ: ئەو بەیعەتە شەرت دار کراوە بە بەهەشتەوە عبادەی کوڕی صامت (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەڵێ: من لەوانەم کە لە پێشەوەی بەیعەتەکە بوم لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ وە

---

[1]- بنواڕە بۆ (السيرة)ی ابن كثير ١٧٦/٢.

دەڵێ: بەیعەتمان پێ کرد لەسەر ئەوە کە هاوەڵ شەریك بۆ خوا بڕیار نەدەین، دزی نەکەین، شەرواڵ پیسی نەکەین، ئەو نەفسەی خوا حەرامی کردووە نەیکوژین مەگەر بە هەق، بێ فرمانی پێغەمبەر نەکەین ئەگەر وامان کرد بەهەشت بۆ ئێمە بێ... ئێمەش وامان کرد..

وە لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە دەڵێ: حەزرەت ﷺ فەرمووی: ((فمن وَفىّ فَلَهُ الجنة))[1] گەر وەفاتان بە بەڵێن کرد بەهەشت بۆ ئێوەیە..

لە قەتادەوە ئەڵێ وتمان ئەی پێغەمبەری خوا گەر وامان کرد چی بۆ ئێمەیە؟ فەرمووی: بەهەشت...[2]

لە (أبی مسعود)ەوە (ڕەزای خوای لەسەر) کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فإذا فعلتم ذلك فلكم على اللهِ الجنة، وعَليٍّ)[3] .

ئەگەر بەو شێوەیەتان کرد ئەوە لەلایەن خواو منەوە بەهەشتتان بۆ دەبێ..

لە عەقبەی کوڕی عەمری ئەنصاریەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((فإذا فعلتم ذلك فلكم على اللهِ الجنة وعَليٍّ))[4]

لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەر ﷺ نەعلەکانی دا پێم و فەرمووی: ((إذهب فمن لقيت وراء هذا الحائط شهد ان لا إله إلا الله فبشرهُ بالجنة))[5]

فەرمووی: بڕۆ لە پشتی ئەو دیوارەوە بە هەرکەس گەیشتی شایەتی ئەدا کە خوا تاك و تەنهایە مژدەی بەهەشتی بدەرێ

---

[1]- بنوارە بۆ (البداية والنهاية) ابن كثير ١٥٠/٣.

[2]- بنوارە بۆ (البداية والنهاية) ابن كثير ١٦٢/٣.

[3]- الطبراني ڕیوایەتی کردووە، بنوارە بۆ (مجمع الزوائد) ٤٧/٦.

[4]- ابن ابی شیبه وابن عساكر ڕیوایەتیان کردووە بنوارە بۆ (كنز العمال) ٦٧/١

[5]- ئیمامی مسلم لە (كتاب الأيمان)دا ڕیوایەتی کردووە.

## چەکی چوونە بەهەشت بە دەستی پێغەمبەرەوەیە ﷺ

لــە ئیبنــو عەباســەوە ڕیوایــەت کــراوە (ڕەزای خوایــان لەســەر) دەڵــێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((یوضع للأنبیاء منابر من نور یجلسون علیها و یبقی منبري لا أجلسَ علیه- أو قال -لا أقعدُ علیه- قائماً بین یدي ربي. مخافة ان یبعث بي الی الجنة و تبقی امتي بعدي، فأقول: یا رَب! امتی امتي، فیقول الله عزوجل: یا محمد، ما ترید أن أصنعُ بأمتك؟ فأقول: یا رَبَّ عَجِّل حسابهم، فیدعی بهم فیحاسبون، فمنهم من یدخُلِ الجنة برحمته، و منهم من یدخلِ الجنة شفاعتي، فما أزال اشفع حتی أعطی صیکاکاً برجال قد بعث بهم الی النار حتی إن مالکاً خازن النار لیقول: یا محمد ما ترکت لغضب ربك في أمتك من نقمة))[1] ، واتە: منبەری نوری بۆ پێغەمبەران دانراوە دانــراوە کــە لەســەری دادەنیشــن، تــەنها منبەرەکــەی مــن نــەبێ دانانیشــم لەسەری، بە پێوە ڕادەوەستم لەنێوان دوو دەستەی قودرەتی پەروەردگارم دا، لــە ترســی ئــەوە نــەك مــن بچــمە بەهەشــت و ئومەتەکــەم لــە دوای مــن بمێنێتــەوە، ئــەڵێم: ئــەی پــەروەردگارم، ئومەتەکــەم، ئومەتەکــەم، خــوای باڵادەست ئەفەرموێ: ئەی موحەممەد: ئەتەوێ چی لە ئومەتەکەت بکەم؟ دەڵێم: خوایە لە لێپرسینەوەیان پەلە بکە، بانگیان دەکات و لێپرسینەوەیان دەست پێدەکات، تیایاندا هەیە بە ڕەحمەتی خوا دەچێتە بەهەشت، وە تیایاندا هەیە بە شەفاعەتی من دەچێتە بەهەشت، بەردەوام تکا و شەفاعەت دەکەم هەتا چەکێك دەدەم بە کۆمەڵێ پیاو کە نێرراون بۆ ئاگر تا ڕزگاریان ببێ، هەتا مالك خاوەنی ئاگر دەڵێ: ئەی موحەممەد، لە بۆ توڕەبوونی پەروەردگارت لە ئوممەتەکەت کەست نەهێشتەوە..

---

[1]- ئیمامی طبراني لە (الکبیر) و (الأوسط) وە ئیمامی بەیهەقی لە (البعث) ڕیوایەتیان کردووە وە (المنذري) دەفەرموێ: (ولَیسَ في راوته متروك).

## پێغەمبەر ﷺ بەهەشت ئەبەخشێ

گێڕاوەتەوە لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە دەڵێ: وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر چی بەیعەتت پێ بکەین؟ فەرمووی: ((على السمع والطاعة في النشاط والكسل، وعلى النفقة في العسر، وعلى الأمر بالمعروف والنهي عنِ المنكر ولكُمُ الجنة))لەسەر گوێ ڕایەڵی و بەگوێ کردن لەکاتی چالاکی و تەمبەڵی دا، لەسەر بەخشش و خەرج کردنی ماڵ لەکاتی نەبوونی دا، وە لەسەر فرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە، گەر واتان کرد ئەوە بەهەشت بۆ ئێوەیە...

حافظی ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەحمەد لە ڕێگەیەکی ترەوە لە جابرەوە هێناویەتی، دەڵێ: عەباس دەستی لە دەستی پێغەمبەری خوادا بوو ﷺ کاتێ کە لێبووینەوە لە بەیعەتەکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (اخذتُ و أعطيتُ)[1] (واتە بەیعەتم لێ وەرگرتن و بەهەشتم پێ بەخشین).

منیش دەڵێم[2]: لە ڕیوایەت و گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە زۆر لەو گێرانەوەی پێشوو ڕوون ترە، ئەویش ئەم گێڕانەوەیە کە:

جابر دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی پێیان: بەیعەتم پێ دەکەن لەسەر گوێڕایەڵی و...) تا فەرمووی (بەهەشتیش بۆ ئێوەیە، دەڵێ وتیان: قەسەم بە خوا پشت ناکەینە ئەم بەیعەتەو بە گوێی دەکەین، بەیعەتمان پێ

---

[1]- بنوارە بۆ (فتح الباری) ابن حجر ٢٢٣/٧، وە امامی احمد ڕیوایەتی کردووە بنوارە بۆ (مجمع الزوائد) ٤٨/٦.

[2]- ئەمە وتەی مامۆستا سید محمد مالکی خۆیەتی کە بە شایەتی زانایانی سەردەم پلەی (مُحدث)ێتی هەبووە.

کرد، ئەو (پێغەمبەر ﷺ) شەرتی دیاری کرد ئێمە شەرتەکەمان قبوڵ کرد بەهەشتیشی پێ بەخشین)[1] .

## پێغەمبەر ﷺ بەهەشت ئەفرۆشێت وە عثمان ئەیکڕێت

لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێ: عثمان بەهەشتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کڕی دووجار لە کڕین و فرۆشتنێکی تەواودا، یەکەمیان کە بیری –ڕومە–ی هەڵکەند، وە دووەمیشیان ئەو کاتە بوو کە خەرجی سوپای (العسرە)ی دابین کرد و بەڕێی خست[2] .

هەموو مرۆڤێکی ژیر دەزانێ کە بەهەشت موڵکی خوای پەروەردگارە، کەس ناتوانێ تەصەروفی تیا بکات، با هەر لە پلەو ڕێزێکدا بێت، نە فریشتە، نە پێغەمبەران نابنە خاوەنی بەهەشت، بەڵام خوای پەروەردگار پلەی ڕێزلێنانی داوە بە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بە شێوەیەك کە بەپێی کردەوەکانی ئەو کەسانە بیبەخشێ ئەمەش لەو کەرامەتەیە کە خوا داویەتی بە ئومەتی پێغەمبەر ﷺ.

کە لەم ڕوانگەوە دەتوانین بڵێین: کە ئەمە بەشێکە لە تایبەتمەندیەکانی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ، کە هەرکەس بە گوێڕایەڵی ئەو بجوڵێتەوە، ئەوە زەوی بە هەشتی ئەدرێتێ، یان ضامنی بەهەشتی دەکات، یان بەهەشتی

---

[1]– (الهیثمي) دەفەرموێ: هاوەڵانی (السنن) بەشێکیان گێڕاوەتەوە، أحمد و بزار ڕیوایەتیان کردووە، وە پیاوەکانی ئەحمەد هەموو جێگەی متمانەن، بنوارە بۆ (مجمع الزوائد) ٦/٤٦.

[2]– ئیمامی حاکم لە –مستدرك–دا لە (٣/١٠٧) ڕیوایەتی کردووە، وە تیایدا لە جیاتی –رومە– وشەی –معونە– هاتووە، یەك شتە یەکەمەکەیان جێگیر بووە.

پێ دەفرۆشێ، یان مژدەی بە بەهەشت ئەداتێ، کە بەهەشت موڵکی خوایەو حەزرەتی پێغەمبەری ڕاسپاردووە لەسەر ئەو تایبەتمەندییە.

پەروەردگارا: بینایمان ڕۆشن بکەرەوە، بیستنی دڵەکانمان فراوان بکەیت، هەق و زانستیمان نیشان بدەیت، توانای پەیڕەوی کردنمان پێ ببەخشی..

## مەبەست چی یە لە شەوی لەدایك بوونی پیرۆز
## (ليلة المولد)

هەندێ لە زانایان لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەردا ﷺ باسیان لەوە کردووە کە شەوی لەدایك بوونی خۆشەویست ﷺ ڕێزدارترە لە شەوی قەدری پیرۆز، وە چەند بەراوردێکیان لەنێوان ئەو دوو شەوەدا داناوەو، ئەوەی کە بە پێویستی ئەزانم لێرەدا باسی بکەم:

(مەبەست لەو شەوە خودی شەوی لەدایك بوونی حەزرەتە ﷺ کە لە پێش سەدەها ساڵەوە ڕویداوە، کە زۆر لە پێش ناسین یان باس کردنی شەوی قەدرەوە بووە، کە ئەمە هیچ شك و گومانی تێدا نییە...

مەبەست لەو شەوە ئەو شەوانە نییە کە هەموو ساڵێك دووبارە دەبێتەوە لە مانگی ڕبیعی یەکەمدا، بەڵکو ئەوا هاوشێوەی شەوانی لەدایك بوونی هەقیقین نەك شەوی لەدایك بوونەکە خۆی، بەڕاستی لێکۆڵینەوە لەم باسەیە سودێکی زۆرمان پێ ناگەیەنێ، وە هیچ زیان و زەرەرێکیش لەو کەسانە نادات کە ئینکاری ئەو شەوە دەکەن یان باوەڕیان پێی نەبێ، وە لە زانستی بنەماکانی عەقیدەدا شتێك نییە بەرانبەر ئەوە وەستا بێ، زانایانمان لێکۆڵینەوەکانیان وە نامە و کتێبەکانیان لەسەر شتە گرنگەکانە نەك ئەم باسە بچوکانە...

به کورتی: ئێمە باوەڕمان وایە کە ئەو ڕێز و گەورەیی یە لەنێوان شەوی مەولودی هەقیقی و شەوی قەدرایە، وە ئەو شەوە کە حەزرەتی خۆشەویست ﷺ تیایدا لەدایك بووە تێپەڕیوەو ئەمڕۆ هیچ بوونێکی نی‌یە، بەڵام شەوی قەدری پیرۆز بوونی هەیە و هەموو ساڵێکیش دووبارە دەبێتەوە بە هەمان ڕێز و گەورەییەوە، بۆیە دادەنرێ بە باشترین شەو وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ . وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ . لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾ القدر: ١-٣.

لێکۆڵینەوە لەم باسە و نموونەکانی لەنێوان زانایانی ئیسلام دا کراوە، وە گەورەیانی سەلەفمان قسەیان لەسەر کردووە، ئەوەتا شێخ (ابن تیمیە) باس لەو بەراوردکاریە دەکات کە لە نێوان شەوی قەدر و شەوی ئیسرا و میعراج دا هەیە، بە وردی و زانستیانە لێکۆڵینەوەی لەسەر نوسیوە، کە نەبیستراوە لە کەسەوە لە زانایانمان کە لە پێش ئەودا قسەیان لەسەر کردبێ.. جگە لە پێغەمبەر ﷺ.

## فتوای ابن تیمیە لەم باسەدا

شێخ ئیبنوقەیم دەڵێ: پرسیاریان کرد لە شێخی ئیسلام (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) سەبارەت بە پیاوێك کە بڵێ: شەوی ئیسراو میعراج گەورەترە لە شەوی قەدر، یەکێکی تریش دەڵێ: شەوی قەدر گەورەترە، کامیان پێکاویانە؟

لە وەڵامدا وتی: سوپاس بۆ خوا، ئەو پیاوەی کە دەڵێ شەوی ئیسرا گەورەترە لە شەوی قەدر، گەر مەبەست پێی ئەو شەوە بێ کە ئیسرا بە پێغەمبەر ﷺ کرابێ لە هەموو ساڵێکدا بەڕێزترە بۆ ئومەتی پێغەمبەر ﷺ لە شەوی قەدر، بە شێوەیەك کە بڵێ نوێژ و دوعاو پاڕانەوەکانیش تیایدا

گەورەتر و بەڕێزتر و پاداشتی زیاترە لە شەوی قەدر، ئەمە بەتاڵە و کەس لە موسوڵمانان شتی بەو شێوەیان نەوتووە، کە ئەوە ئاشکرایە و لە ئیسلامدا نیيە، خۆ گەر مەبەستی شەوێکی دیاریکراو بێ، ئەو شەوەی کە سەفەری ئیسرا و میعراجی تیا کردووە کە لە هیچ شەوێکی تردا ڕووداوی بەو شێوە نەبووەو نابێتەوە، بەبێ ئەوەی تایبەتمەندی بکات پەرستش بە نوێژێکەوە ئەوە دروستە و ڕاستە [١] ..

## فەرموودەی ( لا تطروني ) زۆر بڵندم مەکەنەوە

زۆر لە خەڵکی وا تێگەیشتوون کە ئەو فەرموودە باس لەوە دەکات کە نەهیيەکی تەواوی تیا بێ بۆ ستایش و مەدح کردنی پێغەمبەر ﷺ کە دەقەکەی دەفەرموێ: (لا تطروني كما أطرت النصارى عيسى ابن مريم) وە دەڵێن: ستایش و پیاهەڵدانێکی وا کە مرۆۃ تووشی شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دانان ببێ، وە ستایشی پێغەمبەر ﷺ وە بەرزکردنەوەی لەسەر شێوەیەك کە دروست نەبێ بۆ پلەی ئەو، وەسفداری بکەیت بە شتێ کە هی خوا بێ، ئەوە خراپیەکت لە دین دا داهێناوەو پێچەوانەی سوننەتەکانی گەورەی پێغەمبەرانەوە جوڵاویتەوە.

کە ئەم تێگەیشتنە یان بیرکردنەوەیە بۆ دەقی فەرموودەکە هەڵەیە، وە بەڵگەیە لەسەر کورت بینی خاوەنەکەی، چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆی نەهیمان دەکات لەوە کە بەو شێوەیە بەرزی بکەینەوە وەك چۆن عیسای کوڕی مەریەمیان بەرزکردەوە کە وتیان (کوڕی خوایە –پەنا دەگرین بە خوا) .

---

[١]- بنوارە بۆ –زاد المعاد– ٢١/١.

وه ماناى فەرموودەكە بەم شێوە دەڵێ: هەر كەس وەسفدارى حەزرەت ﷺ بكات بە شتێ كە وەسفدارى پێغەمبەر عیساى تیا كرابێ كە ماناى شەریك و هاوەڵى بۆ خوا تیا بێ، ئەوە وەك ئەوان وایە.

بەڵام وەسفدار كردن و ستایش كردنى بە شتێك كە لە هەقیقەتى مرۆڤایەتى دورى نەخاتەوە، وە باوەڕى وابێ كە ئەو پێغەمبەرەش بەندەى خوایە و ڕەوانە كراوە و دوربێ لە باوەڕى نەصاراكان، وە هیچ گومانى تیا نىیە كە مرۆڤێكى یەكتاپەرستە.

دَعْ ما آدعتهُ النصارى في نبيهم — وآحكم بِما شِئت مَدحاً فيه و آحتَكِمِ
فـإنَ فضـلَ رَسولَ اللهِ ليسَ لَهُ — حَـدٌ فيُعرِبَ عنـهُ ناطِق بــــفمِ
فـمبلَغُ العلـمِ فيــهِ أنَـهُ بَشَرٌ — وانَهُ خيرُ خلقِ اللهِ كُلِّـــــهِمِ[1]

---

[1]- كە ئەم شیعرانە لە دانراوى شێخى بویصریە و ناسراوە بە ( مولاى صل ) ، دێرە شیعرەكانى (٤٣ ، ٤٥ ، ٥١) كەراڤەو ماناى شیعرەكان دانەرى ئەم كتێبە نەینوسیوە، چونكە ڕوون و ئاشكرایە ، بەڵام من بە پێویستى دەزانم كە ڕاڤەیەكى بۆ زوبانى كوردى بكەم خوا پشتیوان بێ بەم شێوەیە:

١- واز بێنە لەو گومان و بۆچونانە كە نەصاراكان بەرانبەر پێغەمبەرەكەیان بردیان كە وتیان خوایە یان كوڕى خوایە، بەڵكو حوكم بە سیفەت و ڕێزێك بدە كە دوور بێ لە سیفاتى كەماڵ و بەرزى پلەى خوایەتى، ئەو كاتە كەس ناتوانێ بەرانبەرت بوەستێ.

٢- ستایش و سەناى پێغەمبەرى خۆشەویست بەپێى تواناى خۆت بیكە، چونكە فەزڵ و گەورەیىیەكانى ئەو كۆتایى نایەت و سنورێكى نىیە و خاوەن وتەكان لە وەسفەكان هیلاك دەبن و وەسفەكان هەر دەمێننەوە.

٣- ئەو سنورەى كە زانستى خەڵكى پێى گەیشتووە ئەوەیە كە حەزرەت ﷺ لە زاتى خۆیدا مرۆڤێكە، بەڵام باشترینى نێراوان و دروست كراوانى خواى پەروەردگارە كە خاوەنى ڕێز و گەورەیىیە لەلایەن خواوە.

دەبیـــنین كـــە خـــوای پـــەروەردگار بـــۆ خۆشـــی ستایشـــی پێغەمبـــەرە خۆشەویستەكەی دەكات و دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ القلم:٤، وە فرمانی كردووە بە خەڵكی و موسوڵمانان كە بە ئەدەبەوە لە خزمەتیا بوەستن و گفتوگۆ بكەن، بە ئایەتی ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ﴾ الحجرات: ٢. وە دەفـەرموێ پێمـان: وە ئاگادارمـان دەكاتـەوە كە نابێ هەڵسوكەوتمان لە خزمەتیدا وەك هەڵسوكەوتی نێوان خۆمـان بێ، یان نابێ بەو شێوەیە بانگی لێوە بكەین كە لەناو خۆمانـدا یـەكتری بـانگ دەكـەین، كـە دەفـەرموێ: ﴿لَا تَجْعَلُوا دُعَاء الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاء بَعْضِكُم بَعْضاً﴾ النور: ٦٣.

وە خـوای پـەروەردگار زەمـی ئـەو كەسـانە دەكـات كـە لـە مامەڵـەو هەڵسـوكەوتا جیـاوازی ناخەنـە نێـوان خۆیـان و ئـەو پێغەمبـەرەوە كـە دەفـــەرموێ: ﴿إِنَّ الَّـــذِينَ يُنَادُونَـــكَ مِـــن وَرَاء الْحُجُـــرَاتِ أَكْثَـــرُهُمْ لَـــا يَعْقِلُونَ﴾الحجرات:٤...

هاوەڵان (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لەسەر) ستایش و مەدحی حەزرەتی پێغەمبـەری خۆشەویسـتیان ﷺزۆر كـردووە، لەوانـە ئـەوە صـەحابی و هاوڕێ پێغەمبەرە ﷺ حەسانی كوڕی ثابت-كە لە مەدحیدا دەڵێ:

أغَرُّ عليـــه لِلنبوَةِ خـــاتَمٌ ... من اللهِ مَشهُودُ يَلوُحُ وَ يُشْهَدُ

وَضَمَّ إلا لَهُ مِنْ إسمَ النبيّ الى إسمِهِ ... إذا قالَ فِي الخمسِ المؤذنُ أشهدُ

وَشقَ لَهُ مِنْ إسمهِ لِيُجِلَّهُ ... فذو العَرشِ محموُدُ وهذا مُحَمَدُ

نبيٌّ أتانا بَعْدَ يأسٍ وَفَترةٍ ... مِنَ الرُسُلِ والأوثان فِي الأرضِ تُعبَدُ

فأمسى سِراجاً مُستنِراً و هادياً ... يَلوُحُ كما لاحَ الصقيلُ المُهَذَرُ

وانذرَنا ناراً وَبَشَرَّ جَنَةً ... وَعَلَمَّنا الأسلامَ فاللهَ نَحمَدُ

هەروەها دەڵێ:

يا رُكن معتَمَدٍ وَعِصمَة لائذٍ ... وَمَلاذَ مُنْتَجِعٍ وَجارَ مُجاوِرِ
يـا مَنْ تَخَيَّرَهُ الإله لِـخَلقِهِ ... فَحَباهُ بالخُلُقِ الزكيِّ الطاهِرِ
أنتَ النبيُّ وَخَيرُ عُصبةِ آدَمٍ ... يا مَنْ يَجودُ كفيضِ بَحرٍ زاخِرِ
ميكالُ مَعْكَ وَجبريلُ كِلاهُما ... مَدَدٌ لِنَصرِكَ مِنْ عَزيزٍ قاهِرِ

صەفیەتی کچی عبدالمطلب لە کاتی کۆچ کردنی حەزرەتدا بۆ خزمەت پەروەردگاری ئەم چەند دێرە دەڵێ:

أَلا يا رَسولَ اللهِ كنتَ رِجاءَنا ... وَكُنْتَ بِنا برّاً وَلَمْ تَكُ جافياً
وَكُنْتَ رَحيماً هادياً وَمُعَلِماً ... لَبيكَ عليكَ اليومَ مَنْ كانَ باكياً
صَدَقْتَ وَبَلَغْتَ الرِّسالةَ صادِقاً ... وَقُمْتَ صليبَ الدّين ابلَجَ صافياً
فِدىً لِرَسولَ اللهِ أُميِّ وَخالَتي ... وَعَمِّي وآبائِي وَنفسي وَ مالياَ
لَعَمْرُكَ ما أبكي النبيَّ لِفَقدهِ ... ولَكِنْ لِما أخشى مِنَ الهَرْجِ آتِياَ
كَأَنَّ عليَّ قَلبْي لِذِكْرِ مَحَمدٍ .... وَما خِفْتُ مِنْ بَعْدِ النبيِّ مَطاوِيا
فَلَوْ انَ رَبَّ الناسِ ابقى نبينا ... سَعِدنا ولكن امرُهُ كانَ ماضياً
عليكَ مِنَ اللهِ السَّلامُ تَحيةً ... وَأُدخِلْتَ جَناتٍ مِنَ العَدْنِ راضياً
افاطِمَ صَلَّى اللهُ رَبُّ محمدٍ ... على جَدَثٍ امْسى بِطَيِّبَةَ ثاوِياً

(ابـن مسـعود) لـە کتێبـی (الطبقـات)دا دەڵـێ ئـەو شـيعرانە لـە دانـراوی (ئەرِوای کچی عبدالمطلب)ە .

کەعب ی کوڕی زوهەیر کاتێ ستایشی پێغەمبەری کرد ﷺ ئەو پارچە قەصیدەیەی کە ناسراوە بە (بانَت سُعاد)ی لە خزمەتیا خوێندەوە و وتی:

بانَتْ سُعادُ فقلبي اليومَ مَبتوُلُ .... مُتَيَمٌ إثْرَها لَمْ يَفْدَ مَكبولُ
اُنْبِئْتُ انَ رَسولَ الله اَوْعَدَني .... وَالعَفْوُ عِندَ رَسولُ اللهِ مَأمُولُ
إنَّ الرَّسولَ لَنُورُ يُسْتَضاءُ بهِ .... مُهَنَّدٌ مِنْ سيُوفِ اللهِ مَسلول
في عُصَبةٍ مِنْ قُرَيشٍ قال قائِلُهُمْ .... بِبَطنِ مَكةَ لَمَّا اسْلَمُوا زُولوا

يَمشوُنَ مَشيَ الجَمالِ الزُّهرِ يَعصِمُهُم .... ضربٌ إذا عَرَّدَ السُّودُ التَّنابِيلُ

له گێڕانەوەکەی ئەبی بەکری کوڕی ئەلئەنباری دا هاتووە کە کاتێ کەعب گەیشتە ئەو وتەیەو وتی:

إنَّ الرَّسولَ لَنُورُ يُسْتَضاءُ بهِ .... مُهَنَّدٌ مِنْ سُيُوفِ اللهِ مَسْلولُ

حەزرەت ﷺ عەبایەکەی سەرشانی داگرت و هەڵیدا بۆ کەعب، وە معاویە دە هەزار دیرهەمی ئەو کاتەی پێدا کە بیداتێ، بەڵام کەعب ڕازی نەبوو وە کاتێ وەفاتی کرد، معاویە چەند کەسانێکی نارد بۆ لای میراتگرەکانی و ئەو عەبایەی بە بیست هەزار دیرهەم لێ کڕینەوە..

ئەوە حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ خۆی بۆ خۆی مەدح و ستایشی خۆی دەکات بە فەرموودەی:

(أنا خيرُ أصحاب اليمين) (أنا خيرُ السابقين) .

(أنا اتقى وُلِد آدم واكرمهم على اللهِ وَلا فخر)[١] .

(أنا اكرمُ الأولين والآخرين وَلا فَخر)[٢] .

(لم يلتق أبواي على سفاح قط)[٣] .

جبرەئیل (علیە السلام) دەڵێ: ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای زەوی هەمووی گەڕاوم نەمبینیوە پیاوێك لە محمد ڕێزدارتر بێ، وە نەمبینیوە نەوەی باوکێك ڕێزدارتر بێ لە بەنی هاشم[٤] .

لە ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە شەوی شەوڕەوێنی دا بوراقیان بۆ هێنا، بوراقەکە کەمێ قورسی نواند،

---

[١]- ابن عمر العدنی لە (مسندەکەیدا) ڕیوایەتی کردووە.

[٢]- ئەم فەرموودانە ئیمامی طبرانی و بەیهەقی لە(الدلائل)دا ڕیوایەتیان کردووە.

[٣]- ئیمامی ترمذي و دارمي ڕیوایەتیان کردووە.

[٤]- شەیخان ڕیوایەتیان کردووە.

جبرەئیل پـێی وت: بمحمـدٍ تفعل هـذا؟ بـۆ محمـد ئـاوا دەکـەی؟ بزانـە لـە پێشتردا کەسێك نەهاتۆتە سەر پشتت بەرێزتر بێ لـەلای خوا لـەم کەسـەیە، لێرەدا بوراقەکە هەموو گیـانی داهێنرایـە سـەر عـارەق (فمـا رکبـك أحد أکرم علی الله منه، فارفَضَ عَرَّقاً)[1] .

لـە فـەرموودەی ئـەبی سـەعیدەوە (ڕەزای خـوای لەسـەر) دەگێڕێتـەوە کـە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: (أنا سیدُ وُلدِ آدمَ یـومَ القیامـةِ وَلا فخـر، و بیـدي لواء الحمدِ وَلا فخر، وما من نبي یؤمئذٍ -آدَم فَمِن سواهُ- الاّ تحـتَ لِوائي، وَ أنا أولُ من تنشقَ عنهُ الأرضَ وَلا فخر)[2] .

من گەورەی و سەیدی نەوەی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەتدا شـانازیش ناکەم، ئالآی حەمد و سوپاسـگوزاری لـەنێوان دوو دەسـتەمدایە و شـانازی ناکـەم، لەو کاتەدا هیچچ نێرراوێکـی خـوا نیـیـە -لـە ئادەمـەوە تـا خـوارتر- مەگـەر لـەژێر ئـەو ئـالآ و لیوایـەی منـدایـە، وە مـن یەکـەم کەسـێکم کـە (زەوی)م بـۆ شەق دەکرێ و شانازیش ناکەم.

ئەنەس (ڕەزای خوای لەسەر) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أنا أولُ الناس خروجاً إذا بعثوا، وأنا خطیبُهُم اِذا وُفِدوا، وأنـا مُبَشـرِهُم اَذا أیسُوا، لِواءِ الحمدِ یؤمئذ بیدي، وأنا أکرم وُلدِ آدم علی ربي ولا فخرَ)[3] ، لـە کـاتی زیندووبوونـەوەدا مـن یەکـەم کەسـێکم کـە دەردەچـم بـۆ گۆڕپـانی مەحشەر، وە مـن دوانـدەو وتاربێـژیانم لـە کاتێکـدا کـە بـە وەفـد و تـاقم تـاقم دێنە ڕێوە، وە لە کاتێکدا کە تووشـی بـێ ئومێدی دەبـن مـن مـژدە دەریـانم،

---

[1]- بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە، وە ئەبو نەعیم و طبراني لە عائشەوە گێڕاویانەتەوە..

[2]- ترمذي ڕولیەتی کردووە وە دەڵێ: حسن صحیح.

[3]- ئیمامی ترمذي ڕوایەتی کردووە.

ئەو ڕۆژ و کاتەدا ئالاّ و لیوای حەمد و سوپاسگوزاری بە دەستی منەوەیە، وە من بەڕێزترینی نەوەکانی ئادەمم لەلای خوای خۆم و شانازیش ناکەم...

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (وأنا أكرمُ وُلد آدمَ على ربي، يطوفُ عليَّ ألف خادمٍ كانهم بيضٌ مكنون، أو لؤلؤ منثور)[1]

من بەڕێزترینی نەوەکانی ئادەمم لەلای پەروەردگارم، هەزار خزمەتکار لە چواردەورمدا دەسوڕێنەوە هەریەکەیان پارێزراون دەستی کەسیان پێ نەگەیشتووە (سپی یە وەك سپێتی هێلکە) یان (لە جێبەجێ کردنی ئیش و کاردا، وە لە زۆری ژمارەو جوانی ڕەنگ و ڕێکی لاشەو پۆشاك و ئەو ئاڵتون و زیوانەی کە پێوەیانە وا دەزانی خۆیان درەختێکی یەك پارچە لوئلوئین)[2]

لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: أنا أول من تنشق عنه الأرض فأُكسَي حلة من حلل الجنة، ثم اقومُ عن يمين العرشِ ليس أحد من الخلائق يقوم ذلك المقام غيري)[3] ، من یەکەم کەسێکم کە (زەوی)م بۆ شەق دەکرێ، پۆشاکێکی ئاڵتونی ئەپۆشم لە پۆشاکەکانی بەهەشت، پاشان لەلای ڕاستی عەرش ڕادەوەستم، کە ئەم شوێن و مەقامەیەم هیچ کەس لە دروستکراوانی خوا پێی نەگەیشتووە..

---

[1]- الدارمي ڕیوایەتی کردووە.

[2]- ئەم مانایەم لە تەفسیری ابن كثير وەرگرتووە لە تەفسیری دوو ئایەتی (صافات ٤٨) و (انسان ١٩).

[3]- ترمذي ڕیوایەتی کردووە وە ئەفەرموێ : حسن صحيح.

# پێغەمبەران مرۆڤن .... بەڵام!!

کۆمەڵێ لە خەڵکی وا گومان ئەبەن کە پێغەمبەران –صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ– لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا یەکسانن لەوەدا کە ڕەگەزی مرۆڤن و سەرجەم ئیش و کارەکانیان لە ژیان و مردن و دەسەڵات و نزیکی خوا و...هتد، کە ئەمە هەڵەیەکی ڕوونە و نەزانینێکی تەواوە، چونکە بە کۆمەڵێ بەڵگەی بەهێزی ڕاستی قورئان و فەرموودە ڕەدی ئەدرێتەوە..

ڕاستە ئەو پێغەمبەرانە هاوبەشن لەگەڵ هەموو نەوەکانی ئادەم لە هەقیقەت و ئەصڵی مرۆڤایەتی دا، وەك خوای گەورە ئاماژەی پێ دەکات و ئەفەرموێ:

﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾ الكهف: ١١٠، منیش مرۆڤێکم وەکو ئێوە، واتە لە ڕەگەزدا مرۆڤە وەکو ئێوە، بەڵام ئاگادارمان ئەکاتەوە کە زۆر لە سیفات و ڕەوشت و ئاکارەکاندا جیاوازییەکی تەواوی هەیە، گەر وا نەبێ تایبەتمەندی یە جیاکارییەکان و مەزیەت و گەورەیی ئەو پێغەمبەرانە لە چی دا دەردەکەوێ؟ یان ئەو وتەیەی کە دەڵێن خوا هەڵیان دەبژێرێ و پاکیان دەکاتەوەو وتەی (اصطفی) چۆن دێتە جێ؟؟!

لەم لێکۆڵینەوەماندا چەند شتێك لە سیفاتەکانی ئەو پێغەمبەرانە لە دونیادا ئەهێنینەوە، وە چەند تایبەتمەندییەکیشیان کە خوا پێیان دەبەخشێ لە ژیانی بەرزەخ و گۆڕیاندا باس دەکەین، کە هەموویان جێگیر بوون بە دەقی قورئان و فەرموودەی حەزرەت ﷺ.

# پێغەمبەران گەورەی مرۆڤەکانن

پێغەمبەران، هەڵبژێراوی خوای پەروەردگارن لەنێوان بەندەکان دا، خوا ڕێـز و شـەرەفیان پـێ ئەبەخشـێ بـە پلـەی نبـوەت و پێغەمبەرایـەتی، بـە بەخشـینی حیکمـەت و پەنـدیاری وە خـوای گـەورە هێـزی عـەقڵ و ڕاووبۆچوونی گومانبڕ و بیرتیـژی یـان بـەهێز دەکـات، پاڵفتـەیان دەکـات و هەڵیاندەبژێرێت بە شێوەیەك کە ببنە ناوەندێك لەنێوان خـوای پـەروەردگار و خەلقی خوادا، فرمانەکانی خوایان پێ ڕادەگەیەنن، لـە قـەهر و تـوڕەیی و سـزای خـوایی ئاگاداریـان ئەکەنـەوە، ڕێنومویـان دەکـات تـا سـەرفرازی و سـەعادەتی دونیـا و قیامـەتیان دەسـت بکـەوێ، خـوا ئیرادەی وابـووە کـە پێغەمبـەران لـە مـرۆڤ بـن تـا بتـوانن کۆکـەرەوە بـن لـەنێوان یاسـاکانی خـواو جێبـەجێکاری فەرمانەکـە، تـا خـەڵکی ببیـنن و لێـی تێبگـەن، تـا خـەڵکی شـوێن سـلوك و ڕەوشـتی ئـەو پێغەمبەرانـە بکـەون، کەواتـە بـوونی مرۆڤـی پێغەمبـەران خـۆی لـە خۆیـدا گـەورەترین موعجیزەیـە، ئـەوان لـە ڕەگـەزی مـرۆڤن و خـاوەنی کۆمـەڵێ هەڵسوکەوتی بـەرزن کە هـیچ کـەس لـە دروسـت کراوانی خوا پێیان ناگەن..

لێـرەوە تێبینـی کردنـی مرۆڤایـەتی سروشـتی نەزەریەیـەو بۆچـونێکی سەردەمی نەزانی و جاهیلیەیەتە، کە لە قورئان دا زۆر شایەتمان لـەم وتـەدا هەیە، لەوانە:

ئەو وتەیەی کە هۆزی نوح وتیان بە پێغەمبەرەکەیان کە خوا لەسـەر زاری ئەوان ئەیگێڕێتـەوە وتیـان: ﴿فَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قِوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَراً مِّثْلَنَا﴾ هود:٢٧ ئەوەی بێ باوەڕ بوون وتیـان ئێمـە تـۆ وا دەبیـنین کـە مرۆڤێکی لە ئێمە.

یان خوا باسی ئەو وتەمان بۆ دەکات کە قەومی موسا و هارون بەرانبەر بە پێغەمبەرەکەیان وتیان: ﴿فَقَالُوا أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَابِدُونَ﴾ المؤمنون: ٤٧ ، چۆن ئێمە باوەڕ بێنین بە دوو کەس کە وەك ئێمە مرۆڤن؟ .

وە لەوانە کۆمەڵی ثە مود بە پێغەمبەر صالح یان دەوت ﴿مَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِآيَةٍ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ الشعراء: ١٥٤

تۆ تەنها مرۆڤێکی وەکو ئێمە گەر ڕاست ئەکەیت لەوەدا کە پێغەمبەر و ڕەوانە کراوی خوابی فەرموو بەڵگەیەکمان نیشان بدە..

یان هاوڕێیانی (الأيكة) وتیان بە شوعەیبی پێغەمبەریان:
﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ . وَمَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ﴾ الشعراء: ١٨٥-١٨٦.

وتیان تۆ یەکێکی لەوانەی کە جادوو دەکەیت، وە تۆ نیت مەگەر مرۆڤێك نەبێ وەکو ئێمە وە ئێمە وا گومانی دەبەین کە تۆ لە درۆکارانی.

وە لەوانە وتەی موشریکەکان بەرانبەر هەقی پێغەمبەری سەردارمان ﷺ کە بە چاوی مرۆڤی سادەوە بۆی ئەیانواڕی، بۆیە دەیانووت:
﴿وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ﴾ الفرقان: ٧
وتیان ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە نان دەخوات و بە بازاڕ دەگەڕێ..

## سیفاتی پێغەمبەران ( علیهم السلام )

پێغەمبەران لەگەڵ ئەوەدا کە ڕەگەزی مرۆڤ بوون و نانیان دەخوارد و ئاویان خواردۆتەوە و لەش ساغ بوون یان نەخۆش کەوتوون و ژنیان مارە کردووە و بە بازاڕەکاندا گەڕاون، وە هەڵگری هەموو ئەو سیفەتانە بوون کە لە پلەکانی ژیاندا مرۆڤ تووشیان دەبێ وەك لاوازبوونی لاشەو پیرێتی و

مردن، بەڵام ئەوان هەڵگر بوون بۆ کۆمەڵێ تایبەتمەندی و چەندەها سیفاتی بەرز، کە بۆ ئەوان پێویست بووە و یەکێ بووە لە زەرورەتەکانیان، کە بە کورتی ئەو سیفەتە جوانەیان کورت دەکەینەوە لە شەش خاڵدا:

یەکەم: ڕاستگۆیی..

دووەم: گەیاندنی پەیام .

سێیەم: ئەمانەت پارێزی..

چوارەم: فیطرەت پاکی (الفطانة).

پێنجەم: بێ گەردی لە عەیب و قێزەونی..

شەشەم: مەعصومی (بێ گوناهی) .

لێرەدا شوێنی ئەوەمان نییە کە بە درێژی لەسەر ئەم سیفەتانەیان بدوێین، کە ئەو باسە لە پەڕتووکەکانی –توحید–دا هەستاوە بەم ئەرکە ، لێرەدا هەندێ لەو سیفەتانە دێنینەوە کە سەردارو گەورەی پێغەمبەران و خۆشەویستی خوا حەزرەتی محمد ﷺ جیا دەکاتەوە لە سەرجەم مرۆڤەکان .

## پێغەمبەر ﷺ لە پشتی سەریەوە شتی بینیوە وەك چۆن لە پێشی سەریەوە بینویەتی..

شێخان ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: ((هل ترون قبلتي ها هنا؟ ئایا ئێوە قیبلەکەی من دەبینین لێرەوە؟ (فوالله ما يخفى عليَّ ركوعكُم وَلا سجُودُكم إني لأراكم من وراء ظهري)) قەسەم بە زاتی خوا هیچ شتێك لە رکوع و سەجدەکانتانم لێ شاراوە نییە، من لە پشتی سەرمەوە ئەتانبینم.

پێسەوا موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: ((أيها الناس إني إمامَكم فلا تسبَقوني بالركوع ولا بالسجود وَلا بالقيام ولا بالأنصراف فإني أراكم أمامي وَ مِن خلفي..))

ئەی خەڵکینە، من پێشەوای ئێوەم لە ڕکوع و سوجدە و بەرزبوونەوەو ڕۆیشتنی دوای نوێژ پێشم مەکەون، من ئەتانبینم لە پێشمەوەو لە دوامەوە.

عبدالرزاق هێناویەتی لە (مصنف)یدا، و حاکم و ئەبو نەعیم ئەگێڕنەوە لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((إني لأنظر الى ما ورائي كما أنظرُ الى ما بين يدي)) .

من لە پێشی سەرمەوە ئەتانبینم هەروەك چۆن لەنێوان دوو دەستمدا ئەتانبینم.

-ئەبو نەعیم هێناویەتی لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إني أراكم من وراءِ ظهري)) من لە پشتی سەرمەوە ئەتانبینم...

## حەزرەت ﷺ شتێك ئەبینێ کە ئێمە نایبینین وە شتێك ئەبیستێ کە ئێمە نایبیستین

لە ئەبی زەڕەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إني أرى ما لا ترون و اسمعُ ما لا تسمعون))..

من کۆمەڵە شتێ دەبینم کە ئێوە نایبینن، وە کۆمەڵێ شت ئەبیستم کە ئێوە نایبیستن، ئاسمان خۆی ڕاکێشاوە و هەقی خۆشیەتی کە خۆی درێژ بکاتەوە، شوێنێکی تیا نییە لە چوار پەنجە کەمتر بێ مەگەر فریشتەیەك ناوچەوانی داناوە و کڕنوش بۆ خوا دەبات، قەسەم بە خوا ئەگەر ئەوەی من

ئەیزانم ئێوە بتانزانیایە ئەوە کەم پێدەکەنین و زۆر ئەگریان، وە هەرگیز لەسەر جێگاکانتان لەزەتتان لە ئافرەتەکانتان نەدەبرد، وە ئەچوونە سەر شوێنە چۆڵەکان و هاوار و ناڵەتان بۆ لای خوا دەبرد...[1]

ئەبو زەڕ دەڵێ: ئاواتم خواست کە من درەختێك بوومایە..

## بن باڵی پیرۆزی حەزرەت ﷺ

شێخان هێناویانە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەڵێ:

(رايتُ رسول الله ﷺ يرفَعُ يديه في الدُعاءِ حتى يُرى بياضُ إبطيه) پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە لە پاڕانەوەکانیدا دەستەکانی بەرزکردبۆوە، هەتا سپیایی بن باڵی پیرۆزی دەبینرا...

-ابن سعید لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێ: (کان النبيّ ﷺ إذا سجد يُرى بياض إبطيهِ) هەر کاتێ سەجدەی ببردایە سپیایی نورینی بن باڵەکانی دەبینرا...

کە لەم بارەوە صەحابەکان زۆر فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە..

(المحب الطبري) دەڵێ: یەکێ لە تایبەتمەندی‌یەکانی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە: بن باڵی هەموو مرۆڤێ ڕەنگی دەگۆڕێ غەیری حەزرەتی پێغەمبەر نەبێ..

وە (القرطبي) هەمان وتەی هێناوە و ئەوەشی بۆ زیاد کردووە کە دەڵێ (وانه لا شعر فيه) کە مووی پێوە نەبووە.

---

[1]- احمد و ترمذي و ابن ماجة ڕیوایەتیان کردووە.

## پێغەمبەر ﷺ پارێزراو بووە لە -باوێشك دان-

پێشەوا بوخاری لە -التأریخ-دا هێناویەتی، وە (ابن ابي شيبة) لە -المصنف-دا وە (ابن سعيد) لە یەزیدی کوڕی ئەصەم، دەڵێن: (ما تثاءَب النبيّ ﷺ قطُ) هەرگیز پێغەمبەر ﷺ باوێشکی نەداوە..

وە ئیبن ئەبی شیبە لە موسلەمەی کوڕی عبدالملك ی کوڕی مەڕوان هێناویەتی دەڵێ: (ما تثاءَب نبيٌ قط) هەمان مانا دەبەخشێ.

## عارەقی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ

ئیمامی مسلم ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لامان و قەیلولەیەکی لەلای ئێمە کرد، عارەقی کردەوە، دایکم هات و شوشەیەکی هێناو عارەقەکەی لاشەی پێغەمبەری کۆکردەوە، حەزرەت ﷺ بەخەبەر هاتەوە و فەرمووی: ئەی ئومو سەلیم، ئەوە تۆ چیت دروست کرد؟ عەرزی کرد: (عرقٌ نجعلهُ في طيبنا، وّهو أطيبُ الطيب) ئەوە عارەقێکە لە بۆنە خۆشەکانمان تێکە دەکەین، خۆشترین بۆن خۆشی بۆن خۆشەکانە.

- لە ڕێگەیەکی ترەوە هاتووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ماڵی أمُ سليم و قەیلولەیەکی کرد، وە زۆر عارەقی دەکرد، ئەویش عارەقەکەی بۆ کۆکردەوە و تێکەڵی بۆنە خۆشەکانی خۆیی کرد، حەزرەت ﷺ بەهۆش هاتەوە فەرمووی: ئەوە چیت کرد؟ فەرمووی: بە ئارەقی تۆ عەترەکانم بۆن خۆش دەکەم (عرقُكَ أذوفُ بهِ طيبي)..

# باڵا بەرزی حەزرەت ﷺ

ئیبنو ئەبی خەیثەمە لە -تأریخ-و بەیهەقی و ئیبنو عساكر هێناویانە لە خاتوو عائشەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە:

(لم يكن رسول الله بالطويل البائن ولا بالقصير المتردد، وكان ينسبُ الى الربعة إذا مشى وحده، ولم يكن على حال يماشيه أحدٌ مِنَ الناس ينسبُ الى الطول الا طالَهُ رسول الله ﷺ ولربما اكتنفه الرجلان الطويلان فيطولهما، فإذا فارقاه نُسِبَ رَسُول الله ﷺ الى الربعةِ) .

حەزرەت ﷺ نە ئەوەندە باڵا بەرز بووە ناشرین بێ، وە نە ئەوەندە كورتیش بووە عەیبدار بێ، ئەگەر تەنها خۆی بڕۆیشتایە بە ڕێگەدا چوار شانە ئەینواند، ئەگەر یەكێ لە پاڵیا بڕۆیشتایە چەندە باڵا بەرز بووایە حەزرەت ﷺ باڵابەرزتر دەبوو لەسەری، ئەگەر بكەوتایەتە نێوان دوو باڵابەرزەوە باڵای پێغەمبەر ﷺ بەرزتر دەیڕوانی، كە ئەو دووانە لێی دوور دەكەوتنەوە باڵای دەبوەوە بە چوار شانەیی..

ئیبنو سەبع لە -الخصائص-دا هەمان وتەی سەرەوەی هێناوە و ئەوەشی بۆ زیاد كردووە كە دەڵێ: (أنه كان إذا جلس يكون كتفه أعلى مِن جمعِ الجالسين) ئەگەر دانیشتبووبووایە شانی لە هەموو دانیشتوان بەرزتر ئەینواڕی...

## سێبەری حەزرەت ﷺ

حەکیمی تورموزی ڕیوایەتی کردووە لە (ئەکوان)ەوە کە حەزرەت ﷺ: (لم یکن له ظِلُ في شمسٍ ولا قمر) ، سێبەری نەبووە نە لەبەردەم خۆر و نە لەبەردەم مانگ دا...

(ابن سبع) لە —الخصائص—دا دەڵێ: سێبەری موبارەکی ناکەوێتە سەر زەوی وە پێغەمبەر ﷺ سێبەرەکەی نور بووە، هەرکات بڕۆیشتایە بە ڕێگەدا لە شەودا یان لە ڕۆژدا سێبەری نەدەبینرا..

وە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەوە دوعا و پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ خۆی بووە کە فەرموویەتی: (واجعلني نوراً) .

* * *

## خوا پاراستویەتی لە مێش

قاضي عیاض لە —الشفاء—دا باسی کردووە، وە ئەلعەزەفی لە (مولد)دا هێناویەتی: یەکێ لە تایبەتمەندەکانی حەزرەت ﷺ ئەوە بوو کە مێش لەسەر گیانی نەدەنیشتەوە (أنهُ کان لا ینزل علیه الذباب)..

(ابن سبع) لە —الخصائص—دا ئەڵێ: (إنَهُ لَم یقع علی ثیابه ذباب قط) وە ئەوەشی بۆ زیاد کردووە کە (أن من خصائصه ﷺ انَّ القُمل لم یکن یؤذیهُ) واتە یەکێ لە تایبەتمەندییەکانی حەزرەت ﷺ ئەوەیە کە (کنێچ)ەکان هیچ ئازارێکی پێغەمبەریان نەداوە.

## خوێنی حەزرەت ﷺ

البزار و ئەبو یەعلا و طەبەرانی و الحاکم و بەیهەقی لە عبداللە ی کوڕی زوبەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە کە عبداللە هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا خوێنی کەڵەشاخی دەگرت، کاتێ لێبوویەوە فەرمووی:

(یا عبداللە إذهب بهذا الدم فأهرقهُ حیث لا یراك أحد) ئەی عبداللە ئەو خوێنە ببە لە شوێنێکا ڕۆی بکە کە کەس نەتبینێ. ئەویش چوو خوێنەکەی خواردەوە و گەڕایەوە، فەرمووی: ئەی عبداللە چیت لە خوێنەکە کرد، عەرزی کرد: لە شوێنێکدا شاردمەوە کە کەس نەیبینێ و کەسیش نەزانێ لە کوێدایە، حەزرەت ﷺ فەرمووی: (لعلكَ شربتهُ) ناشێ خواردبێتتەوە؟ وتی: بەڵێ، حەزرەت ﷺ فەرمووی: (ویل للناس منك و ویل لك مِن الناس) ئەیانبینی لەو ڕۆژەوە ئەو هێز و قوەتە لە عبداللە دا بوو نموونەی نەبوو بەهۆی ئەو خوێنەوە بوو..

## خەوی پێغەمبەر ﷺ

شێخان ڕیوایەتیان کردووە لە خاتوو عائشەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە دەگێڕێتەوە کە وتی: (یا رسول اللە أتنامُ قبل أن توتر؟) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەخەوی پێش ئەوەی کە نوێژی وەتر بکەیت؟ فەرمووی: ( یا عائشة! إنَّ عینی تنامان وَ لا ینام قلبی ) ئەی عائشە چاوەکانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێ .

ئەبونەعیم هێناویەتی لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (تنام عینی ولا ینام قلبی) چاوەکانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێ.

وه شێخان ڕیوایەتیان کردووه لـه ئەنەسـی کوڕی مالکەوه کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: (الأنبيـاء تنـام أعيـنهم ولا تنـام قلـوبهم) ، پێغەمبـەران چاوەکانیان ئەخەون بەڵام دڵیان وریایەو ناخەوێ..

## پێغەمبەر و چوونه لای خێزانەکانی

پێشـەوا بوخـاری لـه ڕێگـەی قتـادەوه ڕیوایـەتی کـردووه لـه ئەنەسـەوه (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەڵێ:

(كان النبيّ ﷺ يدور على نسائه في الساعة الواحدة مِنَ الليلِ و النهار وهن إحدى عشرة، قلت لأنس: أو كان يطيقه؟ قال: كنا نتَحَدَّثُ أنَهُ أعطيَ قوة ثلاثين) ، واته پێغەمبەری خوا ﷺ له ماوەی یـەك کاتـژمێردا ئەگـەڕا بەسـەر خێزانەکانیدا کە ژمارەیان یانزه ئافرەت بوون، وتم بـه ئەنـەس ئـەی توانـای هـەبوو؟ وتـی: ئێمـه لـەناو خۆمانـدا ئـەمانووت: پێغەمبـەر ﷺ توانـای سـی پیاوی دراوەتێ..

## پارێزراوی حەزرەت ﷺ له حاڵەتی -شەیتانی بوون-

طـەبـەرانی هێناویـەتی لـه ڕێگـەی عەکرەمـەوه لـه ئیبنـو عەباسـەوه، وه دەینوری له (المجالسة)دا له ڕێگەی مجاهدەوه له ئیبنو عەباسەوه هێناویەتی: دەڵێ: (ما احتلم نبيٌّ قط وإنما الأحتلام مِنَ الشيطان) ، هـەرگیز پێغەمبـەر ﷺ ئیحتلامی نەبووه، چونکه ئیحتلام بوون له شەیتانەوەیە.

# کورتەیەکی سوود بەخش

هەندێ لە زانایان و هۆنەران هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەریان ﷺ کردووە بە شیعر، کە بڵێن لە ڕەگەزی مرۆڤە بەڵام بەم تایبەتمەندیانە جیاکراوەتەوە بۆیە دەڵێن:

خُصَّ نبيّنا بِعَشَرَةِ خصال ... لم يحتَلِمْ قَطُّ وَما لَهُ ظلالُ
والأرضُ ما يَخرَجُ منهُ تَبتَلِعْ ... كذلكَ الذّبابُ عَنهُ مَمْتَنِعْ
تنامُ عيناهُ وَقلب لا يَنام ... مِنْ خَلْفه يَرى كما يَرى امامْ
لَمْ يَتثاءَبْ قَطّ وهي السابَعَة ... وَلِدَ مَختُونَاً إلَيها تابعَة
تَعْرفَه الدّوانِ حِينَ يَركَبُ ... تأتي إليهِ سُرْعَةً لا تَهرُبُ
يَعْلوُ جلوسُهُ جُلُوسَ الجلسا ... صلى الله عليهِ صُبْحاً و مَسا

ئێمە لە باس و لێکۆڵینەوەی پێغەمبەرایەتی لە (بەشی دووەم) هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی ژیانی پێغەمبەرایەتیمان یاداشت کردووە، یوختەی باسەکەمان ئەوەیە کە ئەم تایبەتمەندیانە زۆرن، کە تیایدا سەنەدەکەی ڕاست و دروستە، وە هەیانە ڕاست نییە، وە هەشیانە لەنێوان زانایان دا جیاوازی ڕای لەسەر هاتووە، هەیانە بەڕاستی دەزانین و هەندێکیشیان ڕای پێچەوانەی هەیە و بۆچوونیان لەسەری جیاوازە، وتەی زانایان هەر لە دێر زەمانەوە لەسەر ڕاست و هەڵەی ئەم بابەتانە، وە دروستی و بەتاڵیان دەسوڕێتەوە، نەك لەسەر کوفر و ئیمانداری، ئێمە کۆمەڵێك لەم تایبەتمەندیانەمان کە ڕاست و دروستە بۆ باس کردوون، وە تایبەتمەندییە پەسەند و وەرگیراوەکان یان ناڕاستەکانی گواستۆتەوە، بۆ ئەوەی ببن بە شاهیدێك لەسەر ئەوەی کە باسمان کردووە، لەسەر لەخۆبوردوویی و ئەمەکداری هەندێك لە پێشەوایانی فەرموودەناس کە لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی باسەکەیان کردووە، وە مەبەستی ئێمە لەم وتانە لەسەر دروستی یان نادروستی، جێگیری و ناجێگیری ئەو تایبەتمەندیانە نییە، (خۆشتان تێڕامان بکەن).

## چەمكێ لە (تەبەروك)

زۆر لە خەڵكی بەهەڵداچوون لە هەقیقەتی تەبەروك وەرگرتن بە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ و ئاسارەكانی و ئال و بەیتی و زانایان و دۆستانی خوا، وە ئەوەی بەم پەیڕەوەدا بڕوات بە گومڕاو هاوەڵ دانەر وەسفی دەكەن. هەروەك چۆن خوویان پێوەگرتووە كە هەر شتێك كە لە بیری تەسك و ئیدراكی كورتیان دا جێگەی نەبێتەوە ئەوە بە كوفری دەزانن..

پێش ئەوەی بەڵگەو شاهیدەكان لەسەر دروستی تەبەروك ڕوون بكەینەوە پێویستە ئەوە بزانین كە تەبەروك بریتی یە لە تكاكاری و تەوەسولێك بۆ خزمەتی خوای گەورە بەو كەسەوە كە خاوەنی تەبەروكەكەیە، ئیتر یەكسانە ئەو شتەیە خۆی بێ یان ئاسار و شوێن دەستی بێ یان جێگاكەی بێ..

تەبەروك بە كەسەكەوە، بەو باوەڕەی كە خاوەنی فەضڵ و ڕێزێك و نزیكیەیە لە خوای پەروەردگارەوە، كە هیچ شتێ یان كەسێ ناتوانێ خێر و چاكە بهێنێ یان خراپەت لێ دوور بخاتەوە مەگەر بە ئیزنی خوای گەورە نەبێ..

وە تەبەروك بە ئاثارەكانەوە، بەو باوەڕەی كە ئەو شتە نسبەتی دراوە بەلای كەسەكەوە كە بەهۆی كەسەكەوە ئەم شتەش ڕێزی پەیدا كردووە و خۆشەویست بووە لەبەر خۆشەویستی بۆ خاوەنەكەی.

وە تەبەروك بە شوێن، بەو باوەڕەی كە ئەو شوێنە بۆ خۆی هیچ ڕێزێكی نیەیە، بەڵكو بەهۆی ئەو خێر و چاكەو ڕەحمەتەوەیە كە ڕژاوە بەسەر كەسەكەدا كە لەویا دانیشتووە، وەك نوێژ و ڕۆژووەكان، ئەبنە هۆی هاتنە خوارەوەی ڕەحمەتەكان، فریشتەكان ئامادە ئەبن و سەكینەت بڵاو

دەکەنەوە، کەواتە تەبەروکە بەو سەکینەت و ڕەحمەتەیە کە لەو شوێنەدا بەهۆی خاوەنەکەیەوە ڕژاوە..

وە با بزانین کە ئەم تەبەروك وەرگرتنە هاوەڵانی حەزرەت ﷺ کردوویانە و بەڵگەو شایەتەکان زۆرن، کە لێرەدا هەندێکیان دەهێنینەوە:

## یەکەم/ تەبەروك وەرگرتن بە موو وە تفی موبارەکی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ

لە جەعفەری کوڕی عبدالله ی کوڕی حەکەمەوە دەڵێ: لە ڕۆژی شەڕی یەرموك دا خالیدی کوڕی وەلید قەلەنسۆکەی سەری لێ وون بوو بوو، فەرمووی بگەڕێن بۆم بدۆزنەوە، نەیاندۆزیەوە، جارێکی تر فەرمووی بڕۆن بۆم بدۆزنەوە، دۆزیانەوە قەلەنسویەکی کۆن بوو هیچ تازەییەکی پێوە دیار نەبوو، خالید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ عەمرەکەی کرد و سەری چاك کرد (واتە قژی تاشی) خەڵکی دەگەڕان بە چوار دەوریا و قژەکانی ئەملا و لای سەری پێغەمبەریان کۆکردەوە، منیش پێش کەوتم و موەکانی پێشی سەری پێغەمبەرم بە نسیب بوو، لەو ڕۆژەوە خستوومەتە ناو ئەم قەلەنسۆوە، هیچ شەڕێکم نەکردووە مەگەر ئەم قەلەنسوەم بە موەکانەوە پێ بووە، وە بە هۆیەوە خوا (ڕزقی) سەرکەوتنی پێ بەخشیبووم [١] ...

---

[١]- هەیثهمی دەڵێ: طبرانی ڕیوایەتی کردووە، وە ابو یعلی لە هەمان شێوەی هێناوە وە پیاوەکانی ڕاستگۆن، وە جعفر لە کۆمەڵێ لە صەحابەکانەوە ئەم وتەیەی بیستووە، بەڵام نازانم لە خالید خۆیەوە بیستویەتی یان نا، بنواڕە بۆ (مجمع الزوائد) ٣٤٩/٩، وە بۆ (المطالب العالیة)ی ابن حجر ٩٠/٤، وە تیایدا هاتووە کە خالد فەرمووی: (فما وجهتُ في وجه الاّ فتح لي).

* لـــه مـــاليكی كـــوڕی حـــەمزەی كـــوڕی ئـــەبی ئەســـيری ســـاعيدی خەزرەجیيـەوە، لـە باوكيـەوە، لـە باپيريـەوە ئـەبی سـەيد، كـە لەمەدينـەدا بيرێكی هەبوو بەناوی بيری (بُضاعة)، ئەو بيرە بوو كە پێغەمبەر ﷺ تفی موبارەكی فڕێدايە ئاوی، ئاوی لێ دەخواردەوە و بەرەكەتی لێ وەردەگرت.[١]

## عروەی كوڕی مەسعود هەڵسوكەوتی صەحابەمان لە خزمەت پێغەمبەردا بۆ وەصف دەكات ﷺ

ئيمامی بوخاری ڕيوايەتی كردووە بە سەنەدی خۆی لـە مەسوری كوڕی مەخرەمـە و لـە مەڕوانـەوە، دەڵـێن: عـەروە ئـەو كەسـەی بـە تفـی موبـارەكی پێغەمبەر ﷺ چاوی چاك بۆوە ئەيووت: قەسەم بە خوا حەزرەتی پێغەمبـەر ﷺ تفێك يان بەڵغەمێكی فڕێ نەداوە مەگەر لە دەستی يەكێ لـەو پياوانـەدا بـووە، ئـەيانهێنا بـە دەسـت و لاشـەو دەم و چـاوياندا، كاتـێ فرمـانێكی دەفـەرموو هـەموو ئامـادەيی يـان دەردەبـڕی، كاتـێ دەسـت نوێـژی ئەشـت لەسەر ئاوی دەست نوێژی خـەريك بـوو شـەڕيان دەكـرد، كاتـێ فەرمايشـتی بكردايە هەموو لە خزمەتيدا بێ دەنگ دەبوون، ئەگـەر قسـەيان بكردايـە لـە خزمەتيا دەنگيان نزم دەكردەوە، نەيانتوانيوە پڕاو پڕ سەيری دەم و چاوی بكـەن لەبـەر ڕێـز كـە لێيـان گرتـووە، عـەروە گەڕايـەوە نـاو هـاوەڵانی و فەرمووی: (ئەی كۆمەڵ و هۆزەكەم، وەڵڵاهی بووم بە وەفد بۆ لای مـەليك و پاشاكان، بۆ لای قەيصـەر و كيسـرا و نەجاشـی، وەڵڵاهـی هـيچ پاشـايەكم نـەديووە كـە هـاوەڵانی ڕێـزی لێ بگـرن بەقـەد ئـەو ڕێـزەی كـە هـاوەڵان لـە پێغەمبـەريان گرتـووە، وەڵڵاهـی گـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەڵغـەم يـان تفـی موبـارەكی فـڕێ بدايـە مەگـەر دەكەوتـە دەسـتی يـەكێ لـە هاوەڵانيـەوە، وە

---

[١]- طبرانی ڕيوايەتی كردووە وە دەڵێ (رجاله ثقات)

ئەیانهێنا بە لاشەو دەم و چاویاندا، کە فرمانێکی بکردایە هەموو سەریان بەرز دەکردەوە و ئامادەییان نیشان ئەدا، گەر دەست نوێژی بشتایە لەسەر ئاوەکە شەڕیان دەکرد، کاتێ فەرموودەی بکردایە بێ دەنگ دەبوون لە خزمەتیدا، وە سەیری دەم و چاویان نەدەکرد لەبەر ڕێز لێگرتنی)[١] .

## ڕای ئیبنوحەجەری حافظ لەسەر ئەم چیرۆکە:

ابن حجر (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ:[٢]

(ئەمە نیشانەیە لەسەر پاکێتی تف و بەڵغەم و مووی پێغەمبەر ﷺ وە نیشانەیە لەسەر تەبەروك وەرگرتن بە پاشماوەکانی پیاوچاکانەوە، ئەمە ئاماژەیە بەو خاڵەی کە هاوەڵان بە زوبانی حاڵیان دەڵێن: هەرکەس پێشەواکەی خۆی خۆش بوێ بەم شێوەیە، وە ڕێزی لێ بگرێ بەو ڕێزە گەورەیە، چۆن گومانی ڕاکردن لێی دەکرێ و گومانی تەسلیم کردنی بە دوژمن ببرێ؟ بەڵکو ئەوان سوور بوون لەسەر سەرخستنی خۆی و دینەکەی و خوێنیان لە پێناویدا ڕشتووە؟...هتد.

---

[١]- بوخاری لە بەشی (باب الشروط في الجهاد)دا ڕیوایەتی کردووە.

[٢]- ابن حجر لە (فتح الباري)دا هێناویەتی (٣٤١/٥).

## حەزرەت ﷺ ئامۆژگاریان دەكات

## كە ئاوی دەست نوێژی بپارێزن

لـە طلـق ی كـوڕی عەلیـەوە دەڵـێ: بـە وەفـدێك دەرچـووین بـۆ خزمـەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وە بەیعەتمان لە خزمەتدا كرد و نوێژمان لە خزمەتیدا خوێنـد، وە هـەواڵمان پێـدا (أنّ بأرضـنا بیعةً[1] لنـا، فاسـتوهبناهُ مِـن فضـلِ طهـوره) ، واتــە: لــە زەویەكەمانــدا كەنیســەیەك هەیــە، داواكــارین كــە لــە پاشماوەی ئاوی دەست نوێژی پێمان عەتا بفەرمووی، پێغەمبەریش ﷺ داوای ئـاوی كـرد و دەسـت نوێـژی شـت و ئـاوی لـە دەمـی ڕادا و ئاوەكـەی دەمی و ئاوی دەسـت نوێژەكـەی بـۆ كردینـە شـتێكەوە وە فـەرمووی پێمـان: (اخرجـوا فـإذا اتیـتم ارضـكم فأكسـروا بیعـتكم وانضـحوا مكانهـا لهـذا المـاء واتخذوها مسجداً) واتـە: (بڕۆنـەوە هـەركات گەیشـتنەوە زەویـەكانی خۆتـان ئـەو كەنیسـەیە بشـكێنن و ئـەو شـوێنەیە بـەم ئاوەیـە ئـاوپرژێن بكـەن و لـە شوێنەكەیدا مزگەوتێك دروست بكەن).

ئێمەش عەرزمان كرد: وڵاتەكـەی ئێمـە دوورە و دونیـاش گەرمـە، ئاوەكـە ئەبێتە هەڵم (واتە ناگاتە شوێنی خۆی)، حەزرەت ﷺ فەرمووی: (مُدوهُ مِنَ الماء، فإنَهُ لا یزیدهُ إلاّ طیباً) بە ئـاوی تـر درێـژی بكەنـەوە واتـە ئـاوی تـری تێبكەن، چونكە ئەو ئاوەی تر تەنها چاكێتی و پاكێتی زیاد دەكات[2] ..

ئـەم فەرموودەیـە یەكێكـە لـەو بنـەما پـەند ئـامێزەی كـە ناوبـانگی پەیـدا كردووە لەسەر دروستی تەبەروك وەرگرتن بە پێغەمبەر و ئاسارەكانی وە بە

---

[1]- البیعة: بە مانا كەنیسـە و كڵێسـای جولەكـە و گاورەكانـە، وەك خـوا لـە قورئانـدا فەرموویەتی: ﴿لَّهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيراً﴾ الحج: ٤٠ ( وەرگێڕ ) .

[2]- النسائي ڕیوایەتی كردووە، وە لە (المشكاة)دا هاتووە بە ژمارە (٧١٦)

هەر شتێك كە بدرێتە پاڵ حەزرەتەوە، حەزرەت ﷺ خۆی فرمانی كرد و ئاوی دەست نوێژی كردە شتێكەوە، وە پاشان فرمانی پێكردن لەگەڵ خۆیاندا ببیەن تا مەبەستەكەو داواكەیان بۆ بێتە دی... كە ئەمە نهێنیەكی زۆر بەهێزە لە باوەڕبوون بە تایبەتمەندی‌یەكانی پێغەمبەر ﷺ لە نەفسیاندا دروست دەكات، لە كاتێكدا كە لە مەدینەدا ئاوی تری زۆر اێیە، بەڵكو وڵاتی خۆیان پڕە لە ئاو، ئەی بۆچی ئەم ئەزیەت و ناڕەحەتی باركردن و نەفەوتانی ئەو كەمە ئاوەیە ئەخاتە ئەستۆیان، لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر، لەگەڵ دووری ڕێگە و گەرمای بەر خۆردا؟ .

بەڵێ: ئەمانە هەموو بە لایانەوە گرنگ نەبووە، چونكە هەڵگرتنی ئەو ئاوەیە ئەبێتە هۆكار بۆ لابردنی ناڕەحەتیەكانیان، تەبەروك وەرگرتنە بە پێغەمبەرو پاشماوەكانی، كە ئەو پێغەمبەر و پاشماوانە لە وڵاتی خۆیان نی‌یە و دەست ناكەوێ، بەڵكو حەزرەت ﷺ دووبارەی دەكاتەوە و تەئكیدیان ئەكات وە فرمانیان پێ ئەكات كە ئاوی تری تێ بكەن تا گەرمای ڕێگەكەیان نەیفەوتێنێ، كە ئەمەش نیشانە بووە لەسەر ئەوە كە ئەو بەرەكەتە لە ئاوەكەدایە بەرەكەتی پێغەمبەرە و ئەمێنێتەوە و زیادیش ئەكات، وە بەردەوامەو بەو ئاوە تازەیەشەوە ئەلكێ و ئەویش تەبەروك دار دەكات.

## تەبەروك وەرگرتن بە موەكانی پێغەمبەر ﷺ لەدوای وەفاتی

لە عثمانی كوڕی عبدالله ی كوڕی موهب، دەڵێ: خانەوادەكەم ناردمی بۆ لای ئوموسەلەمە بۆ پەرداخێ لە ئاو، ئوموسەلەمە هەڵسا شتێكی زیوی هێنا كە چەند موویەكی لە موەكانی پێغەمبەر ﷺ تیا بوو پێیان دەوت (جلجل)، ئەوە هەركات یەكێ تووشی چاو یان هەر نەخۆشیەكی تر ببوایە ئەو مووەیان تێكەڵ دەكرد بە كەمێ ئاو ئەیاندایێ بۆ شیفا، منیش سەیری ئەو جەلجەلەم كردو تاڵە موەكانم بینی ڕەنگیان سورباو بوو [1] .

حافظی ابن حجر لە -الفتح-دا دەڵێ: وەكیع لە (مصنف)ەكەیدا دەڵێ: ئەو جەلجەلە لە زیوو بوو وە چواردەوری توند كرا بوو بۆ پارێزگاری لە موەكانی پێغەمبەر ﷺ وە لەلای (أم سلمە) دانرا بوو، وە جەلجەلە ئەشوبهێ بە زەنگ كە لە زیوو یان لە زەردی یان مس دروست دەكرێ كە ئەو بەردانەی لەناویایەتی و دەنگەكە دروست دەكات لێی دەردەهێنن، هەركات پێویستی بە چاك كردن بوو تێ ی دەخەنەوە [2] .

پێشەوا (العیني) دەڵێ: ڕوونكردنەوەی ئەمە ئەوەیە:

كە أمُ سلمە چەند تاڵێ لە مووەكانی پێغەمبەری لەلایە پارێزراوە لەناو ئەو جەلجەلەدا، وە خەڵكی لە كاتی نەخۆشیاندا تەبەروكیان پێوە دەكرد، وە شیفایان بۆ دەهات بەهۆی ئەو تەبەروكەوە، وە لەو موە پیرۆزەیان وەردەگرت و هەڵیان دەكێشایە پەرداخێ یان جامۆڵكەیە ئاوەوە و ئەو ئاوەیان دەخواردەوە كە تاڵە موەكانی بەركەوتووە، بەمەش شیفایان بۆ دەهات، كەس و كاری عثمان لەو ئاوەیان دەست كەوت و خواردیانەوە و شیفای نەخۆشیان هات، پاشان بە عثماندا ئەو پەرداخەیان ناردەوە بۆ أمُ

---

[1]- ئیمامی بخاری لە (كتاب اللباس) باب ما یذكر في الشیب-دا ڕیوایەتی كردووە.

[2]- بنواڕە بۆ (فتح الباري)ی ابن حجر (١٠/٢٩٠).

سلمه و ئەویش ئەیخاتەوە شوێنی خۆی لەناو جەلجالەکەدا و ئەمیش بە خزمەت تاڵە مووەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگات.

وە ئەو وتەیەش کە دەڵێ (کاتێ یەکێکیان تووشی شتێ بوایە...) ئەوە وتەی عثمانی کوڕی عبدالله ی کوڕی موهبە، وەك ئەوە وایە وتبێتی: ئەهلی من تووشی ئەو حاڵە هاتوون.. کە ئەمە (الکرماني) تەفسیری کردووە..

وە هەندێك دەڵێن: ماناى وایە هەر کات یەکێکیان تووشی شتێ بوایە... بەڵام ئەوەی (الکرماني) ئەیڵێ ئەوە ڕاستەکەیانە، ڕوونی کرۆدتەوە کە مرۆڤەکان هەرکات تووشی چاوئێشە یان هەر شتێکی تر ببوونایە لە نەخۆشیەکان یەکێ لە ئەندامەکانی ماڵەکەی ئەنارد بۆ لای اُمّ سلمە بە پەرداخ یان جامۆلکەیەکەوە ئاوی تێدەکرد و تاڵەمووەکانی پێغەمبەری تێ هەڵدەکێشا و دادەنیشت تا ئەی خواردەوە، پاشان موەکانیان دەخستە شوێنی خۆی و نەخۆشەکەش شیفای بۆ ئەهات [1] .

## پێغەمبەر ﷺ تاڵە موەکانی خۆی لەنێوان خەڵکی دا دابەش دەکات

لە ڕیوایەتی حەفص لەلای موسلیم هاتووە کە دەڵێ: (فبدأ بالشق الأيمن فوزعه الشعرة و الشعرتين بين الناس، ثم قال بالأيسر فصنع به مثل ذلك) واتە بەلای ڕاستی سەری دەستی پێکرد و موەکانی دابەش کرد لەنێوان خەڵکی دا یەکی تاڵە موویەك یان دووان، پاشان لای چەپی سەریشی دەست پێکرد بە تاشین و هەمان شێوەی لای ڕاستی کردی..

---

[1]- بنوارە بۆ (عمدة القاري شرح صحيح البُخاري) العيني ٤٩/٢٢

لە گێڕانەوەکەی (حفص)دا هاتووە أبوبکر بە کابرای سەرتاشی وت: (ها وە ئاماژەی بە پەنجەی کرد بۆ لای ڕاستی سەری حەزرەت ﷺ وە مووەکانی دابەش کرد بۆ ئەوانەی لەویا بوون، وتی: پاشان ئاماژەی بە سەرتاشەکە کرد کە لای چەپی دەست پێبکات کە مووەکانی لێ بووەوە دای بە ئومو سەلیم.

## خەڵکی هەوڵیان ئەدا لەسەر دەستکەوتنی تاڵە مووەکانی حەزرەت ﷺ

ئیمامی ئەحمەد لە -مسند-ەکەیدا ڕیوایەتی کردووە، کە حەزرەت ﷺ مووەکانی لای ڕاستی سەری بە ئەنەس دا نارد بۆ لای دایکی ئەنەس کە ناوی ئوموسەلیمە و خێزانی ئەبی طەلحە بوو، بەم شێوە بۆمان باس دەکات:

( لما حلق رسول الله ﷺ رأيته بمنى أخذ شق رأسه الأيمن بيده ، فلما فرغ ناولني فقال: يا أنس انطلق بهذا الى أم سليمٍ) قال: (فلما رأى الناسَ ما خَصنا بِهِ تنافسوا في الشق الآخرِ، هذا يأخذُ الشيء، وهذا يأخذ الشيء)

کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە مینادا قژی تاشی مووەکانی لای ڕاستی گرت بە دەستیەوە، کاتێ کە لێبوویەوە لە تاشینی لای ڕاستی، فەرمووی پێم: ئەی ئەنەس بڕۆ ئەم موانە بدە بە ئومو سەلیم... کاتێ خەڵکی ئەم حاڵەیان بینی کە مووەکانی تایبەت کرد بە ئێمەوە، بۆ تاشینی لاکەی تری سەری پێغەمبەر ﷺ هەوڵیان ئەدا و پێشبڕکێیان دەکرد، ئەمیان چەند تاڵێك و ئەویان چەند تاڵێکیان ئەبرد.

## لێکۆڵینەوەی وتەکان لەم باسەدا

هەروەك بۆمان دەرکەوت جیاوازی لە گێڕانەوەکاندا هەیە، هەندێکیان دەڵێن موەکانی لای ڕاستی سەری بەخشیوە بە ئەبی طەلحە و ئەویش لەنێوان خەڵکی دا دابەش کردووە لای چەپی قژی بووە ، وە لە هەندێ گێڕانەوە دا بە پێچەوانەوەیە، وە هەندێکی تریان دەڵێن موەکانی لای چەپی بەخشیوە بە ئومو سەلیم.

ئەوەی لەنێوان ئەم گێڕانەوانەدا کۆدەکرێتەوە وتەی خاوەنی کتێبی (المُفهم)ە کە دەڵێ: ئەو وتەیە کە وتراوە (کاتێ پێغەمبەر ﷺ لای سەری چاك کرد بەخشی بە ئەبا طەلحە) هیچ بەتاڵ کردنەوەیەکی تیا نییە بۆ ڕیوایەتی دووەم کە دەڵێ (پێغەمبەر ﷺ موەکانی لای ڕاستی سەری دابەش کردووە لەنێوان خەڵکی دا و موەکانی لای چەپی سەریشی بەخشیوە بە ئوموسەلیم) کە خێزانی ئەبی طلحەیە و دایکی ئەنەسە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) دەڵێ:

( لەنێوان ئەم گێڕانەوانە دەگەینە ئەوەی کە بڵێین: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لە چاککردنی لای ڕاستی سەری بوویەوە ئەبا طلحەی بانگ کردووە کە بیبەخشێ و دابەش بکات لەنێوان خەڵکی دا، ئەبا طلحەش فرمانەکەی جێبەجێ کردووە، وە موەکانی لای چەپیشی ناردووە بۆ ئومو سەلیم تا لای ماڵی ئەبا طلحە بمێنێتەوە بەمەش نسبەتی بەلای ئومو سەلیم وەك نسبەتی بەلای ئەبا طلحە وایە) لێرەدا وتەکە تەواو بوو.. خواش دەزانێ...

بەڵام شێخ (المُحِب الطبري) لە شوێنێکدا کۆیان دەکاتەوە و لە شوێنێکی تردا بە پێچەوانەوەیە، وەك دەڵێ: (ئەوەی ڕاست بێ ئەوەیە موەکانی لای ڕاستی سەری دابەش کردووە لە نێوان خەڵکی دا، وە لای چەپیشی بەخشیوە بە ئەبا طەلحە و ئوموسەلیمی خێزانی، وە هیچ دژایەتیەك

لەنێوان دوو گێڕانەوەیەدا نییە، چونکە ئوموسەلیم خێزانی ئەبا طەلحەیە. پێغەمبەریش ﷺ بەخشیویەتی بە هەردووکیان، جارێك نسبەتی بەخشینەکە بۆ ئەبا طەلحەیە و جارێکیش بۆ ئومو سەلیمە) کۆتایی هات.

وە زیاد لە یەك کەس باسیان کردووە کە خالیدی کوڕی وەلید (ڕەزای خوای لەسەر بێ) چەند تاڵە مویەك لە قژی موبارەکی پێغەمبەری ﷺ لەناو قەلەنسوەکەیدا دانا بوو، بەبێ ئەم تاڵە موانە بۆ هیچ لایەك نەدەچوو مەگەر دەروازەی خێر و سەرکەوتنی پێ دەکرایەوە، کە ئەمەش کۆمەڵێکی زۆر لە زانایانی سیرەتنوس جەختیان لەسەر کردۆتەوە.

خالد هات و لەو کاتەدا کە ئەبا طەلحە موەکانی دابەش دەکرد، داوای لە ئەبا طەلحە کرد کە موەکانی پێشی سەری حەزرەتی ﷺ پێبدا، ئەویش پێی بەخشی، کە موەکانی قژی پێشەوەی سەری حەزرەت ﷺ جێی خۆی بوو کە بەهۆیەوە لە شەڕەکاندا سەرکەوتن بە دەست بهێنی).

لێرەدا گێڕانەوەکە کۆتایی هات [1] .

## تەبەروك بە ئارەقی حەزرەت ﷺ

(ثومامە) بۆمان دەگێڕێتەوە، لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) کە: ئومو سەلیم شوێنێکی تایبەت کرد بوو بۆ قەیلولەی پێغەمبەر ﷺ کە هەرکات تەشریفی بهێنایە بۆ پشودان، دەڵێ: کاتێ حەزرەت ﷺ خەوی لێ کەوت عارەقی لاشەی موبارەکی و چەند مویەکم کردە ناو قاروورەکەوە پاشان تێکەڵم کرد بە بۆنە خۆشەکانی خۆمان، ئەویش خەوت بوو، دەڵێ: کاتێ ئەنەسی کوڕی مالك ساتەکانی وەفاتی نزیك بویەوە وەسیەتی بۆ کردم کە لەو ئارەقەی پێغەمبەر ﷺ وەربگرم و تێکەڵی بە بۆنی عەتری

---

[1]- بنوارە بۆ (عمدة القاريء)ی العيني لة ٨/٢٣٠ و ٢٣١.

خۆم بکەم، منیش تێکەڵم کرد، پاشان وەسیەتی کرد کە هەندێك لەو ئارەقەی پێغەمبەر ﷺ تێکەڵ بەو ئاوە بکەم کە لە دوای وەفاتی پێی دەشۆن، دەڵێ منیش وام کرد [١] .

لە ڕیوایەتی ئیمامی موسلیم دا هاتووە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لامان و قەیلولەیەکی کرد و عارەقی دەرکرد، دایکم قاڕورەکەی هێنا و عارەقی موبارەکی پێغەمبەری خوای تێکرد، لەو کاتەدا حەزرەت ﷺ خەبەری بوویەوە فەرمووی: (ئەی ئومو سەلیم ئەوە چی دروست دەکەیت؟) عەرزی کرد: (هذا عرقُكَ نجعله في طيبنا، وهو مِن أطيب الطيب) ئەوە عارەقی موبارەکی تۆیە تێکەڵ بە بۆنە خۆشەکانی خۆمانی دەکەم، کە لە هەموو بۆنێ بۆن خۆشترە.

وە لە گێڕانەوەی ئیسحاق ی کوڕی ئەبی طەلحەدا هاتووە کە دەڵێ: حەزرەت ﷺ عارەقی دەرکرد بوو کەوتبووە سەر ئەو قوماشەی لەسەری پاڵ کەوتبوو، منیش هەڵم گرت ڕاموەشان تا هەموو عارەقەکەم گرت و لە قاڕورەکەدا دامنا، کە خەبەری بووەوە فەرمووی: چیت پێ کرد؟ وتم: (نرجُوا بركته لصبياننا) ڕجام وایە ئەم ئارەقەی تۆ بێتە بەرەکەت بۆ مناڵەکانمان فەرمووی: (أصبت) پێکات ئەی ئوموسەلیم.

وە لە ڕیوایەتی (ابي قلادة)دا هاتووە دەڵێ: (ئوموسەلیم ئارەقی پێغەمبەری کۆکردەوەو هەڵیدەگرت لەناو بۆنە خۆشەکانی خۆیدا و هەندێکیشی لە قاڕورەکەدا دادەنا، فەرمووی: ئەوە چی‌یە؟ عەرزی کرد: (عرقُكَ أدوفُ بهِ طيبي) ، ئەوە عارەقی تۆیە تێکەڵ بە بۆنەکانی خۆمی دەکەم..

---

[١]- ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە (كتاب الأستئذان) باب (من زار قوماً فقال عندهم ) .

لەم گێڕانەوانەدا ئەو سوودە دەبینین کە:

ئاگاداری تەواوی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کردەوەیەی کە ئوموسەلیم دەیکات وە بە ڕاستیشی دانا، وە هیچ نکوڵیەك نییە لەنێوان ئەوەدا کە بۆ ناو بۆنە خۆشەکانی خۆی کۆکردەوە یان بۆ بەرەکەت، بەڵکو ئەوە نیشان ئەدات کە ئوموسەلیم بە مەبەستی هەردوو حاڵەتەکە عارەقەکەی کۆکردبێتەوە)[1] .

## تەبەروك بە دەست دان لە پێستی موبارەکی پێغەمبەرەوە ﷺ

لە عبدالرحمانی کوڕی ئەبی لەیلاوە، لە باوکیەوە، دەڵێ: ئوسەیدی کوڕی حُوضەیر پیاوێکی قسە خۆش و ڕوو خۆش بوو: لە کاتێکدا کە لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، ئەوانەی لە چواردەوری بوون و پێدەکەنین، پێغەمبەر ﷺ پەنجەکانی خستە سەر نەرمایی خوار سکی و وتی: ئازاری پێ گەیاندم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەقی خۆتم لێ بسەنەوە، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ پۆشاکت پۆشیوە و منیش لەو کاتەدا ئازارم پێ گەیشت ڕووت بووم، پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی بەرز کردەوە تا نەرمایی سکی دەرکەوت، دەستی کرد بە ماچ کردنی سکی پێغەمبەری خوا و دەیوت: (بأبي أنت و أمي یا رسول الله أردتُ هذا) دایك و باوکم بە فیدات بێ من ئەئەمەم ئەویست..

---

[1]- بنوارە بۆ (فتح الباري) ابن حجر (٢/١١)

ئیمامی حاکم دەڵێ: ئەم فەرموودەیە –صحیح الأسناد–ە وە (الذهبي)یش دەڵێ ئەم فەرموودەیە صەحیحە.[1]

ئیبنو ئیسحاق گێڕاویەتیەوە لە حەبانی کوڕی واسعەوە، ئەویش لە بەتەمەنەکانی هۆزەکەیەوە دەڵێ:

پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی بەدرا ڕیزی هاوەڵانی ڕێك دەخست، لەو ساتەدا بەهۆی دارێکەوە ڕێکی دەخستن، گەیشتە لای سەوادی کوڕی غەززیە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە هاوپەیمانی حەلیفی کوڕی عەدی کوڕی نجار بوو، کە تۆزێك لە ڕیزەکە هاتبووە دەرەوە، پێغەمبەر ﷺ بە دارەکەی دەستی بە هێواشی کێشای بە سکی سەوادا و فەرمووی: (استو یا سواد) ڕێك ببەوە ئەی سەواد، ئەویش عەرزی کرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئازارت پێگەیاندم خودا تۆی بۆ دادپەروەری و بە هەق و ڕاستی ناردووە ئەبێ تۆڵەی ئەو ئازارەت لێ وەربگرم...

پێغەمبەر ﷺ سکی موبارەکی بۆ ڕووت کرد و فەرمووی: تۆڵەی خۆت بکەرەوە، سەوادیش باوەشی کرد بە سکی پێغەمبەرداو ماچی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چی وای لێ کردی بەو شێوەیە بجوڵێیتەوە ئەی سەواد؟ عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی کە بینیت ، ویستم لە کۆتای وەستانم لە خزمەتدا پێستم بەر پێستی موبارەکت بکەوێ، پێغەمبەر ﷺ دۆعای خێری بۆ کرد[2] .

---

[1]– ابن عساکر لە ابی لیلاوە هەمان شتی هێناوە، هەروەك لە (الکنز)دا هاتووە ٣٠١/٧ منیش دەڵێم: فەرموودەکە لای ابو داود الطبراني لە ئوسەیدی کوڕی حوضەیرەوە هاتووە وەك لە –الکنز–دا گێڕاویەتیەوە ٤٣/٤.

[2]– ابن کثیر لە (البدایة والنهایة) دا هێناویەتی ٢٧١/٤.

عبدالرزاق هێناویەتی لە حەسەنەوە کە پێغەمبەر ﷺ گەیشت بە پیاوێك کە خەنەی زەردی کرد بوو، وە لەو کاتەدا لاسکە دارێك بە دەستی حەزرەتەوە بوو ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لاسکەکەی کێشا بە سکی ئەو پیاوەدا و فەرمووی ( خطُ ورس ) و پاشان فەرمووی: ئەی من نەهیم لێ نەکردوون ائێی؟ پیاوەکە لەسەر سکی خوێن تێزا، پیاوەکە وتی: تۆڵەم دەوێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ خەڵکەکە وتیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ تۆڵە دەسەنی؟ کابرا وتی: پێستی کەس گەورەیەتی ئیە بەسەر پێستی کەسی تردا، پێغەمبەر ﷺ سکی موبارەکی بۆ ڕووت کرد و فەرمووی: تۆڵەت بسەنە، کابراکە سکی پێغەمبەری ماچ کرد و فەرمووی: (داوات لێ دەکەم کە لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەتم بۆ بکەی..)[1]

ابن سعد[2] هێناویەتی لە حەسەنەوە کە حەزرەت ﷺ سەوادەی کوڕی عەمری بینی بەو شێوەیە. ئیسماعیل دەڵێ: سەوادە گۆڕا بوو. دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەت خەت و تاڵ تاڵ، پاشان بەو دارەی بە دەستەوەی بوو یان بە سیواکەکەی لە سکی داو ئازاری پێ گەیاند.. بەم شێوە فەرموودەکە دەگێڕێتەوە.

هەروەها عبدالرزاق[3] هێناویەتی لە حەسەنەوە دەڵێ: پیاوێك لە ئەنصارەکان پێیان دەوت: سەوادەی کوڕی عەمر (ڕەزای خوای لەسەر بێ) بە بۆنێکی خۆش کە تێکەڵی کردبوو بەو زەعفەران لە خۆی دابوو، کە پێغەمبەر ﷺ بینی پێ ناخۆش بوونی دەربڕی، وە ڕۆژێکی تر هاتەوە قژی

---

[1]- بنوارە بۆ (کنز العمال ۹۱/۱۵)..

[2]- بنوارە بۆ -الطبقات/ ابن سعد ۵۱٦/۳.

[3]- بنوارە بۆ -الکنز- ۳۰۲/۷، وە ئیمامی -البغوی- لە کتێبی -الأصابة-دا هەمان شتی هێناوە لە ۹٦/۲.

گۆڕی بوو، پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەو دارەوە کە بەدەستیەوە بوو سکی بریندار کرد، کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆڵەم دەوێ، پێغەمبەر ﷺ دارەکەی دا بە دەستی پیاوەکەوە لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ دوو کراسی لەبەردا بوو، هەردووکیانی بەرزکردەوە خەڵکی هاواریان لە کابرا کرد کەشتی وا نەکات، بەڵام پیاوەکە بە خزمەتی سکی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ گەیشت دارەکەی فڕێدا و دەستی کردە ماچ کردنی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، داواکارم بەهۆی ئەم حاڵەمەوە لە ڕۆژی قیامەندا بەری شەفاعەتی تۆ بکەوم..

## هەواڵی زاهری صەحابی (ڕەزای خوای لەسەر بێ)

پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (زاهِرُ بادیتنا و نحن حاضِرَتُهُ) (واتە زاهیر دەشت نشینەکەمانە و ئێمەش شار نشینین) پێغەمبەر ﷺ زۆری خۆش دەویست، ڕۆژێك حەزرەت ﷺ چوو بۆ بازاڕ، زاهری بینی بە پێوە ڕاوەستاوە، لە پشتەوە هەردوو دەستی خستە سەر سنگی زاهیر و گرتی، زاهر هەستی کرد کە ئەمە دەستی پێغەمبەری خوایە ﷺ وتی: (فجعلتُ أمسحُ ظهري في صدره رجاءَ بَركتهِ) خۆم هێشتەوە و پشتم ئەهێنا بە سنگی پێغەمبەردا بۆ بەرەکەت.

لە ڕیوایەتەکەی ئیمامی تورموزی دا کە لە کتێبی —الشمائل—دایە دەڵێ: ( لە پشتەوە باوەشی پیاکرد و ئەو پێغەمبەری خوای نەدەبینی فەرمووی: پێم بڵێ ئەمە کێیە؟ ئاوڕێی دایەوە و ناسیەوە، خۆی هێشتەوە تا پشتی خۆی لە سنگی پێغەمبەر ﷺ نوساندەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیفەرموو: کێ ئەم بەندەیە ئەکڕێ؟ زاهر عەرزی کرد: (یا رسول الله! إذاً

تجدني كاسداً) ئەی پێغەمبەری خوا کەواتە منت بێ نرخ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (انت عندَ اللهِ غالٍ) تۆ لای خوا نرخت بەرزە...

وە لە ڕیوایەتی ترموزی یدا هاتووە کە دەڵێ: (لکن عندالله لست کاسِداً) بەڵام تۆ لای خوا بێ نرخ نیت، یان وتی (انت عند الله غالٍ)[1] .

## تەبەروك وەرگرتن بە خوێنی پێغەمبەر ﷺ

* هەواڵی عبدالله ی کوڕی زوبەیر (ڕەزای خوایان لەسەر)

لە عامری کوڕی عبدالله ی کوڕی زوبەیرەوە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە کە هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا حیجامە و خوێنی کەڵەشاخی دەگرت، کاتێ کە لێبوویەوە فەرمووی: (یا عبدالله! إذهب بهذا الدم فأهرقهُ حیثُ لا یراك أحد) ئەی عبدالله بڕۆ ئەم خوێنە لە شوێنێکدا بڕێژە کە کەس نەتبینێت، کاتێ لە چاوی پێغەمبەر ون بوو خوێنەکەی خواردەوە و گەڕایەوە بۆ خزمەتی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەی عبدالله چیت لە خوێنەکە کرد؟) وتی: لە نهێنیترین شوێندا شاردومەتەوە کە کەس نەزانێ لە کوێدایە، فەرمووی: ناشێ خواردبێتتەوە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ولِمَ شربتَ الدمَ؟ ویل للناس منك وَ ویلُ لَكَ مِنَ الناس) بۆچی خواردتەوە؟ وەی بۆ خەڵك لە تۆوە، وە وەی بۆ تۆ لە خەڵکەوە[2] .

---

[1]- القسطلاني لە کتێبی (المواهب اللدنیة)دا هێناویەتی لە ١/٢٩٧.

[2]- بەم شێوەیە لە (الأصابة) ٢/٣١٠ هاتووە، و حاکم هێناویەتی ٣/٥٥٤، طبرانی بە هەمان شێوە هێناویەتی، وە (الهیثمي) لە -مجمع الزوائد- ٨/٢٧٠ دەڵێ: طبرانی و بزار بە کورتی هێناویانە وە پیاوەکانی بزار گێڕانەویان ڕاستە مەگەر هیندی کوڕی قاسم نەبێ کە جێی ثقەیە.

ابو موسا دەڵێ: ئەبو عاصم وتوویەتی: ئەو هێزەیان لە عبدالله دا دەبینی ئەیانوت ئەوە بەهۆی ئەو خوێنەوەیە.

ئەبی نەعیم لە –الحلية–[1]دا هێناویەتی لە کیسان کە مەولای عبدالله ی کوڕی زوبەیر بوو دەڵێ: سەلمان (ڕەزای خوای لەسەر بێ) هاتە ژوورەوە بەسەر پێغەمبەری خوادا، بینی عبدالله ی کوڕی زوبەیر لە خزمەتیایەتی و تەشتێکی بە دەستەوەیە شتێکی تیایە ئەیخواتەوە، ئیتر عبدالله چووە ژوورەوە و عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خاڵیم کردووە، سەلمان وتی: ئەوە چی بوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (اعطيتهُ غُسالةَ مُحاجمي بهريق مافيها) ئەوە خوێنی کەلەشاخەکەم بوو پێم دا کە ڕۆی بکات (بیڕژێ)، سەلمان وتی: بەو کەسەی تۆ بە هەق و ڕاستی ناردووە ئەو خواردیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خواردتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: بۆچی؟ عەرزی کرد: وام پێ خۆش بوو خوێنی پێغەمبەری خوا لەناو لاشەمدا بێ، پێغەمبەر ﷺ دەستی خستە سەر سەری عبدالله و فەرمووی: (ويل لَكَ مِنَ الناس، وَ ويلٌ لِلناس منك لا تَمسّك النارُ إلا قسم اليمين)[2] .

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەڵێ: کاتێ ئیبنو زوبەیر خوێنەکەی خواردەوە حەزرەت ﷺ فەرمووی پێی: (فما حملك على ذلك) چی هانی دای کە وا بکەیت؟ وتی: (علمتُ أنَ دمَكَ لا تصيبه نار جهنم، فشربه لذلك) ئەزانم کە خوێنی تۆ ئاگری دۆزەخ نایسوتێنێ، خواردمەوە لەبەر ئەو هۆکارە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ويل لَكَ من الناس)..

---

[1]- بنوارە بۆ –الحلية– ابي نعيم ١/٣٣٠.

[2]- ابن عساكر لە سەلمانەوە بە کورت کراوەیی هێناویەتی وە پیاوەکانی جێگەی متمانەن هەروەك لە (الكنز–دا هاتووە ٧/٥٦) وە الدار القطني لە سوننەکەیدا ڕیوایەتی کردووە.

وه لەلای دار القطني فەرموودەکە هاتووە لە ئەسماءی کچی ئەبی بەکرەوە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) بە هەمان شێوە بەڵام ئەوەی تیایە کە فەرموێتی (لا تَمَسُكَ النار)..

وه لە کتێبی (الجوهر المكنون في ذكر القبائل والبطون) دەڵێ:

(کاتێ عبدالله ی کوڕی زوبەیر خوێنەکەی خواردەوە بۆنی میسکی لێ دەهات، وە لەو ڕۆژەوە لە دەم و زاری عبدالله وە تا درێژیان کرد (تا مرد) بۆنی میسك لە دەمی دەهات [1]

## هەواڵی سەفینە خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ

طبرانی هێناویەتی لە سەفینەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خوێنی کەڵەشاخی گرت، پاشان فەرمووی: (خُذْ هذا الدم فادفنه مِن الدواب و الطير والناس) ئەم خوێنە بگرە بیبە بیشارەوە لە ئاژەڵان و باڵندەکان و لە مرۆڤەکان، خۆم ون کرد و خواردمەوە، پاشان بۆم گێڕاوە کە خواردومەتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێکەنی [2]

## گێڕانەوەی مالك ی کوڕی سنان ( ڕەزای خوای لەسەر )

لە سونەنی سەعیدی کوڕی مەنصوردا هاتووە لە ڕێگەی عەمری کوڕی سائبەوە دەڵێ: پێم گەیشتووە لە مالکی کوڕی سینانەوە کە باوکی ئەبی سەعیدی خودریە کە کاتێ لە ڕۆژی ئوحوددا پێغەمبەری خوا ﷺ دەم و چاوی موبارەکی بریندار بوو ، شوێن برینەکەی بە دەمی هەڵدەمژی هەتا

---

[1]- بنوارە بۆ -المواهب-ی حافظ ی قسطلاني ١/٢٨٤.

[2]- الهيثمي لە (مجمع الزوائد) ٨/٢٧٠ دەڵێ: پیاوەکانی طبراني جێگەی متمانەن.

پاك بویەوە و شوێنەکەی دەرکەوت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێ ی (هەڵی مژەرەوە)، هەتا شوێن برینەکە سپی دەرکەوت، پاشان خوێنەکە و شوێنەواری برینەکەی قوت دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من أراد أن ینظُرَ الی رجُلٍ من أهل الجنة، فلینظر الی هذا) کێ دەیەوێ بنواڕێ بۆ پیاوێکی بەهەشتی با سەیری ئەم پیاوە بکات..

طبرانی ڕیوایەتی کردووە و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من خالط دمي دمه لا تَمَسُهُ النارِ) کێ خوێنی تێکەڵ بە خوێنم بێ ئاگر نایسوتێنێ[1]

وە سەعیدی کوڕی منصور ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من سَرهُ ان ینظر الی رجل خالط دمي دمُه، فلینظر الی مالك بن سنان) کێ ئەیەوێ سەیری پیاوێك بکات کە خوێنی تێکەڵ بە خوێنم بوو بێ، با سەیری مالکی کوڕی سنان بکات..

## کەڵەشاخ گرەکە خوێنی پێغەمبەری خواردووە

ئیبنو حەبان لە (الضُعفاء) ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) دەڵێ: گەنجێکی قوڕەیشی خوێنی کەڵەشاخی پێغەمبەری خوای گرت ﷺ. کە لێبوویەوە لە کەڵەشاخ گرتنەکە خوێنەکەی برد و لە پشتی دیوارەکەدا سەیری لای ڕاست و لای چەپی کرد کەسی نەدی، سەری پێوەناو خواردیەوە کە گەڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ سەیری دەم و چاوی کرد و فەرمووی: (وَیحَكَ ما صنعت بالدم؟ چیت لە خوێنەکە کرد؟ عەرزم کرد: لە پشتی دیوارەکە شاردمەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە کوێ دا شاردتەوە؟ وتم: ( یا رسول الله نَفِستُ علی دَمِكَ أن أهرِقَهُ في الأرضِ

---

[1]- الهیثمي لە (مجمع) دا ٨/٢٧٠ دەڵێ: لە ئیسنادەکەییا کەسێکم نەدیوە کە پلەی لاوازی پێ بدات.

فهو في بطني ) ئەی پێغەمبەری خوا گومانم لە سەر خوێنەکەت کرد خەریك بوو بیڕژمە ئەرزەکە، بەڵام وا لە سکما، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( إذهب فقد أحرزت نفسَكَ مِن النار) بڕۆ وا خۆتت پاراست لە ئاگر [1] .

## هەواڵی خاتوو بەرەکە خزمەتکاری ئومو حەبیبە ( ڕەزای خوایان لەسەر بێ )

حافظی ئیبنو حەجەر دەڵێ: ڕیوایەتی کردووە عبدالرزاق لە ئیبن جورەیجەوە، دەڵێ: هەواڵم پێ گەیشتووە کە پێغەمبەر ﷺ شەوانە شوشەیەکی هەبوو میزی تێ دەکرد و لە پشتی سەرینەکەیەوە دایدەنا. ڕۆژێك هاتەوە سەیری کرد هیچی تیا نەماوە، فەرمووی (بەو ئافرەتە کە پێیان دەوت (بەرەکە) خزمەتکاری ئومو حەبیبە بوو لە زەوی حەبەشەوە لەگەڵیا هاتبوو: ( أين البول الذي كان في القدح؟) کوا ئەو میزەی لەناو ئەو شوشەدا بوو؟ عەرزی کرد: خواردمەوە، فەرمووی: (صِحَةً يا أمَ يُوسف) بە لەش ساغیت بێ ئەی ئومو یوسف. (بەرەکە بە کونیەی ئومو یوسف بانگیان دەکرد) دەفەرموێ: ئەو ئافرەتە لەو ڕۆژەوە نەخۆشی تووش نەبوو مەگەر ئەو نەخۆشیەی کە پێی وەفاتی کرد [2] .

منیش دەڵێم: ئەم فەرموودەیە هەر یەکە لە ئەبو داود و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە وە شێخی سیوطي دەڵێ: (ئەم فەرموودەیە بە تەواوی (ابن عبدالبر) لە کتێبی (الأستيعاب)دا هێناویەتی و دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ

---

[1]- حافظ القسطلاني لە (المواهب اللدنية)دا ١/٢٨٤ هێناویەتی.

[2]- ابن حجر لة (التلخيص الجير في تأريخ احاديث الشرح الكبير)لة ٢/٣٢ دا.

پرسیاری کرد لەو میزەی لە شوشەکەدا بوو، وتی خواردومەتەوە ئەی پێغەمبەری خوا.... فەرموودەکە تەواو دەکات) [1] .

## تەبەروك وەرگرتن بەو شوێن و مەکانەی کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی تیا کردووە

لە نافعەوە کە عبدالله ی کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لەسەر بێ- بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی کرد لە مزگەوتە بچوکەکە کە لە خوار مزگەوتی ڕەوحائەوە بوو، وە عبدالله ئەو شوێنەی ئەزانی کە پێغەمبەر ﷺ تیایدا نوێژی دەکرد و ئەیوت: (ثم عن يمنيك حين تقوم في المسجد تُصلي، وذلك المسجد على حافة الطريق اليمنى وأنت ذاهب الى مكة، بينه و بين المسجد الأكبر رمية بحجر أو نحو ذلك) [2] .

پاشان بەلای ڕاستدا کەمێك بڕۆ تا ئەگەیتە مزگەوتەکە نوێژێ بخوێنە، ئەوە ئەو مزگەوتەیە کە لەسەر ڕێگەکەی لای ڕاستیەوە لە کاتێکدا کە بڕۆیت بۆ مەککە، لەنێوان ئەم مزگەوتەو مزگەوتە گەورەکەدا کە دووری هاویشتنی بەردێکە یان وەکو ئەو...

---

[1]- بنوارە بۆ (شرح سنن النسائي)ی سیوطي ٣٢/١.

[2]- ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

## تەبەروك وەرگرتن بە شوێنێك كە
## دەمی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ ی پێ گەیشتبێ

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) كە پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لای ئومو سەلەمە، لەماڵەكەی كوپێكی هەڵواسراوی تیا بوو، ئەوەی لەناویا بوو خواردیەوە (واتە بە دەمی كوپەكە) لەو كاتەدا بە پێوە بوو، ئەنەس دەڵێ: ئوموسەلیم دەمی كوپەلەكەی لێ كردەوە ئێستا لای ئەو پارێزراوە [1] .

مانای ئەم فەرمووده: ئومو سەلیم دەمی ئەو كوپەڵەیی شكاند كە شوێنی دەم و خواردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بوو، وە پارێزگاری لێ كرد لە ماڵەكەی خۆیدا بۆ تەبەروك وەرگرتن بە ئاثاری پێغەمبەرەكەیەوە ﷺ........

## تەبەروك وەرگرتن بە ماچ كردنی دەستی
## كەسێ كە بەر لاشەی پێغەمبەر ﷺ كەوتبێ

لە یەحیای كوڕی حارثی ذماریەوە، دەڵێ: گەیشتم بە وائلەی كوڕی ئەسقەع (ڕەزای خوای لەسەر بێ) وتم: بەم دوو دەستەت بەیعەتت لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ كردووە؟ وتی: بەڵێ، وتم: (أعطني يَدَكَ أقبلُها) دەستەكانتم بدەرێ با ماچیان بكەن، (فأعطانيها فقبلتُها) دەستەكانی دامێ و منیش ماچم كردن.[2]

---

[1]- طبراني ڕیوایەتی كردووە، وە براءی كوڕی زیدی تیایە كە تەنها لە عبدالكريم الجزري هێناویەتی. بەڵام احمد بە لاوازی دانەناوە، وە باقی پیاوەكانی تری صەحیحن.

[2]- هەیثهمی دەڵێ: طبرانی ڕیوایەتی كردووە، تیایدا عبدالملكی قاری هەیە كە نایناسم وە باقی پیاوەكانی تری جێگەی متمانەن، بنوارە بۆ مجمع الزوائد ٤٢/٨.

ئەبی نەعیم لە کتێبی (الحلیة)دا هێناویەتی دەڵێ: لە یوسفی کوڕی مەیسورەوە دەڵێ: چووینە ژوورەوە بۆ لای یزیدی کوڕی ئەسوەد و دانیشتین، وائلەی کوڕی ئەسقەع (ڕەزای خوای لەسەر بێ) هاتە ژوورەوە، کاتێ یەزیدی بینی دەستی درێژکرد، ئەویش دەستی هێنا (فأخذ یده فمسح بها وجهه و صدرهُ لأنه بایع رسول الله ﷺ) دەستەکانی گرت و هێنای بە دەم و چاو و سنگیا، چونکە بەیعەتی لە خزمەت پێغەمبەردا پێ کرد بوو)(واتە دەستی خستۆتە دەستی پێغەمبەر ﷺ) پێیان وت: ئەی یەزید گومانت بەرانبەر پەروەردگارت چۆنە؟ فەرمووی: باشە، وائل فەرمووی پێی: ئەی یەزید مژدەت بدەمێ من بیستم لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرموێ: من وام لەگەڵ گومانی بەندەکەمدا، ئەگەر گومانی خێر بوو خێر دێنمە ڕێگەی و گەر خراپە بوو خراپە دێتە ڕێی)[1].

ئیمامی بوخاری لە (الأدب المفرد) دا هێناویەتی لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ڕەزینەوە دەڵێ: تێپەڕین بەلای (ڕەبزە)دا پێیان وتین: لەو شوێنەدا سەلەمەی کوڕی ئەکوەعی لێیە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) چووم بۆ خزمەتی و سەلامی خوامان پێ ڕاگەیاند، وەڵامی سەلامی داینەوەو دەستەکانی بەرزکردەوە و فەرمووی: (بایعتُ بهاتین نبي الله ﷺ) بەم دوو دەستەم بەیعەتم بە پێغەمبەری خوا کردووە، دەستەکانی زۆر تۆکمە و گەورە بوو هەڵساین ماچمان کرد (فأخرجَ کَفّا له ضخمة کأنها کفُّ بعیر، فقمنا إلیها فقبلناها)[2] .

[1]- بنوارە بۆ –الحلیة–ابو نعیم– ۹/۳۰٦.

[2]- ئیمامی بخاری لە (الأدب المفرد) لا ١٤٤٤.

وە ابن سعد لە عبدالرحمانی کوڕی زەیدەوە هەمان فەرموودەی هێناوە.[1]
وە هەروەها ئیمامی بخاری لە (الأدب)دا لە ئیبن جەدعانەوە هێناویەتی دەڵێ: ثابت بە ئەنەسی وت (ڕەزای خوایان لەسەر بێ): ئایا بە دەستەکانت بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتوویت (دەستت داوە لە لاشەیەوە)؟ فەرمووی بەڵێ، ئەویش دەستەکانی ئەنەسی ماچ کرد.[2]
هەروەها بخاری لە صوهەیبەوە هێناویەتی کە دەڵێ: ئیمامی عەلیم بینی –کرمَ الله وجهَهُ– دەستی ئیمامی عەباسی و قاچەکانی ماچ دەکرد (ڕەزای خوای لەسەر بێ).[3]
لە ثابتە وە دەڵێ: هەر کاتێ دەهاتم بۆ خزمەتی ئەنەس ئەو شوێنەی پێ ئەوتم کە من لێی بووم، ڕۆژێ چوومە ژوورەوە بۆ خزمەتی و دەستیم گرت و تێر ماچم کرد و وتم: باوکم بە قوربانی ئەو دەستانەت بێ کە بەر دەستەکانی پێغەمبەر ﷺ گەیشتووە، وە چاوەکانیم ماچ کرد وتم: باوکم بە قوربانی ئەو چاوانەت بێ کە بە بینینی بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتووە (بأبي هاتين اليدين اللتين مَستا رسول الله ﷺ و اقبل عينيه و أقول: بأبي هاتين العينين اللتين رأتا رسول الله ﷺ)[4] .

---

[1]– بنوارە بۆ (الطبقات) ابن سعد ٣٩/٤.

[2]– بخاری لە (الأدب المفرد ) لا١٤٤.

[3]– هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[4]– ابن حجر لە (المطالب العالية)دا ١١١/٤ هێناویەتی وە هەیثەمی دەڵێ: ابو يعلى ڕیوایەتی کردووە و پیاوەکانی هەموو چاکن جگە لە عبدالله ی کوڕی ابی بکری مقدمی نەبێ کە پلەی باوەڕپێکراوی هەیە بنوارە بۆ مجمع الزوائد ٣٢٥/٩.

## تەبەروك وەرگرتن بە جوببەی پێغەمبەری خوا ﷺ

لە ئەسماء ی کچی ئەبی بەکرەوە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) دەگێڕنەوە کە عەبایەکی کەسرەوانی طەیالیسی لابوو کە پارچەیەك وەك دیباجە لەسەر گیرفانەکەی بوو، وە خوارەکەشی بە شێوەی پەڕە چنرا بوو، عەبایەی دەرهێناو فەرمووی: ئەمە جوببەو عەبای پێغەمبەرە ﷺ کە لای خاتوو عائشە بوو تا وەفاتی کرد، دوای ئەوە من وەرمگرت، وە پێغەمبەر ﷺ ئەیپۆشی و ئێمەش ئەمانشت و بە ئاوەکەی شیفای نەخۆشەکانمان ئەدا..[1]

## تەبەروك وەرگرتن بە کەسێ کە دەستی بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتبێ

لە صفیەی کچی مەجزەئەتەوە دەڵێ: ئەبا مەحزورە پرچێکی لە پێشی سەریا هێشتبۆوە، هەرکات دادەنیشت، بەرەڵای دەکرد تا ئەیدا لە زەوی، پێیان وت ئەوە نایتاشی؟ وتی: (أن رسول الله ﷺ مسح علیها بیده فلم اکن لأحلقها حتی أموت) ئەوە پێغەمبەری خوا دەستی بەسەردا هێناوە نایتاشم و کورتی ناکەمەوە تا دەمرم[2].

لە موحەممەدی کوڕی عبدالمالکی کوڕی ئەبی مەحذورەوە لە باوکیەوە لە باپیری یەوە دەڵێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سوننەتی بانگم فێر بکە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی موبارەکی لە پێشی سەرم داناو فەرمووی:

---

[1]- ئیمامی مسلم لە (کتاب اللباس والزنیة)دا ڕیوایەتی کردووە ١٤٠/٣.

[2]- طبرانی ڕیوایەتی کردووە، گێڕانەوەکەشی ئەیوبی کوڕی ثابتی تیایە کە ابو حاتم دەڵێ: فەرموودەی وەرناگیرێ بنواڕە بۆ مجمع الزوائد ١٦٥/٥..

بڵــێ: الله اكــبر الله اكــبر الله اكــبر... الله اكــبر... دەنگــی پــێ بەرزبکــەرەوە... فەرمووەدەکە.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵێ: ئەبو مەحذورە پێشی سەری نە ئەملاولا پێ دەکرد نە کورتی دەکردەوە چونکە دەستی پێغەمبەری خوای بەرکەوتووە[1].

## تەبەروك وەرگرتن بە جامۆلکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وە بەو مزگەوتەی کە نوێژی تیا خوێندووە

لە ئەبی بوردەوە دەڵێ: هاتمە شاری مەدینەی پیرۆز گەیشتم بە عبداللە ی کوڕی سـەلام پـێ‌ی وتم: ڕابکـە بگـەرە ماڵـەوە بـا ئـاوت پـێ بـدەن لـەو جامۆلکەدا کە پێغەمبەری خوا تیایدا ئاوی خواردۆتـەوە، وە نوێـژ بکە لـەو مزگەوتـەدا کـە پێغەمبـەری خـوا نوێـژی تیـا خوێنـدووە، دەڵـێ ڕۆشـتم لـە خزمەتیا ئاوم خواردەوە لەو جامۆلکەیەدا و نوێژمان کرد لـەو مزگەوتـەدا و چەند دەنکە خورمایەکیشـی دا پێم خواردم[2] (انطلـق الى المنـزل فأسـقيك في قـدح شـرب منـه رسـول الله ﷺ، وتصـلي في مسـجد صـلى فيـه الـنبي ﷺ فانطلقت معه فأسقاني سويقاً و اطعمني تمراً و صليتُ في مسجده)..

---

[1]- بیهقی و دار القطني و أحمد و ابن حبان و نسائي ڕیوایەتیان کردووە.

[2]- بخاری لە (كتاب الأعتصام بالكتاب والسنة) باب (ما ذكر النبي ﷺ و حفض على اتفاق أهل العلم)دا ڕیوایەتی کردووە.

## تەبەروك وەرگرتن بە شوێن پێی موبارەكی پێغەمبەر ﷺ

لە ئەبی مەجەلەزەوە دەڵێ ئەبا موسا لە شوێنێ بوو لەنێوان دوو شاری مەككە و مەدینەدا، نوێژی عیشای بە دوو ڕكعات خوێند، پاشان یەك ڕكعات وەتری خوێند و تیایدا سەد ئایەتی لە سورەتی –النساء– خوێند، پاشان ئەفەرموێ: (ما الوتُ أن اضع قدمي حيث وضع رسول الله ﷺ قدميه وانا أقرأُ بما قرأ به رسول الله ﷺ)[1] .

قاچەكانم لەسەر شوێن پێی پێغەمبەری خوا ﷺ لانابەم، لەو كاتەدا كە تیایدا ئەو ئایەتانەی خوێندەوە...

## تەبەروك بە خانویەكی پیرۆز

لە موحەممەدی كوڕی سەوقەوە، لە باوكیەوە دەڵێ: كاتێ عەمری كوڕی حەریث خانوی دروست كرد چووم بۆ لای تا بەكرێ ژورێكم پێ بدا، وتی: پێم چی تیا دەكەیت؟ وتم: تیایا دادەنیشم و كڕین و فرۆشتنیش دەكەم، وتی: تۆ وات وت؟ لەسەر ئەم خانووە ئەم ڕووداوەت بۆ دەگێڕمەوە: بزانە كە ئەم خانوە پیرۆزە بۆ ئەو كەسانەی تیا دادەنیشن، پیرۆزە بۆ ئەوانەی كڕین و فرۆشتنی تیا دەكەن، ئەوەش لەبەرئەوەیە كە: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وە كۆمەڵێ پارەی دانراوی لابوو، دەستی كرد بەو پارەدا و هەندێكی خستە دەستم و فەرمووی: (ئەی عەمر ئەم درهەمانە بگرە) منیش وەرم گرت و هێنامەوە بۆ دایكم وتم: ئەی دایكە ئەم درهەمانە هەڵبگرە تا شتێ دەبێ كە تیایدا هەڵدەگرین چونكە ئەوانە ئەو درهەمانەن كە پێغەمبەری خوا پێی بەخشیوم، ئەویش لای خۆی هەڵیگرت، مایەوە تا

---

[1]- نەسائی ڕیوایەتی كردووە ٢٤٣/٣.

هاتینه شاری کوفه، ویستم خانویەك بکڕم، دایکم پێی وتم: ئەی کوڕم گەر ویستت خانوو بکڕیت و پارەت بۆ کۆکردەوە پێم بڵێ: ئەو شێوە پارەم کۆکردەوە و هاتمەوە بۆ لای دایکم و پارەکەم لەبەردەمیا دانا، پاشان پارەکەی پێغەمبەری دەرهێناو خستیە ناو پارەکەی خۆمان و تێکەڵی تیا کرد، وتم: ئەی دایکە تۆ چی دەکەیت؟ وتی: کوڕم ئەو درهەمانە تۆ بۆت هێنام لە پێغەمبەری خوات وەرگرتبوو، وە من ئەزانم ئەو خانوە کە بەم پارە دەیکڕیت ماڵێکە پیرۆز دەبێ بۆ ئەوانەی کە تیایدا دادەنیشن وە پیرۆز دەبێ بۆ ئەوانەی کە کڕین و فرۆشتنی تیا دەکەن.[1]

## تەبەروك وەرگرتن بە مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ

قاضي عیاض دەڵێ: ئیبنو عومەریان بینی (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەستی خستە سەر شوێن دانیشتنەکەی پێغەمبەر ﷺ لە مینبەرەکەو دەیهێنا بە دەم و چاویا.

وە لە ئیبنو قەسیطەوە و لە عوتباوە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێ خۆی بە تەنها لە مزگەوتا بوایە دەستی ئەهێنا بەسەر بەشی پێشی مینبەرەکە کە وەك هەنار بەرز بوو، پاشان ڕووی دەکردە قیبلە و دەپاڕایەوە.[2]

(الملا علی القاری) کە شەرحی شیفای کردووە دەڵێ: ئەو فەرموودە ابن سعد ڕیوایەتی کردووە.[3]

---

[1]- طبرانی لە –الکبیر– دا ڕیوایەتی کردووە، وە أبو یعلی ڕیوایەتی کردووە بنواڕە بۆ مجمع الزوائد ١١١/٤.

[2]- بنواڕە بۆ (الشفا) قاضي عیاض ٧٣/٢.

[3]- بنواڕە بۆ (شرح الشفا) ملا قاري ٥١٨/٣.

وە شێخ ابن تیمیە لە ئیمامی ئەحمەدەوە ڕیوایەتی کردووە کە ئیزنی وەرگرتووە تا دەست بهێنێ بە مینبەرو بەشی پێشی مینبەردا، وە باسی لەوە کردووە لە ابن عمر بەو شێوەی کردووە، وە سەعیدی کوڕی موسەیب و یەحیای کوڕی سەعید لە زانایانی بەو شێوە تەبەروکیان وەرگرتووە.[1]

## تەبەروك بە مەرقەدی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ

کاتێ مردنی پێشەوای موسولمانان عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لەسەر بێ) هاتە پێشەوە فەرمووی بە عبدالله ی کوڕی، بڕۆ بۆ لای دایکی ئیمانداران خاتو عائشە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) و پێی بڵێ: عومەر سەلامت پێ ڕادەگەیەنێ، مەڵێ ئەمیرولموئمینین چونکە من ئێستا پێشەوای هیچ موسولمانێ نیم، وە بڵێ: عومەری کوڕی خەطاب داوای ئیزن دەکات کەلە پاڵ دوو هاوڕێیەکەیدا بنێژرێ، عبدالله ڕۆیشت و سەلامی لە خاتوو عائیشە کرد و ئیزنی وەرگرت و چووە ژوورەوە بینی وا خاتوو عائشە ئەگری، وتی: عومەر سەلامت لێ دەکات وە ئیزنت لێ وەردەگرێ کە لە پاڵ دوو هاوەڵەکەیدا بنێژرێ، خاتوو عائیشە فەرمووی: من ئەو شوێنەم بۆ خۆم دانابوو، بەلام ئەمڕۆ زۆر دەکەم لە نەفسم (واتە ڕەزامەندی پیشاندا)، کاتێ گەڕایەوە ئەوانەی لە خزمەت خەلیفەدا بوون وتیان ئەوە عبدالله ی کوڕی عومەر گەڕایەوە، حەزرەتی عومەر فەرمووی: بەرزم بکەنەوە، دوو پیاو چوونە ژێر باڵی، فەرمووی چیت پێیە؟ وتی: ئەوەی تۆ پێت خۆشە ئەی پێشەوی موسولمانان، ئیزنی داویت، حەزرەتی عومەر فەرمووی: سوپاس بۆ خوا، هیچ شتێ نەبوو بەقەد ئەوە لای من گرنگ بێ ، گەر من لەناوچووم هەڵمبگرن و بمبەن بۆ دەرگای ماڵی خاتوو

---

[1]- بنوارە بۆ (اقتضاء الصراط المستقيم) ابن تيمية لا ٣٦٧.

عائشه سەلام بكەن و بڵێن: عومەر ئیزن وەردەگرێ، گەر ئیزنی دام بمبەنە ژوورەوە، وە گەر ڕەتی كردمەوە بمگێڕنەوە لە گۆڕستانی موسوڵمانان بمنێژن [1].

## تەبەروك بە مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ
## لە ڕێڕەوی پێشەوای زانایانی ئیسلام – الذهبي-دا

پێشەوا شمس الدین محمد كوڕی ئەحمەدی ئەلذەهەبی دەڵێ:[2]

چەند جارێك ئەحمەدی كوڕی عبدالمنعم هەواڵی داوە پێم و وتوویەتی: هەواڵی پێدام جەعفەری صەیدەلانی بە نوسین، هەواڵی داومێ ئەبو عەلی حەداد، دەڵێ هەواڵی دامێ ئەبو نەعیمی حافظ ، هەواڵی دامێ عبداللە ی كوڕی جەعفەر، بۆی گێڕاینەوە محمدی كوڕی عاصم، بۆی گێڕاینەوە ئەبو ئوسامە، لە عوبەیدوڵلاوە، لە نافعەوە لە ئیبو عومەرەوە، كە دەڵێ (ئەو بەلایەوە كەراهەتی هەبووە كە دەست بدا لە گۆڕی پێغەمبەرەوە ﷺ) منیش دەڵێم: بەلایەوە كەراهەتی هەیە لەبەر نەمانی ئەدەب لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ.

وە پرسیاریان كرد لە ئەحمەدی كوڕی حەنبەل لە حاڵی كەسێ لە دەست لە مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ بدات و ماچی بكات، ئەویش لە وەڵامدا هیچ خراپیەكی تیا نەبینیوە، كە ئەمە كوڕەكەی خۆی (عبداللە ی كوڕی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل) ئەیگێڕێتەوە و ڕیوایەتی كردووە.

---

[1]- ئیمامی بوخاری لە كتاب الجنائز- دا هێناویەتی لەژێر ناوی (باب ما جاء في قبر النبي ﷺ) وە لە (كتاب الفضائل الصحابة)دا لەژێر ناوی (باب قصة البیعة) دا بە درێژی هاتووە.

[2]- لە كتێبی (معجم الشیوخ)ی الذهبي ١/٧٣ ، ٧٤.

ئەگـەر وتـرا: ئایـا صـەحابە شـتی وایـان کـردووە؟ وتـراوە: ئەوانـە بـە زینـدویی بـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ گەیشـتوون و لـە خزمـەتیا بـوون و دەستیان ماچ کردووە و لەسەر ئاوی دەست نوێژی شەڕیان کردووە و موە پیرۆزەکانی لە کاتی سەرچاکردنی حەج ی دا لەنێوان خۆیان دا دابەش کردووە، تفی موبارەکی نەکەوتۆتە زەوی مەگەر لەدەست یەکێ لە هاوەڵاندا بووە و هێناویانە بە دەم و چاویاندا، بەڵام ئێمە هیچ کام لەو بەختانەمان بەنسیب نەبووە و لەو بەشە پیرۆزە هیچمان وەرنەگرتووە، لە خزمەت مەرقەدیدا ئیلتیزاممان هەیە و بە ئەدەبەوە بەلەسەرخۆو نەرمیەوە سەلام دەکەین و بە خزمەتی دەگەین، ئەی نابینی (ثابت النبانی) چی کرد؟ دەستەکانی ئەنەسی کوڕی مالکی ماچ کرد و ئەیخستە سەر دەم و چاوی و دەستی پیادەهێناو ئەیوت (یَدٌ مَسَت یَدَ رسول الله ﷺ) دەستێك بەر دەستی پێغەمبەری خوا کەوتووە، کە ئەم جۆرە کارانە موسوڵمان ناجوڵێنێ مەگەر خۆشەویستی تەواوی بۆ پێغەمبەرەکەی نەبێ، کە ئەمەش فرمانمان پێ کراوە بە خۆشویستنی خواو پێغەمبەرەکەی بە شێوەیەك لە نەفس و ماڵ و منداڵ و سەرجەم خەڵکیمان خۆشتر بوێ، لە سەروەت و سامان و باخ و باخچەکان، بگرە لە بەهەشت و حۆریەکانی ناویشی، تەنانەت لە خۆشەویستی ئەویشەوە خەڵکی ئەبوبەکر و عومەریشیان لە نەفسی خۆیان زیاتر خۆشتر ویستووە.

( جەندار ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە ئەو لەسەر شاخی بیقاع ڕاوەستابوو گوێی لێوە بوو وا پیاوێك وتەی ناشرین بە ئەبوبەکری صدیق ئەڵێ، شمشێرەکەی دەرهێناو دای لە گەردنی، ئەگەر ووتەی نابەجێی بە خۆی و باوکی بووتایە خوێنی حەڵاڵ نەدەبوو، نابینی صەحابەکان چۆن داچووبوون لە خۆش ویستنیان بۆ پێغەمبەرەکەیان بە شێوەیەك هاتنە

خزمەتی و پێیان وت: سەجدە و كڕنوشت بۆ نەبەین؟ فەرمووی: نەخێر. ئەگەر ئیزنی بدانایە ئەوە كڕنوشی شكۆو ڕێزیان بۆ دەبرد نەك بەندایەتی و پەرستش، وەك ئەو كڕنوشەی كە براكانی یوسف (علیە السلام) بردیان بۆ یوسف پێغەمبەر، هەروەها وتە هەیە لەسەر ئەوە ئەگەر موسوڵمانێ لەلای گۆڕەكەی پێغەمبەردا ﷺ كڕنوشی تەعظیم و ڕێز ببات ئەوە كافر و بێ بڕوا نابێ بەڵكو بە گوناهبار دادەنرێ، كە پێویستە بزانین ئەوە نەهی لێكراوە، هەروەها نەهی لێكراوە نوێژ بخوێنی بۆ گۆڕەكان)

لێرەدا وتەكەی –الذهبي– تەواو بوو.

## تەبەروك وەرگرتن بە ئاساری پیاوچاكان و پێغەمبەرانی پێشوو ( علیهم السلام )

لە نافعەوە دەڵێ: عبدالله ی كوڕی عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێ) هەواڵی پێداین كە كۆمەڵێ لە خەڵكی دابەزینە خوارەوە بۆ سەر بەردەكە لە زەوی ثەمود لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ئاویان لە بیرەكەیان دەرهێناو (ئاردیان پێ كرد بە هەویر) پێغەمبەر ﷺ فرمانی پێداین كە بەشی وشترەكانیش خواردن دروست بكەن، و (أمرهم أن يستقوا مِنَ البئر التي كانت تَرِدها الناقة)[1] (فەرمانی پێكردن ئاو لەو بیرە هەڵگۆزن كە وشترەكەی صالح پێغەمبەر ئاوی لێ دەخواردەوە).

شێخی نەوەوی لە (الشرح)دا دەڵێ: (وفي هذا الحديث مِنَ الفوائد التبرُكَ بآثار الصالحين)[2] .

---

[1]– ئیمامی مسلم ڕیوایەتی كردووە لە (كتاب الزهد) لە بەشی (باب لا تدخلوا مساكن الذين ظلموا الا ان تكونوا باكين)..

[2]– بنوارە بۆ (شرح مسلم) النووي ١١٢/١٨.

واتـه لـەم فـەرمودەوە ئـەو سـودە وەردەگـرین کـە دروسـت بـێ تەبـەروك وەرگرتن بە پێغەمبەرانی پێشوو وەبە پیاوچاکانەوە.

## تەبەروك وەرگرتن بە تـابووت

خوای گەورە لە گەورەیی تابوت دا دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ لَهُمْ نِبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ﴾ البقرة: ٢٤٨.

کورتەی چیرۆکەکە: ئەم تابووتە لەلای بەنی ئیسرائیلیەکان بوو، لەکاتی شەڕەکانیاندا بەهۆیەوە سەردەکەوتن و ئەیانکردە وەسیلەیەك بۆ خزمەتی خـوای گـەورە چـونکە کۆمـەڵێ لـە ئاسـاری پـیرۆزی تیـا بـوو، کـە ئەمـە ئـەو تەبــەروك وەرگرتنەیــە کــە ئێمــە لێــرەدا مەبەســتمانە لێــی بــدوێین، کــە پەروەردگاریش بۆمـان مانـا دەکـات کە ئـەو تابووتـە چـی تیایـە دەفـەرموێ: ﴿وَبَقِيَّـةٌ مِّمَّـا تَـرَكَ آلُ مُوسَـى وَآلُ هَـارُونَ﴾ پاشمـاوەی میراتـی بەجێماوە لـە موسـی پێغەمبـەر و هـارون کـە بریتـی بـووە لـە (عەصـاکەی و کۆمـەڵێ لـە پۆشاکەکانی، وە نـەعل و جلـەکانی هارون، وە چەند لـەوحێك لـە تـەورات و تەشتێك) هەروەك مێژوونووسان و موفەسیران هێناویانە وەك ئیبنو کەثیر و قرطبي و سیوطی و طبری و... گەر ویستت زیاتر شارەزا بیت بگەڕێرەوە سەر ئەو سەرچاوانە، کە ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر گەیانـدنی چەند مانایـەك لەوانە: تەوەسول کردن بە پاشماوەی پیاوچاکانەوە، وە پارێزگـاری یـان لـە فەوتان، وە لەوانە: تەبەروك لەو پاشماوانە...

# تەبەروك وەرگرتن بە مزگەوتی عەشار

لە صالحی کوڕی درهەمەوە دەڵێ: لە سەفەری حەج دا دەرچووین. گەیشتین بە پیاوێ پێی وتین: لەو لایەتانەوە ئاواییەك هەیە پێی دەڵێز (ئەلئیبلە)، وتمان بەڵێ، وتی: کێ لە ئێوە بەڵێنم ئەداتێ کە لە مزگەوتی عەشاردا دوو ڕکعات یان چوار ڕکعات نوێژم بۆ بخوێنێ، چونکە ئەمە گێڕانەوەی ئەبوهورەیرەیە کە وتی: بیستم لە خۆشەویستم ئەبا قاسم ﷺ ئەیفەرموو:

(إن الله عزوجل يبعَثُ من مسجد العشار يوم القيامة شُهداء لا يقوم مع شهداء بدر غيرهُم) ، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خوای پەروەردگار شەهیدەکان لە مزگەوتی عەشارەوە زیندوو دەکاتەوە کە هیچ شەهیدێکی تر جگە لە شەهیدەکانی بەدر لێوەی هەڵناسنەوە.

ئیمامی ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە و دەڵێ: ئەمە ئەو مزگەوتەیە کە لەولای ئاوەکەوەیە[1] ، وە هەروەها زانای فەرمودەناسی گەورە شێخ خەلیل ئەحمەد سەهارەنفوری لە کتێبی (بذل المجهود شرح سنن أبي داود)دا دەڵێ:[2]

(و في حديث دلالة على أن الطاعات البدنية توصل الى الغيرِ أجرها، وان مآثر الأولياء والمقربين تزار و يتبرك بها) ، واتە لەو فەرموودەدا بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەوە کە ئەو بەندایەتیانە بە لاشە دەکرێن ئەگات بە غەیری خاوەنەکەی واتە لە ئەجر و پاداشتا، وە شوێن نزرگەی ئەولیاو نزیکانی خوا زیارەت دەکرێن و تەبەروکیان لێوە وەردەگیرێ...

---

[1]- بنوارە بۆ (مشكاة المصابيح)ی خطیبي تەبریزی ٥٤٣٤/٣.

[2]- بنوارە بۆ (بذل المجهود)ی السهارنفوری ٢٢٥/١١.

وە زانای فەرموودەناس شێخ ئەبو طە یب خاوەنی کتێبی (عون المعبود) دەڵێ:[١]

(مسجد عشار مسجد مشهور يُتبركُ بالصلاة فيه) ، واتە مزگەوتی عیشار مزگەوتێکی ناودارەو بە نوێژ خوێندن تیایدا تەبەروك تیایدا وەردەگیرێ.

## هەموومان لە بەرەکەتی پێغەمبەردایین ﷺ

ئەبیستین لە زۆر کەسەوە کە ئەو وتەیە دووبارە دەکەنەوە و دەڵێن: ئێمە لە ژێر بەرەکەتی پێغەمبەردایین یان بەرەکەتی پێغەمبەر وا لەسەرمان ﷺ.
لەسەر ئەم وتەیەوە پرسیاریان کرد لە شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە، لە وەڵامدا وتی: وتەی خەڵکی کە دەڵێن: ئێمە لە ژێر بەرەکەتی فلان داین، ئەم وتەیە لە لایەکەوە ڕاستە و لەلایەکی ترەوە بەتاڵە– بەم شێوەیە:
ئەوەی کە ڕاستەکەیە:

ئەگەر مەبەست پێی ئەوە بێ کە بڵێ: ئەو مایەی هیدایەتدانی ئێمە بووە، یان لەوەوە زانست فێر بووین، بە فرمانی چاکەی ئەو و نەهی لە خراپەی ئەو شتەکان فێر بووین، بە بەرەکەتی شوێن کەوتن و گوێڕایەڵی تەواوی ئەوەوە ئەم خێرە زۆرەمان بە نسیب بووە، ئەمە ڕاستە و گومانی تێدا نیە، هەروەك چۆن خەڵکی شاری مەدینە بە هاتنی و تەشریف هێنانی پێغەمبەر ﷺ بەرەکەتی ئەو بووە مایەی خێر و ئیمانیان پێ هێنا و گوێڕایەڵیان کرد، بە بەرەکەتی ئەوەوە سەرفرازی دونیا و پاشەڕۆژیان بۆ خۆیان دەست خست، بەڵکو هەر باوەڕدارێ کە بڕوای بە پێغەمبەر ﷺ ببێ و گوێڕایەڵی تەواوی بکات، بەهۆی ئەو ئیمانەوە و ئیطاعەکردنەوە ئەکەوێتە ژێر بەرەکەتی حەزرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ وە خێری دونیا و

---

[١]- بنوارە بۆ (عون المعبود)ی العظيم آبادي ٤٢٢/١١.

ئاخیرەتی دەست دەکەوێ، کە نازانرێ ئەو خێرە چەندێکە مەگەر خوای پەروەردگار نەبێ..

هەروەها: ئەگەر بەو وتەیە مەبەستی ئەوە بێ کە بە بەرەکەتی دوعای حەزرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ و صەلاحیەتی ئەو زاتەوە، خوا شەڕ و خراپەی لێ دوور خستۆتەوە و بەهۆیەوە ڕزقمان زۆر بووە و سەرکەوتنمان بەدەست هێناوە، ئەمە هەقە و ڕاستە هەروەك حەزرەت ﷺ ئەفەرموێ: (وهل تنصرون و ترزقون إلاّ بِضُعَفائكم بدعائكم و صلاتهم و إخلاصهم).

ئایا ئێوە سەرکەوتنتان و زۆربوونی ڕزقتان مەگەر بەهۆی لاوازەکانتانەوە نیيە بەهۆی پاڕانەوەی ئەوان و نوێژی ئەوان و ئیخلاصی ئەوانەوەیە.

بەهۆیانەوە سزاو عەزاب لەسەر بێ بڕوا و گوناهباران لادەچێ، تا ئەوانە کە باوەڕدارن لەناویانان تووشی ئەو سزایە نەبن، لەبەر ئەمان سزا لەسەر ئەوانیش هەڵدەگیرێ، لەوانە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَاء مُّؤْمِنَاتٌ﴾ تا ئەگاتە ئەوەی کە دەفەرموێ ﴿لَوْ تَزَيَّلُوا لَعَذَّبْنَا الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَاباً أَلِيماً﴾ الفتح: ٢٥.

کەواتە گەر باوەڕدارە لاوازەکانی مەککە نەبوایە کە لە ناوەڕاستی کافرەکاندا بوون، خوای گەورە سزای ئەو کافرانەی ئەداو دوای نەدەخست.

هەروەها حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ((لو لا ما في البيوتِ مِنَ النِساءِ والذراري لأمرتُ بالصلاة فتقام، ثم انطلق معي برجالٍ معهم حزم من حطب الى قوم لا يشهدون الصلاة معنا فأُحَرِّقَ عليهم بيوتهم) ئەگەر لەناو ماڵەکاندا ئافرەت و منداڵانی تیا نەبووایە، فرمانم دەکرد بە قامەتی نوێژ و پاشان لەگەڵ کۆمەڵێ لە پیاواندا دەردەچووم، کە هەر یەکێ لەو پیاوانە گورزی ئاگرینیان پێیە بۆ لای ئەو کەسانەی کە ئامادەی نوێژ نابن لەگەڵماندا، خانوەکانم بەسەریاندا ئەسوتاند..

هەروەها وازهێنـان لـە ڕەحمـی ئـەو ئافرەتـەی کـە منـداڵی لـە سکدایە، چونکە حەزرەتی عیسا (علیه السلام) فەرمووی: ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكاً أَيْنَ مَا كُنتُ﴾ مريم: ٣١. کە بەرەکەت و پیرۆزی ئەولیای خواو صالحین بەلایـەنی سودەکەیان بۆ خەڵکی بە پاڕانەوەیانە بۆیان تا گوێڕایەڵی خوا زیاتر بکەن، وە بەداوایانە لە خوا کە لە ڕەحمەتی خۆی بڕژێنێ بە سەریاندا و عـەزابیان لەسەر هەڵبگرێ بەهۆی ئەو دۆستانی خوایەوە کە هۆکار و سەبەبێکی هەق و دیارە، هەرکەس مەبەستی ئەم بەرەکەتە بێ لەو وتەیـەدا کـە ئـەیڵێ، ئەوە ڕاستگۆیە و وتەیەکی هەقی وتووە..

بەڵام لایەنە بەتاڵەکەی ئەمەیە:

نمونـەی هاوبەشـی لـە دروسـت کـردن و خـەلق دا، بـۆ نموونـە: پیاوێـك مـردووە نێـژراوە لـە شـوێنێکدا گومـان وا ببـات خـوا بـەهۆی ئـەوەوە فرمانەکانیان بۆ جێبەجێ دەکات، ئیتر نوێژ و ڕۆژویشی نەگرت بەلایانـەوە کێشە نەبێ، ئەمە جەهل و نەزانینە، پێغەمبەر ﷺ گەورەی نەوەکانی ئادەم پێغەمبەرە ﷺ لە ساڵی (الحّرە)دا وەفاتی کرد و لـە مەدینـەدا تەسلیم کرا، خەڵکی تووشی کوشتن و تـاڵانی و تـرس هـاتن کـە خـوا نـەبێ کـەس نازانێ چەندە نەهامەتیەکی گـەورە بـوو، ئەوانـە لەسـەردەمی خولـەفای ڕاشـدین دا بـەهۆی بەرەکـەتی ئیمـان و خواپەرسـتیانەوە خـەڵکی مەدینـەی لـەو ئافاتـە پاراست، چونکە خولەفای ڕاشیدینیش خۆیان ئەو بانگەوازەیان دەکرد، کە بەهۆی بەرەکەتی گوێڕایەڵیان بۆ ئەو چوار خەلیفەیە و بە بەرەکـەتی ئیشـی پـیرۆز و ئـیخلاص و نیـەت پـاکی ئـەو خولەفایانـەوە خـوا سـەری خسـتن و پشـت گیریـان بـوو، هـەروەها پێغەمبـەر ئیـبراهیم ﷺ لـە شـام نێـژراو نەصاراکان بۆ ماوەی سەد ساڵ دەسەڵاتیان بەسەر ئەو شارەدا گرت لـە کاتێکدا کە خەڵکەکەی زۆر خراپەکار بوون، هەرکەس وا گومان ببات کە

مردوو لەسەر زیندوو شت لادەبات لە کاتێکدا کە زیندووە کە بێ فرمانی خواو گوناه بکات ئەوە لە هەڵەدا ئەژی.

هەروەها ئەگەر وا گومان ببات کە بەرەکەتی ئەو کەسەیە ئەگەڕێتەوە سەر ئەو کەسە کە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار داوە و لە ئیطاعەی خواو پێغەمبەرەکەی دەرچووە، وەك ئەوە وایە کە وا گومان ببات کە بەرەکەتی سەجدە بردنی بۆ کەسانی تر ئیشی بۆ دەکات، یان زەوی لە بەردەمیا ماچ بکات ئەوە سەرفەرازی دنیای دەست دەکەوێ، ئیتر با ئەو کەسەی تریش گوێ بە ئیطاعەی خواو پێغەمبەرەکەشی نەدات، یان وا گومان ببات کە ئەو کەسەیە شەفاعەتی بۆ دەکات وە تەنها بەهۆی خۆش ویستنی بۆی ئەیخاتە بەهەشتەوە، یان بەهۆی ئەوەوە کە نەسەبی ئەگاتە سەر زەوی، ئەم شتانە بە گشتی پێچەوانەی فەرمانی قورئان و فەرموودەکەیە، ئەوە حاڵی موشریکەکان و ئەهلی بیدعەچیەکانن، بەتاڵە و دروست نی‌یە باوەڕیان پێ بکەین و نابێ پشتی پێ ببەستی.[1]

وتەکەی (ابن تیمیه) تەواو بوو .

---

[1]- بنوارە بۆ (الفتاوى) ابن تيمية ١١٣/١١.

# ئیمامی ئەحمەد تەبەروك وەردەگرێ و ئیمامی زەهەبیش پشتگیری دەكات[1]

(عبدالله ی كوڕی ئەحمەد دەگێڕێتەوە: (باوكمم بینی چەند تاڵێك لە قژی موبارەكی پێغەمبەری ﷺ پێ بوو ئەیخستە سەر لێوەكانی و زیارەتی دەكردن، وە بینیم كە ئەیخستە سەر چاوەكانی، وە تێكەڵی ئاوی دەكرد و ئاوەكەی دەخواردەوە و بە شیفا بۆ نەخۆشیەكان وەری دەگرت.

وە بینیم دەفرێكی پێغەمبەری ﷺ لابوو ئاوی تێدا ڕا دەدا و ئاوی تیا دەخواردەوە، وە بینیم لە ئاوی زەمزەمی بۆ نەخۆشی بە شیفا ئەخواردەوە وە دەستی تەڕی بە ئاوی زەمزەم دەهێنا بە دەم و چاویدا) .

منیش دەڵێم: (واتە الذهبي): كوان ئەوانەی قین لە دڵ و مونكیری ئەم حاڵەتەن و چی دەڵێن لەسەر ئیمامی ئەحمەد، لە كاتێكدا كە جێگیر بووە كە عبدالله پرسیاری كرد لە باوكی سەبارەت بە كەسێ سەری مینبەری پێغەمبەر ﷺ دەگرێ و دەست ئەدات لە حوجرەی پێغەمبەر و پەنجەرەكانیەوە؟ ئەویش لە وەلامدا فەرمووی: (لا أري بذلك بأس) واتە هیچ خراپیەكی تیا نابینم..

پەنا دەگرم بە خوا كە من و ئێوەش بە دوور بگرێت لە بیروبۆچوونی ئەو كەسانەی كە لە دین دەرچوون و لەوانەش كە بەناوی دینەوە شت هەڵدەبەستن)).

---

[1]- بنوارە بۆ (سير أعلام النبلاء)ی ئیمامی ذەهەبی ٢١٢/١١ كە ئەوەی سەرەوە تەواوی وتەكەیەتی، خوا جەزای بەخێری بداتەوە..

# به کورتی

ئەو فەرموودەو ئاثارانەی کە هێنامان: بریتی یە لە تەبەروك وەرگرتن بە حەزرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ و بە ئاسار و کەلوپەل و شتەکانیەوە، کە لە پلەی سوننەتێکی بەرزکراودایە، وە ڕێگەیەکی دروستی چاکە، بەس بێ بە تەنها کردەوەی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لەسەر) وە بەس بێ پشتگیری حەزرەت ﷺ بۆ ئەو تەبەروکەی صحابە کردوویەتی لە خزمەتیدا، بەڵکو بە ئامـاژە و فرمانی خۆی هاوەڵانی بۆ تەبەروك لە پێغەمبەریان وەردەگرت، بەس بێ ئەو هەموو دەقەی کە هێنامانەوە، درۆی ئەو کەسەش دەرکەوت کە وا گومانی دەبرد یان توهمەی بەرانبەر بە کردەوەی هاوەڵان دەردەبڕی و دەیوت هاوەڵان گوێیان بەو تەبەروکانە نەداوە مەگەر عەبدوڵڵای کوڕی عومەر نەبێ (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) و ئەو وتەشیان بە درۆ کەوتەوە کە دەیانوت کەس لە هاوەڵان لەگەڵ ڕای عبدالله دا نەبوون.

کە ئەمە یان نەزانینە یان درۆ هەڵبەستنە یان تێکەڵ کردنە، زۆر لە هاوەڵان لە غەیری عبدالله ش لەناویاندا هەر چوار خولەفای ڕاشدین و ئوموسەلەمە و خالیدی کوڕی وەلید و واثلەی کوڕی ئەسقەع و سەلەمەی کوڕی ئەکوەع و ئەنەسی کوڕی مالیك و ئومو سەلیم و ئەسیدی کوڕی حوضەیر و سەوادی کوڕی غەزیە و سەوادی کوڕی عەمر و عبدالله ی کوڕی سەلام و ئەبو موسا و عبدالله ی کوڕی زوبەیر، وە سەفینە کە مەولای پێغەمبەر بوو، وە بەرەکە کە خزمەتکاری ئومو حەبیبە بوو، وە مالکی کوڕی سینان و ئەسمائی کچی ئەبوبەکر و ئەبو مەحذورەو مالکی کوڕی ئەنەس و مامۆستا و شێخەکانی شاری مەدینە وەك سەعیدی کوڕی موسەیب و یەحیای کوڕی سەعید و غەیری ئەمانەش (ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێ) تەبەروکیان وەرگرتووە بە حەزرەت و هەموو ئاسارەکانی ﷺ.

((کۆتایی بەشی دووەم))

# ( بەشی سێیەم )

چــەند لێکۆڵینەوەیــەکی جیــاوازە، بــاس لــە ژیــانی بــەرزەخ و ڕوونکردنەوەی حاڵەتەکانی دەکات، لەگەڵ دروســتی زیــارەت کردنــی پێغەمبەر ﷺ لەم کاتی وەفاتەیدا وە ئەو شتانەش کە پەیوەندی بە زیارەتەوە هەیە، بە ڕوونکردنەوەی ئاسار و وتەی بینــەران و شــاهید حاڵەکان و هێنانی موناسەبەکانیان...

# ژیانی بەرزەخی ژیانێکی هەقیقی یە

(ژیانی بەرزەخی ژیانێکی هەقیقی یە) ئەمە ئەو وتەیەیە کە کۆمەڵێکی زۆر بەڵگەی قورئان و فەرموودەکانی لەسەرە.

وەسفدار کردن بە مردن هیچ دژایەتیەکی ئەو ژیانە هەقیقی یە ناکات، وەك خوای پەروەردگار ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ الْخُلْدَ﴾ الأنبياء:٣٤.. یان ئەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾ الزمر: ٣٠ ماناو مەبەستی ئێمە لەو وتەمان کە ژیانی بەرزەخی ژیانێکی هەقیقیە ئەوەیە کە بڵێین: ئەو ژیانەی دوای ئەم دونیایە خەیاڵی یان مثالی نىیە، وەك چۆن زۆر لەوانەی باوەڕیان بە ژیانی دوای مردن نىیە بەو شێوە دەڵێن، ئەوانەی کە تەنها بە بینین و هەست کردن باوەڕ دەکەن بێ ئەوەی مێشك و بیریان بخەنە گەڕ ، بێ ئەوەی باوەڕیان ببێ ئەو غەیب و نادیاریانەی کە مێشکی مرۆڤ ناتوانێ پەی پێ ببات... گەر بە تێڕوانینێکی کورتەوە هەڵوێستەیەك لەسەر وتەکەمان لەبارەی هەقیقەتی ژیانی بەرزەخی بکەین، بچوکترین گومان و دوو دڵی بۆ تێگەیشتن و دەرکردنی واتاکانی نامێنێ تەنانەت لەلایەن کورتبیر و کەم هەستەکانیشەوە، وە باس کردنی (هەقیقەت)یش جگە لە لابردن و نەفی کردنی کارە ناڕەواو بەتاڵ و دەرکردنی خەیاڵ و ئەندێشە پوچەکان نەبێ بۆ هیچی تر نىیە، وە بۆ نەهێشتنی ئەم خەیاڵەیە لە مێشکی مرۆڤە دوو دڵ و بەدگومانەکاندایە لەسەر حاڵەت و دۆخی جیهـــانی بـــەرزەخ و ڕۆژی دوایـــی و جیهانـــەکانی تریشـــەوە وەك زیندووبوونەوە و کۆکردنەوەیان لە ڕۆژی مەحشەر و لێپرسینەوە.

ئەم مانایە بۆ وشەی (هەقیقی) هەموو مرۆڤێکی سادە ئەیزانێ و لێی تێدەگات، کە بەرانبەر وەهم و خەیاڵ و مثال بەکارهاتووە کە ئەو هەقیقەتانە بە بەڵگەی بەهێز و فەرموودەکان جێگیر بووە کە دەیسەلمێنن

مردوو ئەبیستێ و هەست دەكات و خەڵكیش ئەناسێتەوە، جا یەكسانە ئەو مـردووە باوەڕدار بوو بێ یان بێ باوەڕ. كە ئەمەش ڕاستییەو خەیاڵی كەسـی نییـە، كـە هـەر ئەمـەش خـودی مەبەسـتەكەیە و تێگەیشـتن و بۆچوونمان لەسەر ئەم بابەتە هەر ئەمەیە كە كۆمەڵێكی زۆر فەرموودە و ئاساریش پشتگیری دەكەن.

لەوانـە: فـەرموودەی (شـیوی قولـەیب)ە، كـە جـێگیر بـووە لـە هـەردوو صەحیحەكەدا و لە چەند ڕێگەیەكی جیاوازەوە هاتووە، لە ئەبی طەلحە و عومـەر و عبـدالله ی كوڕیـەوە (ڕەزای خوایـان لەسـەر بـێ) هـاتووە دەڵـێن: پێغەمبـەر ﷺ فرمـانی كـرد لـە ڕۆژی بـەدرا كـە بیسـت و چـوار پیـاو لـە گەورەیانی قوڕەیش كە كوژراون بهێنین و بیان خەینە یەكێ لە شیوەكانی بـەدرەوە، پاشـان حـەزرەت ﷺ هـاواری لێ كـردن و نـاوی ئـەبردن و ئەیفەرموو: (ئەی ئەبا جەهلی كوڕی هشام، ئەی ئومەیەی كوڕی خەلف ، ئەی عوتبەی كوڕی ڕەبیعە، ئەی شەیبەی كوڕی ڕەبیعە، ئەوەی خواكەتان بەڵێنی پێ دابوون ئایا بینیتان و پێی گەیشتن؟ چونكە من ئەوەی خوا وادەی پێدابووم بینیمەوەو بە هەق هاتە جێ، عومەر عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ وتەت لەگەڵ كۆمەڵێ لاشەدایە كە ڕۆحیان تیا نییە!؟ حەزرەت لە وەڵامدا فەرمووی: (والذي نفسي بيديهِ ما أنتُم بأسمَعَ لما أقولُ منهم ولكنهم لا يجيبون)[1] .

واتە: سوێند بەو خوایەی كە گیانم لە دەستیایەتی، ئێوە باشتر لەوان نابیستن بەڵام ئەوەندەیە ئەوانە ناتوانن وەڵام بدەنەوە.

---

[1]- بوخاری لە ڕێگەی ئەنەس لە ئەبی طەلحەوە، وە مسلم لە ڕێگەی ئەنەسەوە لە عومەرەوە ڕیوایەتیان كردووە، وە هەردوكیشیان لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتیان كردووە.

طبرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) بە سەنەدێکی چاك، وە لە گێڕانەوەی عبدالله ی کوڕی سیدان و غەیری ئەمیش کە دەڵێ: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەوانە ئەبیستن؟ فەرمووی: ( یسمعون کما تسمعون، ولکن لا یجیبون). ئەبیستن وەك ئێوە چۆن ئەبیستن بەڵام ئەوانە ناتوانن وەڵام بدەنەوە..

یەکێکی تر لەوانە: بەزار ڕیوایەتی کردووە و ابن حبان تەصحیحی کردووە لە ڕێگەی ئیسماعیلی کوڕی عبدالرحمانی سەدی لە باوکیەوە لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی: (إنَّ المیتَ لِسمَعُ خفق نعالیهم إذا ولَو مدبرین) واتە مردوو گوێی لە دەنگی پێیەکانی ئەوانەن کە بەجێی دێڵن.[1]

ئیمامی بوخاری لە صەحیحەکەیدا دەڵێ: (باب المیتُ یسمَعُ خفق النّعالِ) پاشان لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی دەکات لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: (العبدُ إذا وضع في قبره، وَ تُوُلّی و ذهبَ أصحابه حتی إنهُ لیسمَعُ قرع نعالهم أتاهُ ملکان فأقعداهُ) هەروەها هەمان فەرموودەی هێناوە لە (باب ما جار في عذاب القبر)[2] واتە: بەندەی خوا کاتێ دەینێنە گۆڕەکەی و پاشان هاوڕێیانی بەجێی دێڵن، ئەو لە گۆڕەکەوە دەنگی پێیەکانیان ئەبیستێ چونکە لەو کاتەدا دوو فریشتە لەلای ئەون و دایاننیشاندووە.

کە بیستنی دەنگی نەعلەکانی خەڵکی سەر زەوی لەلایەن مردووەکەوە لەم فەرموودەدا ڕوون ئاشکرایە.

---

[1]- ابن حبان هێناویەتی لە ڕێگەی محمدی کوڕی عەمر لە ئەبی سەلەمە لە ئەبی هورەیرەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

[2]- ئیمامی مسلم ڕیوایەتی کردووە.

یەكێكی تر لەوانە: ئەو فەرمودانەیە كە لە باسی پرسیاری ناو گۆڕدا هاتووە كە زۆرن و بڵاون، كە باس لە پرسیاركردنی ئەو دوو فریشتەیە دەكەن وە وەڵام دانەوەی مردووەكەش، بەو وەڵامە یان سەربەرز دەبێ یان بەدبەخت دەبێ..

لەوانە: ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دروستی دانا كە هەر كەس چووە ناو گۆڕستانێ سەلام لە مردوانی بكات و وتەیان لەگەڵدا بڵێ و بە (السلام علیكم دار قومٍ مؤمنین) وتووێژیان لەگەڵدا بڵێ...

(إبن القیم) دەڵێ: (ئەمە وتوێژە بۆ كەسێك كە ببیستێ و خاوەنی عەقڵ و ژیری بێ، ئەگەر وا نەبێ ئەو كاتە ئەو وتووێژە دەچێتە ژێر باسی نەبوون و تەنە بێگیانەكانەوە، وە زانایانی سەلەف كۆن لەسەر ئەمە وە بەڵگەكان زۆرن لەسەر ئەوە كە مردوو ئەزانێ ئەو زیندوەی سەردانی كردووە كێیەو دڵ خۆشیش دەبێ پێی) .

پاشان (ابن القیم) نمونەیەكی زۆر باس دەكات لە كتێبی –الروح–دا گەر دەتوانی بچۆرەوە سەردانی ئەو كتێبە.

منیش دەڵێم:

عبدالرزاق فەرموودەیەكی لەم باسەدا ڕیوایەت كردووە لە زەیدی كوڕی ئەسلەمەوە دەڵێ: ئەبو هورەیرە دای بەلای هاوەڵێكی دا كە لەسەر گۆڕی كەسێكی وەستا بوو، وتی: سەلامی لێ بكە؟ پیاوەكە وتی: ئایا سەلام لە مردووی گۆڕ بكەم؟ ئەبو هورەیرە فەرمووی: گەر لە دونیادا یەك ڕۆژ تۆی بینابێ و ناسیبێتی، ئێستەش ئەتناسێتەوە ( إنْ كان رآك في الدنیا یوماً قطُ، إنَهُ لیعرفُكَ الآن )[1] .

---

[1]- عبدالرزاق لە –المصنف– دا ڕیوایەتی كردووە ٣/٥٧٧.

ئه ئەمەیە کە ئێمە دەڵێین بیروباوەڕ و عەقیدەی دامەزراوی سەلەفی پێشینمانە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ- ئەوانە ئەهلی سوننە و جەماعە بوون، ئیتر نازانم ئەوانە کە خۆیان بە شوێن کەوتەی سەلەف دەزانن چۆن خۆیان بێ ئاگا دەکەن لەم هەقیقەتانە.

شێخ ئیبنو قەیم لە کتێبی -الروح- دا زۆر بە جوانی هێناویەتی کە شیفای تیایە و تەنها ئەویش بەسە، کە لێرەدا ئەو فتوا گەورەیە دەهێنینەوە کە (ابن تیمیە) لەم باسەدا فتوای پێ کردووە لە کتێبی (الفتاوی الکبری)دا هاتووە...

* پرسیاریان کرد لە شێخ سەبارەت لەو زیندوانەی کە سەردانی گۆڕستانەکان دەکەن ئایا مردووەکان هەست بە زیارەتەکەی ئەمان دەکەن؟ وە ئایا مردووەکان ئەزانن کێ لە نزیکانیان لە دوای خۆیان مردون و دونیایان بەجێ هێشتووە؟ .

لە وەڵامدا دەڵێ: سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، بەڵێ ئاسارەکان زۆر هاتوون لەسەر ئەو باسەیەو ئاشکراکردنی کردەوەی زیندوان بۆ مردووەکان، هەروەك ئیبنو موبارەك ڕیوایەتی کردووە لە ئەبی ئەیوبی ئەنصاری‌یەوە دەڵێ: هەرکات گیانی موسوڵمانێ کێشرا و بەرزکرایەوە لە بەندەکانی خواوە بە خشندەیی دێت بەرەو پیریان هەروەك چۆن لە دونیادا مژدەدەرێ دێ بەرەو ڕوویان، ڕووی تێدەکەن و پرسیاری لێ دەکەن، هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەڵێن: بنواڕن بۆ براکەتان لە ناڕەحەتی‌یەکی زۆردا بوو ئیتر ئەحەسێتەوە، دەڵێ: بەرەو ڕووی دەچن و پرسیاری لێ دەکەن و دەڵێن پێی: فلانەکەس چی کرد؟ چی لێ بەسەرهات؟ فلانە ئافرەت هەواڵی چۆنە؟ ئایا مێردی کرد؟... فەرموودەکە.

بەڵام زانستی مردوو بۆ زیندوو لە کاتێکدا کە زیندوەکە زیارەتی دەکات و سەلامی لێ دەکات، ئەوە لە گێڕانەوەی ئیبنو عەباسەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ما من أحدٍ يمُرُ بقبرِ أخيهِ المؤمن كان يعرفهُ في الدنيا فيسلم عليه إلا عرَفه وردَ عليه السلام) هیچ کەسێ نییە بدا بەلای گۆڕی برایەکی موسوڵمانیا کە لە دونیادا ناسیبێتی و سەلامی لێ بکات، مەگەر مردوەکە ئەیناسێتەوە و وەڵامی سەلامەکەی ئەداتەوە.. ئیبنو موبارەك دەڵێ: ئەمە جێگیر بووە لە حەزرەتەوە ﷺ وە پلەی بەهێز و صەحیحی دراوەتێ لەلای خاوەنی (الأحكام)کە ( عبد الحق ) ە [1] ..

لە شوێنێکی تردا هاتووە دەڵێ: پرسیار کرا لە شێخ ئیبنو تەیمیە: ئایا مردوو گوێی لە وتەی زیندوەکانە کە زیارەتی دەکەن وە ئایا کەسەکە دەبینن؟ وە ئایا لەو کاتە ڕۆحەکە دەچێتەوە لاشەی، یان بەسەر گۆڕەکەوە باڵە فڕە دەکات لەو کاتەو کاتەکانی تریشی؟ وە ئایا ڕۆحەکەی لەگەڵ ڕۆحی کەسوکاری لە خزمانی و نزیکانی کە مردوون کۆدەبنەوە و سەردانی یەکتری دەکەن؟...

لە وەڵامدا دەڵێ: سوپاس بۆ خوای پەروەردگار، بەڵێ هەموو ئەو شتانە ئەبیستێ وەك چۆن لە صەحیحەکاندا هاتووە و جێگیر بووە لە حەزرەتەوە ﷺ کە دەفەرموێ: (يسمع قرعَ نعالهم حين يولون عنه)[2] گوێبیستی دەنگی پێڵاوەکانیان دەبێ کاتێ کە دەگەڕێنەوە..

پاشان ژمارەیەکی زۆر فەرموودەی بەو مانایە هێناوە و دەڵێ:

(ئەم دەقانە و هاوشێوەکانی ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە مردوو گوێ بیستی وتەی زیندووەکانە، بەڵام پێویست ناگێڕێ لەسەری کە بەردەوام سیفەتی

---

[1]- بنوارە بۆ (مجموع الفتاوى)ی ابن تيمية: ٢٤/٣٣١.

[2]- بنوارە بۆ صحيح البخاري -كتاب الجنائز- باب الميت يسمع خفق النعال..

گویَ بیستی هەبیَ، بەڵكو لەو كاتەوە بۆ كاتێكی تر دەگۆڕیَ، هەندیَ كات گویَی لیَ دەبیَ، وە كاتی واش ئەگونجیَ كە گویَ بیست نەبیَ، هەروەك چۆن زیندووەكان لەبەر بوونی ڕێگرێك هەندیَ جار گوێبیستی چواردەوریان نابن... كە ئەم بیستنە بە بیستنی هەست و ئیدراك دادەنریَ، كە بەش بەشی لەسەری كۆنابێتەوە و نابیَ بەو گوێبیستەی كە قورئان نەفی لیَ كردووە و دەفەرمویَ: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَى﴾ النمل: ٨٠. كە مەبەست بە ئایەتەكە بیستنی وەرگرتن و جیَبەجیَ كردنە، كە دەبینین خوای پەروەردگار بیَ بڕواكان (كافرەكان) بە مردوو ئەشوبهێنیَ لەوەدا كە نایەن بەدەم بانگەوازەوەو جیَبەجیَی ناكەن، وە بە ئاژەڵ پێناسەیان دەكات لەوەدا كە ئەبیستن بەلاّم هیچ لە مانای تێناگەن، مردووش گویَ بیستە و تێدەگات، بەلاّم ناتوانیَ وەلاّمی بانگەوازەكە بداتەوە یان فرمانەكە جیَبەجیَ بكات یان نەهی لە خراپەیەك بكات، هیچ سودێكی پیَ ناگات كە فرمانی بكەی بەسەردا یان نەهی كارێكی لیَ بكەیت، بە هەمان شێوەش كافرەكانیش كە هیچ فرمانێك و نەهیەك سودیان پیَ ناگەیەنیَ، با گوێبیستی بانگەوازەكەش بن و لێشی تێبگەن، ئەمە مانای ئەو ئایەتەیە كە دەفەرمویَ: ﴿وَلَوْ عَلِمَ اللّهُ فِيهِمْ خَيْراً لَّأسْمَعَهُمْ﴾ الأنفال: ٢٣، بەلاّم بینینی زیندوەكە لەلایەن مردووەكەوە چەند فەرمودەیەك لەسەری هاتووە لە خاتوو عائشەو غەیری ئەویشەوە..

بەلاّم ئەو وتەیە كە یەكیَ دەڵیَ: ئایا ڕۆحەكە دەگەڕێتەوە لاشەكەی لەو ساتەدا، یان بەسەر گۆڕەكەوە باڵە فڕە دەكات لەو ساتەو لە غەیری ئەو كاتەش؟ بەڵیَ لەو ساتەدا ڕۆحەكەی دەگەڕێتەوە لاشەی هەروەك لە فەرمودەدا هاتووە، وە لە غەیری ئەو ساتەشدا دەگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەمەدا ڕوحەكەی بە لاشەكەی دەگات هەركات خوا ئیرادەی ببیَ، كە ئەمە لەو

ساتەدا وەك دابەزینی فریشتەیەکە و بەهۆیەوە سەرزەوی بە تیشکی نورینی ڕۆشن بێتەوەو خەوتووەکان بەهۆشیان دێنێ...

بۆ ئەمە دەڵێم: ئاسارەکان زۆر هاتوون لەسەر ئەمە کە ڕۆحەکان لە بنی گۆڕەکانن. مجاهد دەڵێ: ڕۆحەکان لەو ڕۆژەوە کە لاشەکەیان دەنێژرێ ماوەی حەوت ڕۆژ لە بنی گۆڕەکەیا دەبن و لە لاشەکە جیا نابنەوە، مالکی کوڕی ئەنەس دەڵێ: پێم گەیشتووە کە ڕۆحەکان دەگەنەوە بە لاشەیان هەرکات ئارەزوو بکەن، وە خواش دەزانێ) [1] .

وە ئیبنو تەیمیە لە شوێنێکی تردا دەڵێ:

(ئەو هەواڵە کە خوا پێمان ئەدات و باس لە ژیانی شەهیدەکان دەکات و ڕزق و ڕۆزیان دابین دەکات، وە ئەو فەرمووده ڕاستانەش کە هاتووە لەسەر چوونە ژوورەوەی ڕۆحەکانیان بۆ بەهەشت، هەندێ لە زانایان دەڵێن کە ئەم حاڵەتە تایبەتە بەوانەوەو ڕاستگۆیان و پلەکانی خوارەوە ناگرێتەوە،ئەوەی کە کۆمەڵێ لە زانایانی جمهور و ئەهلی سوننە لەسەری کۆن ئەوەیە کە ژیان و ڕزق و چوونە بەهەشتی ڕۆحەکان تایبەت نییە تەنها بە شەهیدەکانەوە ، بە باس کردن و ناوبردنەوە تەنها بۆ ئەوەیە تا گومان نەبرێ بەوە کە بوترێ ئەوە ئەمرێ و بەمەش واز لە جیهاد بهێنێ یان تەمەڵی تیا بکات، ئەو هەواڵەمان ئەداتێ تا ڕێگرەکان لەبەردەم جیهاد و پلەی شەهادەتا لا ببات، هەروەك چۆن خوا نەهیمان دەکات لەوە کە مناڵەکانمان بکوژین لەبەر برسێتی، کە ئەوە بووە و ڕاستە ) [2] ، وە کوشتنیان هەر دروست نییە لەگەڵ نەبوونی ترسیشیان لە هەژاری و قاتی.

---

[1]- بنواڕە بۆ (مجموع الفتاوى)ى ابن تيمية ٣٦٢/٢٤.

[2]- بنواڕە بۆ (مجمع الفتاوى) ابن تيمية ٣٣٢/٢٤.

## ئەزیەتی مردوو مەدە با ئەزیەتت پێ نەگات

حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ پیاوێكی بینی شانی دادابوو بەسەر گۆڕێكدا فەرمووی پێی: ( لا تُؤذِ صاحِبَ القبر )[1] ئەزیەتی خاوەن گۆڕەكە مەدە...
وە پێشەوا -الطحاوي- لە كتێبی (معاني الآثار)[2] دا هێناویەتی لە فەرموودەی (ئیبنو عەمری كوڕی حەزم)ەوە كە دەڵێ:

پێغەمبەر ﷺ منی بینی لەسەر گۆڕێكدا فەرمووی پێم: (أنزِل عن القبر لا تؤذ صاحب القبر وَلا يؤذيك)[3] دابەزە لەسەر ئەو گۆڕە و ئەزیەتی خاوەن گۆڕەكە مەدە و ئەویش ئەزیەتت نادات..

## مانای ژیانی بەرزەخی

پێویستە ڕوون بێتەوە بۆ خەڵكی كە مانای ئەو ژیانە چیە كە بەرزەخە كە وەك ئەم ژیانەی ئێمە نیە، بەڵكو ژیانیەكی تایبەتی یە كە شایستە بێ لەگەڵ ژیانی ئەو جیهانەی كە تیایدان، بەڵام پێویستە ئەوە ڕوون بكەینەوە بۆیان كە ئەو ژیانە وەك ئەم ژیانەی ئێمە نیە، چونكە ژیانی ئێمە ژیانێكی كەم و كورت و تەسك و لاوازە.

**<u>ژیانی دونیا</u>** : مرۆڤ تیایدا لەنێوان بەندایەتی و خواپەرستی و نەریتە باوەكان و گوناه كردن و ئیش و فرمانی دونیایی چ بۆ نەفسی خۆی یان كەسوكاری یان ئەرك و فەرمانەكانی خوای پەروەردگاری، ڕێ دەكەوێ پاك بێ لە لاشەو پۆشاك دا و جاری واش هەیە بە پێچەوانەوەیە، لە مزگەوتایەو

---

[1]- لە -المنتقى-دا ابن تيمية ١٠٤/٢ هێناویەتی، وە ابن حجر لە (الفتح)دا ١٧٨/٣ دەڵێ (إسنادهُ صحيح).

[2]- طحاوی لە (معاني الآثار) ٢٩٦/١ هێناویەتی.

[3]- هەیثەمی لە -مجمع الزوائد- ٦١/٣ هێناویەتی

کاتی واش هەیە لە حەمام دایە نازانێ کۆتایی ژیانی لە کوێدا دەبێ، دێتە پێشەوە کە لەنێوان ئەو و بەهەشت دا تەنها باڵێکی دەمێنێ، بەڵام فرمانەکان لەسەری پێچەوانە دەبنەوەو بەرەو دۆزەخی دەبەن، وە جاری واش هەیە بە پێچەوانەوەیە.

**بەڵام ژیانی بەرزەخ**: ئەگەر ئەو کەسەیە لە ئیمانداران بوو، ئەوە قۆناغی تاقیکردنەوەی بە چاکی دەبڕێ، کە مەگەر بۆ سەربەرزان ئەو قۆناغەیە بە باشی دەگێڕێ، لەپاڵ ئەمەدا ئەو کەسەیە هیچ جۆرە تەکلیفێکی لەسەر نىیە، بووە بە ڕۆحێکی پاك و ڕۆشن ئەگەڕێ و بەناو کەشتی مەلەکوتی خوای گەورە و موڵکەکانی دا بەرزدەبێتەوە و سەیر دەکات، نە خەفەتیان هەیە، نە دوو دڵی ڕوویان تێ دەکات، نە غەمبار دەبن نە پەست و بێ هیوا، چونکە لەو ژیانەدا نە دونیاو نە خانوو و تەلار، نە زێڕو زیوو، نە حەسادەت و ڕژدو کینە هەیە تا بیانگۆڕێ..

خۆ ئەگەر کەسەکە بە پێچەوانەوە بوو، ژیانەکەشی بە پێچەوانەوە دەبێ.

## پێغەمبەران و تایبەتمەندی بەرزەخیەکانیان

پێغەمبەران (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ) خاوەنی کۆمەڵێ تایبەتین بەتایبەت لە ژیانی بەرزەخیاندا، کە مرۆڤەکانی تر ناتوانن ببن بە خاوەنی، ئەگەر لە شتێکدا لەوان بچن ئەوا لەڕێی نسبییەوەیە، وە ئەو تایبەتمەندییە کە بۆ پێغەمبەران هەیە لە دوو ڕێگەوەیە:

یەکەم: لە ڕێگەی ئەسڵ و بنەچەوەیە..

دووەم: لە ڕێگەی سیفەتی کەمال و تەواوییەوە..

کە ئەمەی خوارەوە هەندێ لەو تایبەتمەندییانەیە:

# ژیانی پڕ كەماڵی پێغەمبەران (علیهم الصلاە والسلام)

لە باسەكانی پێشەوە یادمان خستنەوە كە ژیانی بەرزەخی ژیانێكی هەقیقی‌یە، وە مردووەكان (باوەڕداربن یان بێ باوەڕ) دەبیستن و هەست دەكەن و دەناسنەوە. ژیان و ڕزق و ڕۆزی و چوونە بەهەشتی ڕۆحەكان تەنها بە شەهیدەوە تایبەت نی‌یە، هەروەك دەقە جێگیرەكانیش ئاماژەیان پێ كردووە، ئەوە هەر ئەو ڕاستیەیە كە پێشەوایانی ئەهلی سوننەت لەسەری كۆن و هاوڕان.

<u>لێرەوە:</u>

قسەكردن لە ژیانی پێغەمبەران لە زیادەی وتەكانە، چونكە ئەوە فرمانێكی ڕوون و ئاشكرایە و وەك خۆر نومایانە و پێویستی بە بەڵگە هێنانەوە نی‌یە بۆ بوونی، بەڵكو ڕاستر وایە كە دان بنێین بەوەدا كە ژیانی پێغەمبەران لە تەواوی پلەی شكۆو كەمال و گەورەیی‌دایە، وەك ژیانی خەڵكی وایە كە لەسەر زەوی دا ئەژین، كە ئەمە هەمووی پلەو مەقامات و قۆناغی جیاوازن، هەیانە زیندووە و لە شێوەی مردودایە، وەك خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێ:

﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ الأعراف: ١٧٩..

ئەوانە دڵیان هەیە بەڵام هیچی پێ حاڵی نابن، چاویان هەیە و هیچی پێ نابینن، گوێیان هەیە و هیچی پێ نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵ وانە و بگرە گومڕاترن وە ئەوانە لە بێئاگایدا ژیان بەسەر دەبەن. مەبەست پێی نەبیستن و بینی هەق و ڕاستی یە.

وە لە مرۆڤە زیندووەكان هەیە لە پلەیەكی بەرزدایە كە خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ یونس: ٦٢.

ئەوانە دۆستی خوان نەترسیان هەیە و نە خەفەت و مەراق ڕوویان تێ دەکات. وە هەشیانە تەنها ئیماندارن بەڵام هەڵگری کۆمەڵێ سیفەتی بەرزن وەك خوا لە هەقیاندا ئەفەرموێ ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ . الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ . وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ . وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ . وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ . إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ . فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ . وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ . وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ . أُوْلَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ﴾المؤمنون: ١-١٠..

هەشیانە لە مرۆڤەکان خوا بە موحسین و چاکەکار پێناسەیان دەکات و ئەفەرموێ ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ . كَانُوا قَلِيلاً مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ. وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ الذريات: ١٦-١٨.

بە هەمان شێوەی ژیانی دونیا، ژیانی بەرزەخیش پلەو مەقامات و ڕوتبەیەو لەیەك جودان، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن كَانَ فِي هَـذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلاً﴾ الأسراء: ٧٢.. کێ لەم دونیایەدا بە کوێری ژیابێ واتە هەقیقەت و دینی نەویستبێ، لەو دونیایەش دا بەکوێری دەژی و خراپترین ژیانی دەبێ..

ئەمە بۆ هەموو مرۆڤێکی سادەیە...

بەڵام پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) ژیانیان و ڕزقیان و ناسینەوە و گوێ بیستن و هەست و شعوریان بەهێزترە و لە پلەی تەواو کەمالدایەو لە خەڵکی ئاسایی زیاترە، بەڵگەش فەرموودەی خوایە کە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾آل عمران: ١٦٩..

وا نەزانن و وا گومان نەبەن کە ئەوانەی لە پێناوی سەرخستنی ڕێگەکەی خوادا کوژراون مردووبن، بەڵکو ئەوانە ژینیان بەردەوامە لەلای پەروەردگاریان ڕزق و ڕۆزی دەدرێن.

ئەگەر وشەی ژیان بە مانای مانەوەی ڕۆح بێ، ئەوە نەفەوتاوە و تیانەچووە بۆ شەهیدانی ڕێگای هەق و ڕاستی هیچ جوانیەکی تیا نییە کە تەنها ناوببرێن و ژیانیان هەبێ، چونکە ڕۆحەکانی سەرجەم نەوەکانی ئادەم ئەمێننەوە و نافەوتێن، بەڵکو وتەی ڕاستر ئەوەیە کە لێکۆڵەوەران لە ئەهلی عیلم و زانست لەسەری کۆن، هەروەك (ابن القيم) لە کتێبی —الروح—دا وردەکاری لەسەر کردووە، هەر دەبێ مەزایاو جیاکارییەکی ئاشکرا هەبێت بۆ شەهیدەکان لەسەروی ئەوانی ترەوە، دەنا یادکردنەوەی ژیانی شەهیدەکان بێ هودە و بێ سوود دەبوو، بەتایبەت کە خودای گەورەش نەهی لەوە کردووە پێیان بگوترێ ((مردوو)) وەك دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ يُقْتَلُ فِي سَبيلِ اللّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاء وَلَكِن لاَّ تَشْعُرُونَ﴾البقرة: ١٥٤.

لەم کاتەدا دەڵێین: پێویستە ژیانی ئەو شەهیدانە باشتر و بەرزتر بێ لە ژیانی خەڵکانی تر، کە ئەمە ڕووکەشی دەقەکان پشتگیرن، ڕۆحەکانیان ڕزق دراون و لە جۆگەلەی بەهەشت ئاواشتە دەبن و لە بەرووبوومی درەختەکانی دەخۆن، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ آل عمران: ١٦٩.. لەلایەن پەروەردگاریانەوە ڕزق و ڕۆزیان بۆ دابین کراوە...

پاشان هەست کردنیان بەو خواردن و خواردنەوە و ئەو نیعمەتانە کە پێیان دەگات، ئەمە هەستێکی تەواوەو تام و چێژێکی تەواویشی لێ وەردەگرن، کە هەموو ئەو هەست و چێژانە هەقیقیەیە، وەك لە فەرمووەدەدا

هاتووه كه دەفەرموێ: ((فَلَما وَجدوا طيبِ مأكلهم وَ مشربهم و حسن مقبلهم قالوا: يا ليتَ إخواننا يعلمَونَ ما صنعَ اللهُ بنا))[1] .

واته: كاتێ كه لەزەتی تەواوی خواردن و خواردنەوەو شوێنه خۆشانەيان پێ دەگات دەڵێن: خۆزگايه براكانمان بيانزانيايه كه خوای پەروەردگار چی به ئێمه بەخشيوه..

ڕۆحەكانيان خاوەنی تەسەڕوف و هەڵسوكەوتی تەواو فراوانترن له خەڵكانی تر، دەگەڕين و دەسوڕێنەوه له بەهەشتا هەر كاتێ بيانەوێ، پاشان لەسەر بەرزاييەكانی ژێر عەرش دا دەمێننەوه، هەروەك له –الصحيح–دا هاتووه..

ئەوانه گوێ بيستی وتەكان دەبن و له قسەكان تێدەگەن، هەروەك له –الصحيح–دا هاتووه[2]...

خوای پەروەردگار پێيان دەفەرموێ: (ما تشتَهون) ئارەزووی چی دەكەن؟ عەرزی دەكەن: خوايه فلأن شت و فلأنه شت، جارێكی تر خوای گەوره پرسياريان لێ دەكاتەوه: ئارەزووی چی تر دەكەن؟ ئەوانيش وەڵام دەدەنەوه كۆمەڵێ شتی تر دەڵێن، پاشان له جارێكی تردا داوا له خوا دەكەن كه بيانگێڕێتەوه بۆ دونيا تا جارێكی تر شەهيد ببنەوه، پاشان داوا دەكەن كه خوای گەوره كه نامەيەكی ئەوان بگەيەنێ به براو كەسەكانيان له دونيادا تا بزانن چۆن ڕێزلێگيراون و خوا چی پێ بەخشيون، خوای گەوره له وەڵاميداندا دەفەرموێ: (انا اُبَلغُ عنكَمْ) من ئەو هەواڵەيان پێ دەگەيەنم...

كه ئەم پلەيه جێگيره بۆ شەهيدەكان، ئەوه بۆ پێغەمبەران جێگير دەبێ له دوو ڕووەوەيه :

---

[1]–ئيبنوكەثير دەڵێ: ئيمامی ئەحمەد ڕيوايەتيان كردووه.

[2]– ئيمامی مسلم له –كتاب الأمارة– به ژماره –١٢١–.

يەكەم : ئەمە پلەيەكى بەرز و ڕێزلێگیراوە خوا بەخشیویەتی بە شەهیدەكان بەڵام هیچ پلەو بەرزییەك نییە كەلە پلەی پێغەمبەرێتی گەورەتر بێ، هیچ گومانی تیا نییە كە ژیانی پێغەمبەران بەرزتر و چاكتر لە ژیانی هەموو شەهیدەكانە، ئەمەش مەحاڵە كە ژیانێكی پڕ كەماڵ بۆ شەهیدان هەبێت بەڵام بۆ پێغەمبەران –علیهم السلام– ئەم ژیانە بەدەست نەیەت لە كاتێكدا ئەم پلەی كەماڵە بۆ زیادە نزیك بوونەوەو بەهرەو بەخششی لە خودای گەورە و میهرەبانەوە.

دووەم : ئەم پلەیە بەخشراوە بە شەهیدەكان لە پاداشتی ئەو جیهاد و بەختكردنی نەفسیانە لەبەر خوا، وە پێغەمبەر ﷺ ئەو كەسە بووە كە جیهادی بۆ دامەزراندوین و بانگەشەی ئێمەی كردووە بۆ ئەو جیهادە، وە ڕێگەی باشەو خێری بە ئیزنی خوا نیشان داوین، وە حەزرەت ﷺ خوێ دەفەرموێ: (مَنْ سَنَّ سُنَّةً حَسَنَةً فَلَهُ اجرُها واجرُ مَنْ عَمِلَ بها الى يومِ القيامة ) كەسێ ڕێگەیەكی چاكە دابمەزرێنێ و بیكاتە سوننەت بۆ خەڵكی، ئەوە پاداشتی بۆ خۆی هەیە و پاداشتی ئەوانەشی هەیە كە ئیش بەو سوننەتە دەكەن تا ڕۆژی دوایی.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((مَنْ دَعا الى الهُدى كان لَهُ مِنَ الأجرِ مِثلَ اجوَر مَن اتبعَهُ لا ينقُصُ ذلك مِن اجورهم شيئاً، وَمَن دعا الى ضلالة كان عليهِ مِنَ الإثم مِثلَ آثام مَن اتبعَهُ لا ينقُصُ ذلك من آثامهم شيئاً)) .

واتە: هەر كەسێ بانگەشە بكات بۆ ڕێگەی چاكە پاداشتی ئەوانەشی بۆ دەنوسرێ كە ئیش بەو بانگەشەیە دەكەن و پاداشتی كەسیشیان كەم ناكات، وە هەر كەس ڕێگەیەكی خراپ و گومڕایی فێری خەڵكی بكات یان بانگەشەی بۆ بكات، ئەوە بەشداری ئەو گوناهانەیە كە شوێن كەوتوانی ئەو خراپەیە كردوویانە و لە گوناهی كەسیشیان كەم ناكات...

وە فەرموودەکانی تر لەم بارەوە زۆرن و بەهێزن و دیارن،..

کەواتـە هـیچ پاداشتێك نیـیـە کـە ببەخشرێ بـە شـەهیدەکان، مەگـەر لـەو ئەجرو پاداشـتە بـۆ حـەزرەتی پێغەمبـەریش دەنوسرێ چونکە ئـەو ڕێگـەی جیهادەکـەی فێـر کـردوین، وە ژیـانی بـەرزەخیش بـۆ شـەهیدەکان زیـادە ڕێزلێنان و ئەجرێکی زیاترە لە بەرانبەر ئەو کردەوەی کردویانە لەژێر ئالأی پێغەمبەری خوادا ﷺ وە شەهیدبوونیان لە پێناوی خوادا و لەو ڕێگەیەدا، کەواتـە هـەمان ژیـانی گـەورەو ڕێزلێنـان و پلـەی بـەرزی ئەبەخشـرێ بـە پێغەمبەریش ﷺ بگرە زیاتر و بەرزتر و گەورەتریش دەبێ..

ژیانی بەرزەخی پێغەمبـەران هـەقیقی یـە، بەتایبـەتی پێغەمبـەری ئیسـلام حـەزرەتی محمـد ﷺ کـە زۆر لـەوە گـەورەترو بـەرزترە کـە نـەزان و کـەم ژیرەکان بۆی دەچن و بلأوی دەکەنـەوە کە ژیانیـان وەك ژیـانی ئێمـەبێ بـەو شێوەیە کە ئەخۆن و ئەخۆنـەوە و پێویستیان بە خـواردن و خواردنەوەیـە، پاشـەڕۆیان هەیـە و دادەنیشـن، دێنـە دەرەوە لـە گۆڕەکانیـان و بەشـداری دانیشتنی زیکـر و کۆمـەڵی قورئـان خوێنـان دەکـەن و لەگـەڵ ئومەتەکەیانـدا دەبن و بە خۆشیەکانیانەوەن و لە ڕۆژانی جەژن و بۆنەکانیاندا بەشدارن، پاشان دەگەڕێنەوە ناو گۆڕەکانیـان و شـوێنیان لـەژێر زەوی داو لـەو پارچـە زەوییە تەسکەدا دەبێ کە ئەو هەموو خۆڵـەی بەسـەرەوەیە، کـە ئـەم وتەیـە بچوکترین ڕێزی تیا نییە، بەڵکو خـۆی لـە خۆیدا نزمـی و سـوکایەتییە کـە بـۆ مرۆڤێکـی سـادەش لـە شـوێنکەوتوانیش کـەس ڕەوای نابینـێ... ئـەی دەبێ فـەزڵ و گەورەیی باشـترینی خـەلقی خـودا و شکۆمەندترینی بەنـدەی چـەند زیـاتر و فراوانتر بێ؟ . کەواتـە ژیـانی بـەرزەخی ژیانێکی هەقیقییـە بریتی یە لە: هەستێکی تـەواو و ئیـدراکی گشـتی و زانسـتێك و زانیاریـەکی ڕاستگۆیانە، ژیانێکی پاکی چاکە، تیایدا تەسـبیحات و ئـەوراد و سـوپاسی خواو نوێژ خوێندن داواو پاڕانەوە لەخۆ دەگرێت...

# نوێژی پێغەمبەران لە گۆڕەکانیان دا
# لەگەڵ بەندایەتیەکانی تر

یەکێ لەو بەروبومانەی کە لەو ژیانە بەرزەخیەدا هەیە:

نوێژی ئەو پێغەمبەرانەیە لە گۆڕەکانیاندا بە نوێژێکی تەواوی، نەك بە خەیاڵ و بە میثالی، کە فەرموودەکان زۆرن لەم بارەیەوە، لەوانە:

– لە ئەنەسی کوڕی مالکەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( الأنبياءُ أحياء في قبورهم يَصلّون )[1] .

پێغەمبەران زیندوون و لەناو گۆڕەکانیاندا نوێژ دەکەن...

– حافظي بەیهەقی بەشێکی تایبەت کردووە بەم باسەوە و دەڵێ:

لە گێڕانەوەی ئەنەس دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ الأنبياء لا يتركون في قبورهم بعد اربعين ليلة، ولكنهم بين يدى اللهِ تعالى حتى ينفخ في الصور)) واتە: پێغەمبەران لە چل شەو بەدوا گۆڕەکانیان بەجێ ناهێڵن، بەڵکو ئەوان لەنێوان دوو دەستی قودرەتی پەروەردگاریانان تا فوو دەکرێ بە نەفخی صوردا..

بەیهەقی دەڵێ: (ئەگەر ئەم زاراوەیە ڕاست بێت، ئەوە مەبەست پێی ئەوەیە کە پێغەمبەران گۆڕەکانیان بەجێ ناهێڵن و نوێژی تیادەکەن تا ئەو ماوە تەواو دەبێ، (خواش دەزانێ)، پاشان لەنێوان دوو دەستەی پەروەردگریانا نوێژ دەکەن) .

---

[1]– ئەبو یەعلی و بەزار ڕیوایەتیان کردووە، وە پیاوەکانی ئەبو یەعلی جێگەی متمانەن وەك لە (مجمع الزوائد)دا هاتووە لە ٨/٢١١.

پاشان بەیهەقی دەڵێ: (ولحياة الأنبياء بعد موتهم شواهد من الأحاديث الصحيحة) واتە: بۆ ژیان و زیندویەتی پێغەمبەران لەدوای مردنیان کۆمەڵێ بەڵگەی بەهێز هەیە..

پاشان بەیهەقی لە ڕێگەی خۆیەوە ئەم فەرموودەیە دێنێ و دەیگێڕێتەوە: (قد رايتني في جماعة من الأنبياء، فإذا بموسى قائمَ يُصلي، فإذا رجل ضَرْبٌ جعد كأنَهُ من رجالِ شنؤة، وإذا عيسى ابن مريم قائمٌ يُصلي اقرب الناس بِهِ شبهاً عروة بن مسعود الثقفي، وإذا إبراهيم قائمٌ يُصلي أشبه الناس به صاحبكم -يعني نفسه- فحانت الصلاة فأممتهم، فلما فرغت مِن الصلاة قال قائل: يا محمد! هذا مالك صاحب النار فَسَلِمْ عليه، فالتفتُ إليه فبَدأني بالسلام)[1] .

واتە: خۆمم بینیەوە لەناو کۆمەڵێ لە پێغەمبەران دا، موسا پێغەمبەرم بینی بە پێوە بوو نوێژی دەکرد، لە شێوەی پیاوێکی کەم گۆشتی دا بوو وەك پیاوەکانی تایفەی شەنوئە وابوو، وە عیسای کوڕی مەریەمم بینی نوێژی دەکرد، نزیکترین کەسێ کە بشوبهێ بە پێغەمبەر عیسا عروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفیە، وە پێغەمبەر ئیبراهیمم بینی لە نوێژدا بوو نزیکترین کەسێ کە بشوبهێ پێی هاوڕێکەتانە -مەبەستی خۆی بوو- پاشان کاتی نوێژ هاتە پێشەوە من ئیمامەتم بۆ کردن، کە لە نوێژ بووینەوە یەکێ پێی وتم: ئەی موحەممەد، ئەوە مالکە خاوەنی دۆزەخ سەلامی لێ بکە، ئاوڕێم بۆی دایەوە ئەو لە پێشدا سەلامی لە من کرد..

بەیهەقی لە (دلائل النبوة) دا دەڵێ: لە فەرموودەی ڕاست دا هاتووە لە سولەیمانی تەیمیەوە و لە ثابتی بەنانی و ئەنەسی کوڕی مالك (ڕەزای

---

[1]- مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە، وە عبدالرزاق لە -المصنف-دا تەخریجی کردووە.

خوایان لەسەر بێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((أتيتُ على موسى ليلة أُسريَ بي عندَ الكثِبِ الأحمر وهو قائم يُصلي في قبرهِ))..

لە شەوی شەوڕەوێنی دا ڕۆیشتم بەلای موسا پێغەمبەردا و لە ((کەثیبی سوور))دا بە پێوە بوو لە گۆڕەکەیدا نوێژی دەکرد..

دەڵێم: ئەم فەرمووده پلەی -صحيح-ی هەیە.[1]

جێگیر بووە و شك و گومان هەڵناگرێ..

کە هۆکار لە سوك کردنی نوێژ لە پەنجا نوێژەوە بۆ پێنج نوێژ بۆ ئێمەی ئوممەتی ئیسلام موسا پێغەمبەر بوو -عليه السلام- کە لەو ساتەدا ئەو دونیای بەجێهێشتبوو، ئەو ئەمانەتەی لەسەر شانی بوو بەچاکی جێبەجێی کردبوو، گەیشتبووەوە بە خوای خۆی، بەڵام بوو بە هۆکار لە گەیاندنی گەورەترین خێر بۆ ئوممەتی موحەممەدی، لە کاتێکدا کە داوای کرد لە پێغەمبەرمان ﷺ کە بگەڕێتەوە بۆ خزمەتی پەروەردگاری و پێی وت: (سَلْ رَبَّكَ التخفيف فإنَّ أمتكَ لا تطيق ذلك) داوا بکە لە پەروەردگارت بۆ سوك بکات چونکە ئوممەتەکەت بەرگەی ناگرن. ئایا ئەم گەڕانەوەیە بۆ خزمەتی پەروەردگاری بە هەقیقی بوو یان بە خەیاڵ؟ لە کاتی بەهۆشی دا بوو یان لە کاتی خەودا؟ وە ئایا ئەم گێڕانەوە ڕاستە یان درۆیە و هەڵبەستراوە؟ وە ئایا موسا مردووە یان بەردەوام زیندو بووە تا ئەو کاتەی ئەو داوایەی کردووە لە پێغەمبەرمان ﷺ؟

ئیمامی حاکم تەخریجی کردووەو دەڵێ پلەی صەحیحی هەیە، لە ئیبنو عەباسەوە ئەیگێڕێتەوە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) کە پێغەمبەر ﷺ دای بەلای بەچکە وشترێکدا کە پێیان دەوت (ثنية) فەرمووی: ئەمە هی کێیە؟ وتیان: هی فلانە کەسە. فەرمووی: ((كأني أنظرَ الى يونس على ناقةٍ

---

[1]- ئیمامی مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە.

خُطامها ليف وعليه جبة من صوف وهو يقول: لبيك اللهم لبيك))[1] وەك ئەوە وايـە بنـوارِم بـۆ يـونس پێغەمبـەر لەسـەر وشـترێکە کـە زینەکـەی لبـادەو جوبەيەکی لەخوری لەبەردايەو دەڵێ: لبيك اللهم لبيك...

وە لە فەرموودەيەکی تردا هاتووە کە حەزرەت ﷺ فەرمووی:

شـەوێکيان لای کەعبـەی پيرۆزيـان نيشـان دام، پيـاوێکم بينـی جـوانترين شـێوەی هـەبوو، نيشـانەيەکی جـوانی پێـوە بـوو، لەسـەروی قاچـەکانيەوە قەترە ئاو ئـەتکا لـە کاتێکـدا کە طەوافی دەکرد، وتم: ئەمـە کێيـە؟ وتيـان: ئەوە مەسيحی کوڕی مەريەمە..

لـە فەرموودەيـەکی تـردا هـاتووە: کـە پێغەمبـەر ﷺ بـە شـيوی شـين دا تێپـەڕی و فـەرمووی: وەکـو بنـوارِم بۆ موسـای پێغەمبـەر کە لەسـەر پشـتی وشـتەرەکەی دادەبـەزی بـە وتـەی تەلبيـە دراوسـێيەتی لـە خزمـەت خـوادا دەکـات، پاشـان دايـان بـەلای وشـتری هەرشـا فـەرمووی: وەکـو بنـوارِم بـۆ يونسی کوڕی مـەتا لەسـەر پشـتی سورە و جوبەيـەکی خـوری بەشانەوەيە، ڕەشۆی وشترەکەی گرتووە و لەبەيکە دەخوێنێ.

وە لـە گێڕانەوەيـەکی تـردا دەڵـێ: وەکـو بنـوارِم بـۆ موسـا پەنجـەکانی خستۆتە سەر هەردوو گوێچکەی ...

ئەم فەرموودانە هەموو پلەی –صحيح–يان هەيە، دەرکەوت بۆمان نوێـژی پێغەمبـەران بە پێـوە و ئيمامـەتی کردنـی پێغەمبـەر ﷺ بۆيـان، وە کـەس نەيوتووە ئەمە خـەو بووە، بەڵکو دەفەرموێ: (أرانی) نيشـانيان داوم، هـيچ ئاماژەيەکی تيا نیيە بۆ خـەو، چونکە نهێنيـەکان بەلای زانايـانی پێشـين و دوايـی (سـەلەف و خەلـەف) لەسـەری يـەك ڕان. خـۆ گـەر وتيشـيان ئـەو بينينانە بە خەو بووە، ئەويش ڕاست دەبێ چونکە خەوی پێغەمبـەران هـەق و ڕاستە...

---

[1]– سيوطی لە –الدار المنثور– ٢٣٤/٤ هێناويەتی.

## مانەوەی لاشەی پێغەمبەران
## (سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ)

گێڕاوەتەوە لە ئەوسی کوڕی ئەوس (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە باشترینی ڕۆژەکان ڕۆژی جومعەیە ئادەم پێغەمبەری تیا خەلق بووە، وە تیاید ڕۆحی کێشراوە، تیایدا فوی یەکەم دەکرێ بە کەرناڵدا، وە تیایدا زیندووبوونەوە دەبێ، زۆر لەو ڕۆژەدا صەڵەوات لەسەرم بخوێنن، چونکە بزانن صەڵاوەتەکانتان ئەخرێتە بەردەستم... وتیان: چۆن ئەخرێتە بەردەستت لە کاتێکدا کە تۆ لاشەت نەماوە یان پوکاوەتەوە؟ فەرمووی: ((إنَ اللهَ حَرَّمَ علی الأرضِ ان تأكُلَ أجساد الأنبياء))[1] خوا حەرامی گێڕاوە لەسەر زەوی کە لاشەی پێغەمبەران بخوات...

بزانە کە فەرموودەی: {(إنَ اللهَ حَرَّمَ على الأرضِ ان تأكُلَ اجساد الأنبياء) لە چەند ڕێگەیەکی زۆرە هاتووە کە شێخی مونذری بەشێکی تەواوی بۆ تایبەتمەند کردووە، وە لە کتێبی –الترغيب و الترهيب–دا دەڵێ: ابن ماجە بە پلەی –جيد– ڕیوایەتی کردووە، ئەحمەد و ئەبو داود و ابن حبان لە –صحيح–ەکەیدا و حاکم بە ڕاستی داناوە، وە ئیبنو قەیم لە (كتاب الروح)دا گێڕاویەتەوە لە ئەبی عبدالله ی قورطبي یەوە کە دەڵێ: بە پلەی ڕاست لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرمان گرتووە کە زەوی لاشەی حەزرەتی محمد

---

[1]- سەعیدی کوڕی مەنصور و ئیبنو شەیبە و ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا و ئیبنو ئەبی عاصم لە (الصلاة)ی داو ئەبو داود و نەسائی و ئیبنو ماجە لە سوننەکەیاندا و طبرانی لە –معجم–ی داو ابن خزيمە و ئیبو حەبان و حاکم لە صەحیحەکانیانداو بەیهەقی لە (حياة الأنبياء) و (شعب الأيمان) گێڕاویانەتەوە..

ﷺناخوات، وه پێغهمبهر ﷺ له شهوی شهوڕهوێنی دا به پێغهمبهران کۆبوویهوه له بهیتی مهقدیس داو له ئاسمانهکان، بهتایبهت موسای پێغهمبهر ﷺ که حهزرهت دهفهرموێ: (هیچ موسوڵمانێ نییه که سهلامم لێ بکات مهگهر خوا ڕۆحهکهی دهکاتهوه به لاشهداو ئهیهێڵێتهوه تا وهڵامی سهلامهکهی ئهداتهوه).

وه غهیری ئهم گێڕانهوانهش بهشێوهیهکی پچڕ هاتووه که مردنی پێغهمبهران بهمانای گهڕانهویانه بۆ خزمهت خواو له خهڵکی ون بوون، بهشێوهیهك که ههستیان پێ نهکرێ و بژین و ههبن، ههروهك چۆن ئهوه حاڵی فریشتهکانه، زیندون و ههن و نایانبینین...

قورطبي گێڕاویهتهوه شێخ محمدی سهفارینی حهنبهلی له کتێبی (شرح عقیدة أهل السنة)دا دانی پیاناوه که دهڵێ:

((ئهبو عبدالله ی قورطبي– دهڵێ: شێخی ئێمه ئهحمهدی کوڕی عومهری قورطبي خاوهنی –المفهم في شرح مسلم– پێی وتین: ئهو شتهی که ئهو گومان و شکانه لادهبات ئهوهیه که مردن به شێوهکهی خۆی ڕوو لهوان ناکات، بهڵکو گواستنهوهیه له حاڵ و ژیانێکهوه بۆ حاڵ و ژیانێکی تر، وه بهڵگهی بههێزی لهسهره ئهویش شههیدهکانن که لهدوای مردنیان و کوشتنیان، زیندون له خزمهت پهروهردگاریان و لهلایهن خواوه ڕزقیان ئهدرێ و دڵ خۆش دهکرێن))..

ئهمه سیفهتی زیندووهکانه له دونیادا، ئهگهر ئهوه پلهی شههیدهکان بێ ئهوه پێغهمبهران لهپێشترن و مافی ئهوهیان باشتر ههیه، وه قورطبي هێناویهتی که لاشهی شههیدهکان وهك خۆی دهمێنێتهوه و ناڕزێ، که به پلهی –صحیح– له جابرهوه له باوکیهوه هاتووه، وه عهمری کوڕی جهموح (ڕهزای خوایان لهسهر بێ)لهوانهیه که لهشهڕی ئوحودا شههید بوون وه له

یەك گۆڕدا شارانەوە، لەو دوایەدا لافاو لێیانی داو گۆڕەكانیان هەڵكەند، بینیان وەك خۆیانن، یەكێكیان بریندار بوو بوو دەستی لەسەر برینەكەی دانابوو كە ڕۆحی دەرچووبوو، لە گواستنەوەیاندا دەستی لەبرینەكەی لادرا، دەستی گێڕایەوە سەر برینەكەو خوێنی لێ دەڕۆی، ئەم ڕووداوە چل و شەش ساڵ بەسەر شەڕی ئوحودا تێپەڕی بوو...

وە كاتێ معاویە ویستی ئاوێك بۆ مەدینە ڕابكێشێ، كە ئەمە لەدوای شەڕی ئوحود نزیكەی پەنجا ساڵ تێپەڕبوو بوو، مردووەكانیان گواستەوە، خاكەنازێ بەرقاچی ئیمامی حەمزە كەوت خوێنی لێ هات، وە عبدالله ی كوڕی حەرامیان بینی وەك دوێنێ دفن كرابێ ئاوا بوو...

وە خەڵكی مەدینە هەموو دەیگێڕنەوە كە لە ڕۆژانی حوكمی وەلید دا دیواری پێغەمبەر ﷺ كاتێ ڕوخێنرا قاچی عومەری كوڕی خەطاب (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەركەوت وەك خۆی بوو، كە ئەمیش بە شەهیدی وەفاتی كرد...

وە شێخ ئیبن تەیمیە باس لەوە دەكات كە ڕوخانەكە ڕوویدا قاچ و ڕانی كەسێك دەركەوت، عومەری كوڕی عبدالعزیز هاواری كردو عەروەی بانگ كرد، ئەویش فەرمووی: ئەوە قاچی عومەری كوڕی خەطابە ئیتر عومەری كوڕی عبدالعزیز شاردیەوە)[١] .

پێشەوا أبوبكری كوڕی حسین ی بەیهەقی كە ناسراوە بە (إمام الحجة) لەم بارەوە نوسراوێكی تایبەتی داڕشتووە، كە سەرجەم ئەو فەرموودانەی تیادا تۆمار كردووە كە بەڵگەن لەسەر ژیان و زیندوویەتی پێغەمبەران و مانەوەی لاشەكانیان.

وە هەروەها شێخی حافظ جلال الدین السیوطي نامەیەكی تایبەتی لەم بارەوە نوسیوە .

---

[١]- بنوارە بۆ (اقتضاء الصراط المستقیم)ی ابن تیمیة لا ٣٦٥.

## ژیانێکی تایبەت بە حەزرەتی موحەممەدەوە ﷺ

جێگیر بووە ژیانێکی تەواوی بەرزەخی کە ژیانێکی هەقیقی و ڕێزلێگیراو و تەواوە بۆ حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ کە بۆ کەسانی تر بەو شێوە نەبێ، وە خۆشی صەلات و سەلامی خوای لەسەر باسی بۆ کردوین، وە جێگیر بووە کە پەیوەندی پێغەمبەر ﷺ بە ئومەتەکەیەوە و زانستی سەبارەت بە حاڵ و ژیانیان و ئاگاداری لە کردەوەکانیان هەیە و بەردەوامە، وە گوێ بیستی وتەی ئومەتەکەی و وەڵامی سەلامیان، ئەمانە و زۆری تر کە فەرموودەکان لەم باسەدا زۆر زۆرن، کە هەندێکیان باس دەکەین:

لەوانە: لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرموویەتی: (خوای پەروەردگار کۆمەڵێ فریشتەی گەڕۆکی لەسەر زەوی‌دا هەیە کە سەلامی ئوممەتەکەمم پێ ڕادەگەیەنن) ((إنَ للهِ ملائكة سياحين في الأرض يبلغوني من أمتي سلام))[1]..

وە لەوانە: ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لەسەر بێ) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (ژیانم خێری تیایە بۆ ئێوە قسەم لەگەڵ دەکەن و منیش بۆتان ئەدوێم، وە مردنیشم بۆتان خێری تیا دەبێ، کردەوەکانتان دەخرێتە بەردەستم، هەر چاکەیەکی تیا ببینم سوپاسی

---

[1]- منذری دەڵێ: نەسائی و ئیبنو حەبان لە صەحیحەکەیدا ڕوایەتیان کردووە، بنواڕە بۆ -الترغيب والترهيب- ٤٩٨/٢.

منیش دەڵێم: قاضي اسماعیل و غەیری ئەویش ڕیوایەتیان کردووە لە چەند ڕێگەیەکی جیاوازەوە بە سەنەدێکی باش لە سفیانی ثەوری لە عبدالله ی کوڕی سائب لە زاذان لە عبدالله ی مسعودەوە کە ثەوری بیستویەتی دەڵێ: بۆی گێرامەوە عبدالله ی کوڕی سائب. هەروەك قاضي اسماعیل هێناویەتی... وە عبدالله ی کوڕی سائب و زاذان موسولیم لێوەیان ڕیوایەت دەکات وە (ابن معين) دەڵێ: جێگەی باوەڕن.

خوای لەسەر دەکەم، وە هەر خراپەیەکی تیا ببینم داوای لێخۆش بوونی لەخوا بۆ دەکەم..

کە حافظی عێراقی -ئەبو زەرعە- لە -کتاب الجنائز-لە کتێبی (طرح التثریب في شرح التقریب) دا دەڵێ: ئیسنادی ئەو فەرموودەیە پلەی -جید-ی هەیە[1].

وە حافظی هەیثەمی[2] دەڵێ: بەزار ڕیوایەتی کردووە وە پیاوەکانی جێگەی متمانەن و صەحیحن، وە حافظی سیوطي لە -المعجزات- و لە -الخصائص- بەڕاستی هێناوە، وە قەسطەلانی کە شەرحی بوخاری کردووە پلەی -صحیح-ی داوەتێ، وە مناوی لە -فیض القدیر-[3] دا دەقی لەسەر هێناوە کە صەحیحە، وە زەرقانی لە کتێبی -شرح المواهب- ی قەسطەلانیدا وە شەهابی خەفاجی لە -شرح الشفا-دا[4] بە صەحیحیان داناوە..

---

[1]- هەندێك کەس وا گومان دەبەن کە ئەم گێڕانەوەیەی عێراقی لەگەڵ ئەوەی کە لە کتێبی -إحیاء علوم الدین-دا هەیە دژی یەکن لەکاتێکدا هەردووکیان هەر عێراقی تەخریجی کردووە بەڵام لەڕاستیدا وا نییە، چونکە ئەوەی تەخریجی إحیاءی ئیمامی غەزالی کردووە ئیمامی عێراقییە و وتەکە وتەی ئەوە، بەڵام ئەمەی لە (طرح التثریب)دا هاتووە قسەی کوڕەکەیەتی کە ناوی أبي زرعة العراقي یە، کە پێویستە وردکارترین لە گێڕانەوەکاندا...

[2]- لە -مجمع الزوائد ٩/٢٤دا.

[3]- لە ٣/٤٠١دا

[4]- لە ١/١٠٢ دا.

وه هەروەها ملا علی قاری لە -شرح الشفا-دا[1] دەڵێ: ئەم گێڕانەوەیە حارثی کوڕی ئەبی ئوسامە لە -مسند-ی دا بە سەنەدێکی تەواو ڕیوایەتی کردووە..

وە (ابن حجر) لە -المطالب العالیة-[2]دا هێناویەتی، وە ئەم فەرموودە لە ڕێگەیەکی ترەوە بە مورسەلی هاتووە لە بەکری کوڕی عبدالله ی مەزنیەوە، وە شێخ إسماعیلی قاضي ڕیوایەتی کردووە لە -فضل الصلاة علی النبي ﷺ- دا وە تیایدا دەڵێ: ئەلبانی وتویەتی: مرسل صحیح.

وە خاوەنی کتێبی -الصارم المنکی- کە ناسراوە بە توندڕەو (حافظ ئیبنو عبدالهادی) ئەویش بە صەحیح دایناوە.

فەرموودەی بەهێز کەس ناتوانێ بێ هێزی بکات، ئەو فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەمە کە پێغەمبەر ﷺ کردەوەکانمان ئەخرێتە بەردەستی، داوای لێخۆشبوونمان لەخوا بۆ دەکات لەسەر کردەوە خراپەکانمان..

ئەو کە لەو پلە بەرزەدایە، دروستە بۆ ئێمە تەوەسولی پێ بکەین بۆ خزمەتی پەروەردگارمان و داوای شەفاعەتی لێ بکەین، تەنها ئەوە خاوەنی تکاو شەفاعەتە صەڵات و سەلامی خوای لەسەر- کە خوای پەروەردگار هەواڵی پێداوین لە قورئاندا کە پێغەمبەرمان ﷺ شایەتە بەسەر ئومەتەکەیەوە، دەبێ کردەوەکانمان بخرێتە بەردەستی تا شایەتی بدا لەسەر شتێك کە ببینێ و بیزانێ..

ئیبنو موبارەك دەڵێ: پیاوێکی ئەنصاری هەواڵی پێداین لە مەنهالی کوڕی عەمرەوە کە دەڵێ گوێی لێوە بوو کە سەعیدی کوڕی موسەیب دەیوت: هیچ ڕۆژێ نییە مەگەر بەیانیان و ئێواران کردەوەکان دەخرێتە

---

[1]- ١/١٠٢.

[2]- ٤/٢٢.

بەردەستی پێغەمبەر ﷺ ئەویش ناوونیشان و کردەوەکانیان دەبینێ و دەبێتە شاهید لەسەریان، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلَاء شَهِيداً﴾ النساء: ٤١.

وە یەکێکی تر لەو فەرموودانە:

لە عەماری کوڕی یاسرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( إنَّ اللهَ وَكَلَ بقبري ملكا أعطاهُ اللهَ أسماءَ الخلائق، فلا يُصلي عليَّ أحدُ الى يومِ القيامةِ إلاّ أبلغني بإسمهِ وإسم أبيه، هذا فلان بن فلان قد يصلي عليك ) ، خوای گەورە لەلای گۆڕەکەمدا فریشتەیەکی داناوە ناوی هەموو دروستکراوانی خوای پێ بەخشیوە، هیچ کەسێ نیيە تا ڕۆژی قیامەت صەڵەواتم لەسەر بخوێنێ، مەگەر ئەو فریشتەیە بەناوی خۆی و باوکیەوە پێم دەگەیەنێ و دەڵێ فولانی کوڕی فولان سەڵەواتی لەسەر تۆ خوێند.

بەزار ڕیوایەتی کردووە و ئەبو شێخ ئیبنو حەبان بەم شێوە هێناویەتی دەڵێ: حەزرەت ﷺ فەرمووی: (خوای پەروەردگار فریشتەیەکی هەیە، ناوی هەموو دروستکراوانی خوای پێ بەخشیوە و کە مردم لەلای گۆڕەکەمدا ڕادەوەستێ، هیچ کەس نیيە کە صەڵەواتێکم لەسەر بخوێنێ مەگەر دەڵێ: ئەی موحەممەد! فلانی کوڕی فلان صەڵەواتی لەسەر خوێندی، فەرمووی: خوای پەروەردگار بەسەر ئەو کەسەدا دە جار ڕەحمەتی خۆی دەڕژێنێ)[1] .

وە یەکێکی تر لەوانە:

[1]- طبراني لە –الكبير–دا ڕیوایەتی کردووە بنوارە بۆ الترغيب والترهيب ٢/٥٠٠.

له عەمری کوڕی حارث، له سەعیدی کوڕی ئەبی هیلال، لە زەیدی کوڕی ئەیمەن، لە عوبادەی کوڕی ئەنەسی، لە ئەبی دەردائەوە دەڵێ: حەزرەت ﷺ فەرمووی:

(زۆر صەڵەواتم لەسەر بخوێنن لە ڕۆژی جومعەدا، چونکە دەبینرێ و فریشتەکان شایەتی لەسەر ئەدەن، وە هیچ کەس نی‌یە کە صەڵەواتێکم لەسەر بخوێنێ مەگەر دەخرێتە بەردەستم هەتا لێدەبێتەوە.. دەڵێ: وتم: لەدوای مردنیش؟ فەرمووی: لەدوای مردنیش، چونکە خوای گەورە حەرامی گێڕاوە لەسەر زەوی کە لاشەی پێغەمبەران بخوات، وە پێغەمبەری خوا زیندوەو ڕزقی دەبێ)...[1]

وە یەکێکی تر لەوانە:

لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هیچ کەسێ نی‌یە کە سەلامم لێ بکات مەگەر خوا ڕۆحەکە دەکاتەوە بە لاشەمدا هەتا وەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە).[2]..

شێخ ئیبنو تەیمیە دەڵێ: ((ئەم فەرمودە لەسەر شەرتەکانی موسلیمە، وە دەڵێ: لە موسنەدی ئیبنو ئەبی شەیبە هاتووە لە ئەبی هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَن صلىَّ عليَّ سمعتهُ، ومَن صلى عليَّ نائياً بَلغتُهُ) کە دار القطني بەو مانایە ڕیوایەتی کردووە..

---

[1]- ابن ماجه لە -السنن- ٥٢٤/١ ڕیوایەتی کردووە، وە لە -الزوائد- دا دەڵێ: ئەم فەرموودە صەحیحە، تەنها ئەوەندەیە لە دوو شوێندا پچڕانی تیا کەوتووە، چونکە عوبادە گێڕانەوەکەی لەلای ئەبو دەرداء پلەی مورسەلە، وە ئەلعەلائی دەڵێ: زەیدی کوڕی ئەیمەن لە عوبادەوە پلەی مورسەلە، کە ئەمە بوخاریش بەو شێوە دانی پیاناوە.

[2]- ئیمامی احمد و ئەبوداود ڕیوایەتیان کردووە، وە لە -الترغیب والترهیب- ٤٩٩/٢دا هاتووە.

کێ صەڵەواتی لەسەر بخوێنێ گوێ بیستی دەبێ...

وە لە نەسائی و غەیری ئەویشدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خوای گەورە فریشتەیەکی داناوە لای گۆڕەکەم سەلامی ئومەتەکەم پێ دەگەیەنێ) وە فەرموودەکانی تر لەم بارەوە زۆرن [1] ...

## پێغەمبەر ﷺ وەڵامی ئەوانە ئەداتەوە کە هاواری بۆڵا دەبەن

هەرکەس بە: یا محمد- هاواری لێ بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی ئەداتەوە. لەم فەرموودەیەدا لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

( ولئن قام على قبري فقال: يا مُحمد! لأجيبَنَّهُ ) [2] .

واتە: کە عیسای کوڕی مەریەم دێتە سەر گۆڕەکەم دەڵێ: ئەی موحەممەد منیش وەڵامی دەدەمەوە..

## ناردنی سەلام بە کەسێکی تردا بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ

لە یەزیدی کوڕی ئەبی سەعیدی ئەلمەهرییەوە دەڵێ: کاتێ خواحافیزیم لە عومەری کوڕی عبدالعزیز کرد، فەرمووی: من ئیشێکم بە تۆ هەیە.. وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران بفەرموو ئیشەکەت لەلای من چییە؟

---

[1]- بنوارە بۆ (اقتضاء الصراط المستقيم)ی ابن تيمية لا٣٢٤.

[2]- ئەبی یەعلا ڕیوایەتی کردووە، وە ابن حجر لە -المطالب العالية-دا ٢٣/٤. هێناویەتی بە ناونیشانی: حياته ﷺ في قبره..

وتــی: کاتــێ کــه گەیشــتیته شــاری مەدینــه و بــه خزمــەت مەرقــەدی خۆشەویست ﷺ گەیشتی سەلامی منی پێ بگەیەنه..

لــه حاتــەمی کــوڕی وەردانــەوه، دەڵــێ: عومــەری کــوڕی عبــدالعزیز بــه مەبەســت و نیــەتی ســەلام کــردن لــه پێغەمبــەر ﷺ بەتایبــەتی کەســی لــه شامەوه دەنارد بۆ مەدینه [1] .

خەفاجی هێناویەتی: وه مەلا علی قاری له (شرح الشفا)دا هێناویەتی که ئیبنو ئەبی دونیا ڕیوایەتی کردووه، وه بەیهەقی له (الشعب)دا هێناویـەتی، وه خەفاجی دەڵێ: ( له ڕەوشتی زانایانی پێشینمان (السلف) وابوو که به کەسێکی تـردا سـەلامیان دەنـارد بۆ حـەزرەت ﷺ که ئیبنـو عومـەر یـەکێ بووه لەوانه که سـەلامی گەیانـدووه به پێغەمبـەری خـوا ﷺ وه ئەبوبـەکر و عومـەر (ڕەزای خوایـان لەسـەر بـێ) سـەلامیان نـاردووه، وه پێغەمبـەر ﷺ هەرچەنده سەلامی لەو کەسەوه پـێ دەگەیـەنرێ که سـەلامی لێ دەکات یـان بۆی دەنێـرێ بـا ئـەو کەسـه زۆر دووریـش بـێ، بـەڵام لـەم نزیـك بوونـەوەی سـەلام کردنـه گـەورەیی و فـەضـیلەتـی خیطـاب لـه خزمـەتیان و گـەیانـدنی سەلامەکه به نەفسی خۆی دەردەخات ) [2] .

## دەنگ و سەلام و بانگ دەبیسترێ له مەرقەدی پێغەمبەرەوه

پێشــەوا ئــەبو موحەممــەدی عبــدالله ئەلــدارەمی لــه کتێبــی (الســنن)دا ڕیوایەتی کـردووه، که ئـەم کتێبـه دادەنـرێ به یـەکێ لـه سەرچاوەکان و لـه شــەش کتێبەکــەی فــەرمووده، دەڵــێ: (هــەواڵی پێــداین مــەروانی کــوڕی

---

[1]- قاضي عياض له (الشفا) له باب الزيارە ٨٣/٢ هێناویەتی، وه فیروز ئابادی له – الصلات والبشر لا١٢٩ هێناویەتی.

[2]- خەفاجی له (نسيم الرياض) ٥١٦/٣ هێناویەتی.

موحەممەدد لە سەعیدی کوڕی عبدالعزیزەوە، دەڵێ: کاتێ کە ڕۆژانی گەرما هاتە پێشەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ بانگ نەدرا، کەس لە مزگەوتا نەما تەنها سەعیدی کوڕی موسەیب نەبێ کە لە مزگەوتا مایەوە، ئەمیش نەیدەزانی کاتی نوێژەکان کەیە، مەگەر بەهۆی ئەو دەنگەوە نەبووایە کە گوێی لێوە بوو لە مەرقەدی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەهاتە دەر کە لەمانای بانگ دا بوو) [1] .

–ئیبراهیمی کوڕی شەیبان دەڵێ: لەو کاتەدا حەجم کرد هاتمە شاری مەدینە، چوومە خزمەت مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ سەلامم کرد لە پێغەمبەری خوا گوێم لە دەنگێ بوو لەناو حوجرەکەوە وتی: وعليك السلام..

## ئیبنو تەیمیە پشتگیری ئەو ڕووداوە ئەکات

شێخ ئیبنو تەیمیە ئەم ڕووداوە باس دەکات لە کاتێکدا کە قسەی لەسەر ئەو کەسانە دەکرد کە گۆڕیان دەکردە مزگەوت یان کڕنوشیان بۆ گۆڕەکان دەبرد، لەو کاتەدا ئەڵێ: ((ئەو قسەیەی کە ڕیوایەت کراوە کە گوێیان لە وەڵامی سەلامی پێغەمبەر ﷺ بووە لە گۆڕەکەیدا یان دەنگ بیستن لە گۆڕی پیاوچاکان، ئەوە ناچێتە ئەو باسەوە کە ئێمە ئەمڕۆ لێی ئەدوێین، وە بزانن کە سەعیدی کوڕی موسەیب گوێی لە بانگ بو لە گۆڕەکەی پێغەمبەرەوە لە شەوانی گەرمادا)) [2] .

---

[1]- الدارمی لە (السنن)دا ٤٣/١ هێناویەتی، وە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لە (احكام تمني الموت) وا لە کۆکراوەی فتاواکانی (٤٧/٣) نەقڵی کردووە وە فەیروز ئابادی لە (الصلات والبشر) لاپەڕە ١٢٩دا ئەم ڕیوایەتەی نەقڵ کردووە.

[2]- بنواڕە بۆ (اقتضاء الصراط المستقيم) لاپەڕە ٣٧٣ی ابن تيميه..

وە لە شوێنێكی تردا دەڵێ: (هەروەها باس كراوە لە كەرامەت و شتی سەیر و دەرچوو لە عادەت كەلای گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاكان بیستراوە، وەك هاتنە خوارەوەی ڕۆشنایی و فریشتە لەسەر گۆڕەكانیان، وە پارێزگاریان لە شەیتان و گیانداره درندەكان بۆیان، وە تكاكردنی هەندێكیان بۆ دراوسێیەكانیان، وە دروست بوونی دڵ ئارامی كە لە خزمەتیاندا دادەنیشی، وە هاتنی سزا و ناڕەحەتی بۆ ئەوانەی كە گاڵتە و ئیهانە بە خاوەن گۆڕەكان دەكەن، ئەمانە هەموو ڕاستن و هەقن، ئەوە ئەوەی ئێمە دەیڵێین ئەمانە ناگرێتەوە، ئەو فەزڵ و گەورەیی‌یە كە لە گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاكاندا هەیە لە كەرامەت و ڕەحمەتی خوایی، كە ڕەحمەت و كەرامەتێك نی‌یە كە خەڵكی پێی بگەن، بەڵام باس كردنی ئەو باسەیە تەفصیل و ڕوون كردنەوەی زیاتر دەوێ)[١].

## هەندێ لە كەرامەتەكان بۆ غەیری پێغەمبەریش جێگیر بووە

زانایان و ئەهلی عیلم هەندێ لەو ڕێز و كەرامەتانەیان لە سەلەفی صالحینەوە ڕیوایەتی كردووە (ڕەحمەتی خوایان لەسەر) كە لەدوای مردنیان بینویانە، وە پشت بە پشت لە كەسانی باوەڕپێكراوەوە نەقڵیان كردووە كە بەچاوی خۆیان بینیویانە، وە ئێمەش هەندێكیان ئەهێنینەوە، لەوانە گێڕانەوەكانی شێخ محمدی كوڕی عبدالوهابە ، كە لە كتێبی –أحكام تمنی الموت– كە ئەم كتێبە لەناو كۆمەڵێ نوسراوی تریدا لە زانكۆی محمدی كوڕی سعود بۆی لەچاپ دراوە... دەڵێ:

[١]– بنوارە هەمان سەرچاوە لا٣٧٤.

## * نوێژکردن لەناو گۆڕدا..

لە ئەحمەدی کوڕی عفانەوە، لە حمادەوە، لە ثابتەوە کە دەڵێ:
(اللهم إن كنت أعطيت أحداً الصلاة في قبره، فأعطني الصلاة في قبري) خوایە گەر نوێژ خوێندنت لە گۆڕدا بەکەس بەخشیوە، ئەوە بیبەخشە بە منیش کە نوێژ بکەم لە گۆڕەکەمدا..

وە ئەبی نەعیم هێناویەتی، لە جوبەیرەوە، دەڵێ: من ثابتی بەنانیم داهێڵایە ناو گۆڕەکەیەوە، کە دامان پۆشی خشتێك کە پێمان ڕێك دەخست کەوتە ناو گۆڕەکە، کاتێ ویستم دەری بهێنمەوە، بینیم کە لە گۆڕەکەیدا نوێژی دەکرد.

## * خوێندنەوەی قورئان:

لە ئیبنو جورەیرەوە، لە ئیبراهیمی کوڕی موهەلبیەوە دەڵێ: ئەوانەی کە لە پارشێواندا خشتی سوریان بار دەکرد بۆیان گێڕامەوە و دەیان وت: هەرکاتێ دابێتمان بەلای گۆڕی ثابتی بەنانیدا گوێمان لە خوێندنەوەی قورئان بووە..

وە تورموزی هێناویەتی بەڕاستی داناوە لە ئیبنو عەبادەوە دەڵێ: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ شتیان دەشاردەوە لەسەر گۆڕەکان و نەیاندەزانی ئەوانە گۆڕن، گوێیان لێوە بوو مرۆڤێك سورەتی -الملك- التبارك-ی خوێد تا تەواوی کرد، گەڕانەوە و هەواڵەکەیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش فەرمووی: (هي المانعة، هي المنجية، تنجيه من عذاب القبر) ئەوە سورەتە ڕێگرە، فریاد ڕەسە، ڕزگاری دەکات لە سزای ناو گۆڕ.

وە نەسائی و حاکم هێناویانە لە عائشەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (نمتُ فرأيتني في الجنة) خەوتم و خۆمم بینیەوە لە بەهەشت دا، وە وتەی نەسائی دەڵێ: (چوومە بەهەشتەوە)،

(فسمعتُ صوت قارِيء يقرأ، فقلتُ من هذا؟ قالوا: حارثة بن النعمان، فقال رسـول الله ﷺ كـذاك الـبر، كـذاك الـبر، كـذاك الـبر ) ، گـويْم ليْبـووه يـەكێ قورئانی دەخوێند، وتم ئەمە كێيە؟ وتيان ئەوە حارثەی كوڕی نوعمانـە، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ئـە ئەوەيـە، چاكەكردن، سـێ جـار ئـەم وتەيـەی دووبارە كردەوە...

كە حارثە زۆر باش بووە لەگەڵ دايكيدا..

وە ئيبنو ئەبی دونيا هێناويەتی، لە حەسەنەوە، دەڵێ: پێم گەيشـتووە كە موسـوڵمانێ بمـرێ و هـيچ قورئـانی لەبـەر نەكردبێ، فرمـان دەكـرێ بـە دوو فريشـتەكەی كـە لـە گۆڕەكەيـدا فێـری قورئـانی بكـەن تـا لـە ڕۆژی قيامەتـدا لەگەڵ كەسەكانيدا زيندوو دەبێتەوە...

وە هـەمان گێڕانـەوە هەيـە لـە يەزيـدی ڕەقاشـييەوە، وە (ئەلسـلفی) لـەم مانايەی گێڕاوەتەوە لە كتێبی (مراسل عطية العوفي)يەوە .

## * كەسانی ناو گۆڕەكان سەردانی يەكتر دەكەن :

ئيبنو ئەبی شەيبە هێناويەتی لە ئيبنو سيرينەوە دەڵـێ: حـەزی لـە كفنـی جـوان بـوو، وە دەيـوت: بـەو كفنانـەوە لـە گۆڕەكانيانـدا سـەردانی يـەكتری دەكـەن، وە لـەو مانايـەدا لـە -مسـند-ی ئيبنـو ئـەبی ئوسـامەدا هـاتووە لـە جـابرەوە كـە پلـەی -مرفـوع-ی هەيـە دەڵـێ: (ويتبـاهون و يتـزاورون في قبـورهم).. وە ئيمـامی موسليم لـەو فـەرموودە هێناويـەتی ( إذا ولـي أحدكم أخاه فليحسن كفنَهُ ) ئەگەر كەسێ لە ئێوە برايەكی ئەشاردەوە با جوانترين كفنی بۆ بكات.

وە تورمـذی و ئيبنـو ماجـە هێناويانـە: وە محمـدی كـوڕی يـەحيای هەمەدانی لە -صحيحە-كەيدا هێناويەتی، لە ئەبی قەتادە بە پلەی (مرفوع)

دەڵێ: (إذا ولي احدكم اخاه فليحسن كفنه، فإنهم يتزاورون في قبورهم) گەر کەسێ لە ئێوە برایەکی ئەشاردەوە با جوانترین کفنی بۆ بکات، چونکە ئەوانە لە گۆڕەکانیاندا سەردانی یەکتر دەکەن .

## * نامەیەك لە دونیاوە بۆ بەرزەخ بە مردویەکدا :

ئیبنو ئەبی دونیا هێناویەتی لە ڕاشدی کوڕی سەعدەوە: پیاوێك خێزانەکەی مردبوو، لە خەویا کۆمەڵێ ئافرەتی بینی بەڵام خێزانەکەی خۆیی تیا نەبوو، پرسیاری لێ کردن کوا خێزانەکەی، وتیان: ئێوە کەمتەرخەمیتان لە کفنەکەیدا کردووە، پێی شەرمە لەگەڵ ئێمەدا بێتە دەرەوە، پیاوەکە هات بۆ خزمەت حەزرەت ﷺ و خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بڕۆ سەیر بکە کەس بەو ڕێگەدا دەڕوات؟ (واتە کەس لەسەر مردنە)، پیاوێکی ئەنصاری دۆزیەوە لەکاتی مردندا بوو، چوو بۆلای هەواڵەکەی پێدا، پیاوەکە وتی: گەر کەسێ هەبێ تەبلیغی مردووی کردبێ ئەوە من ئەیکەم، کابرا وەفاتی کرد، و لە گۆڕەکەیدا دوو پۆشاکی کفنی بۆن خۆشکراو بە زەعفەران یان دانا لەناو کفنی کابرای ئەنصاری دا و ناشتیان، لە خەویدا ئافرەتەکانی بینیەوە، سەیری کرد خێزانەکەی لەناویاندایە و ئەو دوو کفنە بۆن خۆشکراوەکەی لەبەردایە...

ئیبنو جەوزی ڕیوایەتی کردووە لە محمدی کوڕی یوسفی فەریابیەوە، چیرۆکی ئەو ئافرەتەی کە لە خەویدا دایکی بینی کە شکاتی حاڵی کفنەکەی دەکرد، هات بۆ خزمەت محمد و پرسیاری خەوەکەی کرد، فریابی ئەو فەرموودەی بۆ گێڕایەوە کە ئەوان بە کفنەکانیانەوە سەردانی یەکتر دەکەن وتی پێی: بڕۆ کفنێك بکڕە، ئافرەتێك ئەو ڕۆژە وەفاتی کرد کفنەکەیان لەناو گۆڕی ئەم مردووەدا دانا تا پێی بگەیەنێت..

## * نور و ڕۆشنایی لەسەر گۆڕەکان:

ئیبنو ئەبی دونیا هێناویەتی لە ئەبی غالبەوە [1]، کە گەنجێك لە شام کاتی مردنی هاتە پێشەوە، وتی بە مامەی: ئەگەر خوای پەروەردگار من بداتە دەست دایکم چیم لێ دەکات؟ وتی: وەڵلاهی ئەتنێرێ بۆ بەهەشت، گەنجەکە وتی: (قەسەم بە خوا خوا بەڕەحمترە لە دایکم) عەمری خوای کرد، مامەکەی دایهێڵایە خوارەوە، کاتێ ڕێکیان دەخست، خشتێکی گەورە لە دەستی کەوتە خوارەوە، بۆ هەڵگرتنەوەی کە سەری بردە ناو گۆڕەکە، پێی چوو سەری بەرز نەدەکردەوە، پێیان وت: ئەوە چیتە چی بووە؟ وتی: گۆڕەکەی پڕبووە لە نوور وە تا چاو بڕبکات فراوان بووە..

وە ئەبی داود لە خاتوو عائشەوە هێناویەتی، دەڵێ: کاتێ کە نەجاشی وەفاتی کرد، ئێمە دەمانوت: بەردەوام نور لەسەر قەبرەکەیدا دەبینرێ..

وە لە (تأريخ ابن عساكر)دا هاتووە لە عبدالرحمانی کوڕی عمارەوە دەڵێ: ئامادەی ئەسپەردەکردنی ئەحنەفی کوڕی قەیس بووم، وە یەکێ بووم لەوانەی کە چووە ناو گۆڕەکەوە، کاتێ کە ڕێکم دەخست، بینیم تا چاو بڕ بکات گۆڕەکەی بۆ فراوان بووە، هەواڵم دا بەوانەی لەوێدا بوون بەڵام ئەوان وتیان ئێمە شتی وامان نەدیوە ..( کۆتایی هات ) .

بۆ ئەمەی کە هێنامان دەقی نوسینەکەی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهابە کە لە کتێبی –أحكام تمنى الموت– هێناویەتی، ئەم نوسخەیەی کە من سەیرم کردووە لەو نوسخە کۆپیەیە کە لەژێر ٨٦/٧٧١ دا هەڵگیراوە لە کتێبخانەی سعودیە لە ریاض، کە شێخ عبدالرحمانی سەدحان و شێخ

---

[1]- خاوەنی ئەبی ئومامەیە.

عبدالله ی جەبەرین لێکۆڵینەوەیان لەسەر نوسیوە لەسەر ناوی (مجلد الفقه- القسم الثاني)دا.

که تیایدا نسبەتی ئەم نوسراوەیان ڕاست کردۆتەوە کە نوسینی شێخە، وە زانکۆی محمدی کوڕی سعود لە ریاض بۆیان چاپ کردووە و لە هەفتەی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب دا بڵاویان کردەوە..

## ( فەرموودەی ( لا تَشد الرحال ) باری وڵاتەکانتان توند مەکەن )

زۆر کەس بەهەڵداچوون لە چەمکی فەرموودەی (لا تشدُ الرحالَ إلاّ الى ثلاثة مساجد، المسجدُ الحرام، وَمَسجدي هذا، والمسجد الأقصى) واتە: بارو بنەتان لەسەر وڵاخەکانتان توند بار مەکەن مەگەر بۆ سێ مزگەوت نەبێ (ئەوانیش: حەرەمی پیرۆزی مەککە، مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینەوە منەوەرە، مزگەوتی ئەقصا لە قودس)، ئەم فەرموودە دەکەن بە بەڵگە بۆ حەرام کردنی سەردانی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ وای دادەنێن کە ئەمە کۆچ کردنە بەرەو گوناه و سەرپێچی، ئەم بەڵگەشیان دەدرێتەوە بەسەر خۆیان دا لەبەرئەوەی بناغەکەی لەسەر بەتاڵ و تێگەیشتنێکی هەڵە دامەزراوە، چونکە ئەم فەرموودەیە ڕاڤە و مەبەستەکەی وەك دەبینین دوورە لە بۆچوون و تێگەیشتنی ئەوان، کە ئەمە لە باسێکدایە و وتەکەی ئەوان لە باسێکی تردایە..

### ڕوونکردنەوەی ئەم باسەیە :

شێخ الاسلام -الفیروز آبادي- دەڵێ: (فەرموودەی "لا تَشُدُ الرِّحال اِلاّ الى ثلاث مَساجد" هیچ بەڵگەیەکی تێدا نیە لەسەر ئەوە کە نەهی زیارەتی پێغەمبەر ﷺ بکات، بەڵکو بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ دامەزراندنی زیارەتی خۆشەویست ﷺ ، وەئەوانە کە ئەیکەنە بەڵگە بۆ حەرامیەتی زیارەت ئەوە

له جورئەتە گەورەکانە کە بەرانبەر خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەینوێنن، کە تەنها نەزانێتی خۆیان نیشان دەدەن لەبواری وەرگرتن -الأستنباط-ەوە وە بەڵگە هێنانەوە -الأستدلال-)[1] .

منیش دەڵێم: ئەم فەرموودەیە لەلای زانایانی زمانەوانی دارشتنەکەی دارشتنێکی -الأشتثناء-ە، بۆیە پێویستی بە بونی شتێ هەیە کە بیگرێتە خۆی و شتێکیش کە لێی دەربکرێ واتە (مستثنی ومستثنی منهُ)، کە یەکەمیان دەبێ لەدوای ئامرازی (الاّ)ەوە بێ، وە دووەمەکەشیان لە پێشەوە بێ، ئەمەش یان ئەوەتا ناوبراوە یان باس نەکراوە، کە ئەمەش لە سادەترین کتێبی -نحو-یدا دان پیانراوەو لای زانایان ئاشکرایە.

ئەگەر سەیری ئەم فەرموودەیە بکەین دەبینین کە دان پیانرانی بە باس کردنی (المستثنی) باس کراوە کە وتەی (ثلاثة مَساجدَ)ە لەدوای -إلاّ-ەوە هاتووە، وە لە فەرمووودەکەدا (المستثنی منهُ) نەهاتووە باس نەکراوە کە شوێنی لە پێش - إلاّ - ەوەیە، کە لەم حاڵ و کاتەدا ئەبێ (تقدیر) واتە لە شوێنەکەیدا ڕوون کردنەوە بکرێ.

گریمان (فرضنا) کە ئەوەی باس نەکراوە و -مستثنی منهُ-ەکەیە وتەی (قبر)بێ و لە شوێنەکیەدا بێ و بەلای پێغەمبەری خوادا بدرێ، واتە وترابێ (لا تَشدُ الرِّحال الی قبر إلاّ الی ثلاث مَساجدَ) کە ئەمەش هەموو تێکەیشتوویەك دەزانێ کە ئەم جۆرە دارشتنە دوورە لە ڕەوانبێژی نەبەوی و پێغەمبەرایەتیەوە.. وە -مستثنی- بەشێك نابێ لەناو -مستثنی منه- چونکە لە بناغەی باسی ڕێزمان و زمانەوانیدا پێویستە لە جنس و ڕەگەزی خۆی بێت تا بتوانێ لێی دەربکرێ، کەواتە وشەی -قبر- ڕەد دەکرێتەوە. وە ئەگەر وا گومان ببەین کە وشەی (مکان) نادیار بێ وە بەلای پێغەمبەری

---

[1]- بنوارە بۆ -الصلای والبشر- الآبادي ١٥٢.

خوا ﷺ درابێ کە بوترێ: (لا تَشدُ الرحال الی مکان إلاّ الی ثلاث مَساجِد)، واتە: دروست نىیە سەفەر کردن و خۆسازدان بۆ هیچ شوێنێ مەگەر ئەم سێ مزگەوتە نەبێ، کە ئەمەش مانای وایە (نابێ سەفەر بکەین بۆ بازرگانی یان فێربوونی زانست یان خێر و چاکە مەگەر تەنها بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێ)، کە ئەمەش بەتاڵەو دوورە لە ڕاستی بەرنامەی ئیسلامەوە..

کەواتە بە تێکڕایی دەنگی زانایانی زمانەوانی لەم کاتەدا کە ڕِستەیەك -مستثنی- باس کرابێو -مستثنی منە- نادیار بێ وە -تقدیر-ی حاڵەتەکەی لەم سێ ڕووەوە دەبێ:

## ڕووی یەکەم:

ئەبێ لە شوێنەکە وشەی -قبر- ببێ، ئەو کاتە فەرموودەکە وا دەبێ (لا تَشد الرحالَ الی قبر إلاّ الی ثلاثة مَساجِدَ) واتە: پێی هەڵهێنانەوە و ڕۆیشتن نىیە بۆ هیچ گۆڕێ مەگەر لەم سێ مزگەوتەدا نەبێ، ئەم بۆچوونە و لەم جێدانانە ساردە و هەڵەیە، هەرکەسێ کەمێ شارەزایی لە زمانی عەرەبیدا ببێ ئەزانێ کە ئەمە ناگونجێ لە زمانەوانیدا، لە هەمان کاتدا بە شانی بەرێزترین کەس کە لە زمانەوانی و زمانی عەرەبیدا شارەزاترین کەسە -صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ- ناگونجێ.

## بۆچوون و ڕووی دووەم:

لەجێ دانان و تەقدیری بە وشەیەکی گشتی بکەین وەك وشەی -مکان- کە ئەمەش بەتاڵە وەك لەپێشتر باسمان کرد و لەلای زانایان ڕوون و ئاشکرایە.

## بۆچوون و ڕووی سێیەم:

لەجێدانان و تەقدیری بە وشەی (مسجد)بێ، کە فەرموودەکە بەم شێوەی لێ دێ کە فەرموویێتی: (لا تَشُدُ الرِّحالَ الی مسجد إلاّ الی ثلاثة مَساجِدَ)،

پێهەڵهێنانەوە و سەفەر نىیە بۆ هیچ مزگەوتێ مەگەر ئەم سێ مزگەوتە نەبێ.

لێرەدا دەبینین کە چۆن ئسلوبی دارشتنی لە ڕستەکەدا ڕێك دەبێتەوەو جوانیەکی زمانەوانی تێدا دەبینرێ، وە ئەو دوو گومانەی پێشوی لەسەر لادەچێ و نوور و ڕۆشنایی ڕۆحی پێغەمبەرایەتی تێدا دەبینرێتەوە.
ئەمە لە کاتێکدا کە گومان بەرین کە هیچ دەق و ڕیوایەتێکی تر لەم جۆرە نەبێ بەڵام سوپاس بۆ خوا لە سوننەتی پێغەمبەرایەتیدا چەندە ڕیوایەت و دەقی بەم شێوە هاتووە، لەوانە:

ئیمامی ئەحمەد هێناویەتی لە ڕێگەی (شهر بن حوش) کە دەڵێ: گوێم لە -ابا سعید- بوو کە باسی نوێژی لەسەر گۆڕی دەکرد و فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لا ينبغي للمُصلي أن يَشُدَ رِحالَهُ الى مسجد تبتغي فيه الصلاةَ غيرَ المسجدَ الحرام والمسجدَ الأقصى وَمَسجدي))[1] .

وە لە فەرموودەیەکی تردا، گەیشتووە بە حەزرەتی عائیشە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە حەزرەت ﷺ فەرمووی: (أنا خاتَمُ الأنبياء وَمسجدي خاتَمُ مسجدِ الأنبياء، أحقُ المساجد أن يُزار وَ تَشَدُ إليه الرواحل المسجد الحرام و مسجدي، صلاة في مسجدي افضلُ من ألف صلاة فيما سواه مِنَ المساجِد الا المسجدَ الحرام)[2] .

---

[1]- بنوارە بۆ -فتح الباري- فضل الصلاة في مسجد مكة و مدينة ٨٤/٣، وە بۆ مسند احمد ٦٤/٣.

[2]- البزار ڕیوایەتی کردووە، بنوارە بۆ -مجمع الزوائد- ٤/٤ للهيثمي، کە موسى بن عبيده-ی تياية كة لاوازة.

واتـه: مـن لـه كۆتـای پێغەمبـەرانم وە مزگەوتەكەشـم كۆتـای مزگـەوتی پێغەمبەرانە، لەپیشترینی مزگەوتەكانـە كـە زیـارەتی بكرێ و سـەفەری بۆلا بكرێ مزگەوتی مەككەو مزگەوتی منـه، كـه یـەك نوێـژ تیایـدا خێری هـەزار نوێژ زیاترە لە مزگەوتەكانی تر جگە لە مزگەوتی مەككە نەبێ..

ئەم وتەیەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر مزگەوتەكان ڕوون كردنەوەیـەكی تیایـە، بۆ ئومەتەكەی كە مزگەوتـەكان جگـە لـەم سـێ مزگـەوتـە لـە ڕێـز و فـەزلا وەك یەك وان ئیتر هیچ سودێك لەخۆ هیلاك كردن بەسەفەر نىیـە بۆ غـەیری ئـەو سیانە، ئیتر گۆڕستانـەكان لـەم فەرموودەیـەدا كـە بـاس دەكـرێ دادەنـرێ بـە درۆ بـەدەم پێغەمبـەری خـواوە ﷺ كـە ئەمـەش سـزایەكی چـاوەڕوان كـراوە بەرەو ڕووی دەچێ...

ئەمە لە كاتێكدا كە زیارەت كارێكی داواكراوە، بەڵكو زۆرێك لە زانایان لە نوسـراوەكانیان لەسـەر مەناسـیكی حـەج دا بـەكارێكی (موسـتەحەب)یـان دانـاوە، كـە زۆر لـە فـەرموودەكانی حـەزرەت ﷺ پشـتگیری و بەڵگـەن، كـە لێرەدا كۆمەڵێكیان دەهێنینەوە:

لە عبدالله ی كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایـان لەسـەر بێ) كـە پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ زارَ قبري وَجبت لَهُ شفاعتي)[1] .

واتە: هەركەس زیارەتی گۆڕەكەم بكات، شەفاعەتی منی بەنسیب دەبێ.

---

[1]- الدار القطني لە -سنن-ەكەیدا٢٧٨/٢ ڕیوایەتی كردووە، هەروەها (الترمذي) لـە -النـوادر- لا ١٤٨ هێناویـەتی، وە (العقیلـی) لـە (الضـعفاء) ٧٠/٤ هێناویـەتی، وە (الدولابي) لە -الكنى- ٦٤/٢ هێناویەتی كەمترین پلەی ئەم فەرموودەیە (حسن)ە وەك ئیمامی (السیوطي) لە -المناهل- لا ٢٠٨ دا دەڵێ (ئەم فەرموودە ڕێگەو شاهیدەكانی چاكن -حسن-ن لەسەر ڕیوایەتی -الذهبي-.

لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَن جاءني زائراً لا يعلم لَهُ حاجة اِلاّ زيارتي كان حقاً عليَّ أن اكونَ لَهُ شفيعاً يومَ القيامة)[1] .

هەرکەس بە نیەتی زیارەت بێت بۆلام، هیچ پێویستیەکی نەبێ مەگەر زیارەتی من نەبێ، ئەوە پێویست ئەگێڕێ لەسەرم کە لە ڕۆژی دوایدا شەفاعەتی بۆ بکەم..

وە لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (من حج فزار قبري في مماتي كان كمن زارني في حياتي)[2] ، هەرکەس حەجی ماڵی خوا بکات و سەردانی گۆڕەکەم بکات لە کاتێکی مردنمدا، ئەوە وەك ئەو کەسە وایە کە لە کاتی ژیانمدا سەردانی کردبم.

وە لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (من زار قبري بعد موتي كان كمن زارني في حياتي)[3] ، هەرکەس لەدوای مردنم سەردانی گۆڕەکەم بکات، وەك ئەو کەسە وایە کەلەکاتی ژیانمدا سەردانم ئەکات.

---

[1]- طبرانی لە (الأوسط)داو لە (الكبير)دا ڕیوایەتی کردووە، وە لە پیاوەکانیدا موسلەمەی کوڕی سالمی تیایە کە پلەی لاوازی هەیە، بنواڕە بۆ (مجمع الزوائد ٢/٤ وە حافظي عێراقی دەڵێ (ابن عساكر) پلەی صحيح ی داوەتێ، وە بنواڕە بۆ المغنی) ٢٦٥/١.

[2]-طبراني (الكبير) و (الأوسط)دا ڕیوایەتی کردووە، وە لە پیاوەکانیدا حفصی کوڕی ئەبی داودی کاری تیایە کە لای کۆمەڵێ لاوازە، بەڵام لای ئەحمەد باوەڕ پێکراوە.

[3]- هەیثەمی دەڵێ: طبراني لە (الصغير)و لە (الأوسط)دا ڕیوایەتی کردووە، کە عائشەی کچی یونس تیایە کە لە وەرگێڕانەکەیدا نەماندۆزیوەتەوە، وەك لە مجمع الزوائد ٢/٤دا هەیە.

**به كورتی:**

فەرموودەكانی زیارەت زۆر ڕێگەیان هەیە كە هەندێكیان هەندێكیان بەهێز دەكەنەوە، وەك پێشەوا –ئەلمەناوی– لە پێشەوا (الذهبي)یەوە لە كتێبی (فیض القدیر)[1]دا گێڕاویانەتەوە، بەتایبەت هەندێ لە زانایان پلەی –صحیح–یان بۆ داناوە، وەك پێشەوا (سبَكي و ابن السكن و عراقي و قاضي عیاض لە –شفا–دا و ملا علي قاري لە شەرحی شفادا و خفاجی لە –نسیم الریاض)[2]دا، كە ئەم زانایانە سەرجەمیان پێشەوای زانایانی باوەڕپێكراوی فەرموودەن بەس بێ كە چوار پێشەواكەمان (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) دانیان بە دروستی زیارەتی پێغەمبەر ﷺدا هێناوە. هەروەك چۆن هاوەڵانیان لە نوسراوە شەرعی‌یە باوەڕپێكراوەكانیان تۆماریان كردووە، وە ئەوەش بەس بێ كە ئەوان فەرموودەكانیان هەڵسەنگاندووە و وەریان گرتووە، چونكە فەرموودەی لاواز بە كردەوە و فتوا پشتگیری لێ دەكرێ، كە ئەمەش زانراوە و لە یاساكانی ئوصولێن و فەرموودەناساندا هەیە.

## زیارەتی مەرقەدی پێغەمبەر زیارەتی مزگەوتەكەیەتی لەلای شێخ ئیبنوتەیمیە

شێخ ئیبنو تەیمیە لەكاتی قسەكردنی لەسەر زیارەت و سەردان وتەیەكی بەپێزی هەیە، لەدوای ئەوەی قسە لەسەر ئەوە دەكات كە خۆئامادەكردن و سەفەركردن بۆلای مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ بە تەنها بەبێ مزگەوتەكە بیدعەیە دەڵێت:

---

[1]- لە ١٤٠/٦.

[2]- لە ٥١١/٣.

(ئەم ڕەخنەیە و هاوشێوەکانی وایان کردووە کە سەفەر کردن بۆ لای گۆڕی پێغەمبەران جۆرێك بێت لە نزیك بوونەوە، پاش ئەوەی کە ڕاوبۆچوونی زانایانیان بیست لە سوننەتی زیارەتکردنی گۆڕی پێغەمبەرمان ﷺ وا گومانیان برد کە سەرجەم گۆڕەکان بە نیەتی سەفەر بۆلاکردن ، کە ئەم ڕێزەیان دیاری کرد لە چەند ڕوویەکەوە:

یەکەم: ئەم سەفەرکردنە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ سەفەرکردنە بۆ لای مزگەوتەکەی کە ئەمەش بە دەق و یەکڕایی زانایان کارێکی دروست و موستەحەبە.

دووەم: ئەم سەفەرە بۆ خودی مزگەوتەکەیە لەکاتی ژیانی حەزرەت دا و ﷺ لەدوای ناشتنی و لەپێش چوونە ژوورەوەی بۆ مەرقەدی پیرۆزی و لەدوای چوونە ژوورەوە، لەهەموو حاڵەتەکاندا سەفەرکردنە بۆ لای مزگەوتەکە جا یەکسانە گۆڕی پێغەمبەرەکە لەویا بێ یان لەویا نەبێ، ئیتر دروست نىیە کە سەفەر کردنەکە بۆلای گۆڕەکە بێ بە تەنها.

پاشان درێژە بە باسەکەی ئەدات و ئەڵێیت:

شەشەم: سەفەرکردن بۆ مزگەوتەکەی –کە ناوبراوە بە سەفەرکردن بۆ لای گۆڕەکەی– ئەو کردەوەیەیە کە موسوڵمانان پشت بە پشت لەسەری کۆن و یەکڕان، بەڵام سەفەر کردن بۆ لای گۆڕەکانی تر، نەزانراوە لە هیچ کام لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و بگرە لە شوێن کەوتوانی شوێن کەوتوانیشیان وتبێتیان غەیری ئەو سێ مزگەوتە سەفەر بکرێ..

پاشان دەڵێ: مەبەست لەم باسەدا ئەوەیە کە بەردەوام موسوڵمانان سەفەر دەکەن بۆ لای مزگەوتەکەو سەفەر ناکەن بۆ لای گۆڕی پێغەمبەران، وەك گۆڕی موساو ئیبراهیمی خەلیل، وە نەبیستراوە لە یەکێ لە هاوەڵانەوە کە سەفەریان کردبێ بۆ لای گۆڕی خەلیل لەگەڵ ئەوەدا کە بەردەوام لە

سـەردانی شـام و بـەیتی مەقـدیس دا بـوون، ئـیتر چـۆن سـەفەرکردن بـۆ مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ وەك هەندێ کەس ناویان ناوە بە زیارەتی مەرقەدی پیرۆزی، وەك سەفەرکردنە بۆ لای گۆڕی پێغەمبەران؟)) ..

لـەم وتەیـەی شـێخ ئیبنوتەیمیە سودێکی زۆر گـرنگ وەردەگـرین ئـەویش ئەوەیە کە:

کـە بەهیچ شـێوەیەك خـەیاڵ بـەو لایـەدا ناچـێ کـە خۆکۆکردنـەوەی ئـەو کەسـەو سـەفەرکردن بـە تـەنها نیـەتی زیـارەت کردنـی گۆڕەکـە بـێ، پاشـان کەسی نییە کە بچێتە ناو ئەو مزگەوتەوەو نوێژ بخوێنێ تیایدا و سوود لەو بەرەکەتـەو چـەندانە پاداشـتی نوێـژەکان وەربگـرێ و لـە ڕەوضـەی پـیرۆزدا نەمێنێتەوە، لە بەرانبەر ئەمەش دا ئەوە بە مێشکی کەس دا نایەت کە بڕوا بـە نیـەتی زیـارەتی مزگـەوتی مەدینـە خـۆی ئامادەباشـی بکـات و پاشـان نەچێتە خزمەت پێغەمبەرو لەبەر مەرقەدیدا ڕانەوەستێ و سەلام لـە خـۆی و دوو هاوەڵەکەی نەکات –صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ–

کە شـێخ لێرەدا بـەو داڕشـتنەی ئامـاژە بـۆ ئـەم مانایـە دەکـات کـە دەڵـێ: (فکیـف یجعـلُ السـفر الی مسـجد الرسـول الـذي یسـمیه بعـض النـاس زیـارة لقبره مثل السفر الی قبور الأنبیاء؟...

پاشان ئەو داڕشتنەوەی کە دەڵێ:( إن السفر إلیه إنما هو سفر إلی مسجده ) ، سەفەرکردن بۆ خزمەت خۆی لە خۆیدا سەفەرکردنە بۆ مزگەوتەکە.

پاشان لەو داڕشتنەیدا کە دەڵێ: (إن السفر الی مسجده الذي یسمی السفر لزیـارة قـبره هـو مـا اجمـع علیـه المسـلمون) سـەفەرکردن بـۆ مزگەوتەکـەی سـەفەرکردتە بـۆ زیـارەتی مەرقـەدی کـە ئەمـە ڕای سـەرجەم زانایـانی موسوڵمانانە.

ئەمە بۆچوونێکی زۆر ڕێك و جوانە کە گەورەترین کێشەی یەکلادەکاتەوە کە بریتی یە لەو جیاوازی‌یە گەورەیەی کە بەهۆیەوە لەنێوان موسوڵماناندا دروست بووە، کە هەندێکی هەندێکی تری بێ بڕوا و دەرچوو لە دین داناوەو لە سنوری ئیسلام یەکتری دەردەکەن، وە گەر ئەو کەسەی خۆی بە شوێنکەوتەی پێشینەکان دەزانێ بەڕاست شوێن (ابن تیمیە) بکەوێ کە پێشەوای زانایانی پێشینی سەردەمی خۆی بووەو، ئەو کاتە دەبێ ئەو کەسە عوزر خوایی بۆ خەڵکی بهێنێتەوە و گومانی باش بەرانبەریان نیشان بدات، ئەو کاتە کۆمەڵێکی زۆر لە موسوڵمانان لە چوونە دۆزەخ ڕزگار دەبن و بەهەشتی بەرین دەبەنەوە.

ئەمە ئەو هەق و ڕاستی‌یەیە کە لەسەری موسوڵمان بووین و بەشێوەیەکی ڕاستگۆیانە بیروباوەڕمان لەسەری دامەزراوە، جا یەکسانە ئاشکرامان کردبێ یان نا، گەر یەکێ لە ئێمە بڵێ: من سەفەر دەکەم بۆ زیارەتی پێغەمبەر ﷺ یان بۆ خزمەتی مەرقەدی، ئەوە مەبەستی تەواوی هەموو مزگەوتە پیرۆزەکەیەتی، وە گەر وتی: من سەفەر دەکەم بۆ زیارەتی مزگەوتەکەی، ئەوە مەبەستی تەواوی مەرقەدەکەشی دەگرێتەوە مەبەست لەم فرمانە بەیەك گەیاندنەوەی ئەو پەیوەندی‌یە بەتینەیە کە لەنێوان مزگەوت و گۆڕەکەدا هەیە، کە لە ڕاستیدا مەبەست پێی زاتی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ خۆیەتی، چونکە سەفەرکردنی بۆ زیارەتی مەرقەدی سەفەرکردنە لە هەقیقەتدا بۆ خزمەتی خودی حەزرەت ﷺ بۆیە نیازو مەبەستی دڵی بەیان ناکات و لەبەر ئەم پەیوەست بوونە بەهێزە گوتنی بە پێویست نازانێت..

بەڵام گۆڕ لە ڕاستیدا نە کەس مەبەستێتی و نە کەسیش ڕووی نیەتی سەفەری بۆ لا دەکات، وە ئێمە کە ڕووی تێدەکەین و باروبارفتەمان بۆ

زیـارەتی کۆدەکەینــەوە، مەبەســت پــێ‌ی نزیــك بوونەوەمانــە لــە خــوای پەروەردگار بـەهۆی ئـەو زیارەتەمانـەوە، لەبەرئەمـە پێویستە لەسـەر هـەموو ئەو موسوڵمانانەی کە زیارەتی دەکەن وتە و شێوەی دەربڕینەکانیان ڕاست بکەنەوە، دوور بن لە گومان و وتەیەك کە شوبهەی لەسەر بێ، دەڵێن: ئێمـە زیارەتی پێغەمبەری خوا دەکەین و بارمان کۆدەکەینەوە بە نیـەتی زیـارەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئە لێرەدا پێشەوا (مالك) دەڵـێ: بەلامانـەوە کەراهـەتی هەیە گەر کەسێ بڵێ: (زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرم ﷺ کرد)..

زانایان کە لەسەر ڕێڕەوی پێشـەوا مـالیکن ئـەم وتەیـەیان بـەو شـێوە ڕاڤـە کردووە ، کە ئەمە بریتی‌یە لە نواندنی ئەدەب لـەناو وتـە و دەربـڕین دا، خـۆ گـەر ئـەو کەســەیە سـەفەرکردنەکەی بـۆ زیـارەتی گـۆڕەکـە بـێ وە مەبەسـتی تەنها زیارەتی مەرقەدی بێ، ئەی ئەو خەڵکە زۆرە بـۆ بـەو شـێوەیە هـەوڵ و شان بە شانی دەکەن لەناو ڕەوضـەی پیرۆزدا، کـە زۆر جـار موسـوڵمانان لـە چـاوەڕوانی کردنـەوەی دەرگاکـانی مزگـەوتـدا و لـەکاتی چـوونە ژوورەوەدا خــەریکی یــەکتری لەســەر بکـوژن تـا زووتـر بگەنـە نـاو مزگـەوت، وە ئـەو کەسانەی کـە سـوورن لەسـەر نوێـژ خوێنـدن لـەناو ئـەو مزگەوتـە و پێشـبڕکێ دەکەن بـۆ چـوونە نـاو ڕەوضـەی پیرۆز هـەر ئەوانـەن کە بە نیـەتی زیـارەتی پێغەمبـەری ئیسـلام محمـدی کـوڕی عبـدالله هـاتوون و بـارو یاتاخیـان بـۆ خزمەتی کۆکردۆتەوە، صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ..

# لێکۆڵینەوەیەکی گرنگ

لێکۆڵینەوەی زانا شێخ (عطیه محمد سالم) خاوەنی پەرتووکی ((تکملة أضواء البيان)) کە ڕاڤەیەکی بەناوبانگی قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە بەناوی ((أضواء البيان)) لەسەر ڕاڤەی زانای ڕاڤەنوس (شێخ محمد الأمين الشنقيطي) ئەم بابەتەی یاداشت کردووە، تیایدا دەڵێت: {بیروباوەڕی لەسەر ئەم بابەتە ئەوەیە ئەگەر دووبەرەکی هاوچەرخەکەی (شێخ الأسلام) لەسەر ئەو و غەیری ئەویش نەبووایە هیچ پێویستمان بەم باسە لەم شوێن و بوارەدا نەدەبوو. بەڵام بینیمان بابەتەکە هەستیارەو بەرهەست و سۆز و خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت و لەکەداری دەکات، ئەمەیان وروژاندووەو حوکمی ئەوەیان دەرکردوە کە هەمووان پابەند بن بە وتەکانیەوە کاتێك دەڵێت: ((نابێت کەس باری خۆی لە وڵاخەکەی توند بکات تەنیا بە مەبەستی زیارەت و سەردان، بەڵکو تەنیا بۆ مزگەوت دەبێت لەپێناوی کارێکدا بە دەقی فەرموودەکە))، ئەم وتە تەم و مژاوییە لەسەری دەڵێت و بە ڕێك و ڕەوانی ڕوونی ناکاتەوە، ئەگەر واتای قسەکەیان نەفی کردن بوایە لەجیاتی نەهی کردن و قەدەغەکردن ئەوا پەسەند دەبوو، یاخود ئەم ئاڵۆزییەی بەدوای خۆیدا نەدەهێنا، لەبەرئەوەی سەردان و سەلام کردنی لە پێغەمبەر ﷺ قەدەغە نەکردووە، بەڵکو گێڕاویەتی بە کارێکی شیاو و نزیك بوونەوە لە خودا (جل جلاله) وە پابەندی خۆی بە دەقی فەرموودەکەوە وبارگە پێچانەوە بۆ مزگەوت و سەلام کردن لە پێغەمبەر ﷺ لە کتێبەکەیدا ڕوون کردۆتەوە}[1] .

---

[1]- عطية محمد سالم ((تكملة أضواء البيان)) ٥٨٦/٨.

پاشـان دەقـی وتەكـەی ئیبنـو تەیمیـەی گواسـتۆتەوە ئێمـەش لـە ئـەومان وەرگرتـووە، پاشـان دەڵێـت: وتەكـەی (شێخ الاسـلام) ئامـاژە بـە پـەیوەسـت كردنی سەردانی گۆڕ و نوێژكردن لە مزگەوت دا دەكات.

هەركەسێك بانگەشەی لەیەك دابڕانی ئەم دووكارە لەیەك بكات و هـەوڵی بۆ بدات ئەوا پێچەوانەی واقیع و ڕاستیەكەی بەكرداری كردووە، خۆ ئەگەر ئـەم پەیوەسـت بوونـە لەنێوانیانـدا جـێگیر بكرێـت ئـەوا ئـەو نـاكۆكی و دووبەرەكیـیـە لەنێوانــدا نامێنێــت، ئێمــەش لەســەر ئەمــە سوپاســی پەروەردگاری جیهانیان دەكەین. وە هـەر ئیبنو تەیمیـە لـە شـوێنێكی تـردا ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە كورت كردنەوەی نوێژ لە سەفەردا و لـە سـەردانی گۆڕی پیاوچاكان و هاوەڵاندا چوار وتەی هەیـە، سێیەمیان ئەوەیـە: كـورت كردنەوەی نوێژ لەكاتی سەردانی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ .

پاشان شێخ عطیە دەڵێ: (نیاز لە ڕوونكردنەوەی ئەوەیە كە هـیچ دابڕان و جیاكارییەك لەلای گشتی زاناكانەوە نییە لەنێوان زیارەتی پێغەمبەر ﷺ و نوێژكردن لە مزگەوتەكەیدا)[1] .

پاشـان ئیبنـو تەیمیـە لـە هـەقی نەزانەكانـدا دەڵێـت: (بـەڵام ئـەوەی ئـەم ڕاستیە نازانێت ئەوە هیچ مەبەستێكی تری نییە جگە لـە سەفەركردنی بـۆ گۆڕەكـەی پاشـان هـەر دەبێـت نوێـژ لـە مزگەوتەكەیـدا بكـات و پاداشـت و خێری لەسەر وەردەگرێت، ئەوەشی دەیكات نـەهی لێ كـراوە ناشـزانێت كـە نەهی لێكراوە، بۆیە لەسەری سزا نادرێت، بەڵكو خێرو پاداشتێكی دەسـت دەكەوێت و هیچ گوناهێكی لەسەر نانوسرێت [2] .

---

[1]- عطیە محمد سالم (تكملة أضواء البیان) ٨/٥٩٠.

[2]- عطیە محمد سالم (تكملة أضواء البیان) ٨/٥٩٠.

بەم ڕوونکردنەوانەدا بۆت دەرکەوت ئەوانەی بە نیازی گۆڕەکەی دەڕۆن بە هەموو حاڵەتێك بێ بەش نابن لە خێرو پاداشت، کەواتە ئایا ڕەوایە پێیان بگوترێ بیدعەچی یان گومڕا یان هاوبەش دانەر؟ .

پاك و بێگەردی بۆ خوا ئەمە بوهتانێکی گەورەیە (سبحانك هذا بهتانُ عظيم) ..

## پێشەوا مالك و زیارەتی پێغەمبەری خوا ﷺ

پێشەوا مالك دادەنرێ بەو کەسەی کە زیاد لەپێویست ڕێزی نیشان داوە بۆ حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ، بەشێوەیەك نە بەسواری و نە بە نەعلەوە بەناو شاری مەدینەدا نەگەڕاوە، لەبەر ڕێزێك بۆ ئەو گڵەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی موبارەکی پیادانـاوەو لەسەری ڕۆیشتووە، ئـەوەتا ئامۆژگاری ئەمیری بڕوادارانـی کـرد کـە (مەهـدی) بـوو لـە کاتێکـدا کـە هاتـە شـاری مەدینـەی پیرۆز و فەرمووی پـێی: تۆ ئێستا هاتویتـە شاری مەدینـەوە لا نادەیــت بەشــوێنێك دا مەگــەر لای ڕاســت و لای چــەپت هــەموو منــاڵ و ئەولادەکانی موهاجیر و ئەنصارەکانن سەلامیان لێبکە، چونکە نییە لەسەر زەوی باشتر بێ لەو قەوم و خەڵکەی کە لەمەدینەدان، وە باشتریش نییە لەشاری مەدینە، خەلیفە وتی: لە کوێ ئەم قسەت هێنا کە شاری مەدینە باشترین شار بێ، فەرمووی: ئەی نازانی باشترین گۆڕێك ئەمڕۆ لەسەر زەوی دا گۆڕی حەزرەتی محمدە ﷺ وە هەر کەسێك گۆڕی محمدی لەلابێ پێویستە گەورەیی و فەضڵی ئەو شوێنە بزانێ [1] .

وە هەر لەبەر نیشان دانی ڕێز بوو کە ئەیفەرموو: کەراهەتی هەیە کەسێك بڵێ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەری خوام کرد ﷺ، بەڵکو ئەیفەرموو: پێویستە

---

[1]- قاضي عياض: (ترتيب المدارك)

ئـەو کەسـەی کـە دێـت بڵێـت: زیـارەتی پێغەمبـەری خـوام کـرد ﷺ، بەڕاستەوخۆیی ئیتر ناوی گۆڕ نەبات، چونکە گۆڕەکان تاریك و وێرانـەن بـە بەڵگەی فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمووی (نوێـژ لـە ماڵـەکانتانا بکەن و مەیگێڕن بە گۆڕ).

وە حـافطي (ابـن حجـر) دەڵـێ: وشـەی گـۆڕی بـە کەراهـەت دانـاوە لەبـەر ئەدەب، ئەنیا کاری زیارەتی بەچاك داناوە بەڵکو لە باشترینی کارەکان و باشـترینی نزیـك بوونەوەکانـە کـە بیانگەیـەنێ بـەزاتی خـوای تـەعالا، وە دروستی زیارەت کردن یەکڕایی لەسەرە بێ جیاوازی [1].

وە پێشەوا ئەبوعمران دەڵێ: ئیمامی مالك بەلایەوە کەراهەتی هەبووە کە بوترێ: طەوافی زیارەت، یان زیارەتی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ لەبەر زۆری بەکارهێنانی بوو لەلایەن خەڵکەوە کە لەنێوان خۆیاندا وایان دەوت بۆیە بەلایـەوە کەراهـەتی هەیـە کـە سـەیری پێغەمبـەری خـوا ﷺ بکـرێ وەکـو خەڵکان لەناو خۆیاندا سەیری یەکتری دەکەن، وە بەلایەوە خۆشەویست بوو کە بڵێن: سەلاممان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

هەروەها زیارەت کردن شتێکی موباح و دروستە لەنێوان خەڵکیدا، وە کارێکی پێویست و واجبە خۆکۆکردنەوەو ڕۆیشتن بۆلای گـۆڕە پیرۆزەکـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، لێرەدا ئـەم کـارە بـە (واجب-پێویست) دادەنـێ کـە مەبەسـت پـێی (پێویستی سوننەت و هاندان و تەئکیدکردنە) نـەك واجب بوونی فەرزی...

بـەلای منـەوە وایـە کـە نەهێشتن و بـە کەراهـەت دانانی پێشـەوا مالـك بـۆ وشـەی (قـەبر) و گـۆڕ بـووە، خـۆ ئەگـەر بیانووتایـە (زیـارەتی پێغەمبـەری خوامـان کـرد) نەیدەفـەرموو کەراهـەتی هەیـە لەبـەر فەرمایشـتەکەی

---

[1]- ابن حجر (فتح الباري) ٣/٦٦.

خۆشەویستمان ﷺ کە فەرموویەتی: ((خوایە گیان گۆڕەکەم نەگێڕی بە شوێنێ بەندایەتی تیابکرێ ، خوای گەورە قەهر و تووڕەیی خۆی گرت لەو هۆزانەی کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کرد بە مزگەوت))[1] .

دەڵێم: ئەگەر مەبەست کەراهیەتی زیارەت بووایە ئەوا پێشەوا مالك دەیفەرموو: ((کەراهەتی هەیە پیاو زیارەتی گۆڕی پێغەمبەری خوا بکات)) بەلاّم بە ڕووکەش وتەکەی (کەراهەتی هەیە پیاو بڵێ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەری خوام کرد) مەبەست پێی تەنها لە وتن دایە نەك لە ئەصڵی کردارەکە..

## دروستی زیارەت کردنی پێغەمبەری خوا لەلای حەنبەلیەکان و غەیری ئەوانیش

لەسەر دروستی زیارەت کردنی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ و زۆر لە زانایانی ئیسلام و پێشەوایانی سەلەف و پێشین باسیان کردووە، وە بەتایبەت حەنبەلیەکان، کە مەبەست لەناوبردنی حەنبەلیەکان بۆ ئەوەیە تا ببێتە بەرپەرچ و ڕەدێك بۆ ئەوانەی کە خۆیان بەشوێن کەوتەی ئەو ڕێڕەوە دەزانن و ناڕاستی بە دەمیانەوە هەڵدەبەستن، لە کاتێکدا کە زانایانی حەنبەلییەکان دوورن لە وتە و هەڵبەستراوانە، ئەینا باسی دروستی زیارەت کردن لە سەرجەم کتێبە فیقهییە ئیسلامیەکاندا هاتووە و بە بەڵگەی تەواوەوە سەلماوە، گەر دەتەوێ سەیری کتێبی فیقهییەکانی حەنەفی بکە، یان مالکییەکان و شافعی و حەنبەلییەکان ، کە چۆن لە باسە فیقهییەکاندا و لەدوای باسی مەناسیکی حەج تۆماریان کردووە، تەنانەت پەرتوکە فیقهییەکانی ( زەیدی و ئەباضی و جەعفەریەکان )یش

---

[1]- القاضي عياض –الشفا– ٢/٧١-٧٢.

که سەرجەمیان هاتوون بەشێکی تەواویان تایبەت کردووە بە باسی زیارەت کردنــی حــەزرەتی پێغەمبــەر و مەرقــەدی پــیرۆزی، ئەمــەش لــەدوای تەواوبوونیان لە تۆمارکردنی مەناسیکی حەج..

## وتەی زانایانمان لەسەر دروستی زیارەت کردنی پێغەمبەری خۆشەویستمان و چوونە خزمەت مەرقەدی

### یەکەم : وتەی قاضي عیاض:

لێرەدا وتەی ئەم زانا بەرزە دەهێنینەوە کە زیارەت کردنی حەزرەت ﷺ لەلای زانایانی پێشین نیشان ئەدات و لەکاتی ڕاڤەکردنی بۆ فەرموودەکە کە ئیمامی مسلم ڕیوایەتی کردووە کە دەڵێ: لە ئیبنو عومەرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (دینی ئیسلام بەشێوەیەکی نامۆ و غەریب هاتە ناوتان، وە بەو شێوە نامۆیەش دەگەڕێتەوە سەرتان وە ئەو دینە لەنێوان دوو مزگەوتدا کۆدەبێتەوە.. هەروەك چۆن مار لە کونەکەیدا خۆی کۆدەکاتەوە).. لە گێڕانەوەکەی ئەبی هورەیرەدا دەڵێ: (بەرەو شاری مەدینە دەڕوات) (ليأزر الى المدينة)... فەرموودەکە..

قاضي عیاض دەڵێ: ((فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: (ليأزر الى المدينة) مانای وایە: کە بیروباوەڕ و ئیمان سەرەتاو کۆتاییەکەی بەم سیفەتەوەیە، چونکە لە سەرەتای ئیسلامدا دەبینین هەموو ئەوانەی ئیمانیان پاکردەوەو ئیسلامیان هەڵدەبژارد ئەهاتنە شاری مەدینە یان بە کۆچ کردویی یان بە نیشتەجێ بوون، ئەمەش یان لەبەر شەوق و ئارەزووی خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەر ﷺ بووە کە بە خزمەتی بگەن و زانستی و زانیاری فێریان بکەن و لەخواوە نزیك ببنەوە.. پاشان لەسەر دەقی خولەفاکانیش دا هەروا بوون و ئەهاتنە شاری مەدینەو ئەچوونە خزمەت

مەرقـــەدی موبـــارەکی، گـــەر بنـــوارین بـــۆ ســـیرەت و دادوەری یـــان بـــۆ شەوێنکەوتەیی هـاوەڵانی حـەزرەت ﷺ، پاشـان بۆ زانایـانی بـەرزی شـوێن کەوتوان ، کـه ڕۆشـنایی وەقـت و پێشـەوای سـوننەت تـا بڵاوبێتـەوە لـەناو موسوڵمانانـدا، کە هەرکەس بڕوای دامـەزراو بێ و سـنگی فـراوان بووبـێ بـە نوری ئیمان بۆ خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ دەڕوات، پاشـان لـە هـەموو سـاتێکی ئەم زەمانەش دا بەرەو زیارەتی مەرقەدی پیرۆزی سەفەر دەکـات و تەبـەروك وەردەگرێ لە بینینی ئەو شوێنە پیرۆزانەو بینینی ئاساری هاوەڵان، کە ئەم سەفەرە کەس نایکات مەگەر کەسێکی باوەڕداری موسوڵمان نەبێ))

ئەمە وتەی قاضي عیاضە و خواش زاناترە بە ڕاستیەکان.[1]

<u>دووەم</u> : پێشەوا ئەلنەوەوی:

پێشەوای ناودار شەرەفەدین ی ئەلنەوەوی خاوەنی (شرح صحیح مسلم) لـە پەرتوکـە ناودارەکـەی لەسـەر مەناسـیکی حـەج کـە بـەناوی –الأیضـاح– ەوەیە، بەشێکی باشی تایبەتمەند کردووە بە باسی زیـارەتی پێغەمبـەرەوە ﷺ کە تیایدا ئەڵێ: (هـەرکاتێ حاجیـەکان و عومرەکـاران لـە زیارەتـەکانی مەککە لێبونـەوە ڕوویـان دەکەنـە شـاری مەدینـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ زیـارەت کردنـی خـۆڵ و خاکەکـەی صـەلات و سـەلامی خـوا لەسـەر خـاوەنی شارەکە بێ، کە ئەمە یەکێکە لە هەرە کارە گرنگـەکان کـە نزیکبوونـەوەی بـۆ لای خوا تیایە و سەرکەوتوترین هەوڵ و کۆششە)[2] .

---

[1]– بنوارە بۆ (شرح مسلم) النووی ٢/١٧٧.

[2]– وە هەروەها بنوارە بۆ وتەکەی لە (شرح صحیح مسلم) لە ٩/١٠٦دا لە باسی (لا تشد الرحال)دا.

سێیەم : پێشەوا ئیبنو حەجەر ئەلهەیتەمی:

پێشەوا (ابن حجر الهيثمي) لە نوسینەکەی لەسەر (الأيضاح)ی پێشەوا ئەلنەوەوی دا، لەسەر وتەی (قد روى البزار والدار القطني بإسنادها عن ابن عمر –رضي الله عنهما قال: قال رسول الله ﷺ: (من زار قبري وجبت له شفاعتي).. دەڵێ:

هەروەها (ابن خزيمة) لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە، وە کۆمەڵێکی تر ئەو فەرمودەیەیان بەڕاست داناوە لەوانە (عبدالحق) و زانا (التقى السبُكي) کە ئەمانە هیچیان دژایەتی وتەکەی پێشەوا ئەلزەهەبی ناکەن کە فەرموویەتی (طرقهُ كلها لينة يقوي بعضها بعضاً) ڕێگاکانی هەموویان نەرمن و یەك یەکتری بەهێز دەکەن.

وە هەروەها پێشەوایان (الدار القطني والطبراني و ابن السبكي) هێناویانە و ڕاستیان کردۆتەوە بە وتەی (مَن جاءني زائراً لا تحمله حاجة الِاّ زيارتي كان حقاً عليّ أن اكونَ لَهُ شفيعاً يومَ القيامة) ، هەرکەس بێ بۆ زیارەتم وە هیچ فرمانێ نەیهێنابێ مەگەر زیارەتی من نەبێ ئەوە مافی ئەوەی هەیە لەسەرم کە لە ڕۆژی دوایدا تکای بۆ بکەم..

وە لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: (كان حقاً على اللهِ عزوجل أن أكون لَهُ شفيعاً يومَ القيامة) ئەوە مافی ئەوەی هەیە لەسەر خوا کە من بگێڕێ بە تکاکاری لە ڕۆژی دوایدا..

مەبەست لە فەرموودەکە کە دەڵێ (لا تحمله حاجة الِاّ زيارتي): دورکەوتنەوە لە هەموو ئەو مەبەست و نیەتانە کە پەیوەندیان بە زیارەتەوە نەبێ، وە هەموو ئەو شتانەش کە پەیوەندیان بە زیارەتەوە هەبێ وەکو نیەتی مانەوە و ئیعتیکاف لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ وە زۆر بەندایەتی تێدا خوێندنی، وە سەردان و زیارەت کردنی هاوەڵانی و غەیری ئەمانە کە

سوننەتە بۆ زیارەتەکەیان پێی هەڵسن، هیچ زیانێك لە نیەتی زیارەتەکەی نادات و لە تکاکردنەکە دووری ناخاتەوە، کە هاوەڵانمان فەرموویانە: (يُسَنُّ أن ينوي معَ التقرب بالزيارة التقرب بِشد الرحل للمسجد النبوي والصلاة فيه) هەروەها لە پێشتر ئاماژەمان پێ کردووە.

پاشان ئەم فەرموودەیە هەردوو مانای زیارەتی تیایە بۆ حەزرەت ﷺ چ لەکاتی ژیانیدا و چ لەکاتی وەفاتیدا، وە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ دەگرێتەوە، چ لە دوور و چ لە نزیك بێ دەیگرێتەوە، کە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر گەورەیی خۆکۆکردنەوەو سەفەرکردن واتە (شد الرحال)، وە سونەتی سەفەرکردن بۆ زیارەت، نیازو مەبەستەکان جۆری بڕیار و حوکمی ئامرازو هۆکارەکان دیاری دەکەن.

پێشەاو ئەبوداود بەڕێگەیەکی ڕاست هێناویەتی کە فەرموویەتی:
(ما مَن احدٍ يُسَلِمُ عليّ الاّ رَدّ اللهُ على روحي حتى أرُد عليه السلام) هیچ کەسێ نییە کە سەلامم لەسەر بخوێنێ مەگەر خوا ڕۆحەکەم دەگەڕێنێتەوە بۆلام تا وەڵامی سەلامەکەی ئەدەمەوە.

ورد ببەرەوە لەم فەزڵ و گەورەییەیە، کە ڕۆحەکەی دەگەڕێنرێتەوە تا وەڵامی سەلامەکە ئەداتەوە، کە نیشانەیە لەسەر زیندوییەتی ئەم خۆشەویستەمان لە مەرقەدەکەیدا هەروەك سەرجەم پێغەمبەرانی پێشوو، کە بە بەرزکردنەوەی فەرموودەیەك دەفەرموێ: ( الأنبياء أحياء في قبورهم يُصلون ) ، پێغەمبەران زیندون لەناو گۆڕەکانیاندا نوێژ دەکەن، وە مانای گەڕانەوەی ڕۆحەکەی : گێڕانەوەی توانای قسەکردنە لەو کاتەدا بۆ وەڵام دانەوە) وتەکە لێرەدا کۆتایی هات[1] .

---

[1]- الأيضاح: لا٤٨٨

چوارەم : پێشەوە ئیبنو حەجەری عەسقەلانی:

(ابن حجر) لەسەر (البخاری) ڕاڤەیەکی کردووەو تیایدا ئەڵێ:

(فەرمودەی: لا تشد الرحال الاّ الی ثلاثة مساجد):

وتەی مەگەر بۆ سێ مزگەوت نەبێ، لە زمانی عەرەبیدا (المستثنی منه) لابراوە واتە (محذوف)ە، یان ئەوەتا ئەو لابراوە گشتی دەبێ ئەو کاتە دەڵێیت: (لا تشد الرحال الی مكان في أي أمر كان الا الی الثلاثة) واتە بارکۆکردنەوە و سەفەرکردن نییە بۆ هیچ شوێنێ بۆ هیچ فرمانێ مەگەر بۆ ئەو سێ شوێنە نەبێ، کە ئەمە گشتییە، یان بەتایبەت مانا دەکرێ، کە یەکەمیان ناتوانرێ بوترێ ڕاستە، چونکە بەهۆیەوە دەرگای سەفەرەکان دادەخرێ چ بۆ بازرگانی بێ یان صیلەی ڕەحم و داواکردنی زانست و عیلم و غەیری ئەمانە بێ.. بۆیە دووەمەکە دیاری دەکرێ، کە دەبێ تایبەتی بکرێ و لەمەشدا پێویستە شتێ (تەقدیر) بکەیت کە بگونجێ لەگەڵ موناسەبە و سەفەرەکەدا، ئەوەش ئەوەیە کە بڵێی (لا تشد الرحال الی مسجد للصلاة فیه الاّ الی ثلاثة) واتە بارکۆکردنەوە و سەفەرکردن نییە بۆ هیچ مزگەوتێ کە نوێژی تیا بکرێ مەگەر ئەم سێ مزگەوتە نەبێ، کە بەمەش وتەو بۆچوونی ئەو کەسانە بەتاڵ دەبێتەوە کە ڕێگرن لە خۆئامادەکردن و سەفەرکردن بە نیەتی زیارەت کردنی مەرقەدی پیرۆزی خۆشەویستمان ﷺ وە گۆڕی غەیری ئەو لە صالحین و پیاوچاکان، وە خواش دەزانێ.

وە بزانە کە (السبكي الكبير) دەڵێ: (لەسەر زۆرێکیان ئیلتیباس و تێکەڵیەکی زانستی ڕووی داوە، کەوا گومان دەبەن خۆ ئامادەکردن و بارکۆکردنەوە بۆ زیارەت لە غەیری ئەو سێ شوێنە لە قەدەغە کراوەکان

بێ، كه ئەمەش هەڵەیە، چونكە دەبێ ( استثناء ) له ڕەگەزی (مستثنى منه) بێ لێرەدا مانای فەرموودەكە وا دەبێ بڵێی:

خۆئامادەكردن و باركۆكردنەوە و ڕۆیشتن و سەفەر نابێ بۆ هیچ مزگەوتێ له مزگەوتەكان یان شوێنێك له شوێنەكان لەبەر خاتری پیرۆزی شوێنەكە مەگەر بۆ ئەو سێ شوێن و مزگەوتەی كه باس كراوە له فەرموودەكەدا، وە خۆكۆكردنەوە و ڕۆیشتن و بۆ زیارەت یان بۆ داواكردنی زانست و زانیاری بۆ شوێنەكە و به نیەتی شوێنەكە نییە بەڵكو بۆ لای ئەو كەسەیە كه لەو شوێنەدا هەیە... والله اعلم)[1] .

## پێنجەم : پێشەوا –الكرماني–

پێشەوا –الكرماني– كه ڕاڤەكاری (البخاري)یە له سەر وتەی (الاّ الى ثلاثة مساجد)دا دەڵێ:

(ئەم لێدەكردن و ئیستثنایە لەجۆری ( مُفَرَغْ ) ە، گەر بڵێیت: وتەو مەبەستەكە بەم شێوەی لێدێ كه بوترێ (باركۆكردنەوە و سەفەر و ڕۆیشتن نییە بۆ هیچ شوێنێ یان مۆڵگەیەك ، ئەو كاتە پێویست دەگێڕێ كه بوترێ (لا يجوز السفر الى مكان) مەگەر ئەو شوێنە نەبێ كه (مستثنى)ی كردووە و لێی دەكردووە كه سێ مزگەوتەكەن، هەتا وای لێ دێ كه بڵێی: سەفەر كردن به نیەتی زیارەت بۆ خزمەتی پێغەمبەر ئیبراهیم و پێغەمبەرانی تر – سەلامی خوایان لەسەر بێ– دروست نییە، چونكە ئەو شتەی كه دەردەكرێ واتە (المستثنى منه) له جۆری –مفرغ– دا ئەبێ به شتێكی گشتی وعام تەقدیر بكرێ..

دەڵێم: مەبەست كه (عام) و (اعم العام) ئەوەیە كه بگونجێ لەگەڵ دەركراوەكەدا له جۆر و وەسف دا، هەروەكو ئەوەی كه بڵێی (نەمدی

---

[1]- بنواره بۆ (فتح الباري) ابن حجر ٦٦/٣

مەگەر زەید نەبێ) کە لە تەقدیریدا وەك ئەوە وایە وتبێتت: هیچ پیاوێ یان هیچ کەسێکم نەدیوە مەگەر زەید نەبێ نەك تەقدیر وابێ بڵێی: هیچ شتێ یان هیچ ئاژەڵێکم نەدیوە مەگەر زەید نەبێ.... ئە لێرەدا تەقدیری فەرموودەکە دەبێ وابێ کە بڵێی (خۆئامادەکردن و بارکۆکردن و سەفەرکردن نیەیە بۆ مزگەوتەکان مەگەر ئەو سێ مزگەوتە نەبێ)، کە لەم سەردەمەی ئێستەماندا لەسەر ئەم باسەیە چەندەها چاوپێکەوتن و لێکۆڵینەوە کراوە بەتایبەتی لە وڵاتی شامیەکاندا، وە چەندەها نامە و نوسراو لە هەردوو لایەنەکەوە بڵاوکراوەتەوە کە لێرەدا ئێمە نامانەوێ بیانهێنین ) وتەکە کۆتایی هات [1] .

شەشەم : شێخ بدر الدین العینی:

ئەم زانایە لەسەر شەرح و ڕاڤەکەی کەلەسەر بوخاری نوسیویەتی دەڵێ: (رافعی گێڕاویەتەوە کە دادوەر (ابن کج)ەوە کە دەڵێ: ئەگەر کەسێ نەزری کرد لەسەر خۆی کە زیارەتی مەرقەد و گۆڕی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بکات، ئەوە لەلای من وایە کە پێویست ئەگێڕێ لەسەری وەفا بەو نەزرەی بکات، وە ئەمە تەنها یەك ڕووی تیایە کە ئەویش زیارەت کردنە، بەڵام گەر ئەو کەسە بڵێ و نەزری بکات لەسەر خۆی کە زیارەت و سەردانی گۆڕی کەسێکی تر بکات جگە لە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەوە لەلای من دووڕووی هەیە. وە ئەبو موحەمەدی ئەلجوەینی و قاضي عیاض لە شافعیەکان فەرموویانە: کە حەرامە و کارێکی نادروستە پێ هەڵهێنانەوەو سەفەرکردن بەنیەتی زیارەت کردن بۆ غەیری ئەو سێ مزگەوتە لەبەر ئەو نەهیە کە تیایدا هاتووە.

---

[1]- شرح البخاري (الكرماني) ١٢/٧.

وە شێخی ئەلنەوەوی دەفەرموێ: (ئەوە بۆچوونێکی هەڵەیە، وە وتەی ڕاست لای هاوەڵانی ئێمە ئەوەیە کە پێشەوا ئەلحەرەمەین و لێکۆڵەرەوان هەڵیان بژاردووە، کە نە لە حەرام کراوەکانە و نە کەراهەتیشی هەیە)..

وە –ئەلخەطابی– دەڵێ: (لا تشد) بە وتە هەواڵ دانە، وە مانای دروست بوونی نوێژە بۆ ئەو کەسەی کە نەزری کردبێ کە نوێژێك بکات لە پارچە زەویەکی پیرۆزکراودا، واتە: دروست نیيە وەفا بەو شتەوە بکات هەتا بە نیەتی زیارەت خۆی ئامادە نەکات، ئەگەر یەکێ نەزری کرد لەسەر خۆی کە نوێژ بکات لە شوێنێ جگە لەو سێ مزگەوتە، ئەوە ئارەزوو لە دەست خۆیدایەتی، یان لەو شوێنەدا نوێژەکە بکات، یان سەفەر نەکات و لە شوێنی خۆی نوێژەکە بکات.

وە گەورەی ئێمە شێخ زەینەددین دەڵێ:

سەرەتاو بنەمای ئەو نەهی کردنە لە فەرموودەکەدا ئەوەیە کە نابێ خۆئامادەکردن و سەفەرکردن بۆ مزگەوتەکان بکرێ مەگەر بۆ ئەو سێ مزگەوتە نەبێ، بەڵام گەر بە نیەتی داواکردنی زانست و زانیاری و دەست کەوتنی قازانجی دونیایی و بازرگانی و زیارەتی پیاوچاکان و بینینی نهێنیيەکان و شاراوەکان و زیارەت کردنی براو دۆستان و لە غەیری ئەو سێ مزگەوتەدا کە باسی کراوە، دروستە و ناچێتە ناو ئەو نەهیيەوە کە کراوە، کە لەم بارەوە لە هەندێ لە ڕێگاکانەوە فەرموودەیەك هاتووە کە لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەددایە کە دەڵێ:

بۆی گێڕاینەوە هاشم، لە عەبدولحەمیدەوە، بۆی گێڕاینەوە شەهر کە دەڵێ: بیستم لە ئەبا سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(لا ينبغي للمطي أن يشد رحاله الى مسجد يبتغي فيه الصلاة غير المسجد الحرام والمسجد الأقصى ومسجدي هذا) ، واتە: دروست نىيە بۆ ئەو كەسەى كە پێيەكانى هەڵدێنێتەوەو سەفەر دەكات كە خۆى و بارفتەى كۆبكاتەوە بۆ مزگەوت كە نوێژى تيا بكات جگە لە مزگەوتى حەرام و مزگەوتى ئەقصا و مزگەوتى من نەبێ.

كە فەرموودەكە ئيسنادەكەى پلەى –حسن–ى هەيە و شەهرى كوڕى حەوشەب، كە زانايانمان بە جێگەى متمانەيان داناوە)[1] .

حەوتەم : شێخ ئەبو موحەممەد (ئيبن قودامە) .

پێشەواى حەنابيلەكان، خاوەنى كتێبى (المغنى):

پێشەوا ئەبو محمد –موفق الدين– عەبدوڵڵاى كوڕى قدامە دەڵێ:

لە چاكە و سوننەتەكانە زيارەت كردنى مەرقەدى پيرۆزى پێغەمبەرى خوا ﷺ وەك (الدار القطني) ڕيوايەتى كردووە بە سەنەدێكى باش لە ئيبنو عومەرەوە كە حەزرەت ﷺ فەرموويەتى: (مَنْ حجَ فزار قبري بعدَ وفاتي فكأنما زارني في حياتي) ، هەركەس حەج بكات و زيارەت و سەردانى گۆڕەكەم بكات لەدواى مردنم وەك ئەوە وايە سەردانى كردبم لەكاتى ژيانمدا..

وە لە گێڕانەوەيەكى تردا هاتووە (مَنْ زار قبري وجبت لَهُ شفاعتي) واتە هەركەس سەردانى گۆڕەكەم بكات، شەفاعەتم بۆى پێويست ئەگێڕێ.

بۆ وتەى يەكەم ڕيوايەتى كردووە سەعد دەڵێ: بۆى گێڕاينەوە حەفضى كوڕى سولەيمان لە لەيثەوە، لە مجاهدەوە لە ئيبنو عومەرەوە.

ئيمامى ئەحمەد دەڵێ: لە ڕيوايەت و گێڕانەوەى عەبدوڵلا لە يەزيدى كوڕى قەسيطە وە، لە ئەبى هورەيرەوە كە حەزرەت ﷺ فەرموويەتى: (ما

---

[1]- بنوارە بۆ (عمدة القاري) العيني ٧/٢٥٤.

مِن احَدٍ يُسَلِّم عليَّ عِندَ قبري الاّ رَدَّ اللهُ عليَّ رُوحي حتى ارُدَ عليهِ السلام)..
واته هيچ كەسێ نىيە كە لەلاى گۆڕەكەمدا سەلامم لێ بكات مەگەر خواى پەروەردگار ڕۆحەكەم بۆ دەگەڕێنێتەوە هەتا وەڵامى سەلامەكەى ئەدەمەوە.
گەر يەكێ حەجى كرد وە يەكەمجارى بوو، واتە لە غەيرى ڕێگەى شامەوە هاتبوو، ڕێگەى شارى مەدينە ناگرێتەبەر، پێويستە لەسەرى بچێتە ناو شارى مەككەوە لە نزيكترين ڕێگەوە، وە بە ئيشى لابەلاوە كاتەكانى نابات سەر... وە گێڕاوەتەوە لە (عوتبى)يەوە دەڵێ: دانيشتبووم لەلاى گۆڕى پێغەمبەرى خوادا ﷺ پياوێكى دەشتەكى هات وتى: (سەلامى خوات لەسەر ئەى پێغەمبەرى خوا، بيستومە كە خوا فەرموويەتى: هەركاتێ ئەوانە زوڵميان لە نەفسى خۆيان كردو هاتنە خزمەتت داواى لێخۆشبوونيان لەخوا كرد و پێغەمبەرى خواش لێيان خۆش بوو، ئەوە دەبينن كە خواى گەورە بەخشندەو لێخۆش بووە ﴿إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾النساء: ٦٤.

وە منيش هاتومەتە خزمەتت داواكارم لە گوناهەكانم بە شەفاعەت و تكاى تۆوە خوا لێم خۆش ببێ، پاشان ئەم شيعرانەى خوێندەوە:

يا خيرَ مَنْ دُفِنَت بالقاعِ أعظمُهُ

فطابَ مِنْ طِيبهِنَّ القاعُ والأَكَمُ

نفسي الفِداء لِقَبرٍ أنتَ ساكِنُهُ

فيهِ العَفافُ وَفيهِ الجُودُ والكرمَ

پاشان كابرا ڕۆيشت و منيش چاوەكانم قورساييان تێكەوت و خەوم لێكەوت، گەيشتم بە خزمەت حەزرەت ﷺ لە خەوەكەمدا و فەرمووى: (ئەى

عوتبی، بگەرە ئەو دەشتەکی‌یە مژدەی بدەرێ کە خوای پەروەردگار لە گوناهەکانی خۆش بوو) [1] ...

**هەشتەم : شێخ ئەبولفەرەج ئیبنو قودامە پێشەوای حەنابلەکان خاوەنی کتێبی –الشرح الکبیر–:**

**لە کتێبی –الشرح الکبیر– ئیبنو قودامە دەفەرموێ:[2]**

(هەرکات حاجی لە جێبەجێ کردنی مەناسیکی حەج لێبوویەوە هەڵدەستێ بە زیارەت کردنی مەرقەدی پێغەمبەری خوا ﷺ وە زیارەت کردنی هەردوو هاوەڵەکەی (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) کە دادەنرێ بە کارێکی چاك و موستەحەب) ، پاشان شێخ (ابن قدامە) باس لە وتەیە دەکات کە دروستە بوترێ لەکاتی سەلام کردنی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە تیایدا دەڵێ: ((خوایە تۆ خۆت فەرمووتە، وە وتەی تۆ هەق و ڕاستە کە فەرمووتە: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّاباً رَّحِيماً﴾ النساء: ٦٤. وە وا من هاتوومەتە خزمەتت تا لە گوناهەکانم خۆش ببی، پێغەمبەرەکەت دەکەمە تکاکار بۆ لای خزمەتت، خوایە ئەم پێغەمبەرە بگێڕە بە یەکەم کەس لە شەفاعەتدا بۆمان ئەی خاوەنی ڕەحم و میهرەبانی بۆ هەموو جیهانیان))..

پاشان دەفەرموێ: ((دەست دانی لە خۆڵی سەر مەرقەدی موبارەکی و ماچ کردنی لە کارە موستەحەبەکان نی‌یە، کە ئیمامی ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) فەرموویەتی: نەمبیستووە کاری وا لە هاوەڵانەوە.

وە –الأثرم– دەڵێ: زانایانی شاری مەدینەم ئەبینیکە دەهاتن و لەلایەکەوە ڕادەوەستان و سەلامیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد و

---

١ بنوارە بۆ ( المغني ) شیخی ( ابن قدامة ) ٣ \ ٥٥٦ .

٢- بنوارە بۆ (الشرح الکبیر) ابن قدامة (٣/٤٩٥)

دەستیان نەدەبرد بۆ گۆڕەکە. وە ئەبو عبدالله دەڵێ: ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێ) بە هەمان شێوە سەلامی دەکرد ئەڵێ: سەبارەت بە مینبەری خۆشەویست ﷺ ڕیوایەت کراوە لە ئیبراهیمی کوڕی عبدالله ی کوڕی عەبدولقاریئەوە کە دەڵێ بینیم ئیبنو عومەر دەستی خستە سەر شوێن دانیشتنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەرەکەو پاشان دەستی ئەهێنایەوە بە دەم و چاویا).

<u>نۆهەم</u> : شێخ مەنصور کوڕی یونس ئەلبەهوتی حەنبەلی:

شێخ مەنصور ئەلبەهوتی لە کتێبی –کشاف القناع عن متن الأقناع– دا هێناویەتی و دەڵێ:[1]

فصل: هەرکات لە جێبەجێ کردنی حەجەکەی بوویەوە دەست دەکات بە زیارەت کردنی گۆڕ و مەرقەدی پێغەمبەری خوا ﷺ و گۆڕی هەردوو هاوەڵی (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) ئەمەش لە جێبەجێ کردنی ئەو فەرمودەیەیە کە –الدار القطني– ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە– کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (مَنْ حَجَّ فزارَ قبري بَعْدَ وَفاتي فكأنما زارني في حياتي) ، هەرکەس حەج بکات و پاشان زیارەتی و سەردانی گۆڕەکەم بکات لەدوای مردنم وەك ئەوە وایە زیارەت و سەردانی کردبم لەکاتی ژیانم دا.

وە لە گێڕانەوەیەکی تردا: (مَنْ زارَ قبري وجبت لَهُ شفاعتي) هەرکەس زیارەت و سەردانی گۆڕەکەم بکات شەفاعەتی من بۆ ئەو بە پێویست دەگێڕێ..

پاشان شێخ ی بەهوتی دەڵێ:

ئاگادارکردنەوەیەك: ئیبنو نەصروڵلا دەڵێ:

---

[1]- بنوارە بۆ –کشاف القناع– البهوتي ۲/۵۹۸.

بۆ زیارەت کردنی مەرقەد و گۆڕی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ پێویست ئەگێڕێ کە خۆئامادەکردن و بارپێچانەوە و (شد الرحال)ی تیا بێ، چونکە زیارەت کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ حاجی لەدوای حەجەکەی نایەتە جێ بەبێ ئەم حاڵەتە، کە ئەمەش وتەیەکی ڕاستەوخۆو ئاماژە پێکردنێکی تەواوە لەسەر (شد الرحال لزیارتە ﷺ) ..

وتەی –البهوتی– تەواو بوو.

## دەهەم : شێخی ئیسلام– تەقیەددینی ئەلفەتوحی حەنبەلی

شێخ تەقییەدینی موحەممەد ئەلفەتوحی دەڵێ:[1]

(سوننەتە زیارەت کردنی گۆڕی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ و گۆڕی هەردوو هاوەڵی (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) کە ڕوویان بوەستیت و سەلامیان لێ بکەیت، پاشان ڕوو بکەیتەوە قیبلە بە شێوەیەك کە حوجرەی پیرۆز بخەیتە لای شانی چەپت و بپاڕێیتەوە لە خوا، وە حەرامە سوڕانەوە بە دەوری دا و کەراهەتی هەیە هەریەك لەدەس دان لە گۆڕەکەی و دەنگ بەرزکردنەوە لە خزمەتیدا)

وتەی –ئەلفەتوحی– کۆتایی هات.

## یانزەهەم : شێخ مەرعی کوڕی یوسف ی حەنبەلی:

شێخ مەرعی کوڕی یوسف لە کتێبەکەی خۆی دا بەناوی (دلیل الطالب) دەڵێ[2]: سونەتە زیارەت کردنی مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ و گۆڕی هەردوو هاوەڵانی (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) وە سوننەتە نوێژ خوێندن لە مزگەوتەکەیدا –صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ– کە خێرەکەی هەزار

---

[1]– بنوارە بۆ –منتهى الأرادات– الفتوحي، ٢/١٧١.

[2]– بنوارە بۆ –دليل الطالب– مرعي الحنبلي– ل٨٨.

نوێژه وه نوێژێك له مزگەوتی كەعبەدا خێرەكەی سەد هەزار نوێژەو له مزگەوتی ئەقصاشدا پێنج سەد نوێژە).

وتەكەی مەرعی تەواو بوو...

**دوانزەهەم : پێشەوا شێخی ئیسلام مەجدەدین موحەممەدی كوڕی یەعقوب ئەلفەیروز ئابادی خاوەنی –القاموس–**

ئەم پێشەوایە لە كتێبی –الصلات والبشر– دەڵێ[1]:

(بزانە كە صەڵەوات خوێندن لەسەر گۆڕەكەی –صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ– زۆر جێگیرە، كە سوننەتە هەموو تواناكان بخەیتە گەڕ بۆ بەدەست كەوتنی ئەو شەرەفە گەورە و ئەو پلەبەرزەیە، كە –الرافعی– دەگێڕێتەوە لە قازی (ئیبنو كەج)ەوە كە (قاضي یوسف ی كوڕی ئەحمەدی كوڕی كەج)ە دەڵێ:

ئەگەر نەزری كرد لەسەر خۆی كە زیارەت و سەردانی مەرقەدی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بكات، ئەوە لەلای من پێویست دەگێڕێ لەسەری كە وەفا بكات و نەزرەكەی بەجێ بهێنێ و هیچ بۆچوونێكی تر هەڵناگرێ. بەڵام گەر نەزری كرد سەردانی گۆڕی كەسێكی تر بكات ئەوە دوو بۆچوونی تیادەبێ كە دەشزانین نەزر پێویست ناگێڕێ مەگەر لە بەندایەتیەكاندا نەبێ..

لەو زانا بەڕێزانەی كە زیارەتیان بە كارێكی موستەحەب و چاك داناوە شێخی –الرافعی–یە لە كۆتایی باسی حەج دا، وە شێخی ئەلغەزالی لە كتێبی –الأحیاء–دا، وە شێخی –ئەلبەغەوی– لە كتێبی –التهذیب–، وە شێخ عزالدین كوڕی عبدالسلام لە مەناسكەكەیدا، وە ئەبو عەمری كوڕی ئەلصەلاح و ئەبو زەكەریای ئەلنەوەوی (ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێ).

---

[1]– بنوارە بۆ –الصلات والبشر– الفیروز آبادي ص١٢٢–١٢٣.

وه له حەنبەلیەکان: شێخ موفق الدین و پێشەوا ئەبولفەرەجی بەغدادی و غەیری ئەوانەش.

وه له حەنەفیەکان: خاوەنی –المختار– له شەرحی موختاردا کە بەشێکی تەواوی داناوه و له کارە مەندوب و موستەحەبەکان هەژماری کردووه .

وه مالکیەکان: قاضی ئەلعیاض ئەگێڕێتەوه کە سەرجەم زانایانی مالکیەکان یەك ڕان لەسەر دروستی زیارەت کردنی مەرقەدی پیرۆزی (صەلات و سەلامی خوای لەسەر) وه له کتێبی –تهذیب المطالب–ی (عبدالحق الصقلي)یە له شێخ ئەبی عمران ئەلمالکی‌یەوه هێناویەتی کە زیارەت کردنی گۆڕ و مەرقەدی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ واجب و پێویستە، عبدالحق دەڵێ: واجبە واتە له سوننەتە پێویست و واجبەکانە..

وه له (شرح الرساله)ی العبدی ئەلمالکی هاتووه کە دەڵێ:

ڕۆیشتن بۆ شاری مەدینه بۆ زیارەت کردنی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ باشترو گەورەترە له ڕۆیشتن بۆ کەعبە و بەیتی مەقدس، وه هاوەڵانی مەزهەب هەموویان یەکڕان لەسەر دروستی سەفەر کردن بۆ زیارەتی، چونکە بە کارێکی موستەحەب و چاکیان داناوه کە حاجی لەدوای تەواو بوونی حەجەکەی زیارەت بکات کە یەکێ له بەڵگەکانیان ئایەی ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُواْ أَنفُسَهُمْ جَآؤُوكَ فَاسْتَغْفَرُواْ اللّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُواْ اللّهَ تَوَّاباً رَّحِيماً﴾ النساء: ٦٤.. وه هیچ گومانێك نی‌یە لەوەدا کە پێغەمبەر ﷺ زیندووەو کردەوەی ئومەتەکەی دەخرێتە بەردەستی) . وتەکەی ئابادی تەواو بوو.

پاشان کۆمەڵێ فەرموودە لەسەر گەورەیی زیارەت دەهێنێتەوه.

**سیانزەهەم : پێشەوا محمد کوڕی غلان ئەلصدیقی شافعی کە شەرحی -الأذکار-ی کردووە**

ئەم پێشەوایە لەسەر وتەی -ئەلنەوەوی- دەڵێ[1]:

زیارەت کردنی حەزرەت ﷺ لە باشترینی کردەوەکانە بۆ نزیك بوونەوە لە خوای پەروەردگار، بۆچی نا؟ وادەو بەڵێن دراوە بەو کەسەی کە سەردانی پێغەمبەر ﷺ دەکات کە شەفاعەتی ئەو زاتەی بەنسیب ببێ، کە ئەو وادەیە بۆ ئەهلی ئیمان و بڕوا بە پێویست دەگێڕێ، کە ڕیوایەت کراوە لە باوکی شێخەوە:

(هەرکەس صەڵەوات بخوێنێ لەسەرم لەلای گۆڕەکەمدا ئەیبیستم و گوێم لێی دەبێ، وە هەرکەس صەڵەوات بخوێنێ لە دوورەوە ئاگادار ئەکرێمەوە) وە -الحافظ- دەڵێ: سەیری سەنەدەکەی دەکرێ، وە ئەبو داود و غەیری ئەو هێناویانە لە ئەبی هورەیرەوە کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: ( هیچ کەسێ نیە کە سەلامم بخوێنێ مەگەر خوا ڕۆحەکەم بۆ دەگێڕێنێتەوە هەتا وەڵامی سەلامەکەی ئەدەمەوە)

-الحافظ- دەڵێ: فەرمودەکە پلەی -الحسن-ی هەیە و ئەحمەد و بەیهەقی و غیەری ئەوانیش هێناویانە.

وە شێخی -السبکی- لە -شفاء السقام- دا هێناویەتی و دەڵێ: (کۆمەڵێکی زۆر لە پێشەوایانی ئێمە بەم فەرموودە: پشتگیری تەواوی زیارەت کردنی مەرقەدی پیرۆزیان بە پێویست داناوە، کە ئەمەش ڕاستە و گومانی لەسەر نیە، چونکە ئەو کەسەی کە زیارەت دەکات سەلام دەکات و لە نزیکیشەوە وەڵامی سەلامەکەی ئەدرێتەوە)...

---

[1]- بنوارە بۆ الفتوحات الربانیة علی الأذکار النوویة- ابن غلاّن ٣١/٥.

## زیارەت کردنی حەزرەت ﷺ بە شێوەی پێشینەییەکان

مەبەست لە زیارەت کردنی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ ئەو شێوە زیارەت کردنەیە کە شەرعی یەو لە سوننەتی پێغەمبەرایەتی و ئاداب و شێوەکانی دا ڕوون کراوەتەوە، کە پێویستە لەسەر زیارەتکار ئاگای لێیان بێت و جێبەجێیان بکات..

شێخ –ابن تیمیە– لە وتەیەکیدا ئەو جیاوازییە باس دەکات کە لەنێوان زیارەت کردن لەلای موسوڵمان و ئەهلی یەکتاپەرستەکان هەیە و لەنێوان ئەوانەدا کە لە زیارەتەکەیاندا هاوەڵ و شەریك بۆ خوا تیایدا بڕیار دەدەن، کە بەڕوونی دەڵێ[1]:

{ئەوانەی کە ئەهلی یەکتاپەرستین کاتێ زیارەتی گۆڕستانی موسوڵمانان دەکەن هەڵدەستن بە سەلام کردن لە مردوان و پاشان پاڕانەوەیان لە خزمەت خوادا بۆ دەخوێنن، کە ئەمە وەك نوێژ خوێندن وایە لەسەر جەنازەکە، وە زیارەتی ئەوانەی کە هاوەڵ بڕیاردەدەن بە شێوەیەکە کە دروست کراوان ئەشوبهێنن بە خالقیان، نەزریان بۆ دەکەن و کڕنوشیان بۆ دەبەن و بەندایەتیان بۆ دەکەن و خۆشیان دەوێن هەروەك چۆن خوایان خۆش دەوێ بە شێوەیەك دەیکەنە خوا یان هاوەڵ بۆ خوا، کە خوای گەورە نەهی کردووە لە فریشتەکان و پێغەمبەران هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن وەك دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ اللّهُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَاداً لِّي مِن دُونِ اللّهِ وَلَـكِن كُونُواْ رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ . وَلاَ يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُواْ الْمَلاَئِكَةَ وَالنِّبِيِّيْنَ أَرْبَاباً أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ آل عمران: ٧٩–٨٠

---

[1]– بنوارە بۆ (الجواب الباهر في زوار المقابر) ابن تیمیة لا٢١.

وه یان خوا دەفەرموێ: ﴿قُلِ ادْعُواْ الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ فَلاَ يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلاَ تَحْوِيلاً . أُولَـئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُوراً﴾ الأسراء: ٥٦/٥٧.

کۆمەڵێ لە زانایانی سەلەف و پێشین دەڵێن: کۆمەڵێك هەبوون داوای خوایەتیان بۆ پێغەمبەران دەکرد وەك عیسی و عوزەیر.

وتەکەی ابن تیمیە کۆتایی هات.

منیش دەڵێم[١]: ئایا زیارەتی ئێمەی موسوڵمان بۆ لای پێغەمبەرەکەمان لەسەر ئەو ڕێگە ڕاستەیە نیيە کە پێشینەکانمان لەسەری ڕێکەوتون؟!

خوای پەروەردگار و فریشتەکانی و ئەو کۆمەڵەش کە عەرشی خواییان بەرزکردۆتەوە شاهیدن کە ئێمە کاتی زیارەتمان بۆ گەورە و خۆشەویستمان پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ بڕوایەکمان نیيە مەگەر ئەوە نەبێ کە ئەویش مرۆڤە و خوای پەروەردگار نیگاو وەحی بۆلا ناردووە و لەنێوان بەندەکانی خۆیدا بەرزی کردۆتەوە و ئەویش داوای ڕەحمەتی خوا دەکات و لە سزای خوا ترساوە و بەکردەوەی چاکە لە خوا نزیك دەبێتەوە، بەڵکو ئەو پێغەمبەرە لە هەموو کەس زیاتر بەپەرۆشتر و بەشەوقترە لەسەر ئەو کارو بەندایەتیانە، ئەو لە هەمووان ترس و تەقوای لە خودا -جل جلالە- زیاترە، زاناترین کەسە بە خودا و لە هەمووان باشتر دەیناسێ، نایشوبهێنین بە خودای بەدیهێنەرو نەزری بۆ ناکەین، سوژدە و کڕنوشی بۆ نابەین، بەندایەتی بۆ ناکەین و بە هاوبەشی خودای (جل جلالهُ) نازانین، یەکسانی ناکەین بە پەروەردگاری جیهانیان، بەڵکو خۆشترمان دەوێ لە

---

[١]- واتە شێخی مالکی (ڕەزای خوای لەسەر بێ)

گیـان و مـاڵ و سـامان و منداڵـەکانمان، وەك فەرمانیشـمان پـێ کـراوە بـەو شێوەیە خۆشمان بوێ.

## شێخ ئیبنولقەیم و زیارەتی پێغەمبەر ﷺ

شـێخ ئیبنولقـەیم لـەو هۆنراوەیـەدا کـە ناسـراوە بـە (النونیـە) بـاس لـە چـۆنیەتی زیـارەت دەکـات و ئادابـە داواکراوەکـان ئـەهێنێ و لـە چـۆنیەتی ڕاوەسـتان لـە خزمـەت مەرقـەدی پیرۆزیـداو هەسـتی زیارەتکـار لـە بەرانبـەر زاتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕوونی دەهێنێتەوە کە دەفەرموێ:

| | |
|---|---|
| فاذا أتينا المسجدَ النبوي صلينا | التَّحيــةَ أوَّلاً ثِـنْــتــانِ |
| بِتَمامِ اركانٍ لَها وَ خُشُوعِها | وَحُضُور قلبٍ فِعلُ ذي الأِحسانِ |
| ثُمَ انْثَنَيْنا لِلزيارَةِ نَقْصُدُ الْـ | قَبْرَ الشريفَ وَلَوْ عَلى الأجفانِ |
| فَنَقُومُ دوُنَ القبرِ وَقْفَةَ خاضعٍ | مُتَذَلِـلٍ في السِّـرِ وَ الأعــلانِ |
| فَكأنَهُ في القَبْرِ حَيٌّ ناطِقٌ | فَالواقِفـونَ نَواكِسُ الأذقــانِ |
| مَلَكَتْهُمُ تلكَ المَهابَةُ فاعتَرَتْ | تِلكَ القوائِــمَ كَثْرةُ الرَّجَفــانِ |
| وَتَفَجَرَتْ تِلْكَ العيُونُ بِمائِها | ولَطالَما غاضَتْ على الأزْمانِ |
| وَ أتى المُسَلِّمُ بالسَلام بِهَيبَةٍ | وَوَقـارِ ذي عِلْمٍ و ذي إيمــانِ |
| لَمْ يَرفَعِ الأصواتَ حَوْلَ ضَريحهِ | كَلاّ وَلَـمْ يَسْجُدْ على الأذقــانِ |
| كلاّ وَلَمْ يُرَ طائِفاً بالقَبَرِ أسـْ | ـبوعــاً كأنَ القبرَ بَيــتُ ثــانِ |
| ثُمَّ انْثَنى بِدُعائِه مَتَوَجِهاً | لله نَحْوَ البيــتِ ذي الأركــانِ |
| هذي زيارَةُ مَنْ غَدا مَتَمَسِكاً | بشَريـعَةِ الأســلامِ والأيمــانِ |
| مِنْ افضلِ الأعمالِ هاتيكَ الزِّيارةُ | وَهيَ يَومَ الحَشـرِ في الميــزانِ |

-دەبینین لە دێڕی کۆتایدا زیارەت بە -افضلُ الأعمال- ناو دەبات...

# مەرقەدی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ

هەندێ لە خەڵكی (خوا هیدایەتیان بدات بۆ ڕێگەی ڕاست) ئەنواڕنە مەرقەدی پیرۆزی تەنها لە ڕوانگەی گۆڕەوە، بۆیە بە نامۆ نییە كە بیروبۆچوونی خراپ زاڵ بێت بەسەر دڵ و مێشكیداو، بكەوێتە گومان بردنی خراپ بەرانبەر بە موسوڵمانان و زیارەت كارانی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو كەسانەی كە لە خزمەتیدا ڕادەوەستن و دۆعاكانیان دەخوێنن، دەبینی دەڵێن: دروست نییە كە خۆئامادە بكرێ و سەفەر بكەیت بۆ خزمەتی مەرقەدی پیرۆزی، یان دەڵێن: دروست نییەپاڕانەوە لەلای گۆڕەكەی، بەڵكو هەندێكیان بەرەنگاریان گەیشتووەتە ئەوەی كە دەڵێن: پاڕانەوە لەلای مەرقەدی پیرۆزی دا هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە یان پلەی كوفر و بێ بڕوایی یە، وە ڕووكردنە مەرقەدی داهێنراو و گومڕایییە، وە زۆر مانەوە لەو مەقامەدا هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە یان لە داهێنراوەكانە، وە گەر كەسێ بڵێ: ئەم شوێنی گۆڕی حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ باشترین شوێنی زەوی یە بە شوێنی كەعبەی پیرۆزیشەوە، ئەوە هاوەڵی داناوە یان لە گومڕایی دا دەژی، كە ئەم بێ بڕواكردنی خەڵكی و موسوڵمانانە و بەگومڕادانیان بەم شێوە كوێرانەیە بەبێ تێڕامان و بیركردنەوە پێچەوانەی ئاین و بیروبۆچوونی سەرجەم زانایانی پێشین و سەلەفی صالحینی ئەم ئومەتەن (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێ) .

وە ئێمە لەكاتێكدا لە باسی گۆڕ ئەدوێین، یان لەسەر زیارەتی گۆڕەكان یان باس لە فەزڵ و گەورەیی گۆڕەكە دەكەین و گەورەیی سەفەر كردن بۆلای گۆڕەكە و پاڕانەوە لە خواو داواكردنی لەبەردەم مەرقەدی پیرۆزی دا، ئەمانە و نیەت و مەبەست تیایاندا لە پێشینەوە تا ئێستا دوو كەس لەسەری پێچەوانەی ڕایان نەبووە و جێگەی جیاوازی ڕای كەس نەبووە،

بەڵکو هەمووی مەبەست ئەو کەسە بووە کە لە گۆڕەکەدا ئارامی گرتووە، ئەویش گەورەیی پێغەمبەران و بەڕێزترینی دروستکراوانی خواو خۆشەویست و ڕێزلێگیراوی خوایە (صەڵەوات و سەلامی خوای لەسەر بێ) ئیتر نرخی گۆڕ و زەوییەك بەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێ چەند بێ؟ بەڵکو نرخ و گەورەیی مزگەوتەکەش بەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبێ چەند بێ؟ بەڵکو نرخی شاری مەدینەی پیرۆزیش بە حەزرەتی محمدەوەیە ﷺ وە بزانین کە نرخی سەرجەم موسوڵمانانیش بەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبێ چەند بێ؟ ئەوانە بەبێ پێغەمبەری خواو ڕیساڵەو نبوەتەکەی و بڕواو ئیمان پێی و خۆشەویستی و دان پیانان و بەدڵ ئیقرارکردنی لە شایەتومانماندا هیچ نین و نەپلەیان ئەدرێ و نە سەرکەوتن و ڕزگاری و سەرفرازی دونیاو قیامەت بەدەست ئەهێنن..

ئەلێرەوە: دەبینین کە ئیبنو عەقیلی ئەلحەنبەلی کاتێ پرسیاریان لێ کرد لە جیاوازی نێوان حوجرەی پیرۆز کە مەرقەدی پیرۆزی تیایەو نێوان کەعبەی پیرۆز فەرمووی: گەر مەبەستت تەنها ژوورەکەبێ کە پێغەمبەری تیا نێژراوە ئەوە کەعبە پیرۆزتر و گەورەترە، وە گەر مەبەستت خودی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ بێ کە لەو ژوور و حوجرەدایە، ئەوە قەسەم بە خوا نە عەرش و نە ئەوانەش کە هەڵیان گرتووە ، نە بەهەشتی بەرین و نە ئاسمانەکانیش ناگەنە پلەی ئەو ژوورەیە، چونکە ئەو حوجرەو ژوورە لاشەی کەسێکی تێدایە گەر بکێشرێ بە هەموو بونەوەرو کەونەکان لاشەکە قورس ترەو بەڕێزترە [1]

کە ئەمە مەبەست بە مەرقەد و زیارەتی و سەفەرکردن و خۆئامادەکردن بۆ خزمەتی..

---

[1]- بنوڕە بۆ(بدائع الفوائد)ی ابن القیم ٣/١٦٨.

وه هەر ئەلێرەوە:

زانایـان فەرموویانـە: دروسـت نىيـە کـە بوترێـت: زیـارەت و سـەردانی گۆڕەکـەم کـرد، بـەڵکو دەبـێ بوترێـت: زیـارەتی حـەزرەتی پێغەمبـەرم کـرد صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ[1] ، کە ئەمەش ئەو ڕایەیە کە زانایان لـە ڕاڤەکردنی وتەی پێشەوا مالك دا (ڕەزای خـوای لەسـەر بێ) کردوویانـە کە فەرموویـەتی: (کەراهـەتی هەیـە پیـاو بڵـێ زیـارەت و سـەردانی گـۆڕی پێغەمبـەرم کـرد، ئەمـەش لەبەرئەوەیـە کـە تـۆ زیـارەت و سـەردانی کەسـێ دەکەی کە دەتبینێ و وتەکانت دەبیستێ و ئەتناسێتەوەو وەڵامـی سـەلامت ئەداتەوە).

باسەکە باسی گۆڕ نىيە، بەڵکو زۆر لەوە گەورەترە کە تـەنها لـەو ڕوانگـەو لایەنـەوە سـەیر بکرێ کـە گـۆڕەو پارچەیەکە لـە زەوی، گـەر تـەنها بنواڕینـە گۆڕەکە بێ ئـەوەی بیر لـەوە بکەینـەوە کە کـێ لـەناو گۆڕەکەدایـە، ئـەوە ئـەو ڕۆحـە پاکانـە دەبینـین کـە چـۆن لـە چواردەوری ئـەو گـۆڕەدان، وه دەبینـین چۆن پردێکی مەلەکی درێژ بۆوە لە مەلەئولئەعلاوە بۆ سەر گۆڕەکە هـاتووە کـە پچـڕانی نىيـە و ئەوسـەری لەلایـەن خـوای پەروەردگارەوەیـەو بـەردەوام تیایدا فریشتەکان ڕەحمەتی خواو صەڵەوات لە خۆیان و پەروەردگاریانەوە دەڕژێننە سـەر گۆڕەکە و ئـەو کەسـەش کە لـەناو گۆڕەکەدایـە کـە حـەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ.

کە شێخی –الدارمی– لە سوننەکەیدا هێناویەتی و دەڵێ: بـۆی گێڕاینـەوە عەبدوڵلای کوڕی صالح، دەڵێ لەیث بۆی گێڕامـەوە، لـە خالیـدەوە کـە ئـەبو یەزیـدی نـاوە، ئـەویش لـە سـەعیدەوە کـە ئیبنـو ئـەبی هیلالـە، ئـەویش لـە نەبیهەی کوڕی وەهبەوە کە دەڵێ:

---

[1]– بنوارە بۆ (الشفا)ی القاضي عياض

(کەعب هاتە ژورەوە بۆ خزمەت خاتوو عائشە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) وە باسی پێغەمبەری خوای کرد، کەعب وتی:

هیچ ڕۆژێك نیيە كە خۆر هەڵبێ مەگەر حەفتا هەزار لە فریشتەکان دێنە خوارەوە هەتا چواردەوری گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دەگرن و بە باڵەکانیان دایئەپۆشن و صەڵەوات دەخوێنن هەتا ئێوارە دادێ و بەرزدەبنەوە، پاشان بە هەمان ژمارە و شێوە دادەبەزن و ئەم حاڵە بەردەوام دەبێ، تا زەوی شەق دەبێ و حەفتا هەزار فریشتە دێنە دەرو دەم و زاریان بە صەڵەواتەوە دەبێ)[1] .

منیش دەڵێم[2]: ئەم گێڕانەوەیە –الحافظ إسماعيل القاضي– بە سەنەدی خۆی هێناویەتی، کە پلەی باش –الجید– ی پێ دراوە لە شەواهید و مەناقبەکان و گەورەیی کردەوەکاندا.

وە گەر سەیری ئەو شتانە بکەین کە لە چوار دەوری گۆڕەکەدان لە ڕەوزەی پیرۆز کە پارچەیەکە لە بەهەشتی بەرین، یان مینبەری پیرۆزی کە پێی موبارەکی لەسەر داناوە و لەسەری دانیشتووە و لە ڕۆژی دوایدا لەسەر حەوز و کانیاوە پیرۆزەکەی دەبێ، یان سەیری ئەو پارچە دارە بکەین کە گریاو ناڵەی کرد لە دوورکەوتنەوەی خۆشەویستەکەی کە لە ڕۆژی دوایدا لە بەهەشتی بەرین دا لە ناوەڕاستی درەختەکانی دا پلەی دەبێ، وە وتراوە کە لە شوێنی خۆی لەناو مزگەوتەکەدا نێژراوە، من وا گومان نابەم کە کەسێکی ژیر هەبێ سوور بێ لەسەر ئیسلامەتی و خێر و چاکە و لەو شوێنەدا ڕانەوەستێ و دۆعاو پاڕانەوەکانی نەکات و دڵی بە خۆشەویستی حەزرەت ﷺ چەکەرە نەکات...

---

[1]- بنوارە بۆ –السنن الدارمي– ٢/٤٣.

[2]- مەبەست پێی دانەر خۆیەتی السيد المالكي كە پلەی مُحَدِث – یتی هەیە.

# مەرقەدی پێغەمبەر و... پاڕانەوە

زانایان ڕەزای خوایان لەسەر بێ باسیان لەوە کردووە کە کارێکی چاك و خۆشەویستە بۆ ئەو کەسەی زیارەتی پێغەمبەر ﷺ ئەکات کە بوەسێ ڕوو بە گۆڕی پیرۆزی و دۆعا بکات و داوا بکات لە خوای گەورە، وە لەم پاڕانەوەدا ڕوو لە قیبلە نەکات، کە دەفەرموون: ئەم جۆرە ڕاوەستانە نەداهێنراوە نە گومڕاییــیە نە هاوەڵ پەیدا کردنە، کە وتەی زانایان بەم شێوەیەیە و بەڵکو زۆرێکیان دەڵێن ئەم حاڵە پلەی (استحباب)ی وەرگرتووە..

بنەمای ئەم باسەیە لەوەوە دێت کە گێڕاوەتەوە لە پێشەوا مالکی کوڕی ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) لە کاتێکدا کە ئەبو جەعفەری مەنصور لە مزگەوتی حەزرەتی پێغەمبەردا ﷺ دەنگ بەرز دەکاتەوە، پێشەوا مالك پێی دەڵێ: ئەی پێشەوای باوەڕداران دەنگت بەرز مەکەرەوە لەم مزگەوتەدا، چونکە خوای گەورە ئەدەبی کۆمەڵێکی داوە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ﴾ الحجرات: ٢، لە هەمان کاتدا ستایشی کۆمەڵێکیشی لێرەدا کردووە کە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ﴾ الحجرات: ٣، وە لێرەدا سەرزەنشتی کۆمەڵێکیشی کردووە بە ئایەتی ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ الحجرات: ٤. وە بزانە ڕێزلێگرتنی پێغەمبەر ﷺ بە مردوویی وەك ڕێزگرتنێتی بە زیندوویی.

لێرەدا: ئەبو جەعفەر پرسیاری کرد لە ئیمام و وتی: ئەی ئەبا عەبدوڵلا: ئایا ڕوو بکەمە قیبلەو بپاڕێمەوە یان ڕوو بکەمە حەزرەت ﷺ؟

پێشەوا مالك فەرمووی: دەی بۆچی ڕووت وەردەچەرخێنی لە حەزرەت ﷺ لە کاتێکدا کە وەسیلەی تۆو باوکە ئادەمتە بۆ خزمەتی پەروەردگارتان لە

ڕۆژی دوایـدا ؟ ، بـەڵکو ڕابوەسـتەو ڕوو بکـە پێغەمبەرەکـەت و بیکـە بـە شەفاعەتکارت بۆ خزمـەت پـەروەردگارت وە بزانـە خـوا فەرموویـەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ...﴾ النساء:٦٤.

ئـەم ڕووداوە پێشـەوا قاضـي عیـاض دەیگێڕێتـەوە بـە سـەنەدی تـەواوی خۆی لە کتێبە ناودارەکەی (الشفا في التعريف بحقوق المصطفى) لـە باسـی زیارەت دا، کە زۆرینەی زانایان دانیان پیادا ناوە.

شێخ ئیبنـو تەیمیـە دەڵـێ: ئیبنـو وەهـب دەگێڕێتـەوە لـەو ڕیوایەتـەوە لـە مالکەوە کە: (اِذا سلم على النبيّ ﷺ يقفُ وَوَجهَهُ الى القبر لا إلى القبلة وَ يدنو ويُسَلم وَ يَدعوا ولا يَمسُ القبرَ بيدهِ)[1] .

واتە: ڕادەوەستیّو ڕوو دەکاتە مەرقەدی پیرۆزی نەك ڕوو بکاتە قیبلە، وە نزیك ببێتەوە و سەلام بکات لە حەزرەت ﷺ وە بپاڕێتەوە و بە دەستەکانی دەست لە گۆڕەکە نەدات..

وە پێشەوا -النووی- ڕەحمـەتی خـوای لێ بێ لـە پەڕتوکە ناودارەکەی -الأذكـار- لـە بەشـی زیـارەت دا هێناویـەتی و لـە کتێبـی (الأيضـاح) و لـە (المجموع) یشیدا تۆماری کردووە [2].

ئەلخـەفاجی لـە شـەرحی -الشـفا-دا دەڵـێ: پێشـەوا ئەلسـبوکی فەرموویـەتی: هاوەڵانمـان فەرموویانـە کـە کـارێکی موسـتەحەبە بێیتـە خزمـەتی مەرقـەدی پـیرۆزی و ڕووی تێبکـەیت و پشـت بکەیتـە قیبلـەو سـەلامی لێ بکـەیت و، پاشـان بـۆ خزمـەتی هـەردوو هـاوەڵی (ئەبوبـەکری صـدیق و عومـەری کـوڕی خـەطـاب) ڕەزای خوایـان لەسـەر بـێ و ، پاشـان

---

[1]- بنوارە بۆ(اقتضاء الصراط المستقيم..)ابن تيمية لاپەڕە ٣٩٣.

٢ بنوارە بۆ ( المجموع ) للنووي ٨ \ ٢٧٢ ..

بگەڕێیتــەوە بــۆ شــوێنی یەکــەمجارت (واتــە بــەردەم حــەزرەت ﷺ) وە ڕابوەستی و بپاڕێیتەوە [1] .

## بۆچوونی شێخ ابنُ تیمیە

ئیبنـو تەیمیـە لـەدوای ئـەوەی کـە وتـەی زانایـان دەگێڕێتـەوە لـەم باسـەدا خۆیشی دەڵێ:

(فاتفقوا في استقبال القبلة و تنازغوا في تولية القبر ظَهرَهُ وقتَ الدُعا)

واتە سەرجەم زانایان یەك ڕان لەسەر ئەوەی کە لـەکاتی زیـارەت دا پشـت بکەیتە قیبلە، بەڵام جیاوازیان لەوەدایە کە ئایا لەکاتی پاڕانەوەدا پشتت لە پێغەمبەر بێ .

ئەمە کورتەی ئەو ڕایەیە کە شێخ ئیبنو تەیمیە لەم باسـەدا هێناویـەتی کـە بەڵگەیـەکی ڕوون ئاشـکرایە بـۆ دروسـتی ڕاوەسـتان و ڕووکردنـە مەرقـەدی پیرۆزی و پاڕانەوەو داوالێکردن، کە بنەمایەکی بەهێزی پشتگیری زانایـانی پێشـین ی چـاکانی هێنـاوە، گـەر کەسـێکی بەویـژدان و ژێـر بنواڕێتـە ئـەم وتەیەی (ابن تیمیـة) کـە دەڵـێ (وَتنـازعوا في توليـة القبر ظهـره وَقت الـدُعاء) واتـە جیـاوازی ڕایـان هەیـە لەسـەر پشـت کردنـە قـەبر لـەکاتی دۆعـادا ئـەوە تێدەگات و دڵی ئاواشتە دەبێ و دادەمەزرێ لەسەر ئەوە کە ئەو کەسانەی زیـارەت دەکـەن و سـەلام لـە پێغەمبـەری خـوا دەکـەن لـەلای قەبرەکـەدا ڕادەوەستن و دەپاڕێنەوە لەسەر تەوحید و یەکتاپەرستین و موسوڵمانن، لە ئـەهلی ئیمـانن، وە ئـەم مەسـئەلە و باسـە جـێی جیـاوازی نێـوان زانایـانی پێشـین بـووەو ، وتـەی لەسـەر ئـەوە بـووە کـە ئایـا ئـەو حاڵەتـە لـە کـردەوە

---

[1]- بنوارە بۆ (شرح الشفا) الخفاجي ٣٩٨/٣.

موستەحەبەکانە یان نا، ئیتر ئایا ئەم حاڵ و جیاوازییە گەیاندونیەتە ئەوە کە سیفەتی هاوەڵ بۆ خوادان و گومڕایی بدەنە پاڵ یەك؟...
پاك و مونەزەهی بۆ پەروەردگار ئەوە بوهتانێکی زۆر گەورەیە.

## شیکردنەوەی وتەکەی (ئیبنو تەیمیە)

ئەوەی لە وتەکەی شێخەوە تێدەگەین ئەوەیە: نەهی لێ کراو لە ڕاستیدا دۆعا خوێندنە لەلای گۆڕەکە ، یان مەبەست گۆڕەکە بێ لەکاتی دۆعادا و کە ڕجاو تکا گیرا بوون ببێ لەو شوێنەدا، یان گەیشتنە بەو مانایەی کە دۆعا خوێندن لەلای ئەم گۆڕەدا قبوڵ دەبێ و وەڵامی دەدرێتەوە، یان مەبەست داواکردنە لە خوای گەورە هەرکەس بە جۆری پاڕانەوەی خۆی و بڕوای خۆی کە لابدا بەلای گۆڕەکەدا و بپاڕێتەوە، یان زیارەت کردنی گۆڕی کەسێکە کە سەلامی لێبکرێ لە خۆی و لەو شوێنەدا کە بەردەوام ڕووی لە گۆڕەکەیەو پشتی لە قیبلەیە لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا کە ناتوانرێت لە هەقی ئەو کەسەدا بوترێت موشریك بووە یان کارێکی داهێنراو بیدعەی جێبەجێ کردبێ...

خوێنەری بەڕێز: لێرەدا دەقی وتەکەی ئیبنو تەیمیە لەم باسەدا ئەنوسینەوە کە لە (اقتضاء الصراط المستقیم)ی خۆیدا هێناویەتی[1]:

(ئەوەی کە دێتە ئەم باسەوە: یان ئەوەتا مەبەست دۆعا خوێندنە لەلای گۆڕەکە، یان مەبەست دۆعا خوێندنە بۆ گۆڕەکە، ئەگەر مەبەست دۆعاو پاڕانەوە بێ لەلای گۆڕەکان و لەلای شوێنە (پیرۆز)ەکان، ئەوە دەبێتە دوو بەش:

---

[1]- بنوارە بۆ –اقتضاء الصراط المستقیم– ابن تیمیة لا٣٣٦.

یەکەمیان: پاڕانەوە لە شوێن وەك ئەوەی لە ڕێگەیدا بپاڕێتەوە و بدات بەلای گۆڕستانێکدا و خوای بیربکەوێتەوەو بپاڕێتەوە، یان زیارەتی گۆڕەکان بکات و سەلامیان لێ بکات و داوای لێخۆش بوون بۆ مردووەکە بکات و عاقبەت بەخێری بۆ خۆی هەروەك لە سوننەت دا هاتووە، ئەمە هیچ خراپیەکی تیا نییە.

دووەمیان: پاڕانەوە لەو شوێنەدا لەلای گۆڕەکەو گومانیش وا ببات کە قبوڵ بوونی پاڕانەوەکە لێرەدایەو لە شوێنی تردا نابێ، ئەمە ئەو جۆرەیە کە نەهی لێکراوە، جا یان نەهییەکە بۆ حەرام کردنە یان بۆ تەنزیهییە، بەڵام بەلای حەرامیەکەدا نزیکترە، وە جیاوازیش لەنێوان ئەو دوو حاڵەدا ئاشکرایە.

وە ئەگەر لەلای بتێك یان خاچێك یان کەنیسەیەکدا بپاڕێتەوەو ڕجاری پاڕانەوە قبوڵ بوونی بێ لەو شوێنەدا، ئەوە یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، بەڵکو گەر مەبەستی ماڵێك یان خانوێ بێ لەو بازاڕەیە، یان هەندێ لە دارو عەمود بێ لەو ڕێگە و بانەکان و ، وابزانێ ئەو شوێنە زیاد لە شوێنەکانی تر خوا دۆعاکەی ئەبیستێ، ئەوە لە کردەوە مونکرەکانە و لەو شوێنەدا دۆعا هیچ فەزڵێکی زیاتری نییە بەسەر شوێنەکانی تردا.. وە پاڕانەوە لەلای گۆڕەکان بەتایبەتی ئەوە لە نەهی کراوەکانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردین کە گۆڕەکان بکەینە مزگەوت یان بیانگێڕین بە شوێنی جەژن و خۆشییەکانمان، یان نوێژ خوێندن لەلایان بە پێچەوانەی شوێنەکانی تر.

وە پاڕانەوە لەلای گۆڕەکان بەتایبەتی ئەوە لەنەهی کراوەکانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردین کە گۆڕەکان بکەینە مزگەوت یان بیانگێڕین

به شوێنی جەژن و خۆشیەکانمان، یان نوێژ خوێندن لەلایان بە پێچەوانەی شوێنەکانی تر..).

## بۆچوونی محمدی کوڕی عبدالوهاب لەسەر دۆعاخوێندن لەلای گۆڕەکان

((پاڕانەوە لەلای گۆڕ نە داهێنراوەو نە هاوەڵ دانانیشە بۆ خوا))

پرسیاریان کرد لە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب لەو وتەیەی کە لە کاتی نوێژەبارانەدا ئیستغاثە دەکەن و دەڵێن: (لا بأس بالتوسل بالصالحين) هیچ خراپیەکی تیا نیە ئەوە بەشێکە لە تەوەسول بە چاکانەوە، وە وتەی پێشەوا ئەحمەد کە فەرموویەتی: (يتوسلُ بالنبي ﷺ خاصته) ئەوە تەوەسول کردنە بە پێغەمبەرەوە بەتایبەتی، لەگەڵ وتەکەی ئەوان کە دەڵێن: (إِنَّهُ لا يستغاث بمخلوق) واتە هاوار و داوا لە مەخلوقات و دروستکراوانی خوا ناکرێ و دروست نیە...

لە وەڵامدا کوڕی عبدالوهاب دەڵێ: جیاوازی لەنێوانیاندا زۆر دیار و ئاشکرایە، ئەوە ئەو باسە نیە کە ئێمە تیایاین، ئەوەی کە هەندێ تەوەسول بە پیاوچاکانەوە بەدروست ئەزانن و ئەوەش کە هەندێکیان دەڵێن ئەوە تەوەسولەو تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەمە زۆر لە زانایان وتوویانە کەراهەتی تیایە، ئەم مەسئەلە بابەتێکی شەرعی و فیقهیە، کەبەلای ئێمەوە ئەوەیە کە کەراهەتدارە، ئینکاری ئەو کەسانە ناکەین کە پێی هەڵدەستن، وە ئینکاری کردن نیە بۆ بابەتە ئیجتهادیەکان، بەڵام ئینکاری ئێمە کە دەیکەین بۆ ئەو کەسەیە کە داوای شتێ بکات یان داوای کارێ بکات لە کەسێ کە تەنها لە خوا داوا بکرێ، مەبەستی بێ بچێتە لای گۆڕێك بۆ نموونە شێخ عبدالقادر و غەیری ئەو، لەو داوا بکات و وا بزانێ

دەرگای خێرو ڕەحمەت و جێبەجێ کاری فرمانەکانی تەنها ئەوە. ئەمە لە کوێ و ئەو حاڵە لەکوێ کە کەسەکە داواو پاڕانەوەی تەنها لە خوا بێ و لەلای گۆڕەکەدا بڵێ: خوایە داوات لێ دەکەم بە خاتری پێغەمبەرەکەت یان بەخاتری پێغەمبەران یان بە خاتری بەندە ڕاستەقینەکانت، یان مەبەستی بێ بچێتە لای گۆڕی کەسێکی چاکی دیاریکراو لەلای گۆڕەکەدا بپاڕێتەوە بەڵام پاڕانەوەکەی تەنها لە خوا بێ و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار نەدات، ئەوە ئێمە و ئەم حاڵەتە لەکوێ و ئەو باسەی ئێمە لەکوێ ) .

(ولكـن يقـول في دُعائـهِ: اللـهم أسـأُلك بنبيـكَ أو بالمُرسـلين أو بعبـادِكَ الصالحين أو يقصد قبر معروف أو غيرهِ يدعوا عندهُ، لكن لا يدعوا الاّ الله مُخلِصاً له الدين، فأينَ هذا مما نحنُ فيه)[1] .

## مەرقەدی پیرۆزو
## تەبەروك بەدەست لێدانی یان ماچ کردنی

بزانە کە پێویستە لەسەر موسوڵمانان کە گۆڕ و مەرقەدی پیرۆزی نابێ ماچ بکەن وە نابێ دەستی لێوە بدەن، وە نابێ لاشەی خۆیان لە سنگ و پشتیانی پیابهێنن، یان بە پەنجەرەکاندا ئەمانە لە کارە مەکروهەکانە،

---

[1]- فتاوى الشيخ امام ابن عبدالوهاب في مجموع المؤلفات (القسم الثالث–ص٦٨– نشر جامعة الأمام محمد بن سعود الاسلامية في أسبوع الشيخ ابن عبدالوهاب)

تێبینی: ئەم پرسیارانە کاتێك لە شێخ کراوە کە لە دانیشتنی دەرس دا بووە و باسەکەشی لەسەر تەوەسولی کافرەکانەوە بووە بە بتەکان کە ئەیانوت (الا ليقربونا الى الله زُلفى) بۆیە شێخ لە وەڵامیاندا ئەڵێ: ئەوە دوورە لە باسەکەی ئێمەوە یان ئەوە ئەو باسە نىیە کە ئێمە تیایاین.... وەرگێڕ.

چونكە بەكارهێنانی پێچەوانەی ئەدەب و ڕەوشتە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

وە ئەو كارانە بەنیەتی تەبەروك وەرگرتن، ئەوە حوكمی كەراهەتە ناسرێنێتەوە چونكە نەزانینە بەرانبەر ئەو ئەدەبەی كە پێویستە لەو مەقامەدا بكرێ، وە نابێ بوترێ زۆرینەی خەڵكی ئەیكەن، چونكە وتەو بۆچوونی ڕاست ئەوەیە كە زانایانمان دیاریان كردووە، كە پێشەوا ئەلنەوەوی لە –الأيضاح–دا بە جوانی ڕوونی كردۆتەوە.

وە پێشەوا –ابن حجر– لە كتێبی –المِنَح– و لە –الجوهر– هێناویانە، وە خاوەنی –الأحياء– دەفەرموێ (مس المشاهد وتقبيلها عادة اليهود والنصارى) دەست لێدان و ماچ كردنی لە داب و نەریتی جولەكە و گاورەكانە.

پێشەوا فُضیل ی كوڕی عیاض (ڕەزای خوای لەسەر بێ) لەو مانایەدا ئەفەرموێ: ( ڕێگەی هیدایەت دراوان بگرەو لەسەری بڕۆ و كەمی ئەو كەسانەی كە سالیكن هیچ زیانێكت پێ ناگەیەنن وە ئاگاداری خۆت ببەو دووربە لە ڕێگەی گومڕابونەوە وە نەكەی زۆری ژمارەی هیلاك بەران بتخەڵەتێنێ )...

وە پێشەوا ئەلنەوەوی (ڕەزای خوای لەسەر بێ) ئەفەرموێ: (كەسێ بە خەیاڵیا بێ كە دەستی بۆ ببات یان یەكێ لەو كارانە بە نیەتی تەبەروك ئەوە لە نەزانین و غەفڵەتی ئەو كەسەوەیە ، چونكە بەرەكەت وا بەشوێن كەوتنی شەرعەوە، ئیتر چۆن فەزڵ و گەورەیی لە پێچەوانەی ڕاستییەوە دەست دەكەوێت )[1] ..

---

[1]- المجموع النووي ٢٧٥/٨.

# بۆچوونی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

چەند گێڕانەوەیەك لەسەر ئەم باسە لە پێشەوا ئەحمەدەوە هاتووە، کە هەندێکیان بە دروستی ئەزانن، وە هەندێکی تر بۆچوونیان ئەوەیە وەستاون و حوکمیان لەسەر نەداوە، وە ڕای هەندێکی تریان جیاوازی نەکردنە لەنێوان مینبەری پێغەمبەر و گۆڕەکەی ئەوەی یەکەم ، واتە مینبەرەکەی بەدروست زانیوە لەسەر دووەم واتە گۆڕەکەی بە موباح و ئاسایی زانیوە یاخود وەستاوەو بڕیاری لەسەر نەداوە، دووەمیان ڕێگە پێدانی، جا هەرکام لەم جیاوازیيانە بگرین ناگەینە ئەوەی کە حوکم ی کافربوون یان گومڕایی یان دەرچوون لە میللەتی ئیسلام یان داهێنراوی لە دین بدەین بەسەر ئەو کەسەدا کەپێی هەڵدەستێ، مەبەست ئەوەیە کە ئەو کەسەیە کارێکی کردووە کە ( جیاوازی ڕا لەسەری هەیە یان مەکروە ) ، ئەوەی جێی باسە ئەوەیە کە بزانین ئەو تەبەروك وەرگرتنە نەکرێتە عادەتێك کە نەزانەکان وابزانن کە ئەو کارە لە پێداویستی زیارەتە و یەکێکە لە ئادابەکانی، لێرەدا وتەی پێشەوا ئەحمەد دەهێنینەوە:

لە کتێبی –خلاصة الوفا–دا هاتووە دەڵێ: لە نوسراوی –العلل والسؤالات–ی عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دا هاتووە کە دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم لە حاڵی پیاوێك کە دەست بدات لە گۆڕی پێغەمبەرەوە ﷺ بە مەبەستی تەبەروك و پیرۆزی وەرگرتن و ماچ کردنی، وە هەمان کار لەگەڵ میمبەردا جێبەجێ بکات بە نیەتی پاداشتی لای خوای گەورە، باوکم وتی: (لا بأس بهِ) هیچ خراپیەکی تیادا نیيە..

ئەبوبەکری ئەلئەثرەم دەڵێ: وتم بە ئەبی عەبدوڵڵا –واتە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل: ئایا گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دەستی لێ ئەدرێ و ئەهێنرێ بە گیاندا؟ وتی: ئەوە نازانم. وتم پێی: ئەی ئەو کارە بۆ مینبەر دەکرێ؟ وتی: مینبەر

بەڵێ ئەوە قسەی لەسەر هاتووە، ئەبو عەبدوڵڵا وتی: شتێك ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو ئەبی فودەیکەوە، لە ئیبنو ئەبی ذئبەوە، ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە کە (أنه مسح على المنبر) دەستی هێناوە بە مینبەردا..

هەروەها گێڕاویانەتەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە هەمان گێڕانەوە. منیش وتم: وە گێڕاویانەتەوە لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە کە دەڵێ: ئەوانە هەرکات بیانویستایە بێنە دەرەوە بەرەو عێراق بڕۆن، دەهاتنە لای مینبەر و دەستیان پیادا ئەهێناو دەپاڕانەوە وە بینیم بە باشیان دادەنا، پاشان دەڵێ: ئەمە لەکاتی زەروریدا هیچ شتێکی لەسەر نییە...

وتیان بە ئەبی عەبدیللا: ئەوانە سکیان ئەنوسێنن بە دیوای گۆڕەکەوە، وە منیش پێم وت: (ئەهلی عیلم)م لە خەڵکی مەدینە بینیوە کە شتی وایان نەکردووە، بەڵکو لەلایەکەوە ڕاوەستاون و سەلامیان کردووە، ئەبو عبدوڵڵاش وتی: بەڵێ هەر ئەوەشە کە ئیبنو عومەر ئەیکرد، پاشان ئەبو عەبدوڵڵا وتی: (بە باوك و دایکمەوە بەفیدات بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ)...

شێخ ئیبنو تەیمیە دەڵێ: ((پێشەواو ئەحمەد و غەیری ئەویش ڕێگەیان داوە کە دەست بدرێ لە مینبەر و لەڕوومانەوە کە شوێنی پێغەمبەری خوا بووە و لێی دانیشتووە، بەڵام ڕێگەی دەست دان لە گۆڕی موبارەکی نەداوە، وە دەگێڕنەوە لە هەندێ لە هاوەڵانمانەوە کە مەسحی گۆڕ دروست دەبێ، چونکە پێشەوا ئەحمەد چەند کەسێکی ناشتوەو دەستی لەسەر گۆڕەکەی داناوە و پاڕاوەتەوە بۆی، بەڵام جیاوازی نێوان ئەم دووانە ئاشکرایە))[1] .

---

[1]- بنوارە بۆ (اقتضاء الصراط المستقيم-ابن تيمية- لا ٣٦٧، هەروەها ابن مفلح گێڕاویەتەوە لە پێشەوا ئەحمەدەوە لە - الفروغ - ٣/٥٢٤.

## گۆڕی پێغەمبەر ﷺ پارێزراوە لە شیرك و وەثە نیەت

خـوای پـەروەردگار ئـەم زەوییـە پـیرۆزەی پاراسـتوە بـەهۆی بـوونی خۆشەویستی گەورە و پێغەمبەری ڕێزلێگیراوەوە، هـەرگیز لـەلای دا هـاوەڵ پەیدا کردن و هیچ شتێك لـە کردەوەکان لـە جۆرەکانی بەندایـەتی کە ڕێگە پێدراو نـەبێ ڕونـادەن و تـەنها ئەو کردەوانـەی کە بـۆ خـودان لـەو شـوێنە پیرۆزەدا دێنە پێشەوە، هەرگیز بە بیرو فیکری هیچ کەس دا نایەت کە ئـەوە بپەرسـترێت یـان ڕوونگـەو قیبلەیـەك بـێ بـۆ بەندایـەتی ڕووی تێبکرێـت، ئەمـەش بـەهۆی بەرەکـەتی بانگەوازەکـەی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ کـە بانگەوازی بۆ دەکـرد و دەپاڕایـەوە لـە پەروەردگاری پـێ ببەخشـێ و خـوای گـەورەش پاڕانەوەکـەی گـیرا کـرد و پـێی بەخشـی، بۆیـە لێـرەدا شـێخ ی ئیسلام ئیبنو تەیمیە دەڵێ:

(لە کتێبی (الموطأ) ی پێشەوا مالك (ڕەزای خـوای لەسەر بێ) هـاتووە لـە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:

(اللهم لا تجعل قبري وَثناً يعبدُ، اشتد غَضبُ اللهِ على قومٍ اتخذُوا قبورَ أنبيـاءهم مسـاجد) ، خوایـە گیـان گۆڕەکـەم نـەگێڕی بـە شـوێنێك کـە بپەرسـترێ، قـەهر و تـوڕەیی خـوا لەسـەر ئـەو کۆمەڵانەیـە کـە گـۆڕی پێغەمبەرانیان ئەگێڕن بە مزگەوتەکان [1] .

سـوپاس بۆ خـوا، پـەروەردگار وەڵامـی داوە و داواکـەی قبـوڵ فـەرمووە و گـۆڕی پێغەمبـەرمان نـەگێڕراوە وەك چـۆن گـۆڕی غـەیری ئـەو گێـڕاوە بـە شـوێنی بەندایـەتی، بـەڵکو هـیچ کەسـێ ناتوانـێ بچـێتە نـاو ئـەو حـوجرە پیرۆزەوە دوای ئـەوەی کە ئەو حوجرە بنیـات نـراو دروسـت کـرا، وە پـێش ئەوەش کەس نـەیتوانیوە بچێتە ژوورو لـەپاڵیا بپاڕێتـەوە، یـان نوێـژ ڕووەو

---

[1]- واتە وەك قیبلە ڕووی تێبکرێ و بپەرسترێ لە غەیری خوا... وەرگێڕ.

ئەو بکات یان ئەو کردەوە ناشەرعی‌یانە بکات کە لای گۆڕەکانی تر دەکرێ، بەڵام لە نەزانەکان چەند کردەوەیەك دەبینرێ وەك نوێژکردن ڕووەو گۆڕەکەی یان دەنگ بەرزکردنەوە لە خزمەتیا ، یان قسەکردن بەو وتانەی کە نەهی کراوە لێمان، ئەمانە کە دەکرێن هەرچەندە لە دەرەوەی حوجرەی پیرۆزیەتی نەك لەلای گۆڕەکەی ، ئەمەش سوپاس بۆ خوا نیشانەی قبوڵ بوونی پاڕانەوەکەیەتی ، ئەوەتا کەس ناتوانێ بچێتە ژوورەوە بۆ لای گۆڕەکەی و لە نوێژدا ڕووی تێ بکات یان پاڕانەوەی نابەجێ یان بیکات بە هاوەڵ بۆ خوای گەورە هەروەك چۆن لای گۆڕەکانی تر دەکرێ..

لە سەردەمی ژیانی خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کەس نەچۆتە ئەو ژوورەوە لەبەر بوونی خاتوو عائیشە چونکە دائەنرا بە ماڵی ئەو، وە کەس نەیئەتوانی کردەوەیەك بنوێنێ یان وتەیەك بڵێ لەلای ژوورو گۆڕەکەی کە نەهی لێ کرابێ، وە لەدوای وەفاتی خاتوو عائشەیشەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) دەرگا داخراو بوو هەتا ئەو کاتەی کە حوجرەیە خرایە سەر مزگەوت دەرگایەکەی بە یەکجاری داخراو دیوارێکی تریان لە پێشیەوە دروست کرد، ئەمەش هەمووی بۆ پارێزگاری کردنی بوو لە کەسە ناحاڵیەکان تا ماڵەکەی نەگێڕن بە شوێنی جەژن و شادی و گۆڕەکەی نەگێڕن بە شوێنی پەرستن، وە نەبێ ئەوە نەزانین کە خەڵکی شاری مەدینە هەموویان موسوڵمان و ئەهلی بڕوا بوون وە یەکێك نەهاتووەتە خزمەتی مەگەر باوەڕدار نەبوو بێ، وە هەموویان ڕێزو گەورەیی و حورمەتی پێغەمبەریان زانیوەو گۆڕی یەکە یەکەی ئومەتەکەشی لەلای ئەوان ڕێزی هەبووە، کە ئەمەشیان کردووە بۆ ئەوە نەبووە کە سوکایەتی یان نزمی بۆ گۆڕە پیرۆزەکە دەربڕن، بەڵکو بۆ ئەوە بووە کە تەنها نەبێتە شوێنێك بپەرسترێ، وە خەڵکی نەیگێڕن بە شوێنی شادیەکانیان، تا پارێزراو بێ

لـەو کردەوەیـەی کـە ئـەهلی کیتابیـەکان دەیـانکرد بەرانبـەر بـە گـۆڕی پێغەمبەرانیان، وە گۆڕەکە ڕێزلێگیراوە لە حوجرەکەداو سەری گۆڕەکە بە –بطحاء– داپۆشراوە کە بریتی‌یە لە لمێکی چڕو پڕ کە نەبەردی تیایە نەدار، وە بە قوڕیش ڕوپۆش نەکراوە هەروەك چۆن گۆڕەکانی تریان پێ ڕووپۆش دەکرد، کە حەزرەت ﷺ نەهی کرد لێمان تا ببێ بە –سَدُ للذریعة– هـەروەك نـەهی کـرد نوێـژ خوێنـدن لـەکاتی خۆرهـەڵاتن و خۆرئاوابوون تـا نەبێتـە هۆکـاری هـاوەڵ بـۆ خـوا بڕیـاردان، وە پاڕایـەوە لـە خـوای باڵادەسـت کـە گۆڕەکــەی نــەکێڕێ بــە شــوێنی بەندایــەتی، خــوای پــەروەردگاریش پاڕانەوەکـەی گیرا کـرد، گۆڕەکـەی نەبووە بـە مزگـەوت و ڕوانگـەو قیبلـەی نوێـژ، بـەڵکو کـەس ناتوانـێ بچێتە ژوورەوە بـۆ لای گۆڕەکـە، لـە ئومـەتانی پێشوودا هەرکات شوێنکەوتەی پێغەمبەرێك کردەوەیەکی خراپی دابهێنایە خوای گەورە پێغەمبەرێکی تری بۆ ڕەوانە دەکردن تا نـەهی‌یان لێ بکاتـەوەو لەو کارە خراپە بیانپارێزێ.

بەڵام حـەزرەتی محمـد ﷺ کۆتـایی پێغەمبەرانـەو پێغەمبـەری تـر لـەدوای ئەو نایەت و خوای گەورەش ئومەتەکەی پاراستووە بەشێوەیەك کە لەسـەر گومڕایی و خراپ هەرگیز کۆنابنەوە، وە گۆڕی موبارەکیشی پاراستووە کە بیگێـڕێ بـە بەندایـەتی، کـە ئـەوە خوانەخواسـتە ئەگـەر ڕوویـدات ئـیتر پێغەمبـەرێکی تـر لـەدوای ئـەو نایـەت تـا نـەهیمان بکـات لێـی، وە ئەوانـەی پارێزکـارن زۆرینــەی ئومــەتن، بۆیـە پێغەمبــەر ﷺ هــەواڵی پێـداوین کـە بـەردەوام کۆمـەڵێك لـە ئومـەتی لەسـەر هـەق و ڕاسـتی دەبـن و ئەوانـەی کـە خراپن زیان بەمان ناگەیەنن و هەرگیز ئەو کۆمەڵـە ناکـەون و سەرشـۆڕ نـابن تا ڕۆژی دوایی، بۆیە ئەهلی بیدعە و خراپەکاران هیچ ڕێگەیەکیان نی‌یە کە

بگەن بە گۆڕی پێغەمبەری ڕێزلێگیراو هەروەك چۆن كراوە بە گۆڕی غەیری پێغەمبەر ﷺ)[1] .

## ئاسارەكانی پێغەمبەری خواو

## شوێنە دینی یەكان وتەبەروك كردن بە زیارەت كردنیان

لەسەر ئەم بابەتە (شیخ ابن تیمیە) وتەیەكی زۆر جوانی هەیە، كە ئێمە لێرەدا سوودە گرنگەكانی ئەگوازینەوە.

( مەقام و شوێنی پێغەمبەران و پیاوچاكان كە بریتی یە لەو شوێنەی كە تیایدا هەڵساون و دانیشتون یان بەندایەتی خوایان تیا جێبەجێ كردووە، بەڵام نەیانگێڕاوە بە مزگەوت، ئەوەی لەم بارەوە پێم گەیشتووە لە زانایانی ناودارەوە دوو قسەیە:

یەكەمیان : قەدەغەیان كردووە و وتویانە پلەی كەراهەتی هەیە، كە دروست نەبێ پارچەیەك لە زەوی بە نیەتی بەندایەتی سەردانی بكرێ مەگەر مەبەست و نیەتی ئەو عیبادەت و بەندایەتی نەبێ كە شەریعەت هێناویەتی، وەكو ئەوەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری كرد بە مەبەستی بەندایەتی، هەروەك چۆن نوێژی لە مەقامی ئیبراهیم دا دامەزراندن، یان وەكو چۆن نوێژی لەلای -الأسطوانة- لەناو مزگەوتدا دەخوێند، یان وەك چۆن مزگەوتەكانی بە مەبەستی نوێژكردن دامەزراند و تیایدا ڕیزو صەفی یەكەمی بە قەصد و نیەت تیا ئامادەبوون بە بەرز پێناسە كردن.

وە قسەی دووەمیان: هیچ خراپیەكی تیا نی‌یە ئەگەر كەم بێ، هەروەك گێڕاوەتەوە بە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لەسەر) (كە ئەگەڕا بۆ ئەو شوێنانەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا دانیشتوە یان نوێژی تیا

---

[1]- بنوارە بۆ (ابن تیمیة- الجوابُ الباهر في زوار المقابر) لاپەرە ١٣..

کردووه، با پێغەمبەری خواش ﷺ چوبێتە ئەو شوێنانە بە ئیتفاق و یەك رایی ) .

(السند الخواتمی) دەڵێ: پرسیارمان لە ئەبا عەبدللا کرد لەو پیاوەی کە دێتە ئەو شوێنانە و سەیریان دەکات چێ دەڵێ؟ وتی: ئەمما لەسەر فەرموودەکەی (ئیبن و ئوم مەکتوم) کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە لە ماڵەکەی خۆیدا نوێژەکانی بکات هەتا بیکاتە شوێنی نوێژ خوێندن، وە لەسەر ئەو کردەوەیەی ئیبنو عومەر کە دەگەڕا بۆ ئەو شوێنانەی کە شوێنی پێغەمبەری خواو ئاثاری ئەو بوون، کە هیچ خراپیەکی تیا نیە کە پیاو بێ و سەیری ئەو شوێنانە بکات، بەڵام ئەوەندە هەیە کە خەڵکی زۆر تیایدا ڕۆدەچن و زۆر بۆی دێنەوە..

هەروەها ئەحمەدی کوڕی قاسم گێڕاویەتیەوە لێی کە:

پرسیاری لێ کرا سەبارەت بەو پیاوەی دێت بۆ بینینی ئەو دیمەنانەی شاری مەدینەی منەوەرە و غەیری ئەویش کە بڕوات و سەردانیان بکات؟ لە وەڵامدا وتی:

ئەمما لەسەر فەرموودەکەی ئیبنو ئوم مەکتوم: ((کە داوای لە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ کرد کە بێتە ماڵەکەی و نوێژ بکات تا شوێن نوێژەکەی حەزرەت ﷺ لە ماڵەکەیدا بکات بە مزگەوت)) وە لەو کردەوەش کە ئیبنو عومەر پێی هەڵسا، کە دەگەڕا بۆ ئەو شوێنانە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایاندا دانیشتبێ یان نوێژی تیا کردبێ هەتا گەیشت بەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی تیا کردبوو بە سەریدا ، کە تیایدا ئاوی کرد بەسەریدا، لێیان پرسی بۆ وات کرد، فەرمووی: (کان النبيُّ ﷺ يُصبُ هُنا ماءً) پێغەمبەر ﷺ ئەلێرەدا ئاوی کردووە بەسەریدا.

فەرمووی: ئەمما ئەمەیان هیچ خراپیەکی تیا نیە، بەڵکو مۆڵەت و ڕوخصەت دراوە بۆ ئەمە، پاشان وتی: بەڵام خەڵکی زۆر تیایدا ڕۆچوون پاشان باسی گۆڕی (حوسەین)ی کرد (ڕەزای خوای لەسەر بێ) کە خەڵکی چی ئەکەن لەدەوری، کە ئەم دوو گێڕانەوە –الخلال– ڕیوایەتیانی کردووە لە –کتاب الادب–دا.

–الشیخ ابن تیمیە– دەڵێ: ئەبو عەبدوڵڵا لەسەر ئەم دیمەنانە زۆر ڕۆیشتووە و درێژەی پێداوە، کە مەبەست پێی ئەو شوێنانەیە کە ئاساری پێغەمبەران و پیاوچاکانی تیایە بەبێ ئەوەی بکرێن بە مزگەوت، وەك شوێنەکانی مەدینە، لەنێوان ئەو کەمانەی کە ئەو شوێنانەیان نەگێڕاوە بە شوێنی جەژن و ئەو زۆرانەی کە گێڕاویانە بە شوێنی بۆنەی پیرۆز وەك لەپێشتر باسمان کرد.

ئەم تەفصیل و درێژە پێدانەیە تیایدا ئاسار و فەرموودەی هاوەڵانی کۆکردۆتەوە، کە پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە صەحیحەکەیدا لە موسای کوڕی عەقەبەوە، دەڵێ: سالمی کوڕی عەبدوڵڵام بینی کە لە ڕێگەیدا چاوی دەگێڕا بۆ ئەو شوێنە ئاسارانە و نوێژی تیا دەکرد، وە ئەیوت کە باوکم تیایدا نوێژی خوێندووە و کە ئەویش پێغەمبەری خوای بینیوە کە لەو شوێنانەدا نوێژی تیا خوێندووە، موسی دەڵێ: هەروەها نافع بۆی گێڕاومەتەوە کە ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لەسەر بێ ئە لەو شوێنانەدا نوێژی خوێندووە.

کە ئەمەش ئەو وتەیەیە کە پێشەوا ئەحمەد ڕوخصەتی تیادا فەرمووە.

بەڵام ئەوەی کە بە کەراهەتی داناوە، ڕیوایەت کراوە لە (سەعیدی کوڕی منصورەوە لە –سننە–دا، دەڵێ: ئەبو موعاویە بۆی گێڕاینەوە، لە (ئەلمەعروری کوڕی سوید)ەوە، لە عومەرەوە (ڕەزای خوای لەسەر بێ)

فەرمووی: لە یەکێ لە سەفەرەکانی حەج دا لە خزمەتیا حەجمان کرد لە نوێژی بەیانیدا لە ڕکعاتی یەکەم (أَلَمْ تَرَ كَيفَ فعل رَبُكَ بأصحاب الفيل)ی خوێندو لە دووەمدا (لإيلاف قريش) دەخوێند کاتێ گەڕایەوە خەڵکی لە ڕێگە بینی بەرەو مزگەوتێك پەلەیان کردو ڕۆشتن، پرسیاری کرد: ئەمە چیە؟ وتیان: ئەوە ئەو مزگەوتەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تیا خوێندووە. فەرمووی: ئە بەم کارانە بوو کە ئەهلی کیتابیەکان بەهیلاکا چوون کە شوێنی ئاساری پێغەمبەرەکانیان دەکردە شوێنی موبایەعە و فرۆشتن، کێ لە ئێوە نوێژی تیا کرد تازە کردی، کێشی نەیکردووە با بێت برۆین)).

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێ) پێی ناخۆش بوو کە شوێنی نوێـژی حـەزرەتی پێغەمبـەر ﷺ بکـرێ بـە شـوێنی جەژنـە، وە ڕوونـی دەکردەوە کە ئەهلی کیتابیەکان بەو کارانەیان لەناوچوون.

شـێخ –ئیبنـو تەیمیـە– دەڵـێ: ( زانایانمـان (ڕەزای خوایـان لەسـەر) جیاوازی رایان هەیە لەسەر هاتن بۆ ئەو شوێنانە ) .

محمدی کوڕی وضاح دەڵێ: پێشەوا مالك و غەیری ئەویش لە زانایانی مەدینە پێیان خۆش نەبوو کە سەردانی ئەو مزگەوت و ئاسارانە بکرێ لە شاری مەدینە جگە لە قوبا و و ئوحود نەبێ، وە سفیانی ثەوری هاتە ناو (بیت المقدس) ەوە نوێـژی تیـا خوێنـد ئـیتر نەچـوو بـۆ شـوێن نوێـژ و ئاسارەکانی تر کە لەویا بوون.

ئەم کەسانە بە شێوەیەکی ڕەها ئەم کارەیان بەباش نەزانیوە لەبەر ئەو گێرانەوەیـەی پێشـەوا عومـەر (ڕەزای خـوای لەسـەر بـێ) ، ئـەم باسـەیە هاوشێوەیە لەگەڵ نوێـژ خوێندن لەسـەر گۆڕەکان، کـە ئـەم کارەیـە ڕێگـە خۆشکەرە بۆ گێرانی بە خۆشی یان چاوکردن لە ئەهلی کیتابیەکان، وە

لەبەرئەوەش کە ئەو کارەی ئیبنو عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێ) هیچ کام لە هاوەڵان هاوڕا نەبوون لەگەڵیدا، ئیتر نەهاتووە لە یەکێ لە خولەفای ڕاشدین و غەیری ئەوانیش لە موهاجرین و ئەنصارەکان، کە بە قەصد و نیەت گەڕابن بۆ ئەو شوێن و ئاسارانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا نوێژی کردبێ یان تیایا دانیشتبێ .

وە کۆمەڵێکی تر لە زانایان بەتایبەتی ((متأخرين)) ئەو کارەیان بە باش و موستەحەب داناوە. وە باسی لە نوسینی زۆر لە نوسەران کردووە لە هاوەڵانی ئێمە وە غەیری ئەوانیش لە کاتی مەناسکی حەج دا کە وتویانە موستەحەبە زیارەت کردنی ئەو شوێنانە کە بەدرێژی لە نوسینەکەیدا ئاماژەی پێداوە.

بەڵام پێشەوا ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لەسەر):

ڕوخصەتی داوە کە سەردانی ئەو شوێنە پیرۆز و ئاسارانە بکرێ مەگەر بیگێڕێ بە شوێنی جەژن و خۆشی ئنجا نابێ، بە نموونە خەڵکی لەو شوێنە ئاسارەدا کۆببنەوە لەکاتێکی دیاریکراودا، هەروەك چۆن ڕێگە دراوە بە ئافرەتان کە بێن بۆ مزگەوتەکان و ئامادەی نوێژی بەکۆمەڵ بن لەکاتێکدا کە ماڵەکانیان خێری بۆیان زیاترە نوێژی تیا بکەن مەگەر ڕێگەیان پێ نەدرێ لە کاتێکدا کە پۆشتە نەبن و توشی فیتنە و گوناه بن، کە بەڵگەو ئاساری زۆری لێرەدا هێناوە وە پشتی بە فەرموودەکەی ئیبنو ئوم مەکتوم بەستووە [1] ) .

وتەکەی شێخ –ابن تيميه– تەواو بوو..

---

[1]– بنوارە بۆ –اقتضاء الصراط المستقيم– ابن تيمية لا ٣٨٧.

بە کورتی ئەوەی لە وتەکەی پێشەوا ئەحمەد ئەبینرێ:

بەلایەوە دروستە وە ڕێگەی داوە کە سەردانی ئەو ئاسار و شوێنە پیرۆزانە بکرێ کە دراونەتە پاڵ پێغەمبەران و پیاوچاکان، وە وا ئەبینێ کە ئەم جۆرە سەردانانە و گرنگی پێدانیان سەرەتاو ئەصڵی لە سوننەتی پێغەمبەردا هەیە، وە کارێکە نەداهێنراوەو نە گومڕایی‌یە، نە هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە و نە بێ بڕوا بوونیشە، بەڵام سەرزەنشتی ئەوانە دەکرێ کە بە شێوەیەکی زیاد لە پێویست تیایدا ڕۆدەچن، کە ئەمە کورتەی ڕایەکەیەتی ڕەزای خواری لەسەر بێ .

ئەمما شێخ ئیبنو تەیمیە لە وتەکەی پێشەوا ئەحمەدەوە زۆر بە درێژی تێگەیشتنەکەی لەنێوان زۆرینە و کەمینەدا ڕوون کردۆتەوە، وە وا تێگەیشتووە کە ئەم کارە لای پێشەوا ئەحمەد کەراهەتی هەیە، وە حوکمی داوە بەسەریدا کە کارێکی مەکروهە و تەواو، ئیتر هیچ ڕوونکردنەوەیەکی زیاترە نەهێناوە لەسەر کەراهەتەکە، کە ئیبنو تەیمیە ڕوونی دەکاتەوە کە زیادە ڕەوییەکی زۆر بە ئاسارەکانی پێغەمبەرایەتیەوە دەکرێت و پەیڕەوکردنی بەم شێوازە جێگای گومان و دوو دڵی‌یە، وە گێڕانی ئەم شوێن و ئاسارانە بە بۆنەی پیرۆز و کۆبوونەوەو ئاهەنگ گێڕان لەم جێگایانەدا وە لە کاتێکی تایبەتیدا کەراهەتی هەیە.

هەروەها لە وتەکەی ئیبنو تەیمیەوە ئەوە تێدەگەین کە:

ئاسار و ئەو شوێنە پیرۆزانەی کە جێگیر بووە کە پێغەمبەران کردوویانە بە مزگەوت و نوێژیان تیا خوێندووە، لەم ڕوونکردنەوەیەی ئەو دەردەچێ، وە مەبەستی ئەوان نی‌یە، وە ئەو شوێن و ئاسارانەی کە جێگیر بووە کە پێغەمبەران نوێژیان تیا خوێندووە مەزیە و تایبەتی خۆیان هەیە و دیاری کراون بۆ بەندایەتی و نوێژ خوێندن تیایاندا، کە ئەم بۆچوونەی بە ئاشکرا

لەسەرەتای وتەکانیدا دەردەکەوێ کە دەڵێ ((لکنهم لم یتخذوها مَسجداً))

وە لەوەشەوە کە دەڵێ ((فقد فصَلَ ابو عبدالله في المشاهد –وهي الأمكنة التي منها آثار الأنبياء و الصالحين من غير أن يكون مساجد لهم كمواضع بالمدينة– بين القليل الذي لا يتخذونه عيداً والكثير الذي يتخذونه عيداً كما تقدم))[1] ..

(کە ئەمە پێشتر باسمان کردووە) ..

## مانای (العید) کە نەهی لێ کراوە لە فەرموودەکەی حەزرەتی پێغەمبەردا ﷺ

شێخ ئیبنو تەیمیە مانای ( العید ) ی لە فەرمودەکەدا کە نەهی لێکراوە دیاری کردووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لا تتخذوا قبري عيداً ) ، دەڵێ: ئەوەی دەبینی دەکرێ لەلای ئەم گۆڕانە ئەوە ئەو نەهیەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتتخذوا قبري عيداً)..

گەر مەبەست شوێنی دیاری کراو لەکاتێکی دیاری کراودا بێ وە بکرێ بە عادەت لە ساڵێکدا یان مانگێکدا یان هەفتەدا ئەوە بە مانای –العید– دەبێ، پاشان نەهی لێکراوە لە بچوك و گەورەی، کە ئەمە ئەو مەبەستەیە کە پێشەوا ئەحمەد ئینکاری لێ کرد وەك لەپێشتر بەیانمان کرد.

پاشان دەڵێ: خەڵکی لەم باسەدا و لەم سەردانانەدا زۆر ڕۆچوون وەك ئەوەی لەلای گۆڕی حوسەین دەیکەن.

وە لە شوێنێکی تریدا دەڵێ: (وە گێڕانی گۆڕەکانیان بەشوێنی جەژنەکان، ئەوە ئەوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی بە حەرامیان داناوە، وە عادەتی خەڵکی کە نیەتی ئەو گۆڕانە دەکەن لە کاتێکی دیاری کراودا، وە

---

[1]– ابن تيمية– إقتضاء صراط المستقيم، لا ٣٥٨.

کۆبوونـەوەی سـاڵانە لـەلایان لـە کـاتێکی دیـاری کـراو ئـەوە پـێ ی دەڵـێن (إتخاذها عیداً) وەك پێشتر باس کرا، ئیتر نازانم لەنێوان موسوڵمانان لە ئەهلی عیلم هیچ جیاوازیەکی ڕا هەبێ ئیتر گومڕا و مەغرور مەبە بە زۆری بەندایـەتی بـەتاڵ، چـونکە ئـەوە خۆشـوبهاندنە بـە ئـەهلی کیتابیـەکان وەك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداوین کە لەناو ئومەتەدا پەیدا دەبن)[1] .

## بیروڕای دانەری ئەم کتێبە

ئەم شێوە باس کردنەی کە شێخ ئیبنو تەیمیە باسی کـردووە هـەمان ئـەو بیروڕایەیە کـە ئێمـە باوەڕمـان پـێ یـەتی بـە فـەزڵی خـوای گـەورە، ئـەوە ئـەو شێوەیەیە کە ئێمە بانگەشەی بۆلا دەکەین و هـانی خـەڵکی بۆ لا ئەدەین لە هەموو شوێن و موناسەبەکانمان دا، ئێمە هانی خەڵکی ئەدەین کە شوێن و ئاسـار و گـۆڕی پێغەمبـەری خـوا ﷺ نـەگێڕن بـە بۆنـەی پیرۆز، نـەهیمان لێ کردون کە ئەو شوێنانە تایبەت بکەن بە یەکێ لە جۆرەکانی بەندایەتیەوە کـە دروسـت نـەبێ کردنـی مەگـەر بۆ خـوای گـەورە نـەبێ، نـەهیمان کـردووە لێیـان کـە ڕۆژێـك تایبـەت بکـەن و بـڕۆن لـە دەوری گۆڕەکـەدا کۆببنـەوە و ئاهەنگ بگێڕن ، ئەمە باوەڕ و ئیعتیقادی ئێمەیە و لەسـەری موسوڵمانین، نەك لەمڕۆوە یان لـە دوێنێ یـەوە، بەڵکو ئەوە ئەو دینەیە کە لـە سەلەف و پێشـینانمانەوە پشـت بە پشـت بۆمان بەجێ مـاوە، ئـەوەش فـەزڵی خـوای پەروەردگارە بەسەرمانەوە..

ئەوەی پێویست و واجبە لەسەرمان کە تێبینی بکەین و بەچاوی پەند لێ وەرگرتنـەوە وەری بگـرین لـەو وتانـەو لـەو لێکۆڵینـەوە زانسـتی یانە کـە لـە زەوقێکـی جـوانی زانسـتی یەوە لێـی تێبگـەین، ئەوەیـە کـە نابـێ بکەینـە

[1]- بنوارە بۆ (اقتضاء الصراط المستقيم) ابن تيمية ٢٧٧/٢.

ئەوەی موسوڵمانان بێ بڕواو تەکفیر بکەین، یان حوکمی گومڕایی و داهێنراوی بدەین بەسەریدا تەنها بەلەچاو گرتنی ئاسارێکی پێغەمبەرایەتی یان گرنگی دانی بە پلەو مەقام و شوێنە تایبەتەکان کە دراونەتە پاڵ پێغەمبەران و پیاوچاکان، وە پێویستە لە شوێن گومانی چاکدا بن و گومانی باشیان بەرانبەر بدەین، وە بزانین کە نیەتی تەواو و مەقصود تەنها خوای گەورەیە و ئەمانە هەموو هۆکارن بۆ زیادبوونی بڕوا لە نەفسەکان دا و دەبنە دروست بوونی پەیوەندییەکی ڕۆحی و زانستی بە خاوەنەکانیان و مێژوو ژیانیان، لە کاتێکدا ئەوانە قدوەو پێشەوای چاکەی خەڵکی بوون، لەگەڵ ئەمەشدا بەوچوون و سەردانە تووشی ئەو بەرەکەت و نەفەحاتە دەبن کە لە شوێنی کردەوە خێریەکان دا بەردەوام دڕژێتە خوارەوە، چونکە ئەو شوێنانەی کە زیندوکراونەتەوە (ئاوەدان کراونەتەوە) بە کەسی چاك و صالح بەردەوام شوێنی ڕازی بوون و خۆشنودی خوایین، وە ئەو شوێنانەش کە بە ئەهلی خراپەکاران و فەساد ئاوەدان بوون، بەردەوام توڕەیی و سەخطی خوایی بەسەرەوەیە، هەر لەبەر ئەم هۆکارەشە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ فرمان دەکات بە هاوەڵانی کە نەچنە ناو شوێن و ماڵەکانی (ثەمود)ەوە، مەگەر چوون بە شێوەیەك بێ بگرین و داوای لێخۆش بوون بکەن، وە نابێ لە ئاوەکەی بخۆنەوە، بەڵکو فرمانی پێ کردن کە ئەوەی خواردویانەتەوە بیهێننەوە، وە فرمانی کرد ئەو خواردنەی لەوێ لێنراوە نەیخۆن، وە فەرمووی پێیان کە گەیشتنە (وادی محسر) ئەو شیوەی ناسراوە بە (شیوی ئاگر) پەلە بکەن لە ڕۆیشتن تیایدا و نەمێننەوە لێی.

کە لە باسێکی سەربەخۆو تایبەت بە تەبەروك کردنم بە ئاسارەکانی پێغەمبەری خواوە ﷺ زیاتر ئەم ڕاستیانەکان ڕون کردۆتەوە لەم کتێبەدا..

# گرنگی دان به ئاسار و شوێنه پیرۆزەکان

پارێزگـاری کردنـی ئاسـارەکانی پێغەمبەرایـەتی پارێزگـاری کردنـە لـە سەرچاوەیەکی گەورە و توراث و زەخیرەیەکی پیرۆز و مێژوویەکی ڕوون.
کە بریتی یە لە مێژووی ئومـەتێك کە شانازی پێوە دەکرێ، کە بەهۆیـەوە گـــەورەیی پیاوەکـــانی دەردەکـــەوێ کـــە بوونـــە مایـــەتی عیـــزەت و سەرکەوتنەکانی، کە پشت کردنە ئەو ئاسارانە، پشت کـردن و لـەناوبردنی ئەو حـەضـارەت و مێژووە ئیسلامیەیە کە ئەمڕۆ واقیعە و بەبێ ئیسلام کەس ژیـانی بـۆ نـابرێ بـەڕێوە، پشـت تێکردنـی دەبێتـە سـڕینەوەی بنـەما سروشـتیەکان کـە ماونەتـەوە لـەو تـوراثـە ئیسـلامیە، وە تـاوانێکی گەورەیە بەرانبەر مێژووی ئومەتی ئیسلام..

ئەگەر وترا: کە هەنـدێ کـەس ئـەو شـوێنانە دەکەنـە شـوێنی –عیـد– و تیایدا هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن بە بەندایەتیان بۆ غـەیری خـوا و یـان بـە سـوڕانەوە بـەدەوریان دا، یـان بـە دانـان و بەسـتنی پـەت و پـەڕۆکان و وەرگرتنی گەڵای دارەکانیان یان سەربڕین بۆیان.

دەڵێین: ئەمانـەی کـە بـاس کـران، بەهیچیان ڕازی نین و لەگەڵیانـدا ڕێـك ناکـەوین، بـەڵکو خـەڵکی لێ دوور دەخەینـەوە و بـەکارێکی نـەهی لێکـراوی دەزانین، ئەوە لە نەزانینەوەیە پێویستە بەرانبەر ئەو نەزانینـە بوەستینەوە، چـونکە ئـەو کەسانە باوەڕیـان بـە خـوا هەیـە و دان بـە یـەکتایی خـوایی دا ئەنێن و شایەتی ئەدەن کە هیچ خوایەك نیە بپەرسترێ مەگەر (الله) نـەبێ، بـەڵام کردەوەیـەکی هەڵـە ئـەنجام ئـەدەن و بەڕاسـتی یـەکان نـەزانن، کـە پێویستە زانیاریان پێ ببەخشرێ و ئیرشادی ڕێگەی ڕاستیان بکرێ، بەڵام دەبێ ئەو ڕاستیەش بزانین کـە ئـەو کردەوانـە نابێتـە هۆکـار بۆ پشـت گـوێ خستنی ئـەو کەسانەو لابـردن و سـڕینەوەیان لـە بوون، کـە عـوزر هێنانـەوە

بەو بەڵگانە عوزرێکی ساردو سڕەو عیلەتەکانیش لەلای زانایان و خاوەن عەقڵەکان قبوڵ نەکراوەو وەرنەگیراوە، چونکە دەتوانرێ ئەو هۆکارانە کە ئاستەنگن ئەگەر هەبن لاببرێن، وەك قەدەغەکردن و چاودێری، وە فرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە، وە بانگەشە بۆ بەرنامەکەی خوا بە حیکمەت و دانایی و ئامۆژگاری چاکە و ڕەوشتی جوان، لەگەڵ مانەوەی ئەو ئاسارانەو پارێزگاری لێکردنیان لە فەوتان و گرنگی دان بە مانەوەیان وەك ئەساڵەتێکی ئومەت و وەفایەك بۆ مێژووەکەی، وە ئەدای ئەو ئەمانەتەی کە لە گەردنماندایە، کە بەشێکی سەرەکی‌یە لە مێژووەکەمان کە مێژووی پێغەمبەرەکەمانە ( صەڵات و سەلامی خوای لەسەر ) .

بیرتیژەکان ئەمڕۆ پارێزگاری دەکەن لەو ئاسارە فەوتاوانەی کە بەسەر ئوتەمە نەفرەت لێکراوەکان دا هاتووە کە لەپێش ئێمەدا سزادراون، وەك هۆزی عاد و ثمود، ئایا دروستە پارێزگاری لە پاشماوەی ئەو ئاسار و شوێنە لەعنەتیانە و هەوڵ دان بۆ مانەوەیان بدرێ، بەڵام ئاسارو شوێن پێی بەڕێزترینی خەلقی خوا بسڕێتەوە ؟ ، کە بە بوونی بیلاد و عیباد شەرەفدار بوون، بەهۆیەوە خوا عیزەتی دا بەم ئومەتەو لەناو ئومەتاندا بەرزی کردەوە، بەشێوەیەك کەس سەری لەم ئومەتە بەرزتر نابێ نە لە مێژوو دا و نە لە ئێستاو نە لە داهاتوودا، کە هەمووی بەهۆی گەورەیی شەرەف و ڕێزی حەزرەتی محمدی کوڕی عبدالله وەیەﷺ

## گرنگیدانی قورئان بە ئاساری پێغەمبەرانی پێشوو

خوای پەروەردگار لە کتێبە پیرۆزەکەیدا باسی چیرۆکی تابوتی بەنی ئیسرائیلیەکان دەکات کە چۆن گێڕابوویان بە نیشانەیەك بۆ دەسەڵاتی طالوت بەسەریانەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نِبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن

يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾البقرة:٢٤٨..

ئەم تابوتـە پلەيـەكی بـەرز و ڕێزێكـی تايبـەتی هەيـە، لـەلای ئـەوان زۆر گـەورە بـوو لـە كـاتی شـەڕەكانيان دا لەگـەڵ خۆيـان ئـەو تابوتـەيان دەبـرد و ئـەيانوت بـە بەرەكـەتی ئـەم تابوتـەو ئەوانـەی نـاوی سـەركەوتن بەدەسـت دەهێنين، واتە تابوتەكە و ئەوانەی ناويان دەكردە تەوەسول بۆ لای خوا تـا خـوای گـەورە سـەركەوتويان بكـات، ئەوانـە شـەڕيان لەگـەڵ هـيچ كەسـێكدا نەدەكرد مەگەر ئەو تابوتەيان لەگەڵدا ئەبوو، خوای گەورە هـەواڵی داوە كـە ئـەو شـتانەی نـاو تابوتەكـە سـەكينەتێكی ئيلاهی‌يـە، وە ئاسـار و كەلوپـەلی پێغەمبەرانە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ﴾ البقرة: ٢٤٨ ئەو پاشماوەيـەی كـە پێغەمبـەر موسـی و پێغەمبـەر هارون بەجێ مـاوون وان لـەناو ئـەو تابوتـەدا، پاشماوەكـەی يـان ميراتەكـەی ئـالی هـارون بريتـی بـوو لـە: عەصـاكەی موسـا، وە عەصـای هـارون و پۆشاكەكانی، وە دوو نەعل و دوو لەوح ی نوسراوە لە تـەورات [1]، هـەروەها تەشتێكی لە ئاڵتون كە دڵی پێغەمبەرانی تيا ئەشۆرا [2]. تەواو بوو.

وە بەهۆی ئەو پاشماوە و ميرات و ئاسارە پيرۆزانەوە كە دراونەتە پاڵ ئەو دوو هەڵبـژێراوە لـە پێغەمبـەرانی خـوا ، ئـەو تابووتـەش ڕێزلێگـراو بـوو لەلايـەن خـواوە مقـامی پـێ بەخشـراوە ، كـە بـە چـاودێری پـەروەردگار پـارێزراوە، بـەڵام كاتـێ گونـاه و بـێ فرمـانی خوايـان كـرد ئەهليـەتيان بـۆ پارێزگـاری ئـەو تابوتـە و ئـەو شـتە پيرۆزانـەی نـاوی نـەما و لێيـان سەنرايەوە، وەك سزايەك بۆيان لەلايەن خواوە .

---

١ ابن كثير – تفسير القرآن العظيم ١ \ ٣١٣ .

٢ ابن كثير – البداية و النهاية ٢ \ ٨ .

خـوای گـەورە پارێزگـاری لـە تابوتەکـە کـرد هـەتا ماوەیـەك، پاشـان گەڕاندیـەوە بۆیـان هـەتا ببێـت بـە نیشـانەو بەڵگەیـەك لەسـەریان، بەڕاسـتی دەسەڵاتی طالوت ڕازی بن ، ئینجا خوای گەورە بە فریشتەدا تابوتەکەی بۆ گێڕانەوە هەتا بەهۆیەوە ڕێـزو شکۆی جارانیان بۆ بگەڕێتەوە. چ بایـەخ و چـاودێریەك مـەزنترە لـەو عینایـەت و بایەخـەی بـە ئاسـار و پارێزگـاری لێکردنیـان کـە خـوای گـەورە گێڕاویـەتی بـە مایـەی هۆشـیاری کردنـەوەی ژیرەکـان و تێگەیشـتنی لـە بایـەخ و بـەهای مێـژووی و ئـاینی ئـەم شارستانیەت و شوێنە پیرۆزانە...

## گرنگیدانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاساری پێغەمبەرانی پێشوو وە ڕێنومایی پێغەمبەر ﷺ بەو گرنگیدانە

گرنگی دانی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ بەو ئاسارە پیرۆزانەی پێش خۆی کـە چـەند شـوێنێك بـوون ڕەحمـەتی خوایـان تیـا نـازڵ بـوون و شـوێنی بەرەکەتی خـوایی بـوون، یـان شـوێنی لـەدایك بـوونی پێغەمبـەران و هاتنـە خوارەوەی وەحی بوون، ئەم گرنگی دانەی حەزرەت ﷺ ئاشکرایەو دیارە، کە ئێمـە نامـە و نوسراوی تایبـەتیمان لەم بارەوە هەیە کە لـەکاتێکی تـردا پشت بەخوا بلاوی دەکەینەوە، وە لێرەدا تەنها ئیکتیفا بە مەنـدە دەکـەین و دەڵێین:

پێشـەوا مالـك لـە کتێبـی ((الموطـأ))ی دا ڕیوایـەتی کـردووە لـە محمـدی کوڕی عـەمری کوڕی حەلحەلەی ئەلدیلیەوە، لـە محمـدی کوڕی عـەمرانی ئەلئەنصاریەوە، لە باوکیەوە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هات بۆ لام کە من لە ڕێگەی مەککە لەژێر درەختێکدا دابەزی بووم، وتـی: بۆچـی لـەژێر ئەم درەختـە دابـەزیوی؟ وتم: سێبەرەکەی دایبەزاندوم، وتـی: غـەیری ئەمـە

هیچی تر نییه؟ وتم: نهخێر، غهیری سێبهرهکهی هیچی تر نییه.
عهبدوڵلای کوڕی عومهر وتی:

پێغهمبهری خوا ﷺ پێی وتم: ( اذا كُنْتَ بينَ الأخشبين مِنْ مِنىً –وَنُفِخَ بيده نحو المَشرق– فإنَّ هنالكَ وادياً يُقالُ لَهُ: السُرَّر، به سَرحَةُ سُرَّ تحتها سَبْعُونَ نبيّاً) قال مالك: ((سُرَّ– يعني قطعت سُرَرُهم حين ولِدوُا )) [1].

واته: ((کاتێ ڕێت کهوته نێوان ئهخشهبهین له مینا، به دهستی ئامازهی بۆلای ڕۆژههڵاتی کرد، فهرمووی: ئهلهوێ شیوێك ههیه پێی دهڵێن (السُرَرْ) که لهویادا (سَرْحة) واته درهختێك ههیه له ژێریدا ناوکی حهفتا پێغهمبهر براوه. پێشهوا مالك وتی: (سُرَّ) واته بڕینی وێلاشی سهر ناوکی منالْ کاتێ لهدایك دهبێ..))

ئهلزهرقانی دهڵێ: (به سَرحَةُ سَرَّ تحتها سبعُون نبيّاً) یانی: لهژێریا لهدایك بوون ناوکیان براوه، (سُرُّهم) به ضهمه بریتییه لهو شوێنهی که مامان ناوکی منالهکهی تیا دهبڕێ، ههروهك له –النهاية– وه غهیری ئهو هێناویهتی.

ئهلسیوطي دهڵێ: واته: لهژێریا ناوکیان براوه لهکاتێکدا لهدایك بوون، که ئهم مانا مهجازیه، لهبهر دراوسێیهتی (ناوك) ناونراوه (سُرَّ)..
مالك دهڵێ: بُشِّروُا تحتها بِما يَسُرَّهُمْ) .

---

[1]– ئیمامی مالك له –الموطأ– كتاب الحج–باب جامع الحج١ :٤٢٤ ڕیوایهتی کردووه وه (ابن حبان) له صحیحه–: (الاحسان ٤٧/٨ ژماره ٦٢١١، وة (النسائي) له (كتاب الحج) باب ما ذكر في منى ٥ :٢٤٩ ژماره ٢٩٩، وه (احمد) له (المسند) ٢ :١٣٨ ژماره ٦٢٣٣، و (البيهقي) له (السنن الكبرى) كتاب الحج–باب النزول بمنى: ١٣٩/٥ ژماره ٩٦١٠ هێناویانه.

(ابن حبيب ) دەڵێ: (ئەوە لە دڵخۆشیەوەیە واتە بێن بە پێغەمبەر لەژێریدا یەك لەدوای یەك، تەفسیریان بەوە كردووە و منیش وا دەڵێم، وە تیایدا تەبەروك وەرگرتنە بە ئاثار و شوێنی پێغەمبەران)[1] .

(ابن عبدالبر) دەڵێ: (لەم فەرمودەدا بەڵگەیەكی بەهێز هەیە لەسەر تەبەروك كردن بە شوێنی پێغەمبەران و پیاوچاكان و مەقام وماڵیان، وە بۆ ئەم مەبەستەش بووە كە عبدالله ی كوڕی عومەر ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە، خواش زاناترە)[2] .

## خولەفای ڕاشدین پارێزگاری موستیلەكەی پێغەمبەر دەكەن ﷺ

پێشەوا بوخاری بە سەنەدی خۆی ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) كە فەرموویەتی: { پێغەمبەری خوا ﷺ خاتەم و موستیلەیەكی زیوی هەبوو لە دەستی دا بوو، پاشان لەدوای ئەو لە دەستی ئەبی بەكردا بوو، پاشان لەدوای ئەو لە دەستی عومەر دا بوو، پاشان لەدوای ئەو لە دەستی عوثمان دا بوو، هەتا كەوتە ناو بیری (ئەریس)ەوە، كە لەسەری نەقش بوو: محمد رسول الله}[3] .

ئیبنو حەجەری حافظ دەڵێ: (لە گێڕانەوەكەی پێشەوا –ئەلنەسائی–دا هاتووە: حەزرەتی عثمان زۆر هەوڵی دا بەڵام بۆی نەدۆزرایەوە) وە لە

---

[1]– شرح الزرقاني على (الموطأ) ٢/٣٩٩

[2]– (التمهيد) لأبن عبدالبر ١٣/٦٧.

[3]– پێشەوا بوخاری لە –صحيح البخاري– كتاب اللباس– باب نقش الخاتم ڕیوایەتی كردووە.

گێڕانـەوەی ئیبنـو سـەعید دا هـاتووە کـە: ئـەو موسـتیلەیە لـە دەسـتی حەزرەتی عوثمان دا بوو ماوەی شەش ساڵ)[1] .

ئەلعەینی دەڵێ: (بیری ئیرس لە باخچەیەك دابوو نزیك مزگەوتی قوباء)[2] .

دەڵێم: ئەو بیرە ئەمڕۆ ناسراوە بە بیری موستیلەکە (بئر الخاتم)، کە ئەو موسـتیلەکەی حـەزرەتی پێغەمبـەر بـوو ﷺ کـە لـە ڕۆژانـی خەلافـەتی عوسماندا کەوتـە ئـەو بیرەوە، ماوەی سێ ڕۆژ بە تـەواوەتی هـەوڵی دا کە دەریبکات و بیدۆزێتەوە بەڵام نەیاندۆزیەوە)[3] .

## خولەفای ڕاشدین پارێزگاری لە حەربەکەی پێغەمبەری خوا دەکەن ﷺ

پێشـەوا بوخـاری بـە سـەنەدی خـۆی ڕیوایـەتی کـردووە لـە زوبـەیرەوە (ڕەزای خـوای لەسـەر بـێ) کـە وتوویـەتی: (لـە ڕۆژی بـەدرا گەیشـتم بـە عوبەیـدەی کـوڕی سـەعیدی کـوڕی ئـەلعاص کـە هـەموو گیـانی بـە چـەك داپۆشی بـوو (مُـدجَج) تـەنها چاوەکانیت ئەبینی، کە کونیـەی (بـاوکی ذات الکرش)ی هەبوو، وتی من (باوکی ذات الکرش)م، منیش ئەو ڕمەی پێم بوو پـێی ئـەوترا (العنـزة) دام لـە چـاوی و کوشـتم، هشـام وتـی: هـەواڵم پێگەیشـتووە کـە زوبێـر وتـی: قاچـم خسـتە سـەر لاشـەی تـا ڕمەکـەم دەربکەمەوە بەنارەحەتی دەرهات.

عروة دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ داوای کرد ئەو ڕمـەی پێبـدا، ئـەویش پـێی دا، کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد بردیەوە، ئەبوبەکر داوای لێ کرد بیداتێ

---

[1]- ابن حجر-فتح البري ٣١٣/١٠.

[2]- العيني-عمدة القاري ٣١/٢٢.

[3]- بنوارە بۆ (المغانم المطابة في معالم طابة)ی فيروز آبادي ٦١٢/٢.

پـێی بەخشـی، کاتـێ ئەبوبەکر وەفـاتی کـرد بردیـەوە عومـەر داوای لێ کـرد پێی بەخشی، کاتێ عومەر شەهید بوو بردیەوە عثمـان داوای لێ کـرد پـێی بەخشی، کاتـێ عثمـان شـەهید بوو کەوتـە لای ئـالی عـەلی[1]، عبدالله ی کوڕی زوبـەیر داوای کـردەوە پێیـان دایـەوە لـەلای ئـەو بـوو هـەتا ئـەویش شـەهید بوو)[2].

کورتـەی ئـەم چیرۆکە: زوبـەیر لـە ڕۆژی بـەدرا بـە (العنـزە) بەیـەك دای لـە چـاوی عبیـدەی کـوڕی سـەعیدی کـوڕی عـاص و کوشـتی، پێغەمبـەر ﷺ داوای ئـەو حەربەیـەکی کـرد، ئـەویش پـێی بەخشـی کاتـێ پێغەمبـەر ﷺ وەفاتی کرد زوبەیریش بردیەوە، پاشان ئەبوبەکر داوای لـە زوبـەیر کـرد بـە ئیستعارە پێی بدا ئەویش پێی بەخشی و لەلای بوو هەتا ئەویش وەفـاتی کـرد، پاشـان گەیشـتەوە بـە خـاوەنی یەکـەمی کـە زوبـەیرە، پاشـان عومـەر داوای لێ کـرد زوبـەیریش پـێی بەخشـی و لـەلای مایـەوە تاوەفـاتی کـرد، پاشان زوبەیر بردیەوە بۆ لای خۆی، پاشان عوسمان داوای لێ کـرد ئـەویش پـێی بەخشـی لـەلای بـوو تـا شـەهید بـوو، کەوتـە لای عـەلی بەداواکردنی لـە زوبەیر، لەلای مایەوە تا شەهید بوو[3].

ئێمەش دەپرسین: بۆچی ئـەو چـوار خەلیفەیـە سـوور بـوون لەسـەر دەسـت کـەوتنی ئـەو حەربەیـە لـە کاتێکـدا هـەزارەها ڕم و حەربـە هەیـە، وە بگـرە جوانترو گەورەتر و چاکتر هەیە، ئەم حیرص و سووربوونە بۆچی؟

---

[1]- ئالی عەلی: یانی لای ئیمامی عەلی بوو، دوای ئەویش لای ئەولادەکانی بووە.

[2]- بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە (کتاب المغازي) باب شهود الملائكة بدراً.

[3]- بنوارە بۆ (الفتح) ٣١٤/٧، و (عمدة القاري) ١٠٧/١٧.

## پارێزگاری عومەری کوڕی خەطاب بۆ میزابی[1] عەباس که پێغەمبەر ﷺ خۆی دایینابوو

له عبدالله ی کوڕی عەباسەوە (ڕەزای خوایان لەسەر) دەگێڕێتەوە وتی: ((عەباس میزابێکی لە ڕێگەی عومەردا هەبوو، عومەر لە ڕۆژی هەینی پۆشاکی تازەی دەپۆشی، عەباسیش لەو ڕۆژە دوو (فرخ-باڕۆکە)ی سەربڕی بوو ئاوی کرد بە خوێنەکەدا و لە میزابەکەوە هاتە دەرەوەو بەر پۆشاکەکانی عومەر کەوت، ئیمامی عومەر فرمانی کرد بە لابردنی ئەو میزابەیە، پاشان گەڕایەوە ماڵەوە و پۆشاکێکی تری پۆشی، پاشان هات و پێش نوێژی بۆ خەڵکی کرد، پاشان ئیمامی عەباس هات بۆ خزمەتی و پێی وت: وەڵڵاهی ئەو میزابەیە شوێنێکە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی خۆی دایناوە. ئیمامی عومەر فەرمووی بە ئیمامی عەباس: سوێندت ئەدەم کە دەبێ بچیتە سەر پشتم هەتا لەو شوێنەیە دایدەنێیتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لێی داناوە. عەباسیش بەو شێوەیەی کرد کە فرمانی پێ کرابوو.[2]

پێشوا ئەبو محمد عبدالله ی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محمدی کوڕی قودامە لە کتێبی (المغنی) دا دەڵێ:

{فصل: (دروست نی‌یە دەرکردنی (میزاب) ئاوەڕۆ بۆ سەر ڕێگەی گشتی، وە دروست نی‌یە دەربکرێ بۆ سەر کۆڵانێك کە دەربچێ مەگەر بە پرسی دانیشتوانەکەی).

---

[1]- میزاب: شوێن ئاوەڕۆی ماڵەکان کە ئەهاتە سەر کۆڵانەکان.

[2]- بنوارە بۆ (کنز الأعمال- المتقي الهندي)٧/٦٦.

پێشەوایان ئەبو حەنیفەو مالك و شافعی دەڵێن:
دروستە بخرێتە سەر ڕێگەکان چونکە عومەر بەسەر ماڵی عەباس دا ئەهات و ئەچوو وە ئەو ئاوەڕۆیەیان هەبوو فرمانی کرد بە لابردنی، ئیمامی عەباس: پێی وت: لایئەبەی لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی داینـاوە؟ فـەرمووی: (وەڵلاهـی دایئەنێیتـەوە لەسـەر پشـتی منـەوە، ئـیتر ئیمامی عومەر پشتی دانەوان و چووە سەر پشتی و دایـنایەوە}.[١]

## ئیبنو عومەر بە تەنها نەبووە بۆ سەردانی ئاسارەکان

بـڵاوە کـە ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خـوای لەسـەر بـێ) ناسـراوە بـەو کەسـەی گەڕاوە بە شوێن ئاسار و شوێنی پێغەمبـەران و پێغەمبـەر و صـالحین دا و گرنگـی زۆری پێـداوە و پارێزگـاری لێ کـردون (شـێخ ئیبنـو تەیمیـە- دەڵـێ: ((پرسیاریان کرد لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبـەل لـەو پیـاوەی ئەگـەڕێ بۆ بینینـی ئـەو ئاسـارانە؟ لـە وەڵامـدا وتـی: ئیبنـو عومـەر گـەڕاوە بـۆ شـوێن پـێی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ هـەتا بینـراوە لـە شـوێنێکدا ئـاوی کـردووە بەسـەری خۆیـدا، لێیـان پرسـی بـۆ وای کـردووە، فەرموویـەتی (ئـە لێـرەدا پێغەمبەری خوا ئاوی کرد بەسەریدا).

پێشـەوا بوخـاری لـە -صـحیح-دا ڕیوایـەتی کـردووە لـە موسـای کـوڕی عەقەبـەوە، وتـی: سـالمی کـوڕی عەبـدوڵلام بینـی ئەگـەڕا بەشـوێن چـەند شـوێنێکدا و نوێـژی تیـا دەکـرد و ئەیگێڕایـەوە کـە بـاوکی لـەم شـوێنانەدا نوێـژی کـردووە و بینیویـەتی کـە حـەزرەتی پێغەمبـەر ﷺ لـەم شـوێنانەدا

---

[١]- ابن قدامة/ (المغني) ٥٥٤/٤.

نوێژی کردووه، موسا وتی: نافع بۆی گێڕامەوه لە ئیبنو عومەرەوه کە لەم شوێنانەدا نوێژی کردووه)).[1]

بەڵام ئیبنو عومەر بە تەنها ئەمەی نەکردووه، بەڵکو زۆر لە هاوەڵان (ڕەزای خوایان لەسەر بێ- بەشوێن ئەو ئاسارانە گەڕاون و پارێزگاریان لێ کردون و گرنگیان پێ داون، لە پێشتر باسمان کرد کە چۆن خولەفای ڕاشیدون و پێشەوایانمان کە پشتگیری ئەم باسە بوون، کە کردەوەکانیان سوننەتەو وەرگیراوه لە خۆشەویستیان ﷺ وه سوننەتی ئەوان سوننەتی پێغەمبەرەو هیدایەتیان هیدایەتی پێغەمبەرەو ئەوەش هەقیقەتێکە: هیچ وتەو هیچ ئیجتیهاد و بۆچوونێك نییەو نابێ لە بەرامبەری ئەو وتەو بۆچوونەی کە جێگیر بووه و لە پێغەمبەری خۆشەویستەوه هاتووه.

## ئیبنو عەباس و ئاساره کۆنەکان

کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ویستی کەعبە بڕوخێنێ، هاوەڵانی کۆکردەوه و پرس و ڕاوێژی پێ کردن، ئیبنو عەباس وتی با هەمووی تێك نەدرێ بەڵکو تەنها ئەو شوێنانە چاك بکرێ کە پێویستی پێیەتی و ئەو بەردانەی تر وەك خۆی بمێنێ هەروەك لە عەهدی یەکەمی ئیسلام دا بووه کە عەهدی بەعثەت و عەهدی حەزرەتی پێغەمبەره ﷺ.

دەگێڕنەوه لە (عطاء) ەوه کە وتوویەتی: کاتێ کە کەعبە سوتێنرا لە زەمانی یەزیدی کوڕی موعاویەدا، لەو کاتەی کە ئەهلی شام هاتنە سەری، ئەوی ڕویدا ڕویدا، ئیبنو زوبەیر وازی لێ هێنا تا ئەهلی شام هاتن بۆ حەج و ویستی تاقیان بکاتەوه، ئیبنو زوبەیر وتی: ئەی خەڵکینە پرس و

---

[1]- ابن تيمية ( اقتضاء الصراط المستقيم ) لا ٣٨٥ .

ڕاویـژتان پـێ دەکـەم سـەبارەت بـەم کەعبەیـە، تێکـی بـدەین و دروسـتی بکەینـەوە، یـان تـەنها زیـان لێکەوتووەکەی چاك بکەینـەوە؟ ئیبنـو عـەباس فەرمووی: مـن ڕایەکم هەیە لێرەدا ، وا ئەبینم کە تەنها زیـان لێکراوەکەی چاك بکەینـەوەو ئـەوی تـری واز لێبهێنین، واز لـە ماڵێك بهێـنن کـە خـەڵکی لەسـەری موسـوڵمان بـوون، واز لـە بـەردێك بهێـنن کـە خـەڵکی لەسـەری موسوڵمان بوون، کە پێغەمبەری خوای لەسەر ڕەوانە کراوە ﷺ)[١] .

## غیرەتی حەزرەتی عومەر لەسەر ئاسارەکانی پێغەمبەرایەتی

حـەزرەتی عومـەر (ڕەزای خـوای لەسـەر بـێ) ناسـراوە بـەو کەسـەی کـە غیرەتێکـی گـەورەی هـەبووە بـۆ پارێزگـاری کردنـی ئاسـارەکانی پێغەمبەرایەتی ، دەبینین کاتێ کە خەڵکی کۆبوونـەوە تا ئەوەی بچن ئەو درەختە بیڕنـەوە کـەپێی دەڵێن –شجرةُ الرِّضـوان– کە بەیعەت لـەژێر ئەم درەختە تازەکرایەوە بە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ کە لە قورئان دا خوا دەفـەرموێ: ﴿لَقَدْ رَضِـيَ اللّـهُ عَـنِ الْمُـؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَـكَ تَحْـتَ الشَّـجَرَةِ﴾ الفتح:١٨. بەڵام حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێ) ئەیزانی کە ئەو درەختـە نەناسـراوە و کـەس شـوێنەکەی نازانـێ، تەنانـەت ئـەو هاوەڵـە بەڕێزانـەش کـە ئامـادەبوون لـەکاتی بەیعەتەکـەدا ئـەوانیش شـوێنەکەیان نەدەزانی، هـەروەك لـە –الصـحيحين–دا هـاتووە لـە ئیبنـو عومـەرەوە (ڕەزای خوایان لەسەر بێ– کە ساڵی دواتر لەدوای بەیعەت هاتینەوە بۆ حەج دەڵێ (فبحثنا عنِ الشجرة، فَلَم يَقع عليها رَجُلان) گەڕاین بۆ ئەو دارە، کەسمان یان دوانمان ڕێمان لێ نەکەوت.

---

[١]– بنواڕە بۆ –شرح النووی علی صحیح مسلم ٩/٩٢–٩٤.

موسەیب باوکی سەعید -ڕەزای خوایان لەسەر- دەڵێ: من ئەو درەختەم بینی پاشان لەبیرم چوێنرایەوە کە شوێنەکەی لەکوێدایە.

طارق کوڕی عبدالرحمن دەڵێ: دەرچووم لەماڵ بە نیەتی حەج، بەلای کۆمەڵێکدا ڕۆیشتم نوێژیان دەکرد، وتم: ئەم مزگەوتە کوێیە؟ وتیان: ئەمە ئەو شوێنەیە کە بەیعەتی ریضوانی تیابووە بە حەزرەتی پێغەمبەرەوە، هاتم بۆ لای سەعیدی کوڕی موسەیب هەواڵەکەم پێدا، وتی: باوکم هەواڵی پێدام کە ئەوانەی بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا کرد لە ژێر درەختەکەدا، وتیان: کاتێ ساڵی داهاتوو هاتینەوە شوێنەکەیمان لێ ون بوو بوو، نەمانتوانی بیدۆزینەوە، سەعید دەڵێ: هاوەڵانی محمد ﷺ شوێنەکەیان نەدەزانی، ئایا ئێوە لەوان زاناترن بە شوێنەکەی؟[1] .

واتە دوو کەسیان یەکڕا نەبوون لەسەر شوێنی درەختەکە، کە ئەمە حاڵیان بوو لەدوای تەنها ساڵێك بەسەر بەیعەتەکەدا، لەگەڵ بوونی ئەو ژمارە زۆرەی هاوەڵان لەژێر درەختەکەو بەیعەت دانیان بە حەزرەت ﷺ ئاخۆ دەبێ چی بڵێیت بە درەختێك کە دەرکەوتبێ لەسەردەمی حەزرەتی عومەردا و لەدوای ئەو هەموو ساڵەیە..

سەردەم و عەهد گۆڕابوو، زۆر لەوانەی کە ئامادەی -بیعة الرضوان- بوون وەفاتیان کرد بوو، خەڵکی جیاوازی ڕایان هەبوو لەسەر شوێنی درەختەکە کە شەرەفمەند بوو بە بەیعەتی موحەمەدی، کە شوێنی هاتنە خوارەوەی مەلائیکەکان بوو، کە زەوی و ئاسمانەکان بۆ ئەو ساتی بەیعەتە هاتە لەرزین، کە قورئانی پیرۆز تۆماری کرد بە فەرموودەی: ﴿لَقَدْ رَضِيَ

---

[1]- بنوارە بۆ -صحيح البخاري-كتاب المغازي- باب غزوة الحديبية- وە بۆ -صحيح مسلم- كتاب الأمارة-باب استحباب متابعة الامام.

اللَّـهُ عَـنِ الْمُـؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَـكَ تَحْـتَ الشَّـجَرَةِ فَعَلِـمَ مَـا فِـي قُلُـوبِهِمْ فَـأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحاً قَرِيباً﴾ الفتح: ١٨.

پاشـان لـەژێر ئـەم درەختـەدا گـەورەترین تایبەتمەنـدێتی بەخشـرا بـە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ كە هەركەس لێرەدا بەیعەت بدا بە پێغەمبـەری خـوا و دەسـت بخاتـە دەسـتی موبـارەكی ئـەوە بەیعـەتی بـە خـودای پـەروەردگار داوە و دەستی قودرەتی خوایش لەسـەر دەستەكانیانەوە بـوو ، كـە قورئـان تۆماری كرد: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّـهَ يَدُ اللَّـهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ الفتح:١٠.

دەركەوت كـە حـەزرەتی عومـەر (ڕەزای خـوای لەسـەر بـێ) لـە هەقیقـەت دا ئەو درەختەی نەبڕیوە، بەڵكو درەختێكی بڕی كە گوماناوی بوو، وە وەهم و خـەیاڵی خـەڵكی بـوو كـە درەختـی –رضـوان– بـێ چـونكە خـوای گـەورە شـاردیەوە لەبـەر حیكمـەتێكی گـەورە كـە تـەنها خـوا –جل شـأنه– خـۆی زاناترە بە باسەكەی.

حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لەسەر بێ) ئەو درەختە درۆینـەی بڕیـەوە، چونكە غیرەتـی هـەبوو بۆ پارێزگـاری لـە درەختـە ڕاستەقینەكەی كە خـوای گەورە شاردویەتیەوە ، ئیتر دروست نىیە بوترێ : كە عومەر (ڕەزای خـوای لەسەر بێ) درەختی ریضوانی بڕیـەوە تـا مـەنعی خـەڵكی بكـات لـە تەبـەروك وەرگرتن لێی و نەهێڵانی سەردانی لەلایەن خەڵكیەوە ، یـان بـوترێ ئـەوە عومـەر شـتێكی كـردووە كـە مـەنعی وەسـیلەی كـردووە چـونكە بەلایـەوە كارێكی شیرك بووە ، بەڵكو هەقیقەت ئەوەیە كە حـەزرەتی عومـەر هـەرگیز ئەو خەیاڵەی نەبووەو ئەو وتانە نەهاتووە بە خەیاڵیدا بە بەڵگـەی ئـەوە كـە جـێگیر بـووە چـۆن تەبـەروكی كـردووەو داوای تەبەروكیشـی كـردووە بـە ئاسارە پیرۆزەكـان ، وەك ئـەوەی داوای كـرد لـە زوبـەیر كە ئـەو حەربەیـەی

بداتێ چونکه ماوەیەك لای حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ و حەزرەتی ئەبوبەکر بووە، وە هەروەها چۆن پارێزگاری لە موستیلەکەی حەزرەت کرد ﷺ وە غەیری ئەم نموونانەش، (ئەم نمونانە پێشتر بەڵگەکانیمان نوسیوە) .

## گرنگی دان بە نەعلە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ﷺ دیراسەکردنی زانستیانە لەسەری

یەکێ لە پاشماوە و ئاسارە پیرۆزەکانی پێغەمبەرایەتی کە جێگەی تێرامان و گرنگی و لێکۆڵینەوەی زانایان بووە، نەعلە پیرۆزەکانی بوو –صەڵات و سەلامی خوای لەسەر– بەڵکو گەورەترین و وردترین لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا لە سیفەت و چۆنیەتی دروست کردنی و نمونەیی و ڕەنگی، کە چەندەها لێکۆڵینەوەو بەحثی تایبەتی لەسەر نوسراوە چەندەها نامە و ڕیسالەی خوێندن بۆ داهاتوش چاوەڕێی دەکات.

مەبەست لەم گرنگی دانە هەمووی خاوەنی نەعلەکانە، کە ئەویش حەزرەتی پێغەمبەری سەرداره –صەڵات و سەلامی خوایی لەسەر– لەکاتێکدا کە گرنگی ئەدرێ بە پاشماوەی پیاوە ناودارەکانی جیهان و پۆشاك و کەلوپەلیان ئەپارێزرێ و چەندەها شوێنی وەك مەتحەفەکانیان بۆ دابین دەکرێ و پارەیەکی زۆر سەرف دەکرێ لە چۆنیەتی پارێزگاریان (لەبەرئەوەی کە پیاوێکی ناوداری زانستی فیزیایی یان کیمیایی یان ڕامیاری بووە) ، کەواتە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ ڕۆحم بەفیدای بێ زۆر لەپێشترە و ئەولاترە، ئەگەر هەموو سەروەت و سامانەکان لەو پێناوەدا سەرف بکرێ کەمە، صەڵات و سەلامی خوایی لەسەربێ.

## گرنگی دانی مەملەکەت بەو ئاسارانە

سوپاس بۆ خوا کە ئەم دەوڵەتە سونیەی موەفەق کرد بۆ لای پارێزگاری ئەو ئاسارە گەورانـە، کـە سـوربوونی و گرنگـی دانـی بـۆ پارێزگـاری ئـەو شارسـتانیە مێژوویـیـە ئیسـلامیـیە، وای لێ کـردووە کـە بەڕێوەبەرایەتیەکی تایبەتی دابنێ بەناوی (إدارة الآثار) وە تیایدا کۆمەڵێ یاسای تایبـەت لـە مەرسومێکی مەلەکیدا ڕێك بخـات بـە ژمـارە م/٢٦، وە لەبەرواری: ١٣٩٦/٢٣ھـ [١] .

وە کۆمـەڵێکی پێـك هێنـا بـەناوی (المجلس الأعلـی للآثـار) وە بڕیـارێکی تایبەتیشی لە ئەنجومەنی وەزیرانەوە دەرکردووە بە ژمارە ٢٣٥ لە بـەرواری (١٣٩٨/٢/٢١ھ) بە پێـك هێنـانی ئـەو لیژنەیـە کـە پێك هـاتووە لـە وەزیـری ئەلمەعاریف وەك سەرۆك و بەئەندامیەتی وەزیرەکانی ناوخۆو مالیـەو حـەج و ئەوقاف و ڕاگەیاندن و ئاسار. وە ئەم دەوڵەتە ئەوەی ڕوون کردۆتـەوە کـە مەبەست لـە پێك هێنـانی ئـەم لیژنـە بالایـە بـۆ ئاسـار گەیشـتنە بـە زۆرتـرین توانای خەبیری و شارەزایی بۆ چۆنیەتی پاراستنی ئەو پاشماوە مێژوویانە.

## پارێزگاری لەسەر ئاسارەکان

لە مادەی (٦)ی ئەم یاسایە هاتووە دەڵێ:

بەڕێوەبەریـەتی ئاسـار بـە یامـەتی ئەنـدامانی تـری دەوڵـەت (هەریـەك بـە پسـپۆری خـۆی) هەڵدەسـتێ بـە پارێزگـاری کردنـی ئاسـارو شـوێنە ئەسەریەکان، هەروەك چۆن هەڵدەستێ بە تۆمارکردنی ئەو شوێن و شتە مێژوویانـە، واتـە تۆمـارکردنی هـەموو ئـەثـەرێك کـە دەوڵـەت دان دەنـێ بـە

---

[١]- بنوارە بۆ (المذكرة الخاصة بنظام الآثار) کە لـە وەزارەتـی (المالية و الأقتصاد الوطني) سعودی دەرچووە لە ساڵی ١٣٩٩ھ.

گرنگی مێژووی و هونەریەوە، وە ئەم لیژنەیە هەڵدەستێ بە ئیش کردن بۆ هێشتنەوەی وەکو خۆی و دیراسەکردنی وە دەرخستنی زانیاریەکان لەسەری بەپێی ئەو یاسایانەی لەم نیزامەدا هاتووە...

## مزگەوتەکان و شوێنەکانی بەندایەتی
## لە گرنگترین شوێنە ئەسەریەکانن

لە مادەی ژمارە -٧- دا هاتووە:

ئاسارەکان دوو جۆرن: ئاساری جێگیر و ئاساری گوازراوە.

أ- ئاساری جێگیر: بریتی یە لەو ئاسارانەی کە بەزەوی یەوە لکاون، وەکو: ئەشکەوتە سروشتیەکان یان هەڵکەنراوەکان کە تایبەت بوون بە پێداویستی مرۆڤی کۆن، وە ئەو بەردانەی کە وێنەی لەسەرە، یان وێنەیان نەقش یان نوسینیان لەسەر هەڵکەنراوە، یان پاشماوەی لادێ و شوێنەکانیان لە ناوەوەی زەوی کە کەڵەکەبوی زەوی لەسەر دروست بووە، یان ئەو شوێن و بینایانەی کە بۆ مەبەستی تایبەتی لە زوودا دروست کراون، وەکو مزگەوتەکان و شوێنەکانی بەندایەتیەکانی تر، وە قەسر و تەلار و خانوەکانی کە لە شوێنە دیارەکاندان، وە یاریگا و گەرماوەکان، وە گۆڕستانەکان و سەد و کەنداوەکان، وە هەموو ئەو شتانەش کە بەمانەوەن وەکو دەرگا و پەنجەرەو پایەو پەیژەو سەقف و تەیەجان و ئەو شتانەش کە وەك ئەمانەن.

ب- ئاساری گوازراوە: ئەو ئاسارانەن کە بە سروشتی خۆی وا دروست کراوە کە جیاوازە لە زەوی، یان لە بینا مێژوویەکان کە دەتوانرێ شوێنەکانیان بگۆڕرێ، وەکو هەریەکە لە (المنحوتات والمسكوكات و المنقوشات و المخطوطات والمنسوجات و المضوعات) (پەیکەرەکان، سکە

و دراوەکـان، وێنــە کێشــراوەکان، هێڵکـاری و نوسـینە دێرینــەکان، کـاڵا چنراوەکان، کەرەستی کارخانەکان)

## حوجرەی پێغەمبەرایەتی و مزگەوتی پیرۆزی

زۆر لـە کۆلکـە موفتیـیـەکان ویسـتیان کـە گۆرانکاریـەك لـە حـوجرەی پێغەمبەرایەتیدا بکەن بەوەی کە گۆڕی پیرۆزی حەزرەت ﷺ لە مزگـەوت دەربکەن یان جیای بکەنەوە، بەڵام کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە خوالێخۆش بوو مـەلیك خالیـدی کـوڕی عبـدالعزیز تورەبـونێکی زۆر بـەهێزی دەربـڕی و هێزی ئیمان لە دڵیدا شەپۆلی دا و، وەڵامێکی توندی هەموو ئەوانەی دایەوە کە ئەو باسەیان پێشنیار کردبوو، لەوە دەچێ هەندێ لەو کەسانە ئێستاش لەژیاندا بن، ڕەحمەتی خوا لەو پاشا چاکە بێ و ئەم وتـەو هەڵوێسـتەی بـۆ کردبـێ بـە تێشـوویەك لـە خزمـەتی خـوای میهرەبـان و دەسـتێکی سـپی لـە خزمەتی گەورەمان حەزرەتی محمد داﷺ کە پشـت بـەخوا بەهۆیـەوە بـەری شەفاعەتی پیرۆزی بکەوێ لە ڕۆژی دوایدا.

## فتوای شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب
## لەسەر حوجرەی پێغەمبەرایەتی

زۆرێك لەوانەی کە ئەهلی فیتنە و خراپەکاری بوون هەستان بە هەڵبەسـتن و خسـتنە پـاڵی شـێخ محمـدی کـوڕی عبـدالوهاب بـەوەی کـە وتـووبێتی حوجرەی پێغەمبەرایەتی لە مزگەوت جیابکرێتەوە، بەڵام ئـەو ئینکـاری ئـەم بۆچونەی کرد و تەبریەی خۆیی تیا کرد، هەروەك چۆن لەو نامەیەیدا کە بۆ ئەهل و خەڵکی (المجمعە)ی نارد کە تیایا دەڵێ:

{دوای ئەوەی کە ڕوون بوویەوە و ئەو باسانەی کە بڵاوبونەتەوە، کە تیانا هەیە درۆ و بوهتانێکی گەورەیە کە گوایا من وتومە: من کتێبی مەزهەبەکان بەتاڵ دەکەمەوە، وە دەڵێن: کە من وتوومە: خەڵکی لەپێش شەش صەد ساڵەوە لەسەر هیچ دینێك نەماون، وە دەڵێن: من بانگەشەی ئیجتیهاد دەکەم، وە من لە تەقلید چوومەتە دەرەوەو باوەڕم پیێ نیە، وە گوایە وتوومە: جیاوازی نێوان زانایان نیقمەت و نەگبەتی یە، وە گوایە من بە تەوەسولی پیاوچاکان باوەڕم نیە، وە من شێخی بوەیصری بەبێ دین و کافر دەزانم لەبەرئەوەی کە وتوویەتی: (یا أکرم الخلق) وە گوایە من وتوومە: گەر دەسەڵاتم ببێ حوجرەی پێغەمبەرایەتی ئەڕوخێنم و لەناوی دەبەم، وە گەر بتوانم مینرابی کەعبەی پیرۆز دەگۆڕم و دەیکەمەوە بە تەختە، وە من وتبێتم، کە ئینکاری زیارەت و سەردانی گۆڕی پێغەمبەری خوام ﷺ کردبێ و ئینکاری سەردانی گۆڕی باوك و دایکی پێغەمبەری خوام کردبێ، وە هەرکەس سوێندی بە غەیری خوا خواردبێ کافرو بێ بڕوا بێ، ئەمە دوانزە باسە بەناوی منەوە، وەڵامم بۆ ئەمانە دەڵێم:

(سُبحانك هذا بُهتانٌ عظیم)[1] (وتەکەی تەواو بوو) .

## قوببەی سەوزی سەر مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ بەلای شێخ محمدی کوڕی عبدالوهابەوە

سەبارەت بە تێکدان و نەهێڵانی قوببەی سەوز کە گوایە محمدی کوڕی عبدالوهاب وتوویەتی و فرمانی پێ کردبێ، بەڵام شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێ بە هەموو هێزی زانستی ئەو ڕایە لەخۆی دوور دەخاتەوەو ئینکاری ئەو وتەیە دەکات لە زۆر شوێنی نامەکانیدا ئینکاریەکەی دەردەبڕێ، لەوانە:

---

[1]- بنوارە بۆ (الرسائل الشخصیة: القسم الخاص، لا٦٣) وە بۆ (الدرر السنیة: ٢/٥٢).

باسی یەکەم : ئەو نامەیەی کە بۆ خەڵکی (القصیم)ی ناردووە، کە تیایدا دەڵێ: ( ئەمە عەقیدەو بیروباوەڕی دان پیانراوی منە و پێوەی سەرقاڵم، وە خواش شاهید بێ لەسەر ئەو واتەی کە دەیڵێم : پاشان لێتان شاراوە نییە کە پێم گەیشتووە کە نامەیەك لەلایەن (سلیمانی کوڕی سەحیم)ەوە گەیشتووە بەلای ئێوە، وە زۆرێك لە ئێوە لەوانەی کە بەلای زانست و عیلمدا دەچن قبوڵیان کردووە و ئەو وتانەی ناو نامەکەیان بەڕاست داناوە خوا دەزانێ کە ئەو پیاوە ئیغتراو درۆی بەدەم منەوە کردووە و زۆرێك لەو شتانەی ناوی نەهاتووە بە خەیاڵمدا، لەوانە: دەڵێ: من بەتاڵ کارەوەی کتێبی چوار مەزهەبەکەم، وە خەڵکی لەپێش شەش صەد ساڵەوە دینیان نەماوە و لەسەر هیچ دینێ نین، وە من ئیدعای ئیجتیهاد دەکەم ، وە من باوەڕم بە تەقلید نەماوە، وە من وتوویێتم جیاوازی نێوان زانایان نیقمەت و تورەیی خواییە، وە من باوەڕم بە تەوەسولی پیاوچاکان نەمابێ، وە من شێخی (البویصری) بەکافر و بێ دین بزانم لەبەر وتەی (یا أکرم الخلق)، وە گەر دەسەلاتم ببێ قوببەی سەر مەرقەدی پێغەمبەر دەڕوخێنم، وە گەر توانام ببێ میزابی کەعبە دەکەمەوە بە تەختە، وە من زیارەت و سەردانی گۆڕی پێغەمبەری خوام ﷺ بە حەرام زانیبێ، وە من ئینکاری سەردانی گۆڕی باوك و دایکی پێغەمبەرم کردبێ، وە من ئەو کەسە بەبێ بڕوا بزانم کە سوێند بە غەیری خوا دەخوات، وە من هەریەکە لە (ابن الفارض) و (ابن عربي) بەکافر بزانم و کتێبی (دلائل الخیرات) و (روض الریاحین) دەسوتێنم و ناوی لێ دەنێم (روض الشیاطین)، وەلامی من بۆ ئەم باسانە ئەوەیە کە دەڵێم: (سُبحانك هذا بهتان عظیم)[1] .

---

[1]- بنواڕە بۆ (مجموعة المؤلفات: القسم الخامس: الرسالة الأولى من الرسائل الشخصیة/ محمد عبدالوهاب) لا ١٢، وە بو (الدرر السنیة ١/٢٨).

باسی دووەم : لەو نامەیەیدا کە ناردویەتی بۆ خەڵکی عێراق، کە ئەو نامەیەیە کە ناردی بۆ (السویدی) لە زانایانی ئەهلی عێراق، کە ئەم زانایە نامەیەکی نارد بوو بۆ شێخ ئیبنو عبدالوهاب کە پرسیاری خەڵکی پێ گەیاندبوو، ئەویش بەم نامەیە وەڵامیانی دابۆوە، کە تیایدا ڕەدی ئەو وتانە دەداتەوە کە خراونەتە پاڵ ئەم و بەدرۆیان دەخاتەوە لەوانە: (بڵاوبۆتەوە کە گوایە من هەموو خەڵکی بە کافر و بێ باوەڕ دەزانم جگە لەوانەی کە شوێن خۆم کەوتبن، وە گومانم وابێ هیچ نیکاحێکیان دروست نەبێ، وە یا عەجەب، چۆن وتەیەکی وا بەبیرو مێشکی عاقڵ دا دەچێ؟ ئایا هیچ موسوڵمان و بێباوەڕ یان خواناس یان شێت شتی وا دەڵێ؟ وە هەروەها وتوویانە: گوایە من وتبێتم گەر دەسەڵاتم ببێ قوببەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕوخێنم، وە بزانن کە (دلائل الخیرات) هۆکاری خۆیی هەیە، وە من ئاماژەم داوە لە ئامۆژگاریەکانم دا کە هەرکەس لەدڵیا ببێ گەورەتر لە کتێبەکەی خوا وە گومانی وابێ خوێندنەوەی کتێبێکی تر خێری زیاتر بێ لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز دروست نیيە، بەڵام سوتاندنی و نەهی کردنی صەڵەوات خوێندن لەسەر حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ بەهەر داڕشتنێ ببێ ئەوە بوهتانێکە بە دەمی منەوە کراوە..)[1] .

ئەم دەربڕینە لە شێخ محمدی کوڕی عبدالوهابەوە لە خۆیدا سەرچاوەی حیکمەت سەرف کردن و دەرخستنی ڕێگەی ڕاستیيە، کە ئەوە سیاسەتێکی شەرعیيە کە پێویستە زانایان و مورشیدان و مەشایخانی لەکاتی فرمان و نەهی و وەعزو ئیرشادیانا بەسەرفی بدەن.

---

[1]- بنوارە بۆ (مجموعة المؤلفات، القسم الخامس) الرسالة الخامسة من الرسائل الشخصية لا٣٧، محمد بن عبدالوهاب، وە بۆ (الدرر السنية ١/٥٤)

که دەبینین شێخ ڕەحمەتی خوای لەسەر، زۆر سوورە لەسەر ئەوەی کە ئەودرۆیانەی بە دەمی ئەوەوە کراوە نەیهێڵێت و ڕەدی ئەو موفتیانەش بداتەوە کە ئەم وتە نابەجێیانەیان بەدەم ئەوە داناوە، دەبینین کە چۆن لە چەند شوێنێکدا ئینکاری دەکات و بە فیتنە و شەڕ لەقەڵەمی دەدات کە خەڵکی بەرەو موصیبەت و کارەسات ئەبەن، ئێمە لەم باسەدا دەوڵەمەندین و پێویستمان پێی نییە، ئەمە لە کوێ و ئەوەی کە هەموو باسێك یان لێکۆڵینەوەیەك نەماوە کە لەسەری بنوسێ یان پێشکەشی بکات مەگەر باسی قوببەی سەوز نەبێ..

لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتمان هەیە، داواکارم لە خوای میهرەبان بۆم ئاسان بکات کە تەواوی بکەم و بڵاوی بکەمەوە...

## پارێزگاری کردنی پاشماوە و ئاسارەکانی پێغەمبەر ﷺ لە نامەکەی مەلیك فەهددا

لەکاتی فراوان کردنی مزگەوتی (قوبا)دا زۆرێك وایان بەباش دەزانی کە ئاسارەکانی ئەم مزگەوتە دەکەوێتە ناو نەخشەکەوە بۆیە لابردنی یان بەباش دەزانی، بەڵام پاشا فەهدی کوڕی عبدالعزیز ئەو نەخشەیەی بەتاڵ کردەوە و نەخشەیەکی تازەی بۆ کێشان کە تیایدا مینبەر و میحراب و شوێنە ئەسەریەکانی وەك خۆی هێشتەوە و فراوان کردنەکەی لەملاو ئەولای مزگەوتەکە کێشا و لە پشتیشەوە نەخشەیەکی فراوانی بۆ دانا، تاوەکو موسوڵمانان پشت بە پشت ئەو شوێنانەی کە شوێن پێ و ئاساری پێغەمبەر و هاوەڵانیەتی شارەزا بن، بۆیە ئەیوت: (چاکە و خەیر لەوەدایە لە مزگەوتەکانی خوا زیاد بکەین نەك نەیانهێڵین) ( مِنَ الخير أن نزيد في مساجد الله ولا نزيل ) .

که ئەم باسەیە ڕۆژنامەکانی سعودیە بە دریژی ئەو چاوپێکەوتنانەیان بڵاوکردۆتەوە ڕۆژی شەممە ١٧ صفر ١٤٠٥هـ وەکو ڕۆژنامەی (المدینة) و (الندوة)...

## تێگەیشتن لە وتەی ( چەمکی کۆبوونەوەکان )

لەسەر شێوەی عادەت وا ڕاهاتووین کە کۆدەبینەوە بۆ زیندوکردنەوەی کۆمەڵێ لە یادەوەری یە مێژوویەکان وەکو: مەولودی پێغەمبەر ﷺ و یادی ئیسراو میعراج و شەوڕەوێنی، وە شەوی نیوەی مانگی شەعبان، وە یادی هیجرەت و کۆچ کردن، یادی نازڵ بوون و هاتنە خوارەوەی قورئان، وە یادی شەڕی بەدرو...هتد ، بەلای ئێمەوە ئەم کۆبوونەوانە کارێکی ئاساییێ و هیچ پەیوەندیەکیان بە ئاینەوە نیە، هیچ شتێك لەسەری نەهاتووە کە بڵێ مەشروعە یان سوننەتە، هەروەك چۆن پێچەوانە و بەرانبەری ئەصڵی بنەماکانی دینیش نیە، چونکە خراپەو خەتەریەت لەوکاتەدا کە بەباوەڕەوە کارێك بە مەشروعیەت جێبەجێ بکەیت کە لە شەرع دا بنەمای نەبێ، وە بەلای منەوە نمونەی ئەم جۆرە کارانە و کۆبوونەوە بۆیان نەریتێکی ئاساییێ و ناوترێت زۆرتر لەوەی کە کارێکی خۆشەویست بێ یان بێزراو بێ لەلای شارعەوە، وە لەو گومانەدام کە ئەمەندە وتن لەسەری کافیە و بەسە کە هەموو لایەك یەك ڕان لەسەری و ئیتفاقیان لەسەر دەربڕیوە.

لای هەندێ کەس کە ئیدعای ئەوە دەکەن کە خەڵکی کۆدەبنەوە بۆ ئەم یادەوەریانە بەنیەتی زیندوکردنەوەیان کە کاتی دیاری کراوی بەسەرچوو بێ کە لەزوودا بووە و لەسەر کاتەکە یەکڕایی هەبووە. دەڵێن: کە خەڵکی خووعادەتیان پێوە گرتووە کە شەوی بیست و حەوتی مانگی ڕەجەب یادی

شـەوڕەوێنی زیندودەکەنـەوە، وە کۆدەبنـەوە لەشـەوی دوانـزەی مـانگی ڕەبیعی یەکەم بۆ زیندوکردنەوەی یادی لەدایك بوونی حەزرەتی محمد ﷺ، لە کاتێکدا کە زانایان جیاوازی ڕایان هەیە لەسەر کاتی ئەو دوو ڕووداوە مێژوویییە.

وە من دەڵێم: یەکڕانەبوون لەسەر کاتی ڕاستی ڕووداو هیچ تەئسیرێکی نییـە، چـونکە ئێمـە بـاوەڕو عەقیـدەمان وا نییـە کـە دیـاری کردنـی کۆبونـەوەکان بـە کـاتێکی دیـاری کـراوەوە مەشـروع و دروسـت بـێ، بـەڵکو فرمانەکە زۆر سادەیە وەك باسمان کرد، ئەوەی بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە کە فرسەتێك لەو کۆبونەوانە بهێنین بۆ خۆدەوڵەمەند کردن بە زانست و ڕێگەی خێر و چاکە نیشانی خەڵکی بدەین، لەم شـەوانەدا خـەڵکی بە شێوەیەکی فراوان کۆدەبنـەوە جا یەکسانە کاتەکـەیان ڕاستەکە بـوو بـێ یـان هەڵەکـە، ئەوانە تەنها کۆبوونەوەکەیان لەسەر یادی خـواو خۆشەویستی پێغەمبـەری خوایە ﷺ کە ئەمەش کافیە بۆ بەدەست هێنانی ڕەحمـەت و فـەزڵی خـودا. من تەواوی باوەڕم وایە کە خەڵکانێك کۆببنەوە لەبەر خواو لەبۆ خودا، ئەوە قبـوڵ کـراوە لەلایـەن خـواوە ئـیتر بـا تـەوقیتی ئـەو کـارە ڕاسـت نـەبووبێ، نموونەیەك دەهێنینەوە تا زیاتر بیرو فیکرمان بۆلای بچێت:

گەر پیاوێك خەڵکی بانگ بکات بۆ وەلیمە و شیرینی خواردنێك لـەکاتێکی دیـاری کـراودا، هەنـدێ لەوانـە کـە داوەت کـراون لـە غـەیری کـاتی دیـاری کراودا دێن و وا گومان دەبەن کە کاتەکەی ئەمان کە هاتوون ڕاستە، ئایا تۆ وادەبینیـت کـە خـاوەنی دەعوەتەکـە دەریـان دەکـات و بەڕویـەکی گـرژەوە پێیان دەڵێ بڕۆنـەوە ئێسـتا کـاتی بانگ کردنەکەم نییـە و لـەکاتی دیاری کراودا وەرن، یان تۆ وا دەبینیت کە بەڕویەکی خۆشەوە بـەرەو پیریـان دێـت و بـەخێرهاتنیان دەکـات و سوپاسـی هـاتن و ئامادەبوونیـان دەکـات و

دەرگای ماڵیان بۆ دەخاتە سەرپشت و دایاندەنیشێنێ و کەمێ خزمەتیان دەکات و پاشان پێیان دەڵێ بڕۆنەوە و لەکاتی خۆیدا وەرن، تۆ کامیان دەبینی؟ .

ئەمە ئەو تەصەورو بۆچوونەمە شایستەیەو ئەگونجێ لەگەڵ ڕەحمی خوداو بەخشندەیی و فەزڵیدا..

ئێمە کاتێ کە کۆدەبینەوە بە نمونە بۆ شەوڕەوێنی یان بۆ مەولودی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ، یان بۆ هەر یادێکی مێژوویی، گرنگ نییە بەلامانەوە کە کاتی تەواوی ڕووداوەکە کەی بووە، چونکە ئەگەر تەواو گونجا بوو لەگەڵ کاتە ئەسڵەکەدا ئەوە سوپاس بۆ خودا، وە ئەگەر لە غەیری ئەو کاتە بوو ئەوە خوای گەورە ڕەدمان ناکاتەوەو دەرگای ڕەحمەتی خۆیمان لێ داناخات.

خۆ دەوڵەمەندکردن لەو کۆبوونەوانەدا بە دۆعا و پاڕانەوەو ڕووکردنە دڵ بۆ خزمەتی خوای پەروەردگار و سود وەرگرتن لەو نەفەحات و خێر و بەرەکەتانەی خوای میهرەبان، کە ئەمە گەورەترین قازانجێکە کە لەو یادانەدا دەبینرێتەوە، وە دەوڵەمەند بوون لەناو ئەو کۆبوونەوەدا بریتییە لە بیرخستنەوەو ڕێنومایی و ئامۆژگاری ئەو خەڵکە بۆ خێرو چاکە، ئەمە باشترە تا دەرکردن و بلاوە پێکردن و ئینکاری کردن..

ئەوانەی کە خاوەنی ژیرییەکی تەواون، خاوەنی بانگەشەی ڕاستین بە هەموو دڵ و دەروونیان تەمەنا ئەکەن و ئەخوازن کە شوێنێکیان دەست بکەوێ کە خەڵکی تیا کۆببێتەوە و بیروبۆچوونی خۆیانیان پێ بڵێن و ببنە مایەی خێر و هیدایەتیان، هەر بۆیە ئەو خەڵکەش لە هەموو شوێنەکان کۆدەبنەوە تا سوود وەربگرن، ئێمە دەبینین کە خەڵکی کۆدەبنەوە ئایا ئێمە چی لەسەر شانمانە بەرانبەریان کە بیکەین؟ .

ئیتر خۆ خەریك كردن بە ئینكاری‌یەوە و بەرپەرچی لەكۆبوونەوەكان چی سودێكی دەبێ مەگەر نەزانین و كات بەفیڕۆدان نەبێ، چونكە ئێمە كەنزێكی زۆر گەورەمان لێ ون بووە و پێویستمان بە فرسەت و كاتێكە تا خۆمان پڕ زانست بكەینەوە مەگەر لە وێنەی ئەم جۆرە یادەوەری‌یانەوە ئەم فرسەتە گرنگە لەدەست نەدەین و بەخێرو پاداشتی گەورەی خۆمان بگەین، چونكە كات و زەمان لەسەر كەس ناوەستێت و بەخێرایی دەڕوا.

## تێگەیشتن لە مەولودنامەی پێغەمبەری سەردار ﷺ

زۆر كەس لەو تێگەیشتنە بەهەڵەدا دەچێ كاتێ كە باس لە مەولودی پێغەمبەری خوا ﷺ دەكرێ، كە ئێمە بانگەشەی بۆ دەكەین و هانی ئامادەبوونی خەڵكی بۆ ئەدەین، ئەوانە كۆمەڵێ بیروبۆچوونی خراپ بنیات ئەنێن و لەسەری هەندێ باسی دوورو درێژ دادەڕێژن و موناقەشە دەكەن، كاتەكانی خۆیان بەهەدەر ئەدەن و كاتی خوێنەریش بەزایە ئەدەن، ئەوانە هەموویان وەك كەفی دەریا نامێنن چونكە وەك وتمان بیروبۆچوونی خراپن. لەسەر مەولودی حەزرەت ﷺ نوسینمان هەیە و زۆر شتمان لەسەر ئامادە كردووە، لە ئێزگەو مزگەوت و شوێنە گشتیەكان دا چەندەها جار تێگەیشتنمان بۆ مەولود ڕوون كردۆتەوە.

ئێمە لێرەدا دەڵێین: (وەك لەپێشتریشدا وتوومانە) كۆبوونەوە لەبەر مەولودی پیرۆز تەنها كارێكی ئاسای‌یەو هیچ لە بەندایەتی بەشی نی‌یە، كە ئەمەش بیروڕامانە. كێش چ گومانێك دەبات ئارەزووی خۆیەتی و ئازادە، چونكە مرۆڤ ئەوە بەڕاست دەزانێ كە لە نەفسیدا هەیە و باوەڕی پێ‌یەتی نەك شتی تر..

وە ئێمە دەڵێین لە هەموو كاتێك و موناسەبەو كۆمەڵێكدا:

ئەم کۆبوونەوانـە بـەم چـۆنیەتە فرمـانێکی ئاسـاییـیە و کۆبوونەوەکـە لـە بەندایـەتی نییـە، ئـیتر لـەدوای ئـەم وتـەمان ئایـا ئینکـاری ئـەو کەسـانەی مونکیرن دەمێنێتەوە؟ بەڵام ناڕەحەتیە گەورەکە لەوەدایە کە ئەوانە فەهم و تێگەیشـتنیان نییـە، بۆیـە پێشـەوامان شـافعی ڕەحمـەتی خـوای لەسـەر دەفەرموێ:

(ما جادَلتُ عالِماً الاّ غَلَبْتَهُ ، ولا جادلتُ جاهلاً الاّ غَلَبَتني)

کام خوێندکارە دەڵێی کە نزمترین پلەی زانستی هەبێ، فەرق و جیـاوازی لـەنێوان (عـادەت و عیبـادەت) دا دەزانـێ و هەقیقـەتی هـەردوکیان لەیـەك جیادەکاتـەوە: ئەگـەر کەسـێك وتـی: ئەمـە عیبادەتێکـەو مەشـروعە و چـۆنیەتەکەی لەدینـە.. پـێی دەڵـێین: بەڵگەکـەت کامەیـە؟ وە گـەر وتـی: عادەتە، پێی دەڵێین: کەواتە چی دەکەیت بیکە چونکە ئەوەی کە خەتـەری تەواوەتییە و ئەو بەڵاو موصیبەتەیە کە لێی دەترسێن ئەوەیـە کە پۆشـاکی بەندایەتی بکەیتە بەری عادەتەکان ، لەبەر کردەوەی کەسێك کە داهێنـراوی کردوەو شەرعی نییە، بەڵکو لە ئیجتیهادی کەسەکە خۆیەتی. ئەمە ئەوەیـە کە ئێمە پێی ڕازی نابێن و دژایەتی دەکەین و لەبەرانبەری ڕادەوەستین.

بە کـورتی (١) : کۆبوونـەوە مەبەسـتی یـادی مـەولود کارێکـی ئاسـاییـیە، بەڵام پێویستە لەو دانیشتنەدا هەموو کارە خێرەکان، ئەوانەیان کە سوود و قازانجیـان بـۆ خـەڵکی هەیـە بیگرێتـەوە، چـونکە ئـەو کارانـە هەریەکـەیان بۆخۆیان کارێکی شەرعین..

لەو بۆچوونە خراپانە کە دەخرێتە مێشکی خەڵکییەوە: ئەوانە وا گومـان دەبـەن کـە ئێمـە خـەڵکی بـۆ یـادی مـەولود بـانگ دەکـەین لـە شـەوێکی دیاریکراوداو ئیتر لە ساڵەکەدا باسی ناکـەین، ئەوانە چەندە غافڵن کە ئـەو کۆبوونەوانەی لە پێناوی مەولوددا لە شاری مەککەو مەدینە بە شێوەیەکی

ماوه و پچڕ پچڕ دەبەسترێ لە هەموو ڕۆژانێکی ساڵدایە، وە لە هەموو موناسەبەیەکدا کە دڵی خاوەنەکەی خۆش دەکرێ، هیچ کات شەو و ڕۆژی تێنەپەڕیوە لەهەردوو شاری مەککە و مەدینەدا مەگەر کۆبوونەوەیەك بۆ مەولودی پیرۆز بووە، دەزانێ ئەوەی بیەوێ بیزانێ، وە بێ ئاگایە ئەوەی خۆی بێ ئاگا دەکات. ئەوەش کە وا گومان دەبات کە ئێمە یادی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها لە یەك شەودا ئەیکەینەوە و ئیتر بە درێژایی سێسەد و پەنجاو نۆ شەوەکەی تری ساڵ لەبیری خۆمانی دەبەینەوە و باسی ناکەین، ئەوە گوناهێکی گەورەی دەکات و درۆیەکی ڕوون و ئاشکرا دەکات، ئەم دانیشتنانەمان بۆ یادی پێغەمبەری خوا سوپاس بۆ دەگیرێ هەموو شەوێ، تەنانەت هیچ ڕۆژێ یان شەوێ تێناپەڕێ تا لێرەو لەوێ کۆبوونەوەیەك هەیە، وە ئێمە بەردەوام ئەم وتەیەمان بڵاوکردۆتەوە و وتوومانە کە تایبەتمەندکردنی کۆبوونەوەکان بە یەك شەوەوە و وازهێنانی لە شەوەکانی تر ئەوە گەورەترین وشکی یە لە بەرانبەری پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ، لەبەرئەوە خەڵکی سوپاس بۆ خوا بە شەوق و زەوقێکی سەرسوڕهێنەرەوە وەڵامی ئەم داوەیەمان ئەدەنەوەو ڕوومان تێدەکەن.

وە هەر کەس وا گومان ببات کە ئێمە ئاهەنگ و یادکردنەوەی حەزرەت ﷺ تایبەتمەند دەکەین بە شاری مەدینەی پیرۆزەوە، ئەوە نەزانە یان خۆی لەبەردەم هەقیقەتەکان نەزان دەکات، هیچمان پێ ناکرێ بەرانبەریان تەنها ئەوەندە نەبێ کە لە خزمەتی پەروەردگارا بۆیان بپاڕێینەوە تا دڵەکانیان بە نوری بەصیرەت ڕۆشن بکات و پەردەی نەزانینی لەسەر لاببات تا ئەو ڕاستیە بەچاوی خۆی ببینێ کە ئەم جۆرە دانیشتنانە تایبەت نییە بە شاری مەدینەی پیرۆزەوە بە شەوێکی دیاری کراوی لە

مانگێکی دیاریکراودا، بەڵکو ئەو موناسەبە بۆ گشتییەو لە هەموو شوێن و زەمانێکدا دەکرێت و دەبێت.

ڕەحمەتی خوا لە شاعیر کە دەڵێ:

وَليسَ يَصِحُ في الأذهانِ شيءُ

اِذا اُحتاج النَهارُ الى دَليلِ

کاتێ کە خۆر هەڵدێ لە ڕۆژهەڵاتەوە و هەموو خەڵکی کە دەیبینن ئیتر پێویست بە بەڵگە هێنانەوە ناکات بەسەر هەڵهاتنەکەی چونکە هەموو خەڵکی دەیبینن.

بە کورتی (٢): ئێمە هەرگیز ناڵێین و نەمانوتووە کە ئاهەنگ گێڕان و کۆبوونەوە بۆ مەولودی پێغەمبەر ﷺ تایبەتە بە شەوێکی دیاری کراوەوە و تەنها لەو شەوەدا دروستە، بەڵکو ئەڵێین هەرکەس لەو بڕوایەدا بێ ئەوە داهێنراوێکی لەدین دا دروست کردووە، چونکە ناوهێنانی حەزرەت ﷺ و لێکۆڵینەوە لە ژیانی پێویستە لە هەموو کات و ساتێکدا ببێ و پێویستیشە کە ناخ و دەروونمان بەیاد و ناوی محمد ﷺ تێربکەین.

وە ئەم کۆبوونەوانە کە دەکرێن، تەنها وەسیلەیەکی گەورەن بۆ بانگەشە کردنی خەڵکی بۆلای خوای گەورە، کە بریتییە لە فرسەتێکی ئاڵتونی کە پێویستە لەکیس خۆمانی نەدەین، بەڵکو پێویستە لەسەر هەموو زانایانی ئاینی و بانگخوازانی ئیسلام کە زوو زوو ئومەتی ئیسلام لەناو و ئەخلاق و سیرەت و ئاداب و ئەحواڵ و هەڵسوکەوت و بەندایەتیەکانی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بیر بخەنەوە، وە ئامۆژگاری و ڕێنومایی ئەو خەڵکە بکەن بۆ خێر و سەربەرزی دونیا و قیامەتیان وە دوریان بخەنەوە لە بەڵاو داهێنراو و شەڕ و فیتنەکان وە ئێمە سوپاس بۆ خوا ئەوە بانگەشەمان بووە و بەشداربووین لەو جۆرە کۆبوونەوانە..

وه بـه خـەڵکی دەڵـێین: مەبەسـت لـەم کۆبوونەوانـە تـەنها ڕوکەشـی کۆبوونەوەکە نیيە، بەڵکو ئەم دانیشتنانە هۆکارێکی پیرۆزن بۆ گەیشتن بە غایەیەکی پیرۆز، وە هەرکەس هیچ سودێك وەرنەگرێ بۆ دینەکەی، ئەوە بێ بەشە لەو خێرانەی کە لە مەولودی پیرۆزی دا هەیە –صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ–

وە ئێمە نامانەوێ درێژە بدەین بەم باسە بە هێنانەوەی بەڵگەو دەلیلەکان چونکە نامە و کتێبێکی سەربەخۆم لـەم بارەیـەوە دانـاوە بـەناوی (حـول الأحتفـال بـالمولود النبـوي الشـريف)، بـەڵام تـەنها لێـرەدا چـیرۆکی ئازادکردنی (ثويبة) بە نموونە دەهێنینەوە لەبەر زۆری وتەکان لەسەری.

## چیرۆکی ئازاد کردنی ( ثويبة )

زانایان لـە کتێبـەکانی فـەرموودەو ژیـانی پێغەمبـەر ﷺدا باسـی چیرۆکی ئازادکردنی ثویبـەی جاریـە دەکـەن لەلایـەن ئـەبی لەهەبەوە، لـەو کاتـەدا کـە هەواڵی لەدایك بوونی پێغەمبەریان پێدا –صەڵات و سەلامی خوای لەسەر– ، وە ئـەوەش دەگێڕنـەوە کـە پێشـەوا عەباسـی کوڕی عبدالمطلب لـە خـەویا ئـەبا لەهـەبی بینـی لـەدوای مردنـی لـە حـاڵی پرسـی کـە چۆنە، لـە وەڵامیـا وتوویـەتی: (لـەدوای ئێـوە هیچ خێـرێکم پـێ نەگەیشـتووە مەگـەر ئاواشـتە دەبم بـەو کردەوەیـەم کـە ئـازادکردنی ثـویبەیـە، وە هـەموو ڕۆژی دوو شەممەیەك سزام لەسەر سووك دەکرێ).

وتوومـە: ئـەم هەواڵـە کۆمـەڵێکی زۆر لـە پێشـەوایانی (الحـديث والسـير) هێناویانـە و ڕیوایەتەکـەیان نـەقڵ کـردووە، وەکـو (پێشـەوا عبدالرزاقی ئەلصەنعانی، وە پێشەوا ئەلبوخاری، وە خافظی ئیبنو حەجەر، وە حافظی ئیبنو کەثیر، وە حافظی ئەلبەیهەقی، وە ئیبنو هشـام، وە ئەلسوهەیلی، وە

حافظی ئەلبەغەوی، وە محمدی کوڕی ئەلحەضرەمی، وە ئەلئەشجەر، وە ئەلعامری) وە پشت بە خوا بە باشتر ڕوونی دەکەمەوە.

پێشەوا (عبدالرزاق الصنعانی) لە کتێبەکەی خۆی (المصنف)[1] ڕیوایەتی کردووە، وە پێشەوا بوخاری لە (صحیح)[2] دا لە عروەی کوڕی زوبەیرەوە بە (مُرسل)ی ڕیوایەتی کردووە، وە (ابن حجر) لە کتێبی (الفتح) دا باسی لێوە کردووە و دەڵێ: (ئەم گێڕانەوەیە ئەلئیسماعیلی لە ڕێگەی ئەلذوهەلی‌یەوە هێناویەتی، لە ئەبی ئەلیەمانەوە، وە عبدالرزاق لە موعەمەرەوە ڕیوایەتی کردووە)، وە دەڵێ: (لەم فەرموودەیەدا ئەو دەلالەتە هەیە کە بێ بڕواکان بەهۆی کردەوە چاکەکانیان لەو دونیا سوودمەند دەبن، بەڵام ئەوەندە هەیە کە موخالەفەی هەیە بۆ ڕوکەشی قورئان واتە (ظاهر القرآن))، لەوەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاء مَّنثُوراً﴾ الفرقان: ٢٣. لە وەڵامدا دەڵێین:

یەکەم: ئەم هەواڵە پلەی (مرسل)ی هەیە لە عروەوە، وە باسی لەوە نەکردووە کە کەس لێوەی باس کردبێ، لەسەر ئەم بۆچوونەوە نابێ (موصول) بێ، وە ئەوەش کە لە هەواڵەکەدا هاتووە خەوێکە بینراوە و نابێ بە بەڵگە.

دووەم: لەسەر ئەوە کە ئەگەر قبوڵ بێت: ئەوە ڕێی تێدەچێ کە ئەمە یەکێ بێ لەو شتانەی کە لە تایبەتمەندی‌یەکانی پێغەمبەری خوان ﷺ، بە بەڵگەی چیرۆکەکەی ئەبی طالب، هەروەك لەپێشتر هێنامان کە سزای لەسەر سوك بوو، پێشەوا بەیهەقی دەڵێ: (ئەوەی کە هاتووە کە خێری بێ بڕواکان بەتاڵ دەبێتەوە، مانای وایە: ئەوانە ڕزگاریان نابێ لە ئاگری دۆزەخ، وە

---

[1]- الصنعاني، المصنف، ٤٧٨/٧.

[2]- صحيح البخاري، كتاب النكاح، باب (وأُمهاتُكُم التي أرضعنكُم)

ناشچـنه بەهەشـتەوە، وە دروسـتە كـە سـزايان لەسـەر سـوك ببـێ لـەو گوناهانەی كە كردويانە نەك بێ باوەڕییان لەسەر لابچێ بەهۆی ئەو چاكانە كە كردويانە).

وە شێخی عیاض دەڵێ: (یەكڕایی هەیە لەسـەر ئەوە كە بێ باوەڕەكان هیچ سودێ لە چاكەكانیان نابینن، نە پاداشتیان لەسەری دەدرێتەوە و نە سزاشیان لەسەر سوك دەكرێ، با هەندێكیان سزاكەیان قورستر بێ لە هەندێكی تریشیان).

دەڵێم: ئـەم وتەیـە ئـەو ئەگـەرەی كـە بەیهـەقی باسـی كـردووە بـەتاڵی ناكاتەوە، چونكە ئەوەی كە لەم باسەدا هاتووە پەیوەندی بە گوناهی خۆ كافركردنەوە هەیە، بەڵام گوناهێك لە غەیری ئەمە ڕێگر ئەبێ چی بێ بۆ سوك كردنی؟.

شێخی (القرطبي) دەڵێ: (ئەم سوك كردنە تایبەتە بەمەوە و بەوەشەوە كـە دەقێـك لەسـەری هاتبـێ) وە (ئیبنـو ئـەلمونیر) لـە (الحاشـیة)دا دەڵـێ: (لێـرەدا دوو بـاس هەیـە: یەكـەمیان نابـێ و مەحاڵـە، ئـەویش ئەوەیـە كـە بەندایەتی كافر لەگەڵ كوفرەكەیدا كۆبكەیتـەوە، چونكە مەرجی بەندایـەتی كاتێك دێتەجێ كە بە نیەتێكی ساغ و چاك بێت، وە ئـەم نیەتـەش لای بێ بڕواو كافرەكان نییە و ونە..

دووەمیـان: پاداشـتی بێ باوەڕان لەسـەر هەندێ لە كردەوە چاكەكانیان ئـەوەیش بـە فـەزڵی خـوا خـۆی، كـە ئەمـەیان لـەلای عـاقڵ و ژیـری جێـی نابێتـەوە، ئەگـەر دان بەمەدا بنرێ ئەوە ئازاد كردنی ثوێبە لەلایـەن ئـەبی لەهەبەوە نابێتە هۆكاری نزیك بوونـەوەی تـەواو، وە دروستە خـوای گـەورە بە فەزڵی خۆی لە هەركاتێ بیەوێ فەزڵی خۆی بڕژێنێ بەسـەر ئـەبی طالبـا (والمُتَّبَعُ في ذلِكَ التوفيقُ نفياً واِثباتاً)..

دەڵێم: (ئەمە تەواو کردنێکی هەیە ئەوەیە: ئەو فەزڵە کە پێی ئەدرێ ڕێزی ئەو چاکەیەیە کە لەو بێ بڕوایەوە دەکرێ، وە خواش زاناترە)[1] .

وە حافظی ابن کثیر، لە (البدایة والنهایة)دا هێناویەتی، وە لەسەری نوسیوە دەڵێ: (لەبەرئەوەی ثویبە مژدەی لەدایك بوونی برازاکەی محمدی کوڕی عبدالله ی پێدا لەو ساتەدا و لەخۆشیدا ئازادی کرد پاداشتی ئەو کارە بەم کارەیە)[2] .

وە حافظی –البغوي– لە –شرح السُنَّة– دا ڕیوایەتی کردووە[3]
وە زانای ناودار –محمد بن عمر بحرق– لە (السیرة)دا هێناویەتی و لەسەری نوسیوە: (دەڵێم: سوك بوونی سزا لەسەری یا ئەوەتا ڕێزێکە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەك چۆن سوك بوو لەسەر ئەبی طالب نەك لەبەر ئازادکردنەکە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾[4] .

وە پێشەوا –العامري– لە (بُهجَة المحافل)دا گێڕاویەتیەوە و (الأشجر) لە شەرحەکەیدا دەڵێ:

(وتراوە: ئەمە تایبەتە بەوەوە لەبەر ڕێزێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەك چۆن سووك بوو بۆ ئەبی طالب بەهۆی ئەوەوە، وە وتراوە: هیچ ڕێگرێك نیە بۆ سوك بوونی سزا لەسەر هەر بێ بڕواو کافرێك کە کردەوەی چاکە بکات)[5] .

---

[1]- بنوارە بۆ –ابن حجر– فتح الباري ١٤٥/٩.

[2]- ابن كثير –البداية والنهاية– ٢٧٣/٢.

[3]- البغوي: شرح السُنة، ٦٠/٥.

[4]- بحرق: حدائق الأنوار، ١٣٤/١.

[5]- الأشجر: شرح البهجة، ٤١/١.

وه –السهيلي– له (الروض الأنف)دا له شەرحی (السيرة النبوية)ی ئیبنو هشام دا هێناویەتی و لەدوای دا دەڵێ: (سودی پێ گەیاند کە ئەو لەناو ئاگردا بوو هەروەك چۆن سودی بە ئەبی طالبی برای گەیاند لەبەر پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەوە سوکترین سزای دۆزەخیەکانە، وە هەروەك لەپێشتر لە –باب أبي طالب–دا باسمان کردووە کە ئەم سوودە پێی سوك کردنێکە لە سزاکەی، ئەگەر وا نەبێ ئەوا کردەوەی بێ باوەڕان هەمووی دەسوتێ بەبێ جیاوازی، واتە لەسەر میزان و تەرازوی نابینرێ و ناچێتە ناو بەهەشتەوە)[1]. کۆتایی هات.

کورتەی باسەکەمان :

بەکورتی: ئەم چیرۆکە بەناوبانگە لە کتێبەکانی فەرموودەو لە کتێبی سیرەت دا، وە زۆرێك لە زانایانی باوەڕپێکراو نەقڵیان کردووە، ئەوەندە بەس بێ کە شێخی بوخاری لە –صحيح البخاري–دا بەڕاستی داناوە و لەسەر پلەو مەکانەتی فەرموودەکە یەکڕایی هەیە، وە ئەو شتانەی کە لە –مسند–دا هەن هەموویان –صحيح–ن بەبێ قسە، وە هەرچی لەسەر نوسین و پەراوێزدا هەیە، هیچیان لە بازنەی قبوڵ بوون دەرناچن، وە ناگەنە پلەی ڕەدکردنەوە، وە ئەمەش ئەهلی زانست ئەوانەیان کە سەرقاڵی زانستی فەرموودەو ماناکانین ئەیزانن و لێیان شاراوە نیيە، وە ئەو کەسانەش کە مانای (المعلق والمرسل) دەزانن حیکمەتی چەندە گەورەیە کاتێ کە لە –صحيح–دا هاتبێ.

ئەگەر ئەتەوێ فەرموو بنوارە بۆ کتێبەکانی (المصطلح) وەکو: ئەلفیەی سیوطي، عراقی و شەرحەکانی و (تدريب الراوي)، ئەوانە هەموو بەها و

---

[1]- السهيلي: الروض الأنف، ١٩٩٣/٥.

قیمەت و نرخی (صحیح) یان لایە لە (معلق ومرسل)دا وە ئەوانە وەرگیراون لەلایەن لێکۆڵەرەکانەوە.

پاشان ئەم باسەیە لە بەشی -مەناقب و فەزڵیەت و کەرامەت - دا زانایان جێیان کردۆتەوە لە کتێبەکانی تایبەت بەو باسەو سیرەت دا، وە لە کاتی هێنانیشیدا هیچ شەرت و مەرجێکیان بۆ ڕاستێتی و صەحیحێتی دانەناوە کە بەمانای زاراوەیی تەواو بێ، خۆ گەر مەرج و شەرتیشیان دابنایە ئەوە دەبوو بەشتێکی شازو نامۆ، چونکە نەماندەتوانی هیچ شتێ لەپێش بوونی بە پێغەمبەرێتی و دوای پێغەمبەرێتی حەزرەتی محمد ﷺ باس بکەین و بنوسرێتەوە، وە کاتێ سەیری کتێبەکانی زانا ناودار و حافظەکانمان دەکەیت کە جێی باوەڕی مێژووی ئومەتن تیایانا تۆمارە، کە دیاریان کردووە کە دروست و نادروست لە بەشی فەرموودەدا هێناویانە بەڕاست و لاوازەوە دیارییان کردووە، ئیتر دەبینی کتێبەکانیان پڕە لەو باسانە کە پلەی (مقطوع و مرسل)ن و هەر شتێ لەو ژیانەدا هەبێ هێناویانە وە ئەوانەش کە لە تایبەتمەندی پێغەمبەری خوان ﷺ وە ئەو قسەیەش کە دەڵێن: ئەم هەواڵە پێچەوانەی وتەی خوایە کە دەفەرموێت: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُوراً﴾ الفرقان: ٢٣، ئەم وتەیەشیان ڕەد کراوەتەوە بە قسەی زانایانی ئیسلام وەك لە پێشتر باسمان کرد.

وە پێویستە بزانین کە ئەم ئایەتە دەلالەت دەکات لەسەر ئەوە کە کردەوەی بێ بڕواکان هیچ سەیر ناکرێ مادام ئەوانە لە سزادا بن، وە لەو کاتەدا بە هیچ شێوەیەکیش سزایان لەسەر سوك نابێ وەك زانایان دانیان پیاناوە..

وە هەروەها بە یەکڕایی هاتووە وەك شێخی -عیاض- دەیگێڕێتەوە کە کافر و بێ بڕواکان سزا لەسەر هەندێکیان سوك نابێت لەبەر کردەوەیەك کە

کردویانه، هەر بۆیەش خوای گەورە دۆزەخ و جەهەنەمی بە پلەو (الدرکات) داناوە بۆیان، وە بۆ دووڕووەکانیش دەفەرموێ: ﴿الدرك الأسفل مِنَ النار﴾ە.

وە پاشان بزانین کە ئەم یەکڕاییە بە دەقێکی ڕاست ڕەد دەکرێتەوە، وە دروست نییە یەکڕایی لەکاتێکدا کە دەقێك هەبێ کە ئەمە لەلای قوتابیانی شەرع ئاشکرایە.

دەبینین جێگیر بووە لە -صحیح-دا کە پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئایا هیچ سودێك بە ئەبو طالب دەگات لەکاتێکدا کە تۆی گرتە خۆی و پارێزگاری لێ کردی؟ لە وەڵامیاندا فەرمووی: (ئەبوطالبم بینیوە لە شیوەکانی دۆزەخ، دەرم هێنایەوە و خستمە چوار دەورەکەی).. فەرموودەکە.

ئەوە ئەبو طالبە بەهۆی دیفاعی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ سودی پێ دەگات، کە پێغەمبەری خوا تکای بۆ دەکات و لەناوجەرگەی شیوەکانیەوە دەیهێنێتە قەراغی ئاگر.

سوك بوونی سزا بۆ ئەبولەهەبیش لەم بابەیەو هیچ ئینکاریەکی تێدا نییە، فەرموودەکەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو ئایەتەی سەرەوە بۆ کەسانێکە کە هیچ کردەوەیەکی وایان نییە کە پێویستی بکات بە سوك کردنی سزا، وە یەکڕایەکەش بۆ ئەمەیە..

وە فەرموودەکەی ئەبو طالب بەڵگەیەکی بەهێزی تێدایە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەپێش ڕۆژی قیامەت و لە ژیانیدا و لە ئێستادا تەصەروف دەکات و دەسەڵاتی هەیە و شەفاعەت و تکا دەکات بۆ ئەو کەسانەی کە ئەویان ویستووە پارێزگاری و دیفاعیان لە شانی کردووە.

وە ئەو قسەەش کە دەڵێن: (ئەم هەواڵە تەنها خەوێك بووە و حوکم و یاسای پێ جێگیر نابێ)، ئەوەی ئەم قسە دەکات -خوا هیدایەتی بدات بۆ ڕێگەی ڕاست- کە نازانێ جیاوازی لەنێوان ئەحکامە شەرعیيەکان و غەیری ئەوان چیيە...

ئەحکامی شەرعی: جیاوازی ڕا لەنێوان شارەزایانی فیقه دا هەیە: کە ئایا دروستە یاسا و حوکم لەخەو وەربگرین وە خەو بەڕاست بزانین یان نا؟

وە هەندێکی تر: کە پشت بەستن بە خەو لەم باسەدا هیچی تیا نییە. کە ئەمە زۆر لە زانایان ئەم ڕایەیان هەیە، بۆیە لە نوسینەکانیان دا باسی ئەو خەوانەیان کردووە کە لە سەردەمی جەهالەتی پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ ڕوویانداوە کردووە کە باس لە دەرکردنی پێغەمبەری ئاخر زەمان دەکەن، کە چۆن دەسەڵات بەسەر خراپەکاری دا دەگرێ و نایهێڵێ و زاڵ دەبێ بەسەر بتەکانیان دا، کە کتێبەکانی سیرە پڕە لەم جۆرە باس و خەوانە...

وە لەپێشی هەموویانەوە کتێبی -دلائل النبوة- بە نمونە دەهێنینەوە کە هەندێ لەو شتانەشی تیایە کە پێی دەڵێن: اِرهاصات- کە ئەگەر بەلایەوە دروست نەبوایە نەیدەهێنان و تۆماری نەدەکردن.

وە ئەو قسەش کە وتراوە لە ئاستی خەوەکەی پێشەوا عەباس کە دەڵێن: (ئەمە نابێ بە حوجەو بەڵگە وە حوکم و هەواڵی پێ جێگیر نابێ) ئەم وتەیە دەرچوونە لە کردەوەی پێشەوایان لە (حفاظ)و جگە لەوانیش لە زانایان، کە خۆر دوورخستنەوەیە لە ڕاستی، ئەینا ئەمە شایەنی لێکۆڵینەوە نییەو بەم شێوەیە ناگەیتە هەق و ڕاستی، فرمانیش هەر بۆ خوایە...

وە ئەو کەسەش کە دەڵێ: ئەو کەسەی کە خەوەکەی دیوەو ئەوەش کە ئەیگێڕێتەوە کە (عباس)ە لەو کاتەدا لە حاڵی کوفردا بووە، وە بێ باوەڕانیش گوێ لە شایەتیان ناگیرێ وە هەواڵیان بەڕاست دانانرێ، ئەم

وتەیەشیان ڕەد دەکرێتەوە چونکە قسەیەکی زانستی نیەیەو بەتاڵە، چونکە کەس لە زانایان بەڕەهایی نەیانووتوە ئەمە خەوە، بەڵکو وتوویانە مژدەیەکە، مژدەش نە لە دین و لەئیمان دا هیچ بەشەرت نەگیراوە تیایدا، بەڵکو خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باس لە یەکێ لەو موعجیزانە دەکات کە بەخشیویەتی بە پێغەمبەر یوسف -علیه السلام- کە لە ڕێگەی ئەو خەوەوە کە پاشای میصر بینی کە پاشا کەسێکی وەثەنی بوو هیچی لەبارەی دینە ئاسمانیەکانەوە نەدەزانی، لەگەڵ ئەوەش دا خوای گەورە خەوەکەی ئەو وەثەنیەی گێڕا بە یەکێ لە بەڵگەکان بۆ دەرکەوتنی پێغەمبەر یوسف و بەهۆیەوە فەزڵ و گەورەیی بەو چیرۆکە دەرکەوت، جا ئەگەر خەو بەڵگە نیەیە و دەلالەت نەکاتە سەر هیچ شتێ بۆچی خوا باسی دەکات، دەبووایە بوترایە ئەوە خەوی کەسێکی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردەری وەثەنیەیەو هیچ سودێکی نیەیە، نە پشتگیری بکرێ و نە ئینکاریش بکرێ..

هەر لەبەر ئەمەشە کە زانایان باسیان لەوە کردووە کە دروستە بێباوەڕان و کافران لەخەودا خوای گەورە ببینن و لەو بینینەیاندا ئاگادار بکرێنەوە یان سەرزەنشت بکرێن.

ئەوەی کە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە کەسێك دەڵێ: کە ئیمامی عەباس کاتێ ئەو خەوەی دیوە بێ باوەڕ بووە، وە بێ باوەڕانیش شایەتیان گوێ لێناگیرێ وە هەواڵدانیان وەرناگیرێ، ئەم قسەیەیان بەڵگەیە لەسەر زانیاری نەبوونیان بە زانستی فەرموودە، کە لە زاراوەکانی ئەو زانستەدا هاتووە و دانپیانراوە کە صەحابەیەك یان غەیری ئەو ئەگەر شتێکی لە حاڵی ژیانی بێ باوەڕەیەکەیدا بینی و پشت ڕاستی کردەوە پاشان لە دوای

موسـوڵمان بونەکەی ڕیوایـەتی کـردووە، ئـەوە لێـی وەردەگیرێ، بنـوارە بـۆ پەرتوکی پێناسەی زاراوەکان... تا ڕاستییەکان بەچاوی خۆت ببینی..

## کۆتـایی

لەدوایدا: تا ئێرە ئەوە ئەو باسانەبوو کە خوای گەورە بۆی ئاسان کردم کـە بیاننوسـم کـە حـەزم کـرد تێگەیشـتنمان لەسـەری ڕوون بکەینـەوە بـەو شێوەیەی کە ئێمە دەیبینین.

ئەگـەر لـەوەی نوسـیومانە لەسـەر ڕاسـتی بـووین، ئـەوە سوپاسـی خـوای گەورە دەکـەم، خـۆ ئەگـەر واش نـەبوو، ئـەوە منـیش مـرۆڤم ڕاسـت ئەکـەم و هەڵــەش دێتــە ڕێگــەم، وە هــەموو کــەس لــە ئێمــە لێــی وەردەگــیرێ و ئەشـدرێتەوە بەڕوویـدا، تـەنها گـەورەمان حـەزرەتی محمـد ﷺ نـەبێ کـە مەعصوم بووە و هەرگیز لەخۆیەوە هیچ وتەیەکی نەفەرمووە بەڵکو هـەموو نیگاو وەحی خودایی بووە.

وە پــەنا بــە خــودای خــۆم دەگــرم لــە خۆدەرخســتن و دووڕوویــی و موجادەلـەکردن و دوژمنایـەتی، پـەنا بـە خـوا دەگـرم لـە زانسـتێ کـە سـوود نەبەخشێ، لە پاڕانەوەیەك کە نەبیسترێ، لە دڵێ کە ترسی خوای تیا نەبێ، پــەنا بــەخوا دەگــرم لــە هــەموو خراپەکارییــەك لــە هــەموو شــەڕو بــەڵاو ناڕەحەتیەك، لـە هـاوەڵ بـۆ خـوا بڕیـاردان و هـەموو کـردەوە داهێنراوەکـان، دان ئەنێم بە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەرەکەم دانی پیانـاوە، لـە خـۆمی دوور دەخەمەوە هەر شتێ کە پێغەمبەرەکەم دووری خستۆتەوە.

داواکارم لە خوای پەروەردگارم کە ئیمانم لەسەری جێگیر بکـات تـا ئـەمرم لەسـەری بـە موسـوڵمانیەتی، بەشـێوەیەك کـە بـاوەڕم لەسـەری پتـەو بـێ

لەنێوان موسوڵمانە یەکتاپەرستەکاندا کە شایەتی ئەدەن بەخوای خۆیان و بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محمد ﷺ وە دەڵێن:

(أشهدُ أن لا إلـه إلا الله، و محمد رسول الله)، وە لەسەر ئەو باوەڕەم بمێنمەوە کە پێغەمبەرو هاوڕێیانی و شوێن کەوتوان و شوێن کەوتەی شوێنکەوتوان لەسەری بوون لە پێشەوایانی سەلەفی صالح و پیاوچاکان ڕەزای خوایان لەسەر بێ، وە لەژێر سێبەری پێشەوایانی یەکتاپەرست و بانگخوازانی ڕێگای خێر لەسەر گەورەکانمان خوای گەورە لەوانەی پێشین خۆش بێ و ئەمانەی دواتریش سەرفراز و سەرکەوتوو بکات بۆ سەرخستنی ڕێگەی هەق و دەستی قودرەتی خوایی لەسەر دەستەکانیان بێ بۆ خێرو خۆشی وڵات و بەندەکانی خوا...

سوپاس بۆ خوای باڵادەست و میهرەبان..

وصلى الله على سيدنا محمد و آله وصحبه أجمعين

* * *

ئەم کتێبە نوسراوە بە دەست و پێنوسی: محمدی کوڕی عەباس، مالکی مەزهەب، سەلەفی بیروباوەڕ، مەککی نیشتمان ، حەسەنی نەسەب، خوای گەورە لێیان خۆش بێ خزمەتکاری زانستی پیرۆز لە بەلەدی حەرام، لە مەککەی پیرۆز نووسی لە مانگی ربيع الأول لە ساڵی ١٤٠٤ لە هیجرەتی پێغەمبەر ﷺ..

تەواو بوو سوپاس بۆ خوا....

أعوذُ باللهِ مِنَ الشَيطانِ الرَجيم

﴿ وَمَنْ يُشاقِقِ الرَسوُلَ مِنْ بَعْدِ ما تَبَيَنَ لَهُمُ الهُدى وَيَتَبِعْ غَيْرَ سَبيلِ المُؤمِنينَ نُوَلِّهِ ما تَوَّلى وَنُصلِهِ جَهَنَمَ وَ ساءَت مَصيراً ﴾

# پێڕست

بابەت | لاپەرە



نووسەر لەچەند دێرێکدا :

- ناوی : السيد محمد الحسن بن علوي بن محمد المالكي الحسنى الأدريسي.
- لە ساڵی ١٩٤٣ لە مەککەی پیرۆز لەدایك بووە
- خاوەنی پلەی ماستەر و دکتۆرایە لە زانکۆی -أصول الدين- لە ئەزهەری پیرۆز.
- ساڵی ١٩٧١ بۆ ١٩٨٠ دەبێتە مودەریس لە کۆلێژی شەریعە لە مەککەی پیرۆز.
- ساڵی ١٩٧٢ باوکی وەفات دەکات و دوای سێ رۆژ دەکرێتە مودەریس لە شوێنەکەی باوکی و پلەی تەدریسی ناو حەرەمی مەککەی پێ دەبەخشرێ.
- لەساڵی ١٩٨٠دا بریار دەدات بەخۆ یەکلایی کردنەوە بۆ تەدریسی کەعبەی پیرۆز و واز لە زانکۆی شەریعە لە مەککەی پیرۆز دەهێنێ.
- لە ١٩٨٠ بۆ ١٩٨٢ دەبێتە لێپرسراوی (التحكيم الدولية لمسابقة القرآن الكريم) لە وڵاتی سعودیە.
- لەلایەنی زانایانی فەرموودە ناسی لە وڵاتی سعودیەوە پلەی (المحدث) یان پێ دەبەخشرێ لەبەر شارەزایی تەواوی لە زانستی فەرموودەدا.
- زۆر گرنگی دەدات بە یەکریزی زانایانی ئاینی و هەمیشە نەرم نیانی و لەسەر خۆیی پێوە دیاربووە و بە بەڵگەی بەهێز دواوە.
- خاوەنی گەورەترین مزگەوت و مەدرەسەو تەکیەیە لەشاری مەککەی پیرۆز.
- خاوەنی زیاتر لە ٦٠ کتێب و دانراوە.
- زۆر لە زانایانی مەککە و دەرەوەی سعودیە بەهرەمەند بوون لێوەی و لە مەدرەسەکەی دا تەخەروجیان کردوە لەوانە (دکتۆر شێخ حبيب علی الجفری)
- لەبەرە بەیانی شەوی هەینی (١٥ی رەمەزانی ١٤٢٥- ٢٩ی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٤) لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا لە مەککەی پیرۆز وەفاتی کردووە.
- لەگۆڕستانی (المعلاة) لەنزیك گۆڕی -خاتوو خادیجە-ی دایکی ئیمانداران لەمەککە نێژراوە.

نرخ ١٠.٠٠٠ هەزار دینار

کتێبخانەی هەورامان